
السراج المنير
في ترتيب أحاديث
صحيح الجامع الصغير
به كوردی
بەرگی یەکەم
الحافظ جلال الدين السيوطي
العلامة محمد ناصر الدين الألباني
رتبه وعلق عليه
عصام موسى هادي
وەرگێرانی:
غازی حمە امین
إحسان برهان الدين
پێداچونەوەی / م. ئەحمەدی شەریعە




# به کوردی

الحافظ جلال الدين السيوطي
العلامة محمد ناصر الدين الألباني

رتبه وعلق عليه
عصام موسى هادي

وەرگێڕانی..
غازی حمه امین - إحسان برهان الدین
پێداچونەوەی..
م. ئەحمەدی شەریعە
دیزاین .. سرمد
لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی تیشك - چاپی یەکەم ۲۰۱۳
لە لایەن بەڕێوبەرایەتی کتێبخانە گشتی یەکانەوە
ژمارەی سپاردنی ( ۱۸۷۹ ) ساڵی ۲۰۱۲ ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.




**بەرگی یەکەم**

الحافظ جلال الدين السيوطي

العلامة محمد ناصر الدين الألباني

رتبه وعلق عليه

عصام موسى هادي

وەرگێرانی:

غازی حمه امين      إحسان برهان الدين

پێداچونەوەی / م. ئەحمەدی شەریعە

# پێشەکی..

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ پەروەردگاری جیهانیان سەلات و سەلام لەسەر پێغەمبەری کۆتا زەمان و شوێن کەوتووانی لە جنۆکە و ئادەمیزاد.

ئیسلام بریتیە لە قورئانێکی نێردراو و پێغەمبەرێکی ڕاوانە کراو. بەدرێژایی مێژوو خوای گەورە کۆمەڵی زانا و بلیمەتی ڕەخساندووە بۆ خزمەتکردن و پارێزگاری کردن و پاسەوانی کردنی ئیسلام، کۆمەڵێکی زۆر لەو زانا گەورە و ناودارانە ژیان و تەمەنی خۆیان تەرخان کردوە بۆ خزمەتکردنی قورئانی پیرۆز و ڕۆح و گیان و تەمەن و ماڵی خۆیان لەپێناودا بەخت کردووە و سەلماندویانە کە میرات گری ڕاستەقینەی پێغەمبەری خودان.

لە بەرامبەردا کۆمەڵێکی تری زۆر لە زانایان بەهەمان شێوەی دەستەی پێشوو ڕۆح و گیان و تەمەن و ژیان و سەروەت و سامانی خۆیان بەخت کردووە لە پێناو خزمەت کردنی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوادا سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت، هەوڵیان داوە فەرموودەکان پلە بەند بکەن و لێکیان هەڵاوێرن بەگوێرەی زانستی تایبەتی فەرموودە ڕیزبەندیان بکەن-ڕاست- بەهێز بەهەمو پلەکانیانەوە، تەنانەت فەرموودە هەڵبەستراوەکانیش دەست نیشان بکەن و ئومەتی ئیسلامیان لێ ئاگادار بکەنەوە.

بێگومان زانایانی ئیسلام لەهەموو بوارەکانی زانستدا فیداکاری و خزمەتێکیان پێش کەش کردووە تەنها خودای گەورە ئەوپەڕی دەزانێت و تەنها پاداشتیان هەر بەخودا دەدرێتەوە.

هەموو گەل و نەتەوەکان لەم سەروەریەدا خاوەنی پشکی تایبەتین و جگەر گۆشە و کەڵەزانا و ناودارانی بلیمەت و فیداکاریان پێش کەش بە ئیسلام کردووە. گەلی کوردیشمان لەم بوارەدا ئەگەر لە پێش هەموو گەل و نەتەوەکانەوە نەبن، لەدەستی پێشەنگ و سەرمەشقی ئەو بوارەدا بوون و مێژوو و دۆست و دوژمن شاهیدی ئەو هەوڵ و فیداکاریەن، لەهەموو بوارەکانی خزمەتکاری ئیسلامدا زانایانی کورد سەرمەشق و پێشەوا بوون لەهەموو بوارەکانی زانست و سەربازی پەروەردە و نوسین و فیداکاری، کێ هەیە ناوبانگی (ابن صلاحی شارەزووری و صلاح الدين الايوبی و ابن الجزری ابن الحاجب و شێخ محمدی نۆدەهی ناسراو بە (مربي الثقلين) و نورسی و ابن آدم و زهاوی و....) سەدان و بگرە هەزاران زانای ئاوایان نەبیستبێ، خزمەت کردنی ئیسلام مایەی شانازی و سەربەرزی ئێمەیە و دەستی لێ بەرنادەین سەربەرزی و سەرفرازی دونیاو دوارۆژی خۆمان لە خزمەتکاری ئیسلام دا دەبینین ، ئومێد وایە کەلێنێکی

باش پڕیکاتەوە لە کتێبخانەی کوردیدا ، ئێمەش ئومێدمان وایە وەکو ئەو هاوەڵەی فەرموی هیچم ئامادە نەکردووە بۆ ڕۆژی قیامەت تەنها خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر نەبێت ، پێغەمبەریش سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت پێ ی فەرموو ﴿أنت مع من أحببت﴾[1] واتە: (تۆ لەگەڵ ئەوەدایت کە خۆشت دەوێت) . ، ئێمەش ئەگەر زانست و کردەوەی بەرچاویشمان نەبێت خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرمان لە دڵدایە ئومێدمان وایە سودمان پێ بگەیەنێت تای تەرازوی چاکەکانمان قورس و سەنگین بکات و شەفاعەتی پێغەمبەرمان بۆ مسۆگەر بکات.



غازی حمە امین – إحسان برهان الدين

مەلا ئەحمەدی شەریعە

چوارشەممە ٢٢-٢-٢٠١٢

---

١ صحيح البخاری ٦١٦٧ – ٦١٧١ ، صحيح مسلم ٢٦٣٩.

بسم الله الرحمن الرحيم

پێشەکی چاپی نوێ

الحمدلله رب العالمين ، و الصلاة والسلام على سيد المرسلين سيدنا محمد ، و على آلـه و أصحابه أجمعين، أما بعد:

ئەمە چاپێکی لێ زیادکراو و بژارکراوە ، پێشکەشی خوێنەرە بەڕێزەکانی دەکەم ، بەو هیوایەی ببێتە مایەی ڕەزامەندیان ، ئینجا ئەم چاپە جیاوازە لە چاپەکانی تر لە چەند شتێکدا ، لەوانە:

١- دروست کردنی پێرست بۆ قەراغ و چاغی فەرمودەکان (الأطراف الاحاديث) وەکو ئاسانکاری بۆ کەسێك بە دوای فەرموودەیەکی دیاری کراودا بگەڕێت.

٢- دەرخستنی سەرچاوەکانی مامۆستایان بۆ (تەخریجی)دەرهێنان فەرموودەکان[1] ، ئینجا خوێنەر لە زۆرێك لەوانە جیاوازی دەبینێ لەوەی کە لە (صحيح الجامع الصغير) دا هەیە چاپی (المكتب الإسلامي) چونکە هەندێ لە سەرچاوەکانم گۆڕیوە بە هەندێکی تر، چونکە خوێنەر ئاسان تر ئەتوانێت پێی بگات لەوەی باس کراوە لە چاپی (صحيح الجامع) دا.

٣- دانانی سەر و بۆ ر بۆ ئەو ووشانەی پێویست دەکات.

٤- چاککردنەوەی هەر هەڵەیەکی پێنووس یان چاپ لە چاپی پێشوو . دەڵێم : ئەمە گرنگترینی ئەو زیادانەیە لەم چاپەدا هاتووە ، هەروەها خوێنەر هەندێ سوودی تر بەدی دەکات کە خستوومەتە سەر ڕاڤەکردنی ووشە نامۆکان ، یان لە وێنەی پەراوێزدانان بۆ فەرموودەکان .

لە خوای گەورەیش داواکارم بەم چاپە تازە سوود بگەیەنێت ، وەکو چاپی پێشوو ، هەروەها بیکاتە مایەی ڕەزامەندی ، خوای پەروەردگاریش خاوەن دەسەڵاتە ئەو کارە ئەنجام بدات.

وصل اللهم على محمد و على اله و اصحابه اجمعين

عصام موسى هادی

عەممان- ئوردون

٧ی شەعبان ی ١٤٢٩ ك ٢٠٠٨/٨/٨ز

---

[1] ( نەمتوانی سەرچاوەی ژمارەیەکی لە سەرچاوەی فەرموودەکان بەدەست بهێنم ، بۆیە جێگاکەم بە بەتاڵی بەجێهێشت، وەکو مامۆستایشمان ئەو کارەی ئەنجام داوە لە (صحيح الجامع) دا)

بسم الله الرحمن الرحيم

ان الحمد لله ، نحمده و نستعينه ، ونستغفره ، و نعوذ بالله من شرور أنفسنا ، ومن سيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ، و من يضلل ، فلا هادي له ، واشهد أن لااله الا الله وحده لا شريكه له ، واشهد أن محمدا عبده ورسوله.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ (ال عمران: ١٠٢)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ (النساء :١)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ (الاحزاب : ٧٠-٧١)

مامۆستامان ڕەحمەتی خوای لێ بێت. ژیانی خۆی تەرخان كردبوو بۆ بەدیهێنانی پرۆژەیەكی گەورە : (تقریب السنه بین یدی الامه) واتە: نزیككردنەوەی سوننەت بۆ بەردەستی ئوممەت ، زیاتر لە پەنجا ساڵیش كاری كرد لە نێو كتێبەكانی فەرموودەدا و بۆ جیاكردنەوەی ڕاستی لە لاواز ، وەكو ئامۆژگاری بۆ موسوڵمانان و ، بەرگریكرد لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) .

یەكێك لە مەزنترین ئەو كتێبانەش مامۆستامان لێكۆڵینەوەی لەسەركرد و ، ڕاست لە لاوازی لێك جیاكردەوە ، كتێبی (الجامع الصغیر من الحدیث البشیر النذیر) كە زانای پایەبەرز (الحافظ السیوطي) دایناوە ، كە مامۆستامان ستایشی كردووە ، فەرموویەتی : كتێبی (الجامع الصغیر من الحدیث البشیر النذیر)ی (الحافظ السیوطي) كۆكەرەوەترین كتێبەكانی فەرموودەیە لە ڕووی بابەتەوە ، لە هەمووشیان بەسودترە و ئاسانترە و جوانتر ڕێكخراوە ، بۆیە هیچ سەیر نیە كە ئەم كتێبە بوو بووە باسی نێو كۆڕكان و زانایان و قوتابیانی زانست لە هەموو كات و شوێنێكدا دەستاو دەستی پێدەكرا ، سەرەڕای جیاوازی پلە و سەرچاوەو ، بواری پسپۆڕیان ، جا نە فەرموودەناس و نە

شه‌رعناس و نه ووتاربێژ و ، نه ووێژه‌وان ده‌ستبه‌ردار و بیّ نیاز نابن لێی هه‌ر بۆیه چاپكردنه‌وه‌ی دووباره ده‌بێته‌وه و ، ڕاڤه‌كه‌رانی زۆر ده‌بن[١] ...

ده‌ڵێم شاراوه نیه له خوێنه‌ر ، كه (السيوطی) ڕه‌حمه‌تی خوای لیّ بێت ، كه‌م و كوڕییه‌كی بینیوه له (جامع) ه‌كه‌یدا ، بۆیه پاشكۆیه‌كی بۆ دروست كردووه له ژێر ناونیشانی (الزياده علی جامع الصغير) به‌ڵام بواری بۆ نه‌ڕه‌خساوه یه‌كیان خات و ، هه‌موو فه‌رمووده‌یه‌ك بخاته جێگای گونجاوی خۆی ، وه‌كو مامۆستامان فه‌رموویه‌تی .

بۆیه له پاش ئه‌و شێخ (يوسف النبهانی) هات و ، ئه‌و زیاده‌ی خسته پالّ (جامع صغير) و ، هه‌ردووكیانی كرد به یه‌ك و ، به شێوه‌یه‌كی تا ڕاده‌یه‌ك باش ڕێكخست و ناوی نا (الفتح الكبير في ضم الزيادة الى جامع الصغير)

هه‌ر ئه‌و كتێبه‌ش بوو ، مامۆستامان ڕه‌حمه‌تی خوای لیّ بێت هه‌ڵساوه به ته‌خریجكردن و لێكۆڵینه‌وه‌ی و دابه‌شی كردووه به دوو به‌ش، یه‌كه‌م : ((صحيح جامع الصغير و زيادته)) دووه‌م ((ضعيف الجامع الصغير و زيادته)) .

(المكتب الاسلامی) یش ، خوا پاداشتی چاكه‌ی بداته‌وه هه‌ڵساوه به چاپ كردنی ، خه‌ڵكیش سوودیان لیّ وه‌رگرت و ، بوو به ڕووگه‌ی توێژه‌ران له‌م سه‌رده‌مه ، كه‌م كه‌سیش هه‌یه له توێژه‌ران پێویستی پێی نه‌بێت ، ئینجا له‌به‌رئه‌وه‌ی كتێبه‌كه له‌سه‌ر پیته‌كانی فه‌رهه‌نگ ڕێك خراوه ، نیاز به‌وه زۆر بوو له‌سه‌ر بابه‌ته‌كان ڕێكخرێت ، بۆ ئه‌وه‌ی فه‌رمووده‌كه به ئاسانی ده‌ست بكه‌وێت ، بۆ ئه‌و مه‌به‌سته‌یش برامان (عونی الشريف) هه‌ڵسا به ڕێكخستنی له‌سه‌ر بابه‌ته فیقهیه‌كان ، به‌ڵام هه‌ڵسا به لابردنی ئه‌و حوكمانه‌ی له‌سه‌ر فه‌رمووده‌كان دراون له سه‌رچاوه‌كانی ته‌خریجیانه‌وه (المكتبه المعارف) یش له (رياض) هه‌ڵساوه به چاپكردنی خوا پاداشتی چاكه‌یان بداته‌وه .

ده‌ڵێم: وا چه‌ند ساڵێكیش تێپه‌ڕ بوو به‌سه‌ر چاپكردنی (صحيح الجامع) دا و ، پێویسته جارێكی تر پێداچوونه‌وه‌ی بۆ بكرێت ، چونكه ئاده‌میزاد به سروشتی هه‌ڵه و لیّ تێكچوونی هه‌یه ، زانستیش سیفه‌تی مت بوون نه جوڵانی تێدا نیه ، نه‌خوازه‌ڵا گه‌ر خاوه‌نی كتێبه‌كه‌ش فه‌رمووده‌ناسی ئه‌م سه‌رده‌مه پێشه‌وای فه‌رمووده‌ناسان بێت ؟

---

[١] ( پێشه‌كی صحيح جامع الصغير (١/٣))

منیش ئەو ساتانەی بەسەرم برد لەگەڵ مامۆستامان لە كتێبخانەكەی ، ، ڕەحمەتی خوای لێ بێت ،دەمبینی هەمیشە خەریكی ئەو كتێبە بوو ، شتی بەسوودی بۆ زیاد دەكرد و پەراوێزی بۆ دادەنا ، منیش ئەو گۆڕانكاریانەم دەنوسی كە شێخ بڕیاریدەدا لەو كاتەی لە نەخۆشخانە بوو ، بەڵام نەخۆشیەكەی لە زیاد بووندا بوو بۆیە بواری نەما هەڵسێت بە كارەكانی جگە لە تێڕوانینی ئەم كتێبە نەبێت، بۆیە نیاز وا بوو پوختەی بكاتەوە و ، دووبارە چاوی پیا بخشێنێتەوە و ، دەیووت : ئەم پرۆژەیە كە نەخۆشی و بێ دەسەڵاتیم سەپانی بەسەرمدا ، بەڵام سەیر ئەوەیە ئەو پرۆژەی كە لە نەخۆشی و بێ دەسەڵاتیدا ئەلبانی پێی هەڵیا ، زۆرێك لەو لێكۆڵەرەوانی خاوەن تەندروست و بەهێزن ناتوانن ئەنجامی بدەن ، ئیتر لەو كاتە مامۆستامان هەندێ هەڵەی بۆ دەركەوت لە كتێبەكەدا كە پێشتر هەستی پێ نەكردبوو ، بۆیە بۆچونی خۆی دووبارەی هەندێ لە فەرموودەكان گۆڕی ، تاكو ئێستاش هەندێ لەو پەراوێزانە دەستنوسەكەی خویدا قەتیسماون و نەمانتوانیوە بیانبینین.

جا تاكو ئەو كاتەی بۆ كەسێك دەرەخسێت ئەو پەراوێزانە ئاشكرا بكات ، پێم خۆش بوو (صحیح جامع) لەسەر بابەتەكان ڕێك بخەم و ، و ئەوەشی لێ زیاد بكەم كە دەستم كەوتووە لە كۆشش و ڕاستكردنەوەی مامۆستامان ، لەگەڵ پێداچوونەوەی سەرچاوە ڕەسەنەكان كە (سیوطی) لێوەی وەردەگرێت و ، ئەو هەڵانەیش كە هیچ مرۆڤێك لێی دەباز نابێت.

داواكاریشم لە خوای گەورە ئەم كارە بكاتە كارێكی پیرۆز و بەسود ، وەكو چۆن بنچینەكەی كردە مایەی سوود ، خوای گەورە خۆی بیسەرەو ، وەڵامدەرەوی بۆ پاڕانەوەیە.

## كاری من لەم كتێبە

١- به پێی بابەتە فیقهیەكان ڕێكم خستووە ، بۆ ئەوەی سەرجەم خەڵكی سوودی لێ وەربگرن و ، ئامۆژگار و ، ووتاربێژیش سوودی لێ وەربگرن ، مامۆستایشمان ئەم جۆرە ڕێكخستنەی ستایش كردووە لە كتێبی (موارد الضمان) (٦/١) : بێگومان ئەم ڕێكخستنە بەسوودترە بۆ خەڵكی ، بۆ سوودوەرگرتن و تێگەیشتن و پیاداچوونەوەش ئاسانترە ، بۆیە ووتراوە (فیقهی)تێگەیشتنی بوخاری لە ناونیشانی بابەتەكانیدایە ، لە صەحیحەكەیدا ، بێگومان گەورە زانایانیش لەسەر ئەم ڕێبازە ڕۆیشتوون ، وەكو خاوەنی ، شەش كتێبەكە و (ابن خزيمة) لە (صحيح) ە كەیدا و ابن جاروود لە (منتقى) یەكەیدا و كەسانی تریش: بەڵكو من دەڵێم ئەوە گونجاوترە لەگەڵ شەرعدا و فەرمانی پێغەمبەریش (ﷺ) كە دەفەرموێت (يسروا ، ولا تعسروا) (متفق عليه) ، لە زنجیرەی (الصحيحه) یشدایە (١١٥١) سەبارەت بەو ڕێكخستنەش سوودی زۆرم وەرگرت لە ئەو بەش بەش كردنەی برامان (زمير الشاويس) لە بەرگێكی بچوكدا ، چونكە ئەو كەسەی سوپاسی خەڵكی نەكات سوپاسی خوایش ناكات.

٢- ڕازاندوومەتەوە بە بەدواداچوونەكانی مامۆستامان لەسەر (سیوطی) ، ئەوەی لە (الصحيح الجامع) یان لە كتێبەكانی تردا بێت.

٣- ئەو ڕاستكردنەوانەم تێكەڵكێش كردووە ماموستامان بە خەتی خۆی نوسیویەتی تێ كردووە ، لە لابردنی هەندێ فەرمووده كە بە ڕاستی دانابوون ، بەڵام دواتر بۆی دەركەوتبوو كە لاوازن ، یان بە پێچەوانەوە ، پاراستومن لەو كتێبەدا كە كە دامنابوو: (محدث العصر الامام الالباني كما عرضته) ، هەروەها ئەو دەسكاریانەی كە لە ڕێگای كتێبەكانیەوە دەستم كەوت[1] ئەوەش فەرموودەكانن:

[1] ( هەروەها سوودم وەرگرت لە كتێبی (تراجع العلامة الألباني) ی (ابو الحسن الشيخ) و ، لە كتێبی (٥٠٠ حديثا في تراجع عنها المحدث) ی (عودة حسن) و ، هەركەس سوپاسی خەڵكی نەكات سوپاسی خوا ناكات)

۞ضعيف الجامع الصغير:

١- أتاني جبريل في خضر تعلق به الدر.

**١- جبريل هاته لام له پۆشاكێكی سەوزدا مرواری پێوه هەڵواسرابوو.**

ئیسنادێكی ئەم فەرموودەیەم لە (مسند أحمد) ەوە (٤٠٧/١) پیشان مامۆستامان دا ، ئیتر ئەویش ووتی : ئیسنادەكەی (حسن) ە ، بیگوێزەرەوە بۆ (صحیح الجامع) و ، مامۆستامان تەخریجی كردووە لە (الصحیحه) (٨٣٣/٦) .

٢- اتقوا الله و اعدلوا بين أولادكم كما تحبون أن يبروكم.

**٢- لەخوا بترسن و پەیوەندی خزمایەتی بەدەست بهێنن.**

دەگوێزرێتەوە بۆ (صحیح الجامع)مامۆستامان تەخریجی كردووە لە (الصحیحه)٨٣٣/٦.

٣- اتقوا الله و صلوا الأرحام.

**٣-لە خوا بترسن( پارێزگاری بكەن )و پەیوەندی خزمایەتی جۆش بدەن.**

(عبد بن حميد و ابن حرير) لە تەفسیرەكەیاندا ، لە قەتادەوە بە مورسەلی.

٤- اجتنبوا الخمر فإنها مفتاح كل شر.

**٤- خۆتان بپارێزن و دورە پەرێزی بكەن لەمەی ، چونكە كلیلی هەموو خراپەیەكە.**

(حسن)

٥- إذا أحب أحدكم عبدا فليخبره فإنه يجد مثل الذي يجد له.

**٥- ئەگەر كەسێكتان بەندەیەكی خوای خۆشویست با ئاگاداری بكاتەوە ، بێگومان ئەویش هەست بە هەمان خۆشەویستی دەكات بەرامبەر بەو كەسە.** (صحیح)

٦- إذا استهل الصبي صلي عليه و ورث.

**٦- ئەگەر منداڵ لەدایك بێت و بگری ، نوێژی مردووی لەسەر دەكرێت و میراتی دەگرێت.**

(حسن)

٧- إذا استيقظ أحدكم من نومه فرأى بللا و لم ير أنه احتلم اغتسل و إذا رأى أنه قد احتلم و لم ير بللا فلا غسل عليه.

**٧- ئەگەر كەسێكتان لە خەو هەڵساو ، تەڕی بینی و هیچ خەوێكی نەبینیبوو ، با خۆی بشوات ، ئەگەریش خەوی نەبینیبوو خۆشتنی لەسەر نییە.**

مامۆستامان ووتویەتی : بگوێزرێتەوە بۆ (صحیح الجامع)

٨- إذا تغوط أحدكم فليمسح ثلاث مرات.

**٨- ئەگەر كەسێكتان پیسی كرد با سێ جار بیسڕێت.**(صحيح)

٩- إذا سقى الرجل امرأته الماء أجر.

**٩- ئەگەر پیاوێك ئاو بدات بە هاوسەرەكەی پاداشتی دەست دەكەوێت.** بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع) .

١٠- إذا كان أحدكم في صلاة فإنه يناجي ربه فلينظر أحدكم ما يقول في صلاته و لا ترفعوا أصواتكم فتؤذوا المؤمنين.

**١٠- ئەگەر كەسێك لە ئێوە لەناو نوێژدا بێت ئەوە لەگەڵ خوای خۆی گفتوگۆ دەكات، جا تەماشام بكەن چی دەڵێن لە نوێژەكانتاندا ، دەنگیش بەرزمەكەنەوە چونكە ئازاری ئیمانداران دەدەن.** (صحيح)

١١- إذا مررتم برياض الجنة فارتعوا قالوا: و ما رياض الجنة ؟ قال: حلق الذكر

**١١- ئەگەر بە لای باخچەی بەهەشتدا تێپەڕ بوون لابدەن ، وتیان : باخچەی بەهەشت كامەیە ؟ فەرمووی: بازنەكانی یادی خوا.**

١٢- أفضل الصدقة إصلاح ذات البين.

**١٢- چاكترین خێر چاككردنی نێوان خەڵكیە. ( حسن لغيره )**

١٣- علق شيخنا في الحاشية على حديث رقم (١٢١٩) – (( أكثروا من قول لا حول و لا قوة إلا بالله فإنها تدفع تسعة و تسعين بابا من الضر أدناها الهم)) (طس) عن جابر - : ((قلت : لم نره من حديث جابر ولا غيره بهذا التمام، وإنما رواه (طس) من حديث أبي هريرة دون قوله : (أكثروا من قول) راجع المصدر المذكور أعلاه)).

**١٣- مامۆستامان بەدواداچوونی كردووە لەسەر پەراوێزی فەرموودەی ژمارە ( ١٢١٩ ) ( زۆر بڵێن ( لاحول و لا قوه الا بالله ) چونكە پەرهەڵستی نەوەد و نۆ دەرگای زیان دەكات بچوكەكەیان خەم و خەفەتە )** (طس) لە (جابر)ەوە : (وتم : ئەمەیان نەبینیوە نە لە فەرموودەی جابیر و نە كەسانی تر، بەم تەواو كردنە بەڵكو (طس) ڕیوایەتی كردووە لە فەرموودەی (أبوهريرە)ەوە ، بەڵام بە بێ ووتەی (أكثروا من القول)

بەرێزەوە بۆ ئەو سەرچاوەی باسكراوی سەرەوە . مامۆستامان ووتویەتی : ئەم پەراوێزە لابرێت چونكە هەڵەیە.

١٤- التمسوا ليلة القدر آخر ليلة من رمضان.

**١٤- بە دواى ( ليلە القدر ) دا بگەڕێن لە دواترين شەوى ڕەمەزاندا .**

بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع)

١٥- اللهم انفعني بما علمتني و علمني ما ينفعني و زدني علما الحمد لله على كل حال و أعوذ بالله من حال أهل النار.

**١٥- خوايە سوودم پێ بگەيەنە بەوەى فێرت كردووم ، و فێرى ئەومم بكە كە سوودى هەيە بۆم و ، زانستم زياد بكە ، تەواوى سوپاس و ستايش بۆ خوا لە هەموو بارودۆخێكدا و ، پەنا بە خوا دەگرم لە حاڵى خەڵكى دۆزەخ .** مامۆستامان ووتويەتى : (صحيح)ە بەڵام بە بێ : الحمد...

١٦- إن الله جعل هذه الأهلة مواقيت فإذا رأيتموه فصوموا و إذا رأيتموه فأفطروا فإن غم عليكم فعدوا ثلاثين.

**١٦- خواى گەورە كاتەكانى مانگى ديارى كردووە جا كە بينيتان ڕۆژوو بگرن ، ئەگەر بينيشتان ڕۆژوو بيشكێنن، ئەگەر هەوريش بوو سى بژمێرن.**[1]

مامۆستامان ووتويەتى : بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع)

١٧- إن الله تعالى قسم بينكم أخلاقكم كما قسم بينكم أرزاقكم و إن الله يعطي الدنيا من يحب و من لا يحب و لا يعطي الدين إلا من أحب.

**١٧- خواى گەورە ڕەوشتەكانى لە نێوانتاندا دابەشكردووە ، وەكو چۆن ڕۆزيەكانى لە نێوانتاندا دابەشكردوون ، خوايش دونيا دەدا بەوەى خۆشى بوێت و خۆشى نەوێت ، بەڵام ئايين تەنها بە كەسێك دەدات خۆشى بوێت.**

ئەم بەشەى لە فەرموودەكە صەحيحە بە مەوقوفى لەسەر ئيبنو مەسعود ، مامۆستامان ووتويەتى حوكمى مەرفوعى هەيە. هەروەها بڕوانە (الصحيحە) (٢٧١٤)

١٨- إن المؤمن ينضي شيطانه كما ينضي أحدكم بعيره في السفر.

**١٨- كەسى باوەردار شەيتانەكەى ماندوو لاواز دەكات ، وەكو چۆن كەسێك لە ئێوە ووشترەكەى لە گەشتدا ماندوو دەكات . بگوێزرێتەوە بۆ ( صحيح الجامع ) .**

١٩- إن أهل الجنة إذا جامعوا نساءهم عادوا أبكارا.

**١٩- بەهەشتيەكان كاتێك جووت دەبن لەگەڵ هاوسەرەكانيان دەبنەوە بە كچ . ( صحيح )**

[1] ( سێ ڕۆژى مانگى (شەعبان) پێش رەمەزان تەواو بكەن)

٢٠- إن صاحب المكس في النار.

**٢٠- باج وەرگر لە ئاگردایە.**

٢١- إن هذا يوم رخص لكم إذا أنتم رميتم الجمرة أن تحلوا من كل ما حرمتم منه إلا النساء فإذا أمسيتم قبل أن تطوفوا بهذا البيت صرتم حرما كهيئتكم قبل أن ترموا الجمرة حتى تطوفوا به.

**٢١- ئەمە ڕۆژی مۆڵەتدانە بۆ ئێوە کە هەموو ئەوشتانەی لێتان قەدەغە کراو بوو دوای شەیتان ڕەجم کردن ، تەنها ئافرەتەکانتان نەبێت ، کە ئێوارەشتان لێهات پێش ئەوە بە دەوری کەعبەدا بسوڕێنەوە ، وەکو پێش فڕمدانی بەردەکان ، شتەکانتان لەسەر قەدەغە دەبێتەوە ، تاکو دەسوڕێتەوە بە دەوری کەعبەدا.** (صحيح).

٢٢- إنكم لا تسعون الناس بأموالكم و لكن ليسعهم منكم بسط الوجه.

**٢٢- ئێوە ناتوانن بە ماڵەکانتان سەرنجی خەڵکی ڕاکێشن ، بەڵام بە ڕووخۆشی و ، ڕەوشت جوانیتان ئەوان کەمەند کێش بکات** . (حسن).

٢٣- أوني موسى الألواح ، وأوتيت المثاني.

**٢٣- موسا ئەلواحەکانی بۆ دابەزێنراو منیش ( المثانی ).** (صحيح)

٢٤- أيتلعب بكتاب الله و أنا بين أظهركم ؟

**٢٤- ئایا یاری بە پەراوی خوا بکرێت و من لە نێوانتاندا بم .**

مامۆستامان لە (غايه المرام) دا ، بە ژمارەی (٢٦١) بە (صحيح الجامع).

٢٥- أيما رجل تدين دينا و هو مجمع أن لا يوفيه إياه لقي الله سارقا.

**٢٥-( أيما رجل تدين دينا وهو مجمع أن لا يوافقه إياه لقي الله سارقاً )واتە :هیچ پیاوێك قەرزێك ناكات و دڵی یەكلا بكاتەوە كە قەرزەكە نەداتەوە دەچێتەوە لای خوا بەدزی.**بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع)

٢٦- ثلاثة لا يدخلون الجنة: مدمن الخمر و قاطع الرحم و مصدق بالسحر و من مات و هو مدمن للخمر سقاه الله من نهر الغوطة نهر يجري من فروج المومسات يؤذي أهل النار ريح فروجهن.

**٢٦- سێ کەس ناچنە بەهەشتەوە :هەمیشە ئارەق خۆر و ، بڕەری پەیوەندی خزمایەتی و ، باوەڕدار بە جادوو، هەرکەسیش بمرێت و ئالوودەی ئارەق خواردن بێت خوای گەورە**

**لــە ڕووبــاری ( العوطــة )ی غەوتــەی دەرخــوارد دەدا ، ڕووبـارێکـە لــە داوێنــی ئافرەتــە سۆزانیەکان ، بۆگەنێکی لێ دێت ئازاری دۆزەخیەکان دەدات .**

(صحيح لغيره).

٢٧- جنة الفردوس هي ربوة الجنة العليا التي هي أوسطها و أحسنها

**٢٧- بەهەشتی فیردەوس تە پۆڵکەی سەروی بەهەشتە کە ناوەڕاست و چاکترینیەی .**

بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع) .

٢٨- حضر موت خير من بني الحارث.

**٢٨- ( حضر موت ) چاکترە لە ( بنی الحارث ). ( صحيح )**

٢٩- الحجر الأسود من الجنة و كان أشد بياضا من الثلج حتى سودته خطايا أهل الشرك.

**٢٩- بەردە ڕەشەکە لەبەردی بەهەشتە ، لە بـەفریش سپی تـر بـوو ، هـەتا تـاوانی بـت پەرستەکان ڕەشی کرد.**(حسن)

٣٠- خصال ست ما من مسلم يموت في واحدة منهن إلا كان ضامنا على الله أن يدخله الجنة: رجل خرج مجاهدا فإن مات في وجهه كان ضامنا على الله و رجل تبع جنازة فإن مات في وجهه كان ضامنا على الله و رجل توضأ فأحسن الوضوء ثم خرج إلى المسجد لصلاة فإن مات في وجهه كان ضامنا على الله و رجل في بيته لا يغتاب المسلمين و لا يجر إليه سخطا و لا تبعة فإن مات في وجهه كان ضامنا على الله.

**٣٠- شەش خەسڵەت هەن ، هەر موسوڵمانێك بە یەکێکیانەوە بمرێت خوای گەورە لـەخۆی گرتووە بیخاتە بەهەشتەوە ، پیاوێك چوبێت بۆ جیهاد، ئەگەر بمرێت لـە بـەرەو ڕوودا لە لایەن خواوە مسۆگەرە ، پیاوێکیش بە شوێن بەرێکەوێت جا ئەگەر بەڕێوە مرد لەلایەن خواوە مسۆگەرە. پیاوێکیش دەستنوێژ بگرێت بـەجوانی و دەرچێت بـۆ مزگـەوت ، ئەگـەر لەرێگـە بمرێـت لـە لایـەن خـواوە مـسۆگەرە ، پیـاوێکیش لـە مـاڵی خۆیـدا غەیبـەتی موسوڵمانان نەکات تورەیی و لێپرسراوێتی بۆ خۆی دروست نەکات ، ئەگەر لـەو حاڵەتـە بمرێت لە لایەن خواوە مسۆگەرە.**

بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع)

٣١- دب إليكم داء الأمم قبلكم: الحسد و البغضاء هي الحالقة حالقة الدين لا حالقة الشعر و الذي نفس محمد بيده لا تدخلوا الجنة حتى تؤمنوا و لا تؤمنوا حتى تحابوا أفلا أنبئكم بشيء إذا فعلتموه تحاببتم أفشوا السلام بينكم.

**٣١- نەخۆشی ئوممەتەکانی پێش خۆتانتان تیا بڵاوبووەتەوە : ئێرەیی و ڕق و کینە ، داتا سەرە داتاشەری ئایین، نەك تاشەری قژ ، سوێند بەو کەسەی گیانی محەمەدی بەدەستە ناچنە بەهەشتەوە تا باوەر نەهێنن، باوەرداریش نابن تاکو یەکترتان خۆش نەوێت ، ئایا ئاگادارتان بکەمەوە لە کارێك ئەگەر ئەنجامی بدەن یەکتریتان خۆش بوێت ، سەلام لەناو خۆتاندا بڵاوبکەنەوە.**

بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع)

٣٢- سبحي الله مائة تسبيحة فإنها تعدل لك مائة رقبة من ولد إسماعيل و احمدي الله مائة تحميدة فإنها تعدل لك مائة فرس مسرجة ملجمة تحملين عليها في سبيل الله و كبري الله مائة تكبيرة فإنها تعدل لك مائة بدنة مقلدة متقبلة و هللي الله مائة تهليلة فإنها تملأ ما بين السماء و الأرض و لا يرفع يومئذ لأحد عمل أفضل منها إلا أن يأتي بمثل ما أتيت.

**٣٢- سەد جار بڵێ ( سبحان الله ) چونکە بەرامبەری ئازادکردنی سەد کۆیلەیە لە نەوەی ئیسماعیل، سەد جاریش بڵێ ( الحمدلله ) بەرامبەر سەد ئەسپی زینکراوە کە لە پێناوی خوادا جیهادی لەسەر بکەیت ، سەد جاریش بڵێ ( الله أكبر ) ، وەکو سەد ووشتر بۆ تۆ کرابێت بەخێر و لێت وەرگیرا بێت ، سەد جاریش بڵێ ( لااله الاالله ) ، چونکە ئەوە ئاسمان و زەوی پڕدەکاتەوە ،هیچ کەسێکیش لەو ڕۆژەدا کردەوەی لەوجۆرەی بۆ بەرز ناکرێتەوە ، مەگەر ئەویش وەکو تۆی کردبێت.** (حسن).

٣٣- ستكون هجرة بعد هجرة فخيار أهل الأرض ألزمهم مهاجر إبراهيم و يبقى في الأرض شرار أهلها تلفظهم أرضوهم و تقذرهم نفس الله و تحشرهم النار مع القردة و الخنازير

**٣٣-لەمەودوا کۆچ لە دوای کۆچ ڕوودەدات و ، چاکترینی خەڵکی سەر زەوی ،دانیشتوانی ئەو شوێنەن ابراهیم کۆچی بۆکرد لەسەر زەویشدا خراپەکانیان دەمێننەوە ، خاکەکانیان فڕەیان دەداتە دەرەوە، لە لای خوا قێزەون دەبن ، ئاگریش لەگەڵ مەیمون و بەرازەکاندا کۆیان دەکاتەوە.** (حسن).

٣٤- السيوف مفاتيح الجنة.

**٣٤- شمشێرەكان كليلی بەهەشتن.** (صحيح).

٣٥- صنفان من أمتي لا يردان على الحوض ، ولا يدخلون الجنة : القدرية والمرجئة.

**٣٥- دوو جۆر هەن لە ئوممەتەكەم نايەن بۆ لام لەسەر حەوزەكە و ، ناچنە بەهەشتەوە : قەدەرییە و ، مورجیئە.**

٣٦- على أهل كل بيت أن يذبحوا شاة فى كل رجب وفي كل أضحى شاة.

**٣٦- خەڵكی هەمووماڵێك لەسەريانە مەڕێك سەرببڕن لە هەموو مانگێكی ڕەجەبدا ، لە هەموو قوربانێكيدا مەڕێك.** بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع)

٣٧- عليكم بالأبكار فإنهن أنتق أرحاما و أعذب أفواها و أقل خبا و أرضى باليسير .

**٣٧- هاوسەرگیری لەگەڵ كچان بكەن چونكە منداڵدانيان بە پيت ترە بۆ منداڵبوون دەبێت و دەميان شيرينە و، فێڵيان كەمە و ، بە شتی كەم ڕازی دەبن.**

بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع)

٣٨- غنيمة مجالس الذكر الجنة.

**٣٨- دەستكەوتی كۆڕەكانی يادی خوا بەهەشتە.** (حسن).

٣٩- قد عفوت عن الخيل و الرقيق فهاتوا صدقة الرقة من كل أربعين درهما درهم و ليس في تسعين و مائة شيء فإذا بلغت مائتين ففيها خمسة دراهم فما زاد فعلى حساب ذلك و في الغنم في كل أربعين شاة شاة فإن لم يكن إلا تسع و ثلاثون فليس عليك فيها شيء " و في البقر في كل ثلاثين تبيع و في الأربعين سنة و ليس في العوامل شيء " و في خمس و عشرين من الإبل خمسة من الغنم فإذا زادت واحدة ففيها ابنة مخاض فإن لم تكن ابنة مخاض فابن لبون ذكر إلى خمس و ثلاثين فإذا زادت واحدة ففيها بنت لبون إلى خمس و أربعين فإذا زادت واحدة ففيها حقة طروقة الجمل إلى ستين فإذا كانت واحدة و تسعين ففيها حقتان طروقتا الجمل إلى عشرين و مائة فإن كانت الإبل أكثر من ذلك ففي كل خمسين حقه " و لا يفرق بين مجتمع و لا يجمع بين متفرق خشية الصدقة " و لا يؤخذ في الصدقة هرمة و لا ذات عوار و لا تيس إلا أن يشاء المصدق " و في النبات ما سقته الأنهار أو سقت السماء العشر و ما سقي بالغرب ففيه نصف العشر.

**٣٩-چاوپۆشيم كرد لە زەكاتی ئەسپ و كۆيلە ، بەڵام زەكاتی زيو بهێنن لە هەموو چل درهەم درهەمێك ، لە سەدو نەوەديشدا هيچ زەكات نيە كە گەيشتە دووسەد درهەم ،**

**پێنج درهەمی تێدایە ، هەرچەند زیادیش بکات ئەژماری لەسەر ئەوەیە ، لە مەڕ و بزنیشدا لە هەموو چل سەر مەڕ یەك سەر ، ئەگەر تەنها سی و نۆ مەڕ بوو زەکاتی تێدا نییە. لە مانگایشدا لە هەموو سی سەر گوێرەکەیەك ، لە چل سەر مانگایەك[1]، ئەوانەش کەوا بۆ کارکردنە تەرخان کراون زەکاتیان تێدا نییە. لە هەموو بیست و پێنج ووشتریش پێنج سەر مەڕ یان بزن زەکاتی هەیە ، ئەگەر یەکێك زیاد بکات بەچکە وشترێکی مێینەی یەکساڵەی تێدایە ئەگەری ئەوەی نەبوو، بەچکەیەکی نێرینەی وشترێکی شیردەر، هەتا ژمارەیان دەگاتە سی و پێنج.**

٤٠- كبري الله مائة مرة و احمدي الله مائة مرة و سبحي الله مائة مرة خير من مائة فرس ملجم مسرج في سبيل الله و خير من مائة بدنة و خير من مائة رقبة.

**٤٠- سەد جار بڵێ ( الله أكبر ) ، سەد جار بڵێ ( الحمد لله ) ، سەد جار بڵێ ( سبحان الله ) ، چاکترە لەسەد ئەسپی لغاوکراو و سەد ووشتر و ، سەد ( گەردن )کۆیلە .**

٤١- كان إذا دخل المسجد صلى على محمد وسلم و قال: رب اغفر لي ذنوبي و افتح لي أبواب رحمتك و إذا خرج صلى على محمد وسلم و قال: رب اغفر لي ذنوبي و افتح لي أبواب فضلك.

**٤١- کە دەچووە مزگەوتەوە سەڵاوات و سەلامی دەدا لەسەر موحەممەد و ، دەیفەرموو : .......... دەرگاکانی بەزەیی و میهرەبانیتم بۆ بکەرەوە کە دەرچووە دەرەوە ، سەڵاواتی دەدا لە سەر موحەممەد و ، دەیفەرموو : .... دەرگاکانی چاکەی خۆتم بۆ بکەرەوە .**

بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع)

٤٢- كان إذا دخل المسجد قال: بسم الله اللهم صل على محمد وأزواج محمد.

**٤٢- کە دەچووە مزگەوتەوە دەیفەرموو :........ خوایە درود و سڵاوی خۆت بنێرە سەر موحەممەد و خێزانەکانی موحەممەد .**

بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع)

٤٣- كان إذا رأى الهلال قال: اللهم أهله علينا باليمن و الإيمان و السلامة و الإسلام ربي و ربك الله.

**٤٣- کە مانگی یەکشەوەی دەبینی دەیفەرموو : خوایە بە ئاسایش و باوەڕ سەلامەتی و ئیسلام هەڵیبێنەوە بە سەرماندا ....پەروەردگاری ئێمە و خوای تۆش ( الله ) یە.** (حسن بهذا اللفظ)

---

[1] ( کە ژمارەی دانەکانی تەواو روابن)

٤٤- كان يصوم تسع ذي الحجة و يوم عاشوراء و ثلاثة أيام من كل شهر: أول اثنين من الشهر و الخميس و الاثنين من الجمعة الأخرى.

**٤٤- پێغەمبەر (ﷺ) نۆی زیلحەججە و ، ڕۆژی عاشورا و ، سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا بەڕۆژوو دەبوو، یەکەم دووشەممە لە ئەو مانگە و ، پێنج شەممە و ، دوو شەممە لە هەینی داهاتوو.**

٤٥- لتتركن المدينة على خير ما كانت تأكلها الطير و السباع.

**٤٥-بێگومان مەدینە بەجێدەهێڵن لە چاکترین شێوەدا ، بۆ ئەوەی باڵندە و دڕندە بیخوات .**

(حسن) بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع)

٤٦- لما انتهينا إلى بيت المقدس ليلة أسري بي قال جبريل بأصبعه فخرق بها الحجر و شد به البراق.

**٤٦- کاتێك گەیشتینە (بیت المقدس) لەو شەوەی شەو ڕەویم پێکرا ، جیبریل بە پەنجەی وای کرد و بەردەکەی کون کرد و ، بوراقی پێوە بەستەوە .**

بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع)

٤٧- لولا أن أشق على أمتي لفرضت عليهم السواك عند كل صلاة كما فرضت عليهم الوضوء.

**٤٧- ئەگەر بارگرانی نەبوایە لەسەر ئوممەتەکەم سیواکم لەسەر فەرز دەکردن لەگەڵ هەموو نوێژێکدا ، وەکو چۆن دەست نوێژیان لەسەر پێویست.**

بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع)

٤٨- لينتهين رجال من ترك الجماعة أو لأحرقن بيوتهم.

**٤٨- پیاوانێك دەبێ واز بهێنن لە نەکردنی نوێژی بەکۆمەڵ یان ماڵەکانیان بەسەردا دەسوتێنم.** (حسن)

٤٩- ما أطيبك و أطيب ريحك ! ما أعظمك و أعظم حرمتك ! - يعني الكعبة - و الذي نفس محمد بيده لحرمة المؤمن أعظم عند الله حرمة منك و ماله و دمه و أن يظن به إلا خيرا.

**٤٩- چەند بۆن خۆش و چەند بەڕێزی! :چەند گەورەو پایەداری (واتە کەعبە)، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ، ڕێزی باوەڕدار گەورەترە لە لای خوا لە ڕێزی تۆ، ماڵ و خوێنی و ، تەنها هەردەبێ گومانی چاکەیشی پێ ببرێت.** (حسن).

٥٠- ما من أحد يدان دينا يعلم الله منه أنه يريد قضاءه إلا أداء الله عنه في الدنيا .

**٥٠- هەركەسێك قەرزێك بكات و خوای گەورە بزانێت ئەو كەسە نیـازی دانـەوەی هەیـە ، خوای گەورە خۆی لەو دنیـادا بۆی دەبژێرێت.**

(ضعيف) بە بۆنەی (فى الدنيا) ئەگەرنا ئەو دوای فەرموودەكە (شاهد) ی هەیە.

٥١- ما من رجل يدرك له ابنتان فيحسن إليهما ما صحبتاه أو صحبهما إلا أدخلتاه الجنة.

**٥١- هەر پیاوێك فریای دوو كچی خۆی بكەوێت و چاكەیان لەگەڵ بكات ، تاكو لەگەڵ یەكتر بن ، دەبنە هۆی چونە بەهەشتی یەوە . ( حسن )**

٥٢- ما من مؤمن يعزي أخاه بمصيبة إلا كساه الله من حلل الكرامة يوم القيامة.

**٥٢- هەر باوەردارێك دڵنەوایی براكەی بكات لەبەر كارەساتێك ، خـوای گـەورە پۆشـاكی رێز لێگرتنی لەبەر دەكات لە ڕۆژی قیامەتدا .( حسن )**

٥٣- ما من مسلم تدرك له ابنتان فيحسن إليهما ما صحبتاه إلا أدخلتاه الجنة.

**٥٣- هەركەسێك بگاتە دوو كچی خۆی لە ژیاندا و چاكەیان لەگەڵ بكات ، دەبنە هۆكاری چوونە بەهەشتی یەوە. ( حسن )**

٥٤- مثلي و مثل الساعة كفرسي رهان مثلي و مثل الساعة كمثل رجل بعثه قوم طليعة فلما خشي أن يسبق ألاح بثوبيه: أتيتم أتيتم أنا ذاك أنا ذاك.

**٥٤- نموونەی من و قیامەت وەكو دوو ئەسپی پێشبڕكێن ، نمونەی من و قیامەت وەكو پیاوێكە كەسانێك وەكو پێشەنگ ناردبێتیان ، كاتێك ترسا ئەوان پێش خۆی بگەن ، بە جلەكانی ئاماژەی كردووە :بۆتـان هاتن بۆتان هاتن ، من ئەو كەسەم و من ئەو كەسەم.**

٥٥- مروا بالمعروف و انهوا عن المنكر قبل أن تدعوا فلا يستجاب لكم.

**٥٥- فـەرمان بـە چـاكە بكـەن و بەرهەڵـستی خراپـە بكـەن پـێش ئـەوەی بپارێنـەوە و ، نزاتـان گیرا نەبێت. ( حسن ).**

٥٦- من أحيا سنة من سنتي قد أميتت بعدي فعمل بها الناس كان له مثل أجر من عمل بها لا ينقص من أجورهم شيئا و من ابتدع بدعة لا يرضاها الله و رسوله فعمل بها كان عليه مثل أوزار من عمل بها لا ينقص من أوزارهم شيئا

**٥٦- هەركەسێك سـوننەتێك لـە سـوونەتەكانم مـن زینـدوو بكاتـەوە و ،ئینجـا خـەڵكی كاری پێ بكەن ، وەكو پاداشتی ئەوانی دەست دەكـەوێت ، لـە پاداشـتی ئـەوان هـیچ كـەم**

**نابێتەوە ، هەرکەسێکیش کارێکی داهێنراو لە دیندابکات و خەڵکی کاری پێ بکەن ، وەکو ئەوان گوناهی دەگات و لە گوناهی ئەوان کەم نابێتەوە.**

٥٧- من أدرك الأذان في المسجد ثم خرج لم يخرج لحاجته و هو لا يريد الرجعة فهو منافق.

**٥٧- هەرکەسێك بە بگاتە بانگ رابگات و لە مزگەوت و دەربچێت بێ هیچ پێویستیەك و نەیەوێت بگەڕێتەوە ، ئەو کەسە دووڕووە. ( حسن ).**

٥٨- من أراد الحجامة فليتحر سبعة عشر و تسعة عشر و إحدى و عشرين لا يتبيغ بأحدكم الدم فيقتله.

**٥٨- هەرکەسێك بیەوێت کەڵەشاخ بگرێت ، با هەوڵ بدات لە حەقدە و ، نۆزدە و ، بیست و یەك ، ئە نجامی بدات.**

**بگوێزرێتەوە بۆ ( صحيح الجامع )**

٥٩- من أصاب حدا فعجل عقوبته في الدنيا فالله أعدل من أن يثني على عبده العقوبة في الآخرة........

**٥٩- هەرکەسێك تاوانێکی گەورە بکات و لە دنیا لەسەری سزا بدرێت ، خوای گەورە لەوە دادگەرترە جارێکیتریش لە قیامەتدا سزای بدات .**

٦٠- من أعان ظالما ليدحض بباطله حقا فقد برئت منه ذمة الله و ذمة رسوله.

**مامۆستامان ووتوویەتی : ئەوەی هێڵی بەژێردا ڕاکێشراوە ( شاهد ) ی هەیە ووتم : ئەویش ئەوەیە کە نوسیومە.**

**٦٠- هەرکەسێك پشگیری ستەمکارێك بکات بۆ ئەوەی بە ناهەقەکەی هەقێك پووچەڵ بکاتەوە خوا و پێغەمبەرەکەی لەو کەسە بێ بەرین.**

**بگوێزرێتەوە بۆ ( صحيح الجامع )**

٦١- من تخطى رقاب الناس يوم الجمعة اتخذ جسرا إلى جهنم.

**٦١- هەرکەسێك بەسەر خەڵکدا تێپەڕێت لە ڕۆژی هەینیدا پردێك بۆ خۆی دروست دەکات بەرەو دۆزەخ. ( حسن ).**

٦٢- من تداوى بحرام لم يجعل الله فيه شفاء.

**٦٢- هەرکەس خۆی تیمار بکات بە شتی حەرام ، خوای گەورە چارەسەری ناخاتە ئەو شتە. ( حسن ).**

٦٣- من ثابر على اثنتي عشرة ركعة من السنة بنى الله له بيتا في الجنة: أربع ركعات قبل الظهر و ركعتين بعدها و ركعتين بعد المغرب و ركعتين بعد العشاء و ركعتين قبل الفجر.

**٦٣- هەركەسێك بەردەوام بێت لە كردنی دوانزە ڕكاتی سوننەت، خوای گەورە خانوێكی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەكات : چوار ڕكات پێش نیوەڕۆ ، دوو ڕكات دوای نیوەڕۆ دوو ڕكات داوی ( مەغریب )ئێوارە، دوو ڕكات دوای ( عیشا )عیشا، دوو ڕكات پێش بەیانی.**

**( حسن ).**

٦٤- من حمى مؤمنا من منافق يغتابه بعث الله ملكا يحمي لحمه يوم القيامة من نار جهنم و من رمى مسلما بشيء يريد شينه به حبسه الله على جسر جهنم حتى يخرج مما قال.

**٦٤- هەركەسێك پارێزگاری لە باوەڕدارێك بكات بەرامبەر دووڕوێك كە غەیبەتی بكات ، خوای گەورە فریشتەیەك دەنێرێت لە ڕۆژی قیامەتدا گۆشتی بپارێزێت لە دۆزەخ، هەركەسێكیش قسەیەك بە موسوڵمانێك بڵێت بۆ ئەوەی ناشرینی بكات ، خوای گەورە لەسەر پردی دۆزەخ گیری دەدا تاكو لەو قسەی دەردەچێت . ( حسن ).**

٦٥- من رأى عورة فسترها كان كمن أحيا موءودة من قبرها.

**٦٥- هەركەسێك نهێنی كەسێك بزانێت و داپۆشێت ، وەكو ئەوەیە كچێكی زیندەبەچاڵی زیندوو كردبێتەوە.**

**( حسن ) ە ، ووشەی ( من قبرها ) نەبێت.( لە گۆڕەكەیدا )**

٦٦- من رابط ليلة في سبيل الله كانت له كألف ليلة صيامها و قيامها.

**٦٦- هەركەسێك شەوێك لە پێناو خوادا پاسەوانێتی بكات،ئەو شەوە وەكو بە ڕۆژوو و شەو نوێژی هەزار شەوە. ( حسن )**

٦٧- من ستر على مؤمن عورة فكأنما أحيا ميتا.

**٦٧- هەركەسێك نهێنی موسوڵمانێك دا پۆشێ ، وەكو ئەوەیە مردوویەكی زیندوو كردبێتەوە.**

**( صحيح بلفظ مؤودة )**

٦٨- من ستر عورة أخيه المسلم ستر الله عورته يوم القيامة و من كشف عورة أخيه المسلم كشف الله عورته حتى يفضحه بها في بيته.

**٦٨- هەركێ نهێنی برایەكی موسوڵمانی بپارێزێت خوای گەورە نهێنی دەشارێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ، هەركەسێكیش نهێنی برایەكی موسوڵمانی ئاشكرا بكات ، خوای گەورە نهێنی ئاشكرا دەكات ، تاكو لە نێو ماڵەكەی خۆشیدا ئابڕووی دەبات.**

٦٩- من صام رمضان و صلى الصلوات و حج البيت كان حقا على الله أن يغفر له إن هاجر في سبيل الله أو مكث بأرضه التي ولد فيها.

**٦٩- هەركەسێك ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت و ، نوێژەكان بكات و حەجی ماڵی خوا بكات ، مافە لەلای خوا كە لێی خۆش بێت،ئەگەر كۆچیش بكات لە پێناو خوادا یان لەو خاكەی تیایدا لە دایك بووە، بمێنێتەوە. ( حسن ).**

٧٠- من ضم يتيما له أو لغيره حتى يغنيه الله عنه وجبت له الجنة.

**٧٠- هەركەسێك هەتیوێكی خۆی ، یان هەتیوی كەسێكی تر بگرێتە خۆی ، تاكو خوای گەورە بێنیازی دەكات لەو ، ئەو كەسە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت.**

٧١- ... ومن تعلق شيئا وكل إليه.

**٧١- ........... هەركەسیش شتێك هەڵواسی[1]، دەدرێتە دەستی ئەو شتەوە.**

**( حسن ) وتم : ئەم ووشە هاتووە لە فەرموودەی ( من عقد عقده )**

٧٢- من قال لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك و له الحمد يحيي و يميت و هو على كل شيء قدير عشر مرات على أثر المغرب بعث له مسلحة يحفظونه من الشياطين حتى يصبح و كتب له بها عشر حسنات موجبات و محي عنه عشر سيئات موبقات و كان له بعدل عشر رقبات مؤمنات.

**٧٢- هەركەس دەجار بڵێ ( لااله الاالله وحده لاشريك له ، له الملك و له الحمد ، يحيى و يميت و هو على كل شيء قدير ) لە دوای نوێژی ئێوارەدا ، هەندێ فریشتەی بۆ ڕەوانە دەكرێت بیپارێزن لە شەیتانەكان تاكو ڕۆژ دەبێتەوەو، دە چاكەشی بۆ دەنوسرێت و ، دە خراپەی فەوتێنەریشی بۆ لادەبرێت ، وەكو ئازاد كردنی دە كۆیلەش وایە بۆی. ( حسن ).**

٧٣- المختلعات.... هن المنافقات.

**٧٣- ئەو ئافرەتانەی داوای خولع[2]،دەكەن لە هاوسەرەكانیان .... ئەوانە دوروون.**

**( صحيح دون لفظة المتبرجات ).**

---

[1] ( واتە:شتێك هەڵواسێ و نیازی پێ هەبێت و بڕوای وابێت شتی بۆ دەكات)

[2] ( جۆرێكە لە جیابوونەوەو لێكترازانی ژن و مێرد)

٧٤- المسلم أخو المسلم يسعهما الماء و الشجر و يتعاونان على الفتان.

**٧٤- موسوڵمان برای موسوڵمانە ، ئاوو درەخت بەشیان دەکات کۆمەکی یەکتر دەکەن لەدژی شەتان و دزو ڕێگر.** [١] **( حسن )**

٧٥- نهى أن يبال بأبواب المساجد.

**٧٥- پێغەمبەر ( ﷺ ) قەدەغەی کردووە لە دەرگای مزگەوتەکان میز بکرێت .**

بگوێزرێتەوە بۆ (صحيح الجامع)

٧٦- نهى أن يبال في قبلة المساجد.

**٧٦- پێغەمبەر ( ﷺ ) قەدەغەی کردووە میز بکرێت لە ڕووگەی مزگەوتدا.**

٧٧- لا تبيعوا القينات و لا تشتروهن و لا تعلموهن و لا خير في تجارة فيهن و ثمنهن حرام في مثل هذا أنزلت هذه الآية ( و من الناس من يشتري لهو الحديث الآية ).

**٧٧- ئافرەتی گۆرانی بێژ مەکڕن و مەفرۆشن و فێریان مەکەن ، خێر لە بازرگانی کردن بەوانەوە نییە و نرخیان (حەرامە) یاساغە، لە هاوشێوەی ئەوەشدا ئەم ئایەتە دابەزیوە** ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِى لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا ۚ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٦﴾﴾ (لقمان : ٦) (حسن)

وتم: بەم شێوە هێناومە لە نوسخەی مامۆستامان لە (صحيح الجامع) و ، ئینجا ئەو حوکمی (حسن)یشی بەسەردا داوە لە (صحيح سنن الترمذي) دا ، بەڵام دواتر مامۆستامان بۆی دەرکەوت بگەڕێتەوە سەر حوکمی یەکەم بەسەر فەرموودەکەدا بە لاوازکردنی باشترە، بۆیە پێویستە لابرێت لە (صحيح الترمذی).

٧٨- لا تدخل الملائكة بيتا فيه جرس.

**٧٨- فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە زەنگی تیادا بێت.** (حسن).

٧٩- لا تدخل الملائكة بيتا فيه جرس و لا تصحب ركبا فيه جرس.

**٧٩- فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە زەنگی تێدا بێت و ، هاوڕێیەتی کاروانێکیش ناکەیت کە زەنگی تیا بێت.** (حسن)

---

[١] ( قاموسی رستە ،بەرگی ٣،لاپەرە ١٩٢٦)

٨٠- لا تشددوا على أنفسكم فيشدد عليكم فإن قوما شددوا على أنفسهم فشدد الله عليهم فتلك بقاياهم في الصوامع و الديارات......

**٨٠- بارگرانی بۆ خۆتان درووست مەكەن،با خوای گەورە لێتان قورس نەكات چەنكە كەسانێك كارەكانیان لەسەرخۆیان قورس كردەوە ، خوای گەورەیش لەسەریان قورس كردوون، ئەوە پاشماوەكانیانە لە كڵێسا و شوێنەواری ماڵەكاندا....**

**تاكو ئێرە بگوێزرێتەوە بۆ** (صحيح الجامع)

٨١- لا تعلموا العلم لتباهوا به العلماء أو تماروا به السفهاء و لا لتجترئوا به المجالس فمن فعل ذلك فالنار النار.

**٨١- فێری زانست مەبن بۆ خۆنواندن بەرامبەر زانایان ، یان بۆ ئەوەی مشت و مڕ لەگەڵ كەودەن و نەشارەزایاندا ، یان كەمەند كێش كردنی خەڵكی بۆلای خۆتان ، هەر كەسێك ئەو كارە بكات لە دۆزەخدایە.**

**بگوێزرێتەوە بۆ** (صحيح الجامع).

٨٢- لا تكرهوا البنات فإنهن المؤنسات الغاليات.

**٨٢- ڕقتان لە كچان نەبێت ، چونكە ئەوانە خەم ڕەوێن و بەنرخن.** (صحيح)

٨٣- لا تمس النار مسلما رآني أو رأى من رآني.

**٨٣- ئاگر موسوڵمانێك ناگەزێت منی بینیبێت یان كەسێك بینیبێت كە منی بینیوە .**

(حسن)

٨٤- لا شيء في الهام والعين حق وأصدق الطيرة الفأل.

**٨٤- خوێنبایی نیە لە پێوەدانی گەزندەو بەچاوەوەكردن و ڕاسترین شومیش گەشبینیە.**

٨٥- لا قود في المأمومة و لا الجائفة و لا المنقلة.

**٨٥-تۆڵە نیە[1] لە برینی( المأسوسە )كە چۆتە ناو ئێسقانی و ( الجائفە )ئەو برینەی چۆتە دیووی ناوەوەی سنگ و سك و ئێسقانی سەر و ئەو برینەی ئێسقانی لە جێی خۆی لاداوە( المنقلە )بەڵكو خوێنبایی هەیە**

٨٦- لا يؤوى الضالة إلا الضال.

**٨٦- كەسێك گومڕا نەبێت ، ووڵاخی وونبوو لە خۆی ناگرێت.** (حسن)

---

[1] ( بەڵكو خوێنبایی هەیە:لە جیاتی (المأمومة)سێ یەكی و (الجائعة)سێ یەكی یە و(المنقلة)دەیەك و نیوی خوێنبایی دەدرێت كە دەكاتە ١٥ پانزە ووشتر.صحيح فقه السنة ج٢ ص٢٤٧-٢٤٨)

٨٧- لا يخرج الرجلان يضربان الغائط كاشفين عن عورتهما يتحدثان فإن الله يمقت على ذلك.

**٨٧- ڕەوا نیە دوو پیاو بڕۆن بۆ دەست بە ئاو گەیاندنم ، شەرمگەیان دەربخەن و پێكەوە قسە بكەن ، بەراستی خوای گەورە ڕقی لەو كارەیە.** (حسن).

٨٨- يا أيها الناس ! إن على أهل كل بيت في كل عام أضحية.

**٨٨- هۆ خەڵكینە ! هەموو خاوەن مردوویەك ساڵانە قۆچێكیان لەسەرە.**

٨٩- يا أيها الناس ! ما بال أحدكم يزوج عبده أمته ثم يريد أن يفرق بينهما ؟ إنما الطلاق لمن أخذ بالساق.

**٨٩- هۆ خەڵكینە ! بۆچی كەسێك لە ئێوە كەنیزەكەكەی مارە دەكات لە كۆیلەكەی و ، دوایی دەیەوێت لە یەكتریان جیا بكاتەوە ، تەڵاق تەنها بەدەست ئەو كەسەیە لەگەڵ خێزانی خۆی جووت بووە.** (حسن)

٩٠- يا بني إذا دخلت على أهلك فسلم تكون بركة عليك وعلى أهل بيتك.

**٩٠- كوڕی خۆم ئەگەر چوویتە لای كەس و كارەكەت سەلام بكە ، بۆ ئەوەی ببێتە پیرۆزی بۆ خۆت و خێزانیماڵەكەت.**

(حسن) لغيره وتم: تەنها ئەم بەشە كەوتۆتە نێو ئەو فەرموودەیەی ئاوا دەست پێدەكات (يا بـنى اياك و الالتفات).

٩١- يا سفيان لا تسبل إزارك ، فإن الله لا يحب المسبلين.

**٩١- ئەی سوفیان جل و بەرگەكەت زۆر شۆڕ مەكەرەوە ، چونكە خوای گەورە ڕقی لەو كەسانەیە** . (حسن)

٩٢- يجيء القرآن يوم القيامة كالرجل الشاحب فيقول لصاحبه: أنا الذي أسهرت ليلك و أظمأت نهارك.

**٩٢- قورئان لە ڕۆژی قیامەتدا وەكو پیاوی زەرد هەڵگەڕاو دێت ، بە خوێنەرەكەی دەڵێت من بووم بە شەو خەوم دەرزاندی و ، بە ڕۆژ تێنووم دەكردی.** (حسن)

٩٣- أيما رجل كشف سترا فأدخل بصره من قبل أن يؤذن له فقد أتى حدا لا يحل أن يأتيه و لو أن رجلا فقأ عينه لهدرت و لو أن رجلا مر على باب لا سترة عليه فرأى عورة أهله فلا خطيئة عليه إنما الخطيئة على أهل الباب.

**٩٣- هەرکەسێك پەردەیەك لابدات و لێیەوە تەماشای ماڵی خەڵکی بکات پێش ئەوەی ڕێگەی پێ بدرێت ئەو کەسە تاوانێکی ئەنجام داوە کە ڕەوا نەبووە بۆی ، ئەگەر کەسێکیش لەکاتەدا چاوی دەربهێنرێت بە زایە دەچێت ، ئەگەر کەسێکیش بە لای دەرگایەك دا تێپەڕ بێت پەردەی نەبێت و کارێکی نهێنیەك ببینێ گوناهبار نابێت ، بەڵکو خاوەنی دەرگاکە گوناهبار دەبێت.**

مامۆستامان بە (صحيح) ی زانیوە لە (الصحيحه) (٣٤٦٣)

٩٤- إذا ذبح أحدكم فليجهز.

**٩٤- ئەگەر کەسێك لە ئێوە ئاژەڵێکی سەربڕی با پەلەی لێ بکات .**

مامۆستامان ئەم فەرموودەی (تصحيح) کردووە لە (صحيح الترغيب) دا (١٠٩١)

٩٥- ضحك ربنا من قنوط عباده وقرب غيره.

**٩٥- خوای گەورە پێکەنی بەبێ ئومێدی بەندەکانی و نزیکی کۆسکەوتوانی.**

مامۆستامان ئەم فەرموودەیەی بە (حسن) داناوە لە (الصحيحه) (٢٨١٠)

٩٦- استتروا في صلاتكم ولو بسهم.

**٩٦- (سوترە)پەردە بۆ خۆتان دابنێن لە نوێژدا ، ئەگەر بە تیرێکیش بێت .**

مامۆستامان بە (صحيح) ی زانیوە لە (الصحيحه) دا (٢٧٨٣)

٩٧- إن أعمالكم تعرض على أقاربكم و عشائركم من الأموات فإن كان خيرا استبشروا و إن كان غير ذلك قالوا: اللهم لا تمتهم حتى تهديهم كما هديتنا.

**٩٧- کردەوەکانتان پێشان خزم و هۆزەکانتان دەدرێت لە مردووان ، ئەگەر چاکە بێت پێی گەش دەبنەوە ، ئەگەریش بە جۆرێکی تر بێت ، دەڵێن خوایە مەیا نمرێتنە ڕێنوێنی دەکرێن وەکو ئێمە ڕێنوێنی کراین.**

مامۆستامان بە (حسن) ی داناوە لە (الصحيحه) (٢٧٥٨)

٩٨- لتنتهكن الأصابع بالطهور أو لتنتهكنها النار.

**٩٨- یان پەنجەکانتان لە دەستنوێژدا بە چاکی پاك دەکەنەوە ، یان ئاگر بە سەختی دەیان سوتێنێ .**

مامۆستامان (تصحيح) ی کردووە لە (صحيح الترغيب و الترهيب) دا (٢١٨).

٩٩- ليس من الجنة في الأرض شيء إلا ثلاثة أشياء: غرس العجوة و الحجر و أواق تنزل في الفرات كل يوم بركة من الجنة.

**٩٩- هیچ شتێکی بەهەشت لەسەر زەوی دا نییە ، جگە لە سێ شت نەبێت :نەمام و رووەکی عەجوە و ، بەردە رەشەکە و کێشانەی سەنگین نەبێت کە وەکو فەروو پیرۆزییەك لە بەهەشتەوە دێتە ناو فورات.**

مامۆستامان بە (حسن) ی زانیوە لە (الصحیحە) (٣١١١)

١٠٠- إذا ضحى أحدكم فليأكل من أضحيته.

**١٠٠- ئەگەر کەسێکتان قوربانی کرد با لە قوربانییەکەی خۆی بخوات .**

مامۆستامان ئەم فەرموودەیەی بەهێزکردووە لە (الصحیحە) (٣٥٦٣)

١٠١- نهى عن بيع المحفلات.

**١٠١- پێغەمبەر( ﷺ ) فرۆشتنی ئاژەڵی نەدۆشراو[١]ی قەدەغەکردووە.**

مامۆستامان ئەم فەرموودەیەی بەهێزکردووە لە (الصحیحە) (٣٢٣٦)

١٠٢- إذا أديت زكاة مالك فقد أذهبت عنك شره.

**١٠٢- ئەگەر زەکاتیماڵەکەت دەربکەیت خرا پەکەیت لەسەر خۆت لاداوە.**

مامۆستامان بە (حسن) ی زانیوە لە (صحیح الترغیب) (٧٤٣)

١٠٣- أما إن ربك يحب المدح.

**١٠٣- خوای تۆ حەزی لە ستایش کردنە.**

مامۆستامان بە (حسن) ی زانیوە لە (صحیح الترغیب) (٣١٧٩)

١٠٤- إذا ظننتم فلا تحققوا و إذا حسدتم فلا تبغوا و إذا تطيرتم فامضوا و على الله فتوكلوا و إذا وزنتم فأرجحوا.

**١٠٤- ئەگەر گومانتان برد کاری پێ مەکەن ، وە ئەگەر ئێرەیتان برد زیادە رەوی مەکەن ، ئەگەر بەرامبەر کارێك رەشبین بوون وازی لێ مەهێنن و ، پشت بەخوا ببەستن، لە کێشانەشدا قورس بکێشن.**

مامۆستامان بەهێزی کردووە لە (الصحیحە) (٣٩٤٢).

[١] (المحفلات)واتە:ئەو ئاژەڵانەی خاوەنەکەی چەند رۆژێك نایدۆشێت هەتا لە کاتی فرۆشتنیدا بە کام و شیر دەر دیاربێت)

١٠٥- إذا صلى أحدكم فأحدث فليمسك على أنفه ثم لينصرف.

**١٠٥- ئەگەر كەسێكتان لەناو نوێژدا بوو دەست نوێژی نەما با دەست بە لووتی خۆیەوە بگرێت و بڕوات.**

مامۆستامان به (صحيح) ی زانیوه له (الصحيحه) دا (٢٩٧٦)

١٠٦- أفش السلام و ابذل الطعام و استحي من الله تعالى كما تستحيي رجلا من رهطك ذا هيئة و ليحسن خلقك و إذا أسأت فأحسن فإن الحسنات يذهبن السيئات.

**١٠٦- سەلام بڵاو بكەرەوە و ، خواردن ببەخشە و ، شەرم لەخوا بكە ، وەكو چۆن لە پیاوێكی شكۆداری پێرەكەت شەرم دەكەیت ، با ڕەوشتیشت جوان بێت ، ئەگەر خراپەیەكیشت كرد چاكەیەكی بەدوادا بكە ، چونكە چاكەكان خراپەكان لادەبەن.**

مامۆستامان بەهێزی كردووه له (الصحيحه) دا (٣٥٥٩)

١٠٧- سافروا تصحوا ، واغزوا تستغنوا.

**١٠٧- گەشت بكەن تەندروستیتان چاك ئاسودە دەبێت ، غەزایش بكەن با دەوڵەمەندو بێنیاز بن.**

مامۆستامان به (صحيح) ی زانیوه له (الصحيحه) دا (٣٣٥٢)

١٠٨- إن الصدقة لتطفئ عن أهلها حر القبور و إنما يستظل المؤمن يوم القيامة في ظل صدقته.

**١٠٨- خێرە گڕی ناو گۆڕەكان لەسەر خاوەنەكانیان دەكوژێنێتەوە، لە ڕۆژی قیامەتیشدا ، باوەڕدار لە سایەی خێرەكەیدا دەحەسێتەوە .**

مامۆستامان به (حسن) داینراوه له (صحيح الترغيب) (٨٧٣)

١٠٩- و أحب الأسماء إلى الله تعالى عبد الله و عبد الرحمن و أصدقها حارث و همام و أقبحها حرب و مرة.

**١٠٩- خۆشترین ناو بە لای خوای گەورەوە ( عبدالله ) و ( عبدالرحمن ) ە ، ڕاسترینیشیان ( حارس ) و ( همام ) ە ، ناشرینترینیشیان ( حرب ) و ( مره ).** [1]

مامۆستامان به (صحيح) ی داناوه له (الكلم الطيب) (٢١٨/ طبعة المعارف)

١١٠- إن كنت تحبني فأعد للفقر تجفافا فإن الفقر أسرع إلى من يحبني من السيل إلى منتهاه.

[1] ( ناوەكان بە ماناو واتاكانیان حوكمی چاكی و خراپی و خۆشی و ناخۆشی دەدرێت بەسەریاندا(حرب)واتە جەنگی یان جەنگ(مرة)تاڵ یان حمە تاڵ)

**١١٠- ئەگەر منت خۆش دەوێت خۆت ئامادە بكە بۆ هەژاری ، چونكە هەژاری ئەوەندە بە پەلە دەڕواتە لای كەسێك منی خۆش بوێت ، لە هەوژمی خێراتری لافاو.**

مامۆستامان به (صحيح) ى زانيوه له (الصحيحه) دا (٢٨٢٧)

١١١- أعطيت ما لم يعط أحد من الأنبياء قبلي نصرت بالرعب و أعطيت مفاتيح الأرض و سميت أحمد و جعل لي التراب طهورا و جعلت أمتي خير الأمم.

**١١١- ئەوەم پێدراوە كە پێش من بە هیچ پێغەمبەرێك نەدراوە : بە ترس و بیم لەدڵی دوژمندا پشگیری كراوم ، كلیلەكانی سەر زەویم پێدراوە و ، ناوم نراوە ئەحمەد ، خۆڵم بۆ كراوەتە پاككەرەوە و ، ئوممەتی منیش كراوەتە چاكترین ئوممەت.**

مامۆستامان (تصحيح) ى كردووه له (الصحيحه) دا (٣٩٣٩)

١١٢- قال الله تعالى: افترضت على أمتك خمس صلوات و عهدت عندي عهدا أنه من حافظ عليهن لوقتهن أدخلته الجنة و من لم يحافظ عليهن فلا عهد له عندي.

**١١٢- خوای گەورە دەفەرموێت : پێنج نوێژم فەرز كردووە لەسەر ئوممەتەكەت ، لە لای خۆیشم پەیمانم كردووە هەركەسێك بیانپارێزێت و لەكاتی خۆیاندا بیانكات بەهەشتەوە ، هەركەسیش پارێزگاریان نەكات هیچ پەیمانێكی لای من نی یە.**

(الصحيحه) (٤٠٣٣)

١١٣- لقد تاب توبة لو تابها صاحب مكس لقبلت منه - يعني ماعزا -

**١١٣- تەوبەیەكی كردووە ئەگەر باجگری ناڕەوا بیكردایە ، لێی وەردەگیردرا. - واتە: ماعیز -**

(الصحيحه) (٣٢٣٨)

١١٤- سموه بأحب الأسماء إلي : حمزة.

**١١٤- ناوی بنێن بە خۆشەویسترین ناوەكان بە لامەوە : ( حەمزە )**

(الصحيحه) (٤٠٣٣)

١١٥- إن أهل الشبع في الدنيا هم أهل الجوع غدا في الآخرة.

**١١٥- بەراستی ئەوانە لە دونیا دا تێرن سبەینێ لە ڕۆژی دواییدا برسین.**

مامۆستامان گواستويه‌تيه‌وه بۆ (صحيحه) وه‌كو خۆى له (الضعيفة) دا ووتوويه‌تى (١/٤٨٨/ طبعة المعارف)

١١٦- إن الحميم ليصب على رءوسهم فينفذ الحميم حتى يخلص إلى جوفه فيسلت ما في جوفه حتى يمرق من قدميه و هو الصهر ثم يعاد كما كان.

**١١٦- ئاوی گەرم دەكرێت بە سەریاندا و دەچێتە ناوەوە تاكو بەناخیدا دەچێتە خوار و ئەوەی لە ناخی دایە دایدەڕزێنێ تاكو لە ژێر پێیەوە دەردەچێت و دەیتوێنێتەوە ، دیسان وەكو یەكەمین جاری لێ دێتەوە.**

(الصحيحه) (٣٤٧٠)

١١٧- إذا أديت زكاة مالك فقد قضيت ما عليك.

**١١٧- ئەگەر زەكاتیماڵەكەت بدەیت ئەوەی لەسەرتە جێ بەجێت كردووە .**

مامۆستامان بە (حسن) ی زانیوە لە (صحيح الترغيب) دا (٧٥٢)

١١٨- إذا أنت بايعت فقل: لا خلابة ثم أنت في كل سلعة ابتعتها بالخيار ثلاث ليال فإن رضيت فأمسك و إن سخطت فارددها على صاحبها.

**١١٨- ئەگەر شتێكت فرۆشت بڵێ بە بێ فروفێڵ ، ئینجا لە هەموو كەل و پەلێكدا كە دەیكڕیت سێ شەو سەرپشكی ، ئەگەر پێت باش بوو هەڵیگرە ، ئەگەر پێشت خراپ بوو ، بیگەڕێنەوە بۆ خاوەنەكەی .**

مامۆستامان بە (حسن) ی زانیوە (٢٨٧٥)

١١٩- إن هذا الخير خزائن لتلك الخزائن مفاتيح فمفاتيحه الرجال فطوبى لعبد جعله الله مفتاحا للخير مغلاقا للشر و ويل لعبد جعله الله مفتاحا للشر مغلاقا للخير.

**١١٩- ئەم چاكەیە گەنجینەیە ، ئەم گەنجینانەیش كلیلیان هەیە ، كلیلەكانیان پیاوەكانە ، خۆشبەختی بۆ بەندەیەك خوای گەورە بیكاتە كلیلی چاكەو ، داخەری خراپە،وا وەی لا بۆ بەندەیەكیش خوای گەورە بیكاتە واڵاكەری خراپە و داخەری چاكە.**

مامۆستامان بە (حسن) ی زانیوە لە (صحيح الترغيب) دا (٦٦)

١٢٠- في إشارة في الصلاة عشر حسنات.

**١٢٠- لە هەموو ئاماژەیەكی نوێژدا دە چاكەی تیایە.**

مامۆستامان بەهێزی كردووە لە (الصحيحه) دا (٣٢٨٦)

١٢١- إن أولى الناس يوم القيامة أكثرهم علي صلاة.

**١٢١- لە پێشترین كەس بۆ من لە ڕۆژی قیامەتدا كەسێكە سەڵەواتی زۆرم لەسەر بدات.**

مامۆستامان بە (حسن) ی زانیوە لە (صحيح الترغيب) دا (١٦٦٨)

١٢٢- (أما إن كل بناء فهو وبال على صاحبه يوم القيامة إلا ما كان في مسجد أو أو أو) و حديث (أما إن كل بناء وبال على صاحبه إلا ما لا إلا ما لا).

**١٢٢- هەموو بیناسازیەك كارەساتە بۆ خاوەنەكەی لە ڕۆژی قیامەتدا مەگەر بیناسازیەك بۆ مزگەوت بێت ، یان ، یان ، یان.. هەروەها فەرموودەی هەموو بونیاتێك كارەساتە لەسەر خاوەنەكەی ، تەنها ئەوە نەبێت ، تەنها ئەوە نەبێت.**

(الصحيحه) (٢٨٣٠)

١٢٣- ما ضحك ميكائيل منذ خلقت النار.

**١٢٣- میكائیل لەو ڕۆژەوە دۆزەخ دروست كراوە پێنەكەنیوە.**

بە (حسن) ی زانیوە لە (الصحيحه) دا (٢٥١١)

١٢٤- اعبدوا الرحمن ، وأطعموا الطعام ، وأفشوا السلام ، تدخلوا الجنة بسلام.

**١٢٤- خوا بپەرستن و خواردن ببەخشن، سەلام بڵاوبكەنەوە ، بە ئاسوودەیی دەچنە بەهەشت .**

بە (صحيح) ی زانیوە لە (الصحيحه) (٥٧١) و (صحيح الترغيب) (٩٤٥)

١٢٤- إن الله تعالى ليعجب من الشاب ليست له صبوة.

**١٢٥- خوای گەورە و مەزن تەماشای لاوێك دەكات هەرزە نەبێت.**

(تصحيح) ی كردووە (الصحيحه) (٢٨٤٣).

١٢٦- الغنيمة الباردة الصوم في الشتاء.

**١٢٦- دەسكەوتی سارد ڕۆژووی زستانە.**

مامۆستان بە (حسن)ی زانیوە لە لێكۆڵینەوەی دووهەمی (المشكاه) دا ، وەكو هاتووە لە (هدايه الرواه) (٢٠٠٨) هەروەها بڕوانە (الصحيحه) (١٩٢٢).

١٢٧- لا يزال الله مقبلا على العبد و هو في صلاته ما لم يلتفت فإذا صرف وجهه انصرف عنه.

**١٢٧- خوای گەورە بەردەوام بەرەو ڕووی بەندەیەكە كە لە نوێژدایە تاكو ڕووی وەرنەگێڕێت ، ئەگەر وای كرد خوای گەورەش ڕووی وەردەگێڕێ.**

مامۆستان بە (حسن)ی زانیوە لە (صحيح الترغيب) دا (٥٥٤)

١٢٨- ما بال أقوام يصلون معنا لا يحسنون الطهور ؟ ! فإنما يلبس علينا القرآن أولئك.

**١٢٨- ئـەوە کەسـانێك چـیانە نوێـژمان لەگـەڵ دەکـەن و دەسـتنوێژیش چـاك نـاگرن ؟! ئەوانە قورئان خوێندنمان لێ تێکدەدەن .**

(تصحيح) ی کردووە لە (هدایه الرواه) (٢٨٢)

١٢٩- إنكم في زمان من ترك منكم عشر ما أمر به هلك ثم يأتي زمان من عمل منهم بعشر ما أمر به نجا.

**١٢٩- ئێوە لەسەردەمێکدان هەرکەس لە ئێوە دەیەکی ئـەوەی فـەرمانی پێکـراوە نـەیکات تیا دەچێت ، بەڵام دوای ئەوە سەردەمێك دێت هەرکێ لەوان بە دەیەکی ئەوە کاربکات کـە فەرمانی پێکراوە ڕزگاری دەبێت.**

(تصحيح) ی کردووە لە (الصحيحه) دا (٢٥١٠).

١٣٠- إن الله تعالى يوصيكم بالنساء خيرا فإنهن أمهاتكم و بناتكم و خالاتكم إن الرجل من أهل الكتاب يتزوج المرأة و ما تعلق يداها الخيط فما يرغب واحد منهما عن صاحبه.

**١٣٠- خوای گەورە ڕاسپاردەی چـاکەتـان پـێ دەکـات دەربـارەی ئافرەتـەکانتان ، ئەوانـە دایك و کچ و پووری ئێوەن ، پیاوی وا هەیە لە ئەهلی کیتاب ئافرەتێك دەکاتە هاوسەری خۆی زۆر هەژارە کەسیشیان بێزار نابن لەوی تریان.** (تصحيح) ی کـردووە لـە (الـصحيحه) دا (٢٨٧١).

١٣١- أمر الدم بما شئت و اذكر اسم الله عز و جل.

**١٣١-( سەری برە )و خوێنەکەی بڕێژە بە هەر شتێك بۆت دەلوێ و ، ناوی خوای لەسەر بهێنە.**

مامۆستان (تصحيح)ی کردووە لە (الصحيحه) دا (٣٠٠١)

١٣٢- (إن أدخلت الجنة أتيت بفرس من ياقوتة لها جناحان فحملت عليه ثم طار بك حيث شئت) (إن يدخلك الله الجنة فلا تشاء أن تركب فرسا من ياقوتة حمراء تطير بك في أي الجنة شئت إلا ركبت)

**١٣٢- گەر بچیتە بەهەشتەوە ئەسپێکت بۆ دەهێـنن لـە مـروای دوو بـاڵی هەیـە ئـاوزەنگ دەدرێـت و هەڵتـدەفرێنێ بـۆ هـەر جێگایـەك بتـەوێت و ئەگـەر خـوای گـەورە بتخاتـە بەهەشتەوە ، هەر کـاتێکیش حـەز بکـەیت سـواری ئەسـپێك بیـت لـە مـرواری سـوور ئـەوا هەڵتدەفرێنێ بۆ هەر جێگایەك لە بەهەشتدا حەزت لێبێت.**

١٣٣- من قال في دبر صلاة الفجر و هو ثاني رجليه قبل أن يتكلم: لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك و له الحمد يحيي و يميت و هو على كل شيء قدير عشر مرات كتب له عشر حسنات

و محي عنه عشر سيئات و رفع له عشر درجات و كان يومه ذلك كله في حرز من كل مكروه و حرس من الشيطان و لم ينبغ لذنب أن يدركه في ذلك اليوم إلا الشرك بالله عز و جل.

**١٣٣- هەرکێ لە دوای نوێژی بەیانی بڵێت لەو کاتەی هێشتا قاچی نوشتاوەتەوە پێش ئەوەی قسە بکات دەجار بڵێت : ( لا اله الا الله وحده لا شريك له ، له الملك و له الحمد ، يحيى و يميت و هو على كل شيء القدير )ده چاکەی بۆ دەنوسرێت و ، دە خراپەی لەسەر لادەبرێت و ، دە پلە بەرز دەکرێتەوە ، لە تەواوی ئەو ڕۆژەشدا لە پارێزگاریدا دەبێت و پاسەوانێتی دەکرێت لە هەموو خراپەیەك ، لەو ڕۆژەیشدا هیچ گوناهێکی لەسەر نانوسرێت جگە لە شیرك.**

بە (حسن)ی زانیوە لە (صحیح الترغیب) دا (٤٧٢)

١٣٤- إذا زنت الأمة فاجلدوها فإن زنت فاجلدوها فإن زنت فاجلدوها ثم بيعوها و لو بضفير.

**١٣٤- ئەگەر ئافرەتی کۆیلە داوێن پیسی کرد شەلاقی لێبدەن ، ئەگەر جارێکی تر داوێن پیسی کرد ، بە شەلاقی لێبیبدەن و ،ئینجا بیفرۆشن ئەگەر بە گوریسێکیش بێت.**

مامۆستان بە (صحیح)ی زانیوە لە (الصحیحە) دا (٢٩٢١)

١٣٥- إخواني! لمثل هذا اليوم فأعدوا.

**١٣٥- براکانم ! بۆ ڕۆژێکی وەکو ئەم ڕۆژە خۆتان ئامادە بکەن.**

بە (حسن)ی زانیوە لە (الصحیحە) (١٧٥١)

١٣٦- كم من جار متعلق بجاره يوم القيامة يقول: يا رب هذا أغلق بابه دوني فمنع معروفه.

**١٣٦- چەندین دراوسێ وابەستەی دراوسێکەیانن لە ڕۆژی قیامەتدا و دەڵێت: پەروەردگارا : ئەوە ئەو دەرگاکەی خۆی لە ڕووم داخست و ،ێگەی لە چاکەی خۆی گرت.**

بە (حسن)ی زانیوە لە (الصحیحە) دا (٢٦٤٦)

١٣٧- ثلاثة لا ترى أعينهم النار يوم القيامة: عين بكت من خشية الله و عين حرست في سبيل الله و عين غضت عن محارم الله.

**١٣٧- سێ کەس هەن چاویان ئاگر نابینێ لە ڕۆژی قیامەتدا : چاوێك لە ترسی خوای گەورە گریا بێت ، چاوێکیش لەبەر خوا پاسەوانی کردبێت، چاوێکیش تەماشای قەدەغەکراوەکانی خوای گەورەی نەکردبێت.**

(الصحیحە) (٢٦٧٣)

١٣٨- إذا وقعت الملاحم بعث الله بعثا من الموالي من دمشق هم أكرم العرب فرسا و أجودها سلاحا يؤيد الله بهم هذا الدين.

**١٣٨- ئەگەر داستانەكان ڕوو بدەن ، خوای گەورە نێردراوێك لە مەوالی یەكانی دیمەشق دەنێرێت ، ئەسپیان لە ئەسپی هەموو عەرەب ڕەسەنترە ، چاكترین چەكیشیان پێیە خوای گەورە پشگیری ئەم ئاینەیان پێ دەكات .**

بە (حسن)ی زانیوە لە (الصحيحه) دا (٢٧٧٧)

١٣٩- كيف بكم إذا جمعكم الله كما يجمع النبل في الكنانة خمسين ألف سنة لا ينظر إليكم ؟.

**١٣٩- حاڵتان چۆن دەبێت ئەگەر خوای گەورە كۆتان بكاتەوە وەكو چۆن تیر لە تیراندا كۆ دەكرێتەوە ، پەنجا هەزار ساڵ تەماشاتان نەكات.**

(الصحيحه) دا (٢٨١٧)

١٤٠- ما حدثكم أهل الكتاب فلا تصدقوهم و لا تكذبوهم و قولوا: آمنا بالله و كتبه و رسله فإن كان باطلا لم تصدقوه و إن كان حقا لم تكذبوه.

**١٤٠- ئەوەی (ئەهلی كیتاب)خاوەن پەراوەكان بۆتان باس دەكەن نە باوەڕیان پێ بكەن و نە بە درۆشیان مەزانن ، بڵێن : باوەڕمان هێنا بە خوا و كتێب و پێغەمبەرەكانی ، ئەگەر قسەیەكی ناهەق بێت بڕوای پێ مەكەن ، ئەگەر ڕاستیش بێت بە درۆی مەخەنەوە.**

(الصحيحه) دا (٢٨٠٠)

١٤١- (خيار أمتي الذين إذا رءوا ذكر الله و شرار أمتي المشاءون بالنميمة المفرقون بين الأحبة الباغون البرآء العنت) (خياركم الذين إذا رءوا ذكر الله بهم، وشراركم المشاءون بالمنيمة ، المفرقون بين الأحبة الباغون البرآء العنت).

**١٤١- چاكترینی ئوممەتم ئەوانەن ئەگەر ببینرێن خوا یاد بكرێتەوە ، خراپترینی ئوممەتیشم ئەوانەن : قسە دێنن و دەبەن و ، خۆشەویستیان لێك دەكەن و ، ستەمكارو خراپە كارن؛چاكترینیان ئەوانەن بە بینینیان خوا یاد بكرێتەوە، خراپترینیان ئەوانەن قسە دێنن و دەبەن، خۆشەویستان لێك دەكەن ، ستەمكار دورە پەرێز و شەڕەنگێز و خۆبەزلزان**

بە (حسن)ی زانیوە لە (الصحيحه) دا (٢٨٤٩) و (صحيح الترغيب) (٢٨٢٤)

١٤٢- ألحد آدم و غسل بالماء وترا فقالت الملائكة: هذه سنة ولد آدم من بعده.

**١٤٢- ئـادەم خرايـە نـاو ( لحـد )گۆڕيـچە و، بـە ئـاو شـۆردرا بـە تـاك و ووتيـان : ئەمـە ( سوننەت )ڕێو ڕەسمی ئەوەی ئادەمە لە دوای خۆی.**

مامۆستامان كردوويەتی بە (صحيح) ، بڕوانـە (الـضعيفه) (٢٨٥٩)، و (صـحيح الجـامع) (لما توفي أدم)(كاتێك ئادەم مرد)

١٤٣- إذا رميت الجمار كان لك نورا يوم القيامة.

**١٤٣- ئەگەر بەردەبارانيان كرد بۆت[١] دەبێتە ڕووناكی لە ڕۆژی قيامەتدا.**

بە (حسن)ی زانيوە لە (الصحيحه) دا (٢٥١٥).

١٤٤- إن فقراء المهاجرين يدخلون الجنة قبل أغنيائهم بمقدار خمسمائة سنة.

**١٤٤- هەژارانی كۆچ كردووەكان پێنج سەد ساڵ پێش دەوڵەمەندەكانيان دەچنە بەهەشتەوە .**

(تحسين) ی كرووە لە (صحيح ابن ماجه) (٣٣٤٤) هەروەها بڕوانە : (صحيح الجامع) : (فقراء المهاجرين)

١٤٥- من أحب دنياه أضر بآخرته و من أحب آخرته أضر بدنياه فآثروا ما يبقى على ما يفنى.

**١٤٥- هەركەسێك دونيای خۆی خۆش ووپـست بـەو ئەندازەيـە زيـان بـە دواڕۆژی دەگـات ، هەركەسيش دواڕۆژی خۆی خـۆش بوێـت بـەو ئەندازەيـە زيـان بـە دونيـای دەگـات ، بۆيـە هەڵبژێرە لەوەی كە دەمێنێتەوە لەسەر ئەوەی كە لە نێو دەچێت.**

(تصحيح) كردووە لە (صحيح الترغيب) دا (٣٢٤٧)

١٤٦- كلوه فإني لست كأحدكم إن أخاف أن أوذي صاحبي.

**١٤٦- بيخۆن من وەكو هيچ يەكێك لە ئێوە نيم دەترسم ئازاری هاوەڵەكەم بدەم .**

بە (حسن)ی زانيوە لە (الصحيحه) دا (٢٧٨٤)

١٤٧- من خرج في طلب العلم فهو في سبيل الله حتى يرجع.

**١٤٧- هەركەسێك بڕوات بۆ فێر بوونی زانست ئەو لە پێناو خوادايە تاكو دەگەڕێتەوە.**

بە (حسن)ی زانيوە لە (صحيح الترغيب) دا (٨٨)

١٤٨- إن خيار عباد الله الذين يراعون الشمس و القمر و النجوم و الأظلة لذكر الله.

**١٤٨- چـاكترينی بەنـدەكانی خـوا ئەوانـەن كـە چـاودێری خـۆ و مـانگ و ئەسـتێرە و سێبەرەكان دەكەن بۆ يادی خواكردن.**

(الصحيحه) (٣٤٤٠)

[١] ( واته:بەردە بارانی شەيتان(رەجمكردنی شەيتان لە حەجدا))

١٤٩- يا أبا رزين ! أليس كلكم يري القمر ليلة البدر مخليا به ؟ فإنما هو خلق من خلق الله فالله أجل و أعظم.

**١٤٩- ئەی باوکی ڕووزەین ! ئایا هەمووتان بە تەنیا مانگ نابینن لە شەوی چواردەدا ، ئەوە دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی خوا، خوای گەورەیش مەزنتر و گەورەترە.**

بە (حسن)ی زانیوە لە (في ظلال الجنة) (٤٥٩) و (صحيح ابن ماجه) دا (١٥٠)

١٥٠- للمهاجرين منابر من ذهب يجلسون عليها يوم القيامة قد أمنوا من الفزع .

**١٥٠- کۆچکەرەکان مینبەری زێڕینیان هەیە لەسەری دادەنیشن لە ڕۆژی قیامەتدا ،بێگومان لە ڕاچەڵەکانیش دڵنیا بوونە .**

بە (حسن)ی زانیوە لە (الصحيحه) دا (٣٥٨٤)

١٥١- رباط يوم في سبيل الله خير من ألف يوم فيما سواه من المنازل.

**١٥١- پاسەوانی شەوێك لە پێناوی خوادا چاکترە لە هەزار ڕۆژ لە پلە و پایەکانی تر .**

بە (حسن)ی زانیوە لە (صحيح الترغيب) دا (١٢٢٤) و (هدايه الرواه)

١٥٢- إن أفواهكم طرق للقرآن فطيبوها بالسواك.

**١٥٢- دەمتان ڕێگەی قورئانن ، بۆیە بە سیواك پاك و بۆن خۆشیان بکەن.**

لە (صحيح ابن ماجه) دا (تصحيح) ی کردووە.

١٥٣- إن لكل شيء سناما و إن سنام القرآن سورة البقرة.

**١٥٣- هەموو شتێك لوتکەیەکی هەیە ، لوتکەی قورئانیش سورەتی ( البقره ) یە.**

ئەم ئەندازەی ئەم فەرموودەیەی بە (حسن) زانیوە کە (صحيح الترغيب) (١٤١٦).

١٥٤- كان إذا دخل المسجد يقول: بسم الله و السلام على رسول الله اللهم اغفر لي ذنوبي و افتح لي أبواب رحمتك و إذا خرج قال: بسم الله و السلام على رسول الله اللهم اغفر لي ذنوبي و افتح لي أبواب فضلك.

**١٥٤- پێغەمبەر( ﷺ ) کە دەچووە ناو مزگەوتەکەوە دەیفەرموو ، : بەناوی خوای گەورە ، سڵاو لە پێغەمبەری خوا ، خوایە لە گوناهەکانم خۆش ببە و ، دەرگاکانی میهرەبانی خۆتم بۆ بکەرەوە ، کاتێکیش دەردەچوو دەیفەرموو : بەناوی خوای گەورە و ، سڵاو لە پێغەمبەری خوا ، خوایە لە گوناهەکانم خۆبە و دەرگاکانی چاکەی خۆتم بۆ بکەرەوە.**

(تصحيح) ی کردووە لە (صحيح ابن ماجه) (٧٧١).

**ئەمەش ئەو فەرموودانەن لە ( صحيح الجامع ) دا بوون و ، مامۆستامان بە ( تصحيح ) کردنیان چۆتەوە و فەرمانی کردووە بە گواستنەوەیان بۆ ( ضعيف الجامع ) :**

١- اتقوا الله فإن أخونكم عندنا من طلب العمل.

**١- لە خوا بترسن ، براکانی ئێوە لە لای ئێمە ئەوانەن کە داوای زانست دەکەن.**

(ضعيف)(لاواز)

٢- إذا أصبح أحدكم فليقل: أصبحنا و أصبح الملك لله رب العالمين اللهم أني أسألك خير هذا اليوم فتحه و نصره و نوره و بركته و هداه و أعوذ بك من شر ما فيه و شر ما قبله و شر ما بعده ثم إذا أمسى فليقل مثل ذلك.

**٢- با کەسێك لە ئێوە بەیانی کردەوە بڵێت بەیانیمان کردەوە و موڵك هەمووی بوو بە موڵکی پەروەردگاری جیهانیانە ، خوایە داوای چاکەی ئەم ڕۆژەت لێ ئەکەم ، لە ڕووی : ( فەتح )کردنەوە ، و سەرکەوتن و ڕووناکی و پیرۆزی و ڕێنموونیەوە، پەنایشت پێ دەگرم لە خرا پەکانی ئەم ڕۆژە و خرا پەکانی دوای ئەم ڕۆژە ، ئینجا لە ئێوارەیشدا هەمان ئەم قسانە بڵێرەوە.**

(ضعيف) (تخريج المشكاة) (٢٤١٢)

٣- (إذا أفطر أحدكم فليفطر على تمر فإنه بركة فإن لم يجد تمرا فليفطر على الماء فإنه طهور) وورد أيضا في صحيح الجامع بلفظ: (إذا كان أحدكم صائما فليفطر على التمر فإن لم يجد التمر فعلى الماء فإن الماء طهور).

**٣- کە بەر بانگ دەکەمەوە بە خورما بەربانگ بکەنەوە بەراستی خورما پیرۆزە، ئەگەر خورمای دەست نەکەوت با ئاو بەربانگ بکاتەوە ، چونکە پاك و پاکەرەوەیە.**

**لە ( صحيح الجامع ) دا ، بەم شێوە هاتووە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە بە ڕۆژوو بوو با بە خورما بەربانگ بکاتەوە ، ئەگەر خورمای دەست نەکەوت با بە ئاو بکاتەوە چونکە پاك و پاکۆکەرەوەیە.**

(ضعيف) مامۆستامان ووتویەتی : ڕاست ئەوەیە کە پێغەمبەر کردوویەتی.

٤- و لا على ما وضعها.

**٤- نە و لەسەر ئەوەی کە دایناوە .**

بەم شێوە هاتووە لە فەرموودەی : کاتێك کەسێکتان لە خەو هەڵدەستن .

مامۆستامان فەرموویەتی : ئەمە (منكره) با لا ببرێت.

٥- إذا ولج الرجل بيته فليقل: اللهم إني أسألك خير المولج و خير المخرج باسم الله ولجنا و باسم الله خرجنا و على الله ربنا توكلنا ثم يسلم على أهله.

**٥- ئەگەر پیاوێك چووە ماڵی خۆیەوە ، با بڵێت: خوایە داوای چوونە ژوورەوە و هاتنە دەرەوەی چاکت لێ دەکەم ، بە ناوی خواوە چووینە ژوورەوە و ، بە ناوی خواوە دەرچووین، پشتمان بە خوای خۆمان بەست ، ئینجا سڵاو لە خانەوادەی بکات.**

(ضعيف)

٦- اللهم اجعل أوسع رزقك علي عند كبر سني.

**٦-خوایە زۆرترین ڕۆزیت بۆ من با لەکاتی بەتەمەنیمدا بێت.**

(ضعيف جدا)

٧- أما مررت بوادي قومك ممحلا ثم تمر به خضرا ثم تمر به ممحلا ثم تمر بهخضرا ؟ ( كذلك يحيي الله الموتى) .

**٧- ئایا تێپەڕ نەبووی بە لای دۆڵی گەلەکەتدا بە ووشك و برینگی و دوای ئەوەش بە سەوزی و دوای ئەوەش بە وشك و برینگی ئینجا بە سەوزی پێیدا تێدەپەڕی.**

**( كذلك يحيى الله الموتى ) ( البقره : ٧٣ )هەرئاوا خوا مردووەکان زیندوو دەکاتەوە.**

(ضعيف)

٨- إن الله يبغض كل جعظري جواظ سخاب في الأسواق جيفة بالليل حمار بالنهار عالم بالدنيا جاهل بالآخرة.

**٨-خوا ڕقی لەهەموو ڕق ئەستور و خۆ بە گەورە زانێکە،کە لە بازاردا قیرەقیرووهاوار هاوار دەکات،بەشەو لاکە مردارەوە بووی شەوو،کەری ڕۆژ،لە دونیا شارەزا و نەفام بە دوا ڕۆژ.**

٩- إن يوم الجمعة سيد الأيام و أعظمها عند الله و هو أعظم عند الله من يوم الأضحى و يوم الفطر فيه خمس خلال: خلق الله فيه آدم و أهبط الله فيه آدم إلى الأرض و فيه توفى الله آدم و فيه ساعة لا يسأل الله فيها العبد شيئا إلا أعطاه إياه ما لم يسأل حراما و فيه تقوم الساعة و ما من ملك مقرب و لا سماء و لا أرض و لا رياح و لا جبال و لا بحر إلا و هو يشفق من يوم الجمعة أن تقوم فيه الساعة.

**٩- ڕۆژی هەینی سەرداری ڕۆژەکانە و مەزنترینیانە لەلای خواو ، لە ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕەمەزانیش گەورەترە لەلای خوا ، پێنج خەسڵەتیشی تیایە : ئادەمی تیا دروست کراوە ، خوای گەورە ئادەمی دابەزاندە سەر زەوی ، لەو ڕۆژەیشدا خوای گەورە ئادەمی مراند ، ساتێکی تیایە بەندە داوای هەر شتێکی تیا بکات پێی دەبەخشرێت ، ئەگەر داوای شتی قەدەغەکراو نەکات ، لەو ڕۆژەشدا قیامەت بەرپا دەبێت ، هەرچی**

**فریشتەی نزیکانی خوا و ئاسمان و زەوی و با و شاخ و دەریا هەیە لە ڕۆژی هەینی دەترسن کە قیامەتی تیا بەرپا بێت.**

(ضعيف) (الضعيفة (٢٠١/٨)).

١٠- تكفير كل لحاء ركعتان.

**١٠- قەرەبوی هەموو جنێو دانێك دوو ڕکات نوێژە.**

(ضعيف)

١١- تكون إبل للشياطين، وبيوت شياطين.

**١١- ووشتری وا هەیە بۆ شەیتانە و ، هەندێ ماڵی وا هەیە بۆ شەیتانە.**

(ضعيف)

١٢- حيث يبتغي الفرج من عند غير الله عزوجل.

**١٢- لەو کاتەی داوای دەروی خێر جگە لە خوای گەورە لە کەسانی تر بکرێت.**

(ضعيفة) ئەم بڕگە کەوتۆتە نێو فەرموودەی (عجيب لصبر اخي يوسف).

١٣- خير الصحابة أربعة و خير السرايا أربعمائة و خير الجيوش أربعة آلاف و لا تهزم اثنا عشر ألفا من قلة.

**١٣-چاکترینی هاوەڵان چوارن ، چاکترینی پۆلە سەربازیەکان چوارسەدن ، چاکترینی سوپاکانیش چوار هەزارن ، سوپاش ئەگەر دوانزە هەزار کەس بێت لەبەر کەمی ناشکێت.**

(ضعيف)

١٤- وأسخن أقبالا.

**١٤- پێشەوەیان گەرمترە.**

(ضعيفة) ئەم بڕگە کەوتۆتە نێو فەرموودەی (عليكم بالأبكار)

١٥- عليكم بلحم الظهر فإنه من أطيبه.

**١٥- گۆشتی پشت بخۆن چونکە لە هەمووی خۆشترە.**

(ضعيف)

١٦- كفارة النذر إذا لم يسم كفارة يمين .

**١٦- ( کەفارەتی )قەرەبووی لە ( نەزر ) ئەگەر خۆگرتن ناو نەنرێت قەرەبووی سوێندە.**

(صحيح) تەنها وشە (لم يسم) نەبێت.

١٧- كان أكثر صومه السبت والأحد ، ويقول: هما يوما عيد المشركين ، فأحب أن أخالفهم.

**١٧- زۆربەی ڕۆژوەكانی لە شەممە و یەك شەممە و یەك شەممەدا بووە دەشیفەرموو : ئـەو دوو ڕۆژە جەژنی بت پەرستانە و ، حەز دەكەم جیاواز بم لە ئەوان.**

(ضعيف)

١٨- كان يصوم من الشهر السبت والأحد والاثنين ، ومن الشهر الآخر الثلاثاء والأربعاء و الخميس.

**١٨-لە مانگێكدا شەممە و دوو شەممە بە ڕۆژوو دەبوو ، لە مانگی دوایشدا سێ شـەممە و چوار شەممە و پێنج شەممە بە ڕۆژوو دەبوو.**

(ضعيف)

١٩- لتركبن سنن من كان قبلكم شبرا بشبر و ذراعا بذراع حتى لو أن أحدهم دخل جحر ضب لدخلتم و حتى لو أن أحدهم جامع امرأته بالطريق لفعلتموه.

**١٩- ڕێگەی ئەوانەی پێش خۆتـان دەگـرن بـست بـە بـست و (بـاڵ بـە بـاڵ)گەزبەگـەز ، تەنانـەت ئەگەریەكێكیان بچێتە كـونی بـزن مژەیەكـەوە ئێـوەیش بـە دوایانـدا دەچـنە ژوورەوە ، تەنانـەت ئەگەر كەسێكیان لە ڕێگادا لەگەڵ خێزانەكەی جووت بێت ئێوەیش وا دەكەن.**

ڕاستەكەی (جامع امه)

٢٠- لو أن قطرة من الزقوم قطرت في دار الدنيا لأفسدت على أهل الدنيا معايشهم فكيف بمن تكون طعامه ؟.

**٢٠- ئەگەر دڵۆپەیەك لە (زقوم) بخرایەتە دونیـاوە ژیانی لە خەڵكی سەر زەوی تێكدەدا ، ئەخوازەڵا كەسێك ئەوە خواردنی بێت.**

(ضعيف)

٢١- ليأتين على أمتي ما أتى على بني إسرائيل حذو النعل بالنعل ( حتى إن كان منهم من أتى أمه علانية لكان في أمتي من يصنع ذلك و إن بني إسرائيل تفرقت على ثنتين و سبعين ملة و تفترق أمتي على ثلاث و سبعين ملة كلهم في النار إلا ملة واحدة ما أنا عليه و أصحابي.

**٢١- ئەوەی بەسەر بەنی ئیسرائیل دا هات بەسەر ئوممەتەكەی منیش دێت ، شوێن پێ بە شوێن پێ تەنانەت ئەگەر كەسێكتان بـە ئاشكرا بـچێتە لای دایكـی خـۆی كەسـانێك لـە ئوممەتی من ئەو كارە دەكەن ، ئینجا بەنی ئیـسرائیل پەرتـەوازە بـوون بـە حـەفتاو دوو كۆمەڵ ئوممەتی منیش دەبنە حەفتاو سێ كۆمەڵ هەموویان لەدۆزەخدایـە ، تـەنها یـەك كۆمەڵیان نەبێت ،ئەوانیش ئەوانەن لەسەر ڕێبازی من و هاوەڵا نمن.**

بە هەڵە برگەی (حتى ان كان....) لابراوە بۆ ئاگاداری

٢٢- ليس يتحسر أهل الجنة على شيء إلا على ساعة مرت بهم لم يذكروا الله عزوجل فيها .

**٢٢- بەهەشتیەکان ئاخ بۆ هیچ شتێك هەڵناکێشن تەنها بۆ ساتێك نەبێت یادی خوایان تیا نەکردووە .**

(ضعيف)

٢٣- ليسترجع أحدكم في كل شيء حتى في شسع نعله فإنها من المصائب.

**٢٣- با هەر یەکێکتان لە هەموو شتێك دا بڵێت ( انا لله و انا الیه راجعون ) ، تەنانەت لە پەتی نەعلەکەی ئەگەر بپچڕێت ، چونکە ئەوەش بەڵایە.**

(ضعيف)

٢٤- من ادّان دينا ينوي قضاءه أداه الله عنه يوم القيامة.

**٢٤- هەرکەسێك قەرزێك بکات نیازی دانەوەی هەبێت ، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی دەداتەوە.**

وشەی (یوم القیامە) لاوازە با لابیرێت.

٢٥- فأصابه وضح.

**٢٥- تووشی ناڕەحەتی بوو.**

(ضعيفه) ئەم بڕگەیە لە نێو فەرموودەی (من باب و في يده ريح عمر) هاتووە، ئینجا بینیم مامۆستامان لە جێگەی (وضع) وشەی (شيء) ی داناوە.

٢٦- من صام رمضان إيمانا واحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه وما تأخر.

**٢٦- هەرکەسێك ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێت بە بڕواو و چاوڕوان کردنی پاداشتەوە ، هەرچی گوناهی کردووە و هەرچیش لە داهاتوو دا دەیکات خوای گەورە لێی خۆش دەبێت.**

وشەی (و ما تأخر) لاوازە ، با لابیرێت.

٢٧- من صلى علي حين يصبح عشرا ، وحين يمسي عشرا، أدركته شفاعتي يوم القيامة.

**٢٧- هەرکەسێك بەیانی و ئێوارە دەجار سڵاوات بداتە سەرم بە ، ( شەفاعەتی ) تکای من شاد دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا.**

(ضعيف)

٢٨- عن أهله.

**٢٨- لە کەس و کارەکەی.**

(ضعيفه) ئەم بڕگەیە لە نێو فەرموودەی (من کتم علی) هاتووە.

٢٩- من وجد تمرا فليفطر عليه ، ومن لا" فليفطر على الماء ، فإنه طهور.

**٢٩- هەركەسێك خورمايەكى دەست كەوت با بەربانگى پێ بكاتەوە ، ئەوەشى خورماى دەست نەكەوت ، با ڕۆژووەكەى بە ئاو بشكێنێ ، چونكە پاكەرەوەيە.**

(ضعيف)

٣٠- من وجد من هذا الوسواس فليقل : آمنا بالله ورسوله ثلاثا فإن ذلك يذهب عنه .

**٣٠- هەركێ هەستى بە دوو دڵى كرد با بڵێت : باوەڕمان هێنا بە خواو پێغەمبەرەكەى سێ جار ، چونكە ئەوەى لەسەر لادەبات .**

ووشەى (ثلاثا) لابرێت.

٣١- نهى أن يبال في الماء الجاري.

**٣١- پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەى كردووە.ميز بكرێتە ئاوى ڕاوەستاوەوە.**

(ضعيف)

٣٢- الولد ثمرة القلب وإنه مجبنة مبخلة محزنة.

**٣٢- منداڵ بەرهەمى دڵە ، دەبێتە مايەى ترسنۆكى و چروكى و خەم.**

وشەى (ثمرة القلب) لاوازە با لابرێت.

٣٣- لا إحصاء في الإسلام .

**٣٣- خەساندن لە ئيسلام دا نييە.**

بە هەڵە لە ژێرى نوسراوە (ضعيف) با بخرێتە نێو (صحيح) ەوە.

٣٤- بريدا.

**٣٤- ماوەى يەك بەريد.** [1]

(شاذة) ئەم برگەيە لە نێو فەرموودەى (لا سافر المراة بريدا) هاتووە.

٣٥- لا يزال قوم يتأخرون عن الصف الأول حتى يؤخرهم الله في النار.

**٣٥- كەسانێك هەيە هەن خۆيان دوا دەخەن لە ڕيزى يەكەم تا خوا گەورە دوايانئەخات نێو ئاگرەوە.**

مامۆستامان فەرموويەتى : ووشەى (في النار) زيادەيەكى (منكر)ە ، با لابرێت.

٣٦- (كلهم تجتمع عليه الأمة) (ثم يكون الهرج)

**٣٦- (هەموويان ئوممەتيان لێ كۆدەبێتەوە) و (ئينجا كوشتار دەست پێ دەكات) .**

دوو زيادەى (منكر) ن ، مامۆستامان وايوتووە، منيش ووتومە: ئەو زيادانە لە نێو فەرموودەى (لا يزال هذا الدين قائما) هاتووە.

٣٧- بشماله.

[1] (يەك بەريد ٢٠ كيلۆمەترە كە دەكاتە ١٢ و فەرسەخيش چوار فەرسەخە)

**٣٧- بە دەستی چەپی.**

(شاذة) لە نێو فەرمودەی (يطوى السموات) دا هاتووە.

٣٨- خير الصحابة أربعة و خير السرايا أربعمائة و خير الجيوش أربعة آلاف و لا تهزم اثنا عشر ألفا من قلة.

**٣٨- چاکترینی هاوەڵان چوارن ، چاکترینی پۆلە سەربازیەکان چوارسەدن ، چاکترینی سوپاکانیش چوار هەزارن ، دوانزە هەزار کەسیش بە هۆی کەمی یەوە تووشی شکست ناهێنن.**

(ضعيف) دووبارەیش بۆتەوە بە ژمارەی (٧٧٢٧) با ئەویش لابرێت.

٣٩- أقروا الطير على مكناتها.

**٣٩- واز لە باڵندەکان بێنن لە جێگاکانی خۆیان بێزاریان مەکەن .**

مامۆستامان بە باشی زانی لە (صحيحه) دەریبکات.

٤٠- و ما تلذذتم بالنساء على الفرش) الواقعة في الحديث: ( إني أرى مالا ترون).

**٤٠- لەزەت و چێژتان لە لەسەر جێگای ئافرەتەکانتان نەکرد.**

**لە نێو فەرموودەی : (اني ارى مالا ترون) ، مامۆستامان ووتویەتی پاڵپشتێکی نەدۆزیوەتەوە ئەم فەرموودەیە بەهێز بکاتەوە.**

٤١- أشكر الناس الله أشكرهم للناس.

**٤١- ئەو کەسەی زیاتر سوپاسی خوا دەکات ،ئەو کەسەیە کە زیاتر سوپاسی خەڵکی دەکات.**

بگوێزرێتەوە بۆ (ضعيف) وەکو لە (ضعيف الترغيب) دا هاتووە (٥٧٠).

٤٢- يجيء يوم القيامة ناس من المسلمين بذنوب أمثال الجبال يغفرها الله لهم و يضعها على اليهود.

**٤٢- لە ڕۆژی قیامەتدا هەندێك لە موسوڵمانان گوناهی وەکو چیاکان لەگەڵ خۆیانت دەهێنن ، خوای گەورە لێیان خۆش دەبێت و دەیخاتە سەر جوولەکە.**

٤٣- كان يحتجم على هامته و بين كتفيه و يقول: من أهراق من هذه الدماء فلا يضره أن لا يتداوى بشيء لشيء.

**٤٣-کەڵەشاخی لە پێشەسەری و نێوان هەردوو دەفی شانیدا.**

مامۆستامان بە (ضعيف) ی داناوە لە (الضعيفه) (١٨٦٧).

٤٤- لا تصحب الملائكة رفقة فيها جلد نمر.

**٤٤- فریشتەکان هاوڕێیەتی کەسێك ناکەن پێستی پڵنگی تیا بێت.**

منكر (ضعيف الترغيب) (١٨١٧)

٤٥- بطحان على بركة من برك الجنة.

**٤٥- بوختان لەسەر ئەسێرێکە لە ئەستێڵەکانی بەھەشت.**[1]

بە (ضعيف) ی داناوە لە (الضعيفە) (٥٧٣٠)

٤٦- (ومطردة للداء عن الجسد)(عليكم بقيام الليل).

**٤٦- نەخۆشی پەرێنە.**

وشەی (ضعيف) بەھەڵە ھاتووە لە (صحيح الجامع) دا ، ئەوەیش پارچەیەکە لە فەرموودەی (عليكم بقيام الليل)

٤٧- إن الله استقبل بي الشام و ولى ظهري اليمن و قال لي: يا محمد إني جعلت لك ما تجاهك غنيمة و رزقا و ما خلف ظهرك مددا و لا يزال الإسلام يزيد و ينقص الشرك و أهله حتى تسير المرأتان لا تخشيان إلا جورا و الذي نفسي بيده لا تذهب الأيام و الليالي حتى يبلغ هذا الدين مبلغ هذا النجم.

**٤٧- خوای گەورە ڕووی پێ کردمە شام و پشتیشی پێ کردمە یەمەن و پێی فەرمووم: ئەی موحەممەد ئەوەی بەرمو ڕووتە کردومەتە دەسکەوت بۆت ، ئەوەشی لە پشتتەوە کردومەتە پشتیوان بۆت ، ئیسلامیش ھەر لە زیادبووندایە، بتپەرستی و بتپەرستانیش ھەر لە کەم بووندان ، تاکو وای لێ دێت دوو ئافرەت کە پێوەبن لە ھیچ ناترسن مەگەر لە ڕێگەی لێتێکچوون ، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ، ڕۆژوو شەو نابڕێتەوە نەگاتە ئاستی ئەو ئەستێرەیەیە.**

ئینجا بە (ضعيف) ی داناوە لە (الضعيفە) (٥٨٤٨)

٤٨- من فصل في سبيل الله فمات أو قتل أو وقصته فرسه أو بعيره أو لدغته هامة أو مات على فراشه بأي حتف شاء الله فإنه شهيد و إن له الجنة.

**٤٨- ھەرکەسێك لە پێناو خوادا لەماڵ دەرچێت و بمرێت ، یان بکوژرێت ، یان ئەسپەکەی و ووشترەکەی دایشێلێت و ملی بشکێنێت ، یان گیانەوەرێك پێوەی بدات یان لەسەر جێگای خۆی بمرێت ، یان بەھەر شێوەیەك بمرێت کە خوا بیەوێت ، ئەو کەسە شەھیدەو دەچێتە بەھەشتەوە.**

ئینجا بە (ضعيف) ی کردووە لە (الضعيفە) (٥٣٦٠)

---

[1] ( ئەسێرو ئەستێل ھەردووکیان یەکشتن و ناون بۆ ئەو بەنگاوەی لەبەر کانی و کارێزدا دەکرێن و ئاوی تێدا کۆدەکرێتەوە)

٤٩- كان يكره المسائل و يعيبها فإذا سأله أبو رزين أجابه و أعجبه.

**٤٩- پێغەمبەری خوا( ﷺ ) بێ تاقەت دەبوو لە پرسیار لێ کردن زۆر پێی خۆش نەبوو ، بەلام کە ئەبو روزەین پرسیاری لێ دەکرد وەلامی دەدایەوە و ، پێشی خۆش بوو.**

(ضعيف)

٥٠- اتقوا بيتا يقال له الحمام فمن دخله فليستتر.

**٥٠- خۆتان بپارێزن لە ماڵێك کە پێ دەوترێ( حەمام )گەرماو هەر کەسێکیش چووە ناوی با خۆی دا پۆشێ .**

(ضعيف) ی کردووە لە (ضعيف الترغيب).

٥١- (عن الجمعة) منكرة وهي قطعة من حديث: (احضروا الجمعة)

**٥١- لە جێگەی جومعە.**

(منكرە) و پارچەکە لە فەرموودەی (احضروا الجمعة) بڕوانە (صحيح الترغيب) (٧١٣)

٥٢- ما أمرت كلما بلت أن أتوضأ ، ولو فعلت لكانت سنة.

**٥٢- فەرمانم پێ نەکراوە هەموو جارێ میز بکەم و دەست نوێژ بگرم ، ئەگەر وایشم بکردایە دەبووە سوننەت.**

مامۆستامان بە (حسن) ی زانیوە ، بەلام دواتر لە (المشكاة) و (ضعيف سنن أبي داود (٩)) (ضعيف) ی کردووە.

٤) ئەوەم بە باشزانی لە بەدواداچوونەکانی مەناوی لەسەر (السيوطى) بۆم زیاد کرد ، چونکە (السيوطى) لە ژمارەیەك لە فەرموودەکان کەمتەرخەمی کردووە لە دەرخستنی سەرچاوەکانی.

٥) چاککردنەوەی هەڵەکان لە نوسخە چاپکراوەکەی (صحيح الجامع)

٦) پێداچوونەوەی زۆرێك لە فەرموودەکانی کتێبەکە لەسەر بنەما و سەرچاوە سەرەکیەکان کە (سيوطى) لێیانەوە وەردەگرێت ، هەروەها دەرخستنی جیاوازیەکان لە پەراوێزدا کە ، مەگەر جیاوازیەکان هیچ کاریگەرییان نەبێت وەکو: (وكان)(فكان) و (بلقائه) و (لقائه) و شتی وەکو ئەوانە.

٧) ڕاڤەکردنی وشەی نامۆ لە (فيض القدير) ی مەناوی و کتێبی تر.

ڕێڕەوی (سیوطی) لە (جامع) ەکەیدا:بێگومان ئەو کەسەی لە کاری سیوتی ورد بێتەوە کە لە (جامعە)کەیدا کردوویەتی بۆی دەردەکەوێت لەسەر بەرنامەیەك ڕۆیشتووە کە لەم خاڵانەدا کورت دەکرێتەوە:

١- هەڵبەستنی ووشە لەو ڕیوایەتانەی هەیە لەو سەرچاوانەی ئاماژەی پێکردووە.

٢- فەرموودەکە دەداتە پاڵ ئەو کەسەی دەریهێناوە(تەخریجی) کردووە و ، و هەندێ ووشەی تێدایە کە لە لای ئەو کەسە نییە ، بەڵکو لە لای کەسی تر هەیە.

٣- فەرموودە دەداتە پاڵ بوخاری و موسلیم و کە لە ڕاستیدا یەکێکیان بە تەنیا بەوشێوەیە ڕیوایەتیان کردووە.

٤- فەرموودە دەداتە پاڵ کەسێك و لەوانە بە کەسێکی لەو کەسە بەهێزترو ڕاستتر ڕیوایەتی کردبێت.

٥- هەندێك فەرموودەی داوەتە پاڵی کەسێك کە چینی نزمترە لەو کەسەی تەخریجی کردووە ، چونکە لە ڕێگەی هاوەڵێکی ترەوە هاتووە ، بۆ نموونە ناوەرۆکەکەی لە بوخاری دایە ، لە فەرموودەی جابیرەوە ، بەڵام ئەو دەیداتە پاڵ (الترمذي) لە فەرموودەی ئەبو هورەیرەوە.

٦- نەرمی دەنوێنێ لە باسکردنی سەرچاوەی فەرموودەکاندا ، جاری وا هەیە فەرموودەیەك دەداتە پاڵ کۆمەڵێك لەوانەی تەخریجیان کردووە ، کەچی هەمووشیان بەو شێوە ڕیوایەتیان نەکردووە.

لە خوا داوایە کە بەم کتێبە سود بگەیەنێت بە موسوڵمانان وەکو چۆنە بە سەرچاوەکەی سوودی لەگەیاندنەوە ، خوایە درود و سڵاوی فراوان بنێرە بۆ سەر گیانی پاکی موحەممەد و هاوەڵانی.

# پێشەكی ( حافظ السيوطي )

هەرچی سوپاس و ستایش هەیە بۆ ئەو خوایەی كە لەسەری هەموو سەد ساڵێكدا كەسێك دەنێرێت كاروباری ئەم ئایینە نویٚ بكاتەوە ، لە هەموو سەردەمێكیشدا ئەم میللەتە دەپارێزێت بە پتەوكردنی گۆشە و پایەكانی و ، پشگیری سوننەتەكانی و روونكردنەوەیان ، شایەتیش دەدەم كە جگە لە خوای پەروەردگار خوایەكی تر بە هەق نییە و هیچ هاوبەشێكی نییە ، شایەتییەك تاریكی گومان برەوێنێتەوە بە شەبەقی ڕاستی و دڵنیایی ، شایەتیش دەدەم كە سەروەرمان موحەممەد بەندە و ڕەوانە كراوی خوای گەورەیە ، خوای گەورەیش ناردوویەتی بۆ بەرزكردنەوەی ووتەی ئیسلام ، و نەرم كردنی ڕێبازی بیٚ باوەڕی و لاواز كردنی ، درووود و سڵاوی خوای پەروەرگار لەسەر خۆی و هاوەڵە بەڕێزەكانی.

ئەم كتێبە:

بە هەزاران فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) م بۆ خواستووە،لە چەندەها پۆلی حوكمی مستەفایی ، تەنها فەرموودەی كورتیشم باس كردووە ، جوان و پوختەشم كردووە ، ئەوە و پاراستوویشمە لە درۆی دانەران[1] ، بەم شێوەیەش بەرزتر بۆتەوە بەسەر هەموو ئەو كتێبانەی لەم جۆرەن ، وەكو (الفائق) و (الشهاب) ، ئەوەندەش بابەتی نایاب و زانستی تازەی فەرموودەی تیایە ،كە لە هیچ كتێبێكی تردا نەبێت ، بەڵام من بە پێی پیتەكانی فەرهەنگ ڕێكم خستون وەكو لەبەرچاوگرتنی سەر ناوو كۆتایی فەرموودەكان ئاسانكاری بۆ خوێنەر و فێرخواز ، ناویشم نا : (الجامع الصغير من حديث البشير النذير) ، چونكە پوخت كراوەی كتێبێكی گەورەیە كە ناوم ناوە: (جمع الجوامع) ، كە تیایدا ویستم سەرتاپای فەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ) كۆبكەمەوە ، ئەمەیش نیشانەكانیەتی .

---

[1] ( ئەم بەڵێنەی بۆ نەهاتۆتە دی چونكە لەم كتێبەدا دەیان ، بەڵكو سەدان فەرموودەی دانراوی هێناوە و ، یان فەرموودەیەك تەنها كەسێكی درۆزنە گێراوێتی یەوە ، وەكو مامۆستامان ڕوونیكردوەتەوە لە پێشەكی یەكەیدا بۆ (صحيح) و (ضعيف الجامع الصغير))

لەخوام داوایە ئەم كارەمان لێ وەربگرێت و ، بمانگێڕێت بە كۆمەڵی سەرفرازی و خۆی و پێغەمبەرەكەی ئامین[١] .

| (خ) بۆ بوخاری | (م) بۆ موسلیم | (ق) بۆ هەردووكیان |
|---|---|---|
| (د) بۆ ئەبو داود | (ت) بۆ (الترمذی) | (ن) بۆ نەسائی |
| (ه) بۆ ئیبنو ماجە | (ع) بۆ ئەو چوارە (ابن ماجە) نەبێت | (حم) بۆ ئەحمەد لە موسنەدەكەی |
| (عم) بۆ عەبدوڵلای كوڕی لە زوائید | (ص) بۆ سەعیدی كوڕی مەنصور لە سوننەنەكەیدا | (خد) بۆ بوخاری لە (الأدب المفرد) |
| (تخ) هەر بۆ بوخاری لە (التاریخ) | (حب) بۆ ئیبنو حەیبان لە صەحیحەكەیدا | (طب) بۆ تەبەرانی لە (الكبیر) دا |
| (طس)بۆ تەبەرانی لە(الأوسط) دا | (طص) بۆ تەبەرانی (الصغیر) دا | (ش) بۆ ئیبنو ئەبی شەیبە |
| (فر) بۆ دەیلەمی لە موسنەدی فیردەوسدا | (عب) بۆ (عبدالرزاق) لە (الجامع) دا | (ع) بۆ ئەبو یەعلا لە موسنەدەكەیدا |
| (هق) بۆ بەیهەقی لە سوننەنەكەیدا | (حل) بۆ ئەبو نوعەیم لە حیلیە دا | (هب) بۆ بەیهەقی لە (شعب اللأیمان) دا |
| (عد) بۆ ئیبنو عەدی لە (الكامل) دا | ( خط) بۆ خەتیب لە (التاریخ) دا ئەگەر نا ئاشكرای دەكەم. | (عق) بۆ عوقەیلی لە (الضعفاء) دا |
| (ك) بۆ حاكم ، ئەگەر لە (المستدرك) بێت هەر وام پێ وتووە ئەگەر نا ئاشكرای دەكەم | | |

[١] ( (سیوطی) لە كۆتایی كتێبەكەیدا فەرموویەتی :

(لە ڕۆژی دووشەممە هەژدەی ڕەبیعی یەكەمی ساڵی (٩٠٧) لێی بوومەوە ، خوای گەورە بیكا بە مایەی چاكە و پاداشت و درود و سڵاوی خوای گەورە لەسەر پێغەمبەر و یاوەرانی).

وتم: دانەر ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە ساڵی (٩١١) لە دونیا دەرچووە)



## پەڕاوی
## دەست پێ كردنی نیگا (وحی)

١- إذا تكلم الله بالوحي سمع أهل السماء الدنيا صلصلة كجر السلسلة على الصفا فيصعقون فلا يزالون كذلك حتى يأتيهم جبريل حتى إذا جاءهم جبريل فزع عن قلوبهم فيقولون يا جبريل ماذا قال ربك فيقول الحق فيقولون الحق الحق.

(صحيح) ( د ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٢٩٣)

**١- كاتێ خوای گەورە نیگا ( وحی ) دائەبەزێنێت، دانیشتوانی ئاسمانی دونیا گوێ بیستی دەنگێك دەبن وەك دەنگی زنجیرە ئەلقەی زرێ كاتێ ڕابكێشرێ لە شوێنێكی ڕەقدا، یەكسەر دەكەون و بێهۆش دەبن لە شوێنی خۆیاندا. تا ئەو كاتەی جیبریلی ئەمین دێتە لایان و بەترسەوە دەڵێن ئەی جیبریل( فریشتەی وحی ) خوای گەورە چی فەرمووی؟ لە وەڵامدا ئەفەرموێ : ڕاستی فەرموو ئەوانیش دەڵێن: ڕاستە ڕاستە.**

٢- إنما ذلك جبريل ما رأيته في الصورة التي خلق فيها غير هاتين المرتين رأيته منهبطا من السماء سادا عظم خلقه ما بين السماء والأرض .

(صحيح) ( ت ) عن عائشة . (الصحيحة ٣٥٧٥)

**٢- ئەوە جیبریل بوو جگە لەم دووجارە هەرگیز لە شێوەی ڕاستەقینەی خۆی نەم دیوە بینیم لە نێوان ئاسمان هاتە خوارەوە و بەری ئاسمانی گرتبوو بە تەواوی گەورەییەكەی لە نێوان ئاسمان و زەویدا دەركەوت.**

٣- فتر الوحي عني فترة فبينا أنا أمشي سمعت صوتا من السماء فرفعت بصري قبل السماء فإذا أنا بالملك الذي أتاني في غار حراء على سرير بين السماء والأرض فجبنت منه فرقا حتى هويت إلى الأرض فأتيت خديجة فقلت دثروني دثروني فدثرت فجاء جبريل فقال ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ۝٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ۝٤ وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ۝٥﴾ المدثر .

(صحيح) ( الطيالسي حم م ) عن جابر .

**٣- ماوەیەك بوو ( نیگا )-وحی-م بۆ نەدەهات جارێك بە پێ دەڕۆشتم لەناكاو گوێم لە دەنگێك بوولە ئاسمانەوە هات ومنیش خێرا سەرم بەرزكردەوە بۆ ئاسمان و بینیم ئەو فریشتەیەی كە یەكەم جار لە ئەشكەوتی( حەڕڕا ) نیگای بۆ هێنام مەبەستی-**

**جوبرەئیله- ئەوە خۆیەتی و لەسەر کورسیەك لەنێوان ئاسمان و زەویدا دانیشتووە منیش ئەوەندە لێی ترسام تا بەسەر زەویدا کەوتم و پاشان گەڕامەوە بۆ لای خەدیجە و پێم گوت: دام پۆشن دام پۆشن ئەویش جێگای بۆ هێنام و داپۆشیم یەکسەر لەدوای ئەوە جیبریل- فریشتەی نیگا- هاتە لام و ئەم ئایەتانەی سورەتی( المدثر )ی بۆ هێنام کە ئەفەرموێ :** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرۡ ٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ ٤ وَٱلرُّجۡزَ فَٱهۡجُرۡ ٥﴾ المدثر **واتە: ئەی محمد( ﷺ ) ئەی ئەو کەسەی خۆت دا پۆشیوە هەستە دینی خوا رابگەیەنە ، تەنها خوای خۆت بە گەورە و پشت و پەنا بزانە وە پۆشاکت بە پاك رابگرە و لە گوناهکردن دورە پەرێز بە.**

٤- كان إذا أنزل عليه الوحي نكس رأسه ونكس أصحابه رءوسهم فإذا أقلع عنه رفع رأسه

(صحيح) ( م ) عن عبادة بن الصامت. (المشكاة ٥٨٤٥)

**٤- کاتێ نیگا( وحی ) دابەزیایە بۆ سەر پێغەمبەر( ﷺ )سەری موبارەکی ئەوی دەکرد هاوەڵەکانیشی هەموویان بەدوایدا سەریان ئەوی دەکرد کاتێ نیگا تەواو دەبوو جیبریل دەڕۆشت سەری بەرز دەکردەوە.**

٥- أحيانا يأتيني - يعني الوحي - في مثل صلصلة الجرس وهو أشده علي فيفصم عني وقد وعيت ما قال وأحيانا يتمثل لي الملك رجلا فيكلمني فأعي ما يقول .

(صحيح)( مالك حم ق ت ن ) عن عائشة زاد ( طب ) في آخره: وهو أهونه علي.(الصحيحة ٣٩٥٨)

**٥- پێغەمبەری خوا ( ﷺ )ئەفەرموێ: هەندێ جار کە نیگام بۆ دێت لە شێوەی زەنگی جەرەسدا بە ئاگام دێنێت کەئەمەیان نارەحەترین حاڵەتە لەسەرم وئەوکاتەی کە جێم دەهێڵێت و دەگەڕێتەوە زۆر چاك ئایەتەکانم لەبەر کردووە و تێگەیشتووم و هەندێ جاریش فریشتەی نیگا-جیبریل سەلامی خوای لێبێت- لە شێوەی پیاوێکدا دێت بۆ لام و پەیامەکەیم پێ دەڵێت و منیش راستەوخۆ تێدەگەم و لەبەری دەکەم.**

٦- كان إذا أنزل عليه الوحي كرب لذلك وتربد وجهه.

(صحيح) ( حم م ) عن عبادة بن الصامت. (المشكاة ٥٨٤٥)

**٦- پێغەمبەری خوا( ﷺ ) کاتێ نیگای بۆ دائەبەزی باری لاشەی گران دەبوو رەنگی دەم و چاوی دەگۆڕا.**

٧- كان إذا نزل عليه الوحي ثقل لذلك وتحدر جبينه عرقا كأنه جمان وإن كان في البرد.

(صحيح) ( طب ) عن زيد بن ثابت. (الصحيحة ٢٠٨٨)

**٧- پێغەمبەری خوا( ﷺ ) کاتێ نیگای بۆ دائەبەزی باری لاشەی قورس وگران دەبوو ئارەق وەکو گەهەر بە نێوچاوانیدا دەهاتە خوارێ با کاتی سەرما و زستانیش بوایە.**



## بابەتی پێناسەی ئیمان

٨- آمركم بأربع وأنهاكم عن أربع آمركم بالإيمان بالله وحده أتدرون ما الإيمان بالله وحده شهادة أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله وإقام الصلاة وإيتاء الزكاة وصيام رمضان وأن تؤدوا خمس ما غنمتم وأنهاكم عن الدباء والنقير والحنتم والمزفت احفظوهن وأخبروا بهن من وراءكم .

(صحيح) ( ق ٣ ) عن ابن عباس . (الصحيحة ٣٩٥٧)

**٨- فەرمانتان پێ ئەدەم بەچوارشت، وەبەرگریتان لێ دەکەم لە چوار شت، فەرمانتان پێ ئەکەم بە باوەڕ بوون بەخوای تاکو تەنها ، ئایا دەزانن مانای باوەڕ بوون بە خوای تاکو تەنها چۆنە؟ بڕیاردانە بەوەی هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خوودی ( الله )وە ( محمد ) یش نێردراوی خوایە، هەروەها بەرپاکردنی نوێژ و زەکات بەخشینو بەرۆژوو بوونی مانگی رەمەزانوبەخشینی پێنج یەکی ئەو غەنیمەودەستکەوتەی لە جەنگو جیهاد دا دەست دەکەوێت وەبەرگریتان لێ دەکەم لە کولەکە و دۆڵ( دییەگ )و کۆزە( دیزە )ی سەوز و پێشی خۆشکراو ئەمانەی عارەقیان تێدا خۆش درووستکراوە.**

٩- الإيمان الصبر والسماحة .

(صحيح) ( فر ) عن معقل بن يسار ( تخ ) عن عمير الليثي . (الصحيحة ٥٥٣)

**٩- ئیمان برتییە لە ئارامگرتنو لە خۆ بوردن بۆجێبەجێکردنی[1] ئەرکەکان.**

١٠- الإيمان أن تؤمن بالله وملائكته وكتابه وبلقائه وبرسله وتؤمن بالبعث الآخر

(صحيح) ( حم ق هـ ) عن أبي هريرة . (الترغيب ١٨٧٣)

---

[1] (ئیمانی بەیەهقی ئەفەرموێ مەبەست لە ئارامگرتن: ئارامگرتنە لەسەرنەکردنی گوناهو حەرام وە مەبەست لەخۆبوردویی ئەفسە لەسەرجێبەجێ کردنی ئەرکە خواییەکان )

**١٠- (ئيمان) باوەر بريتييه لەوەی باوەڕهێنی بەخوای تاك و تەنهاوە بەفريشتەكانیو بە كتێبەكەیو بەگەیشتن بەخزمەتی پەروەردگارو بە پێغەمبەرانو بەزيندوو بوونەوەی دوایی.**

١١- الإيمان أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر وتؤمن بالقدر خيره وشره .

(صحيح) ( م ٣ ) عن عمر . (المشكاة ٢)

**١١- ئيمان بيرتيه لەوەی باوەڕهێنی بەخوای گەورەو فريشتەكانیو كتێبەكانی و پێغەمبەرەكانیو رۆژی دوايی و باوەڕ بێنی بە( قەدەری خوا ) نەخشەی بڕياری بەهەردوو بەشی خێرو شەڕەوە.**

١٢- الإيمان أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله وتؤمن بالجنة والنار والميزان وتؤمن بالبعث بعد الموت وتؤمن بالقدر خيره وشره .

(صحيح) ( هب ) عن عمر . (الترغيب ١٨٧٢)

**١٢- (ئيمان) باوەر بريتييه لەوەی باوەڕ بهێنی بە خوای گەورەو فريشتەكانیو كتێبەكانی و پێغەمبەرەكانیو باوەڕبێنیٚ بە بەهەشتو دۆزەخو ميزان- تەرازوی كێشانی چاكەو خراپە- وباوەڕ بهێنی بە زيندوو بوونەوەی پاش مردنو بە( قەدەری خوا ) نەخشەی بڕياری ميهرەبان بەهەردوو بەشی خێرو شەڕەوە.**

١٣- المؤمن من أمنه الناس على أموالهم وأنفسهم والمهاجر من هجر الخطايا والذنوب .

(صحيح) ( هـ ) عن فضالة بن عبيد. (الصحيحة ٥٤٦)

**١٣- (ئيماندار)باوەردار ئەوكەسەيە كە خەڵك بە ئەمين و دەسپاكی بزانن لەسەر گيان و ماڵی خۆيان وە كۆچكەر –مهاجر- ئەوكەسەيە كەكۆچ دەكات لە گوناهو تاوانو وازيان لیٚ دێنیٚ .**

## بابەتی خەسڵەتو نيشانەكانی (ئيمان)باوەڕ

١٤- إذا زنى العبد خرج منه الإيمان فكان على رأسه كالظلة فإذا أقلع رجع إليه.

(صحيح) ( د ك ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٥٠٨)

**١٤- هەر كەسیٚ كاتیٚ زينای كرد ئيمان لێی جودا دەبێتەوە وەك پارچە هەورو سێبەرێك بەسەرسەريەوەيەتی، تا ئەوكاتەی واز دێنیٚو تۆبە دەكات بەراستی، ئەوكاتە دەگەڕێتەوە بۆ لای.**

١٥- إذا سرتك حسنتك وساءتك سيئتك فأنت مؤمن.

(صحيح) ( حم حب طب ك هب الضياء ) عن أبي أمامة . (الصحيحة ٥٥٠)

**١٥- هەركاتێ وات لێهات بەخوا پەرستی وچاكەكانت دڵخۆش بوویت و بەگوناه و خرا پەكانت دڵ تەنگ وخەفەتبار بوویت ئەوە تۆ ئیمانداریت .**

١٦- أفضل الإيمان الصبر والسماحة

(صحيح) ( فر ) عن معقل بن يسار ( تخ ) عن عمير الليثي . (الصحيحة ١٤٩٥)

**١٦- باشترین پلەوحاڵەتی ئیمان ئارامگرتن و لێبوردەی و لەخۆبوردەییە.**

١٧- إن الإيمان ليخلق في جوف أحدكم كما يخلق الثوب فاسألوا الله تعالى أن يجدد الإيمان في قلوبكم . (الصحيحة ١٥٨٥)

(صحيح) ( طب ك ) عن ابن عمرو .

**١٧- هەروەك چۆن جل و بەرگی بەرتان كۆن ئەبێت و لەوانەیە بدڕێت[1] ئیمانیش ئاوا كۆن دەبێت لەدڵ و دەروونتاندا، بپاڕێنەوە ئیمان لەدڵەكانتاندا نوێ بكاتەوە.**

١٨- إن لكل عمل شرة ولكل شِرةٍ فترة فمن كان فترته إلى سنتي فقد اهتدى ومن كانت إلى غير ذلك فقد هلك . (الترغيب ٥٦)

(صحيح) ( هب ) عن ابن عمرو .

**١٨- بێگومان هەموو ئیش و كارێك لەسەرەتاوە گەرم و گوڕی و ورمو بەرزی دەوێت ، وە هەموو گەرم و گوڕیەكیش لە پاش ماوەیەك لاواز بوون و بێ تاقەتیەك ڕووی لێ تێ دەكات ، جا هەر كەس بێ تاقەتی و بێ حەواسیەكەی خو گرتن بێت بە سونەتی منەوە بێگومان ئەو كەسە ڕوو لەهیدایەتە، بەلآم هەر كەس لاوازی و بێتاقەتیەكەی بەرەو شتی تری بەرێت بێگومان ئەوەش ڕوو لە تیاچوون و خەسارۆمەندییە.**

١٩- الإيمان بضع وسبعون بابا فأدناها إماطة الأذى عن الطريق وأرفعها قول لا إله إلا الله

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٧٦٩)

**١٩- (ئیمان) باوەر حەفتاو ئەوەندە پلەو بەشە نزمترین پلەی ئیمان لابردنی ناخۆشییە لەسەر ڕێگاو بەرزترین پلەی ئیمانیش ( لا الەالا الله )یە .**

---

[1] (السراج المنير ج١ ص٤١ ط١)

٢٠- الإيمان بضع وسبعون شعبة فأفضلها قول لا إله إلا الله وأدناها إماطة الأذى عن الطريق والحياء شعبة من الإيمان

(صحيح) ( م د ن هـ ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٧٦٩)

**٢٠- ئیمان حەفتاو ئەوەندە بەشی ووتنی( لا اله الا الله )یەو نزمترین بەشی لادانی درك و داڵی سەر ڕێگایە پاكردنەوەی ڕێگایە لە ناخۆشی ، شەرمو حەیاش بەشێكە لە ئیمان.**

٢١- الإيمان بضع وستون شعبة والحياء شعبة من الإيمان

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة .

**٢٠- ئیمان حەفتاو ئەوەندە بەشی ووتنی( لا اله الا الله )یەو نزمترین بەشی لادانی درك و داڵی سەر ڕێگایە پاكردنەوەی ڕێگایە لە ناخۆشی ، شەرمو حەیاش بەشێكە لە ئیمان.**

**٢١- ئیمان شەستو ئەوەندە بەشە شەرم و شكۆ بەشێكە لە ئیمان.** [1]

٢٢- الإيمان قيد الفتك لا يفتك مؤمن

(صحيح) ( تخ د ك ) عن أبي هريرة ( حم ) عن الزبير ومعاوية . (المشكاة ٣٥٤٨)

**٢٢- ئیمان بەستنەوەی خاوەنەكەیەتی لە ناپاكی [2] ئیمان ڕێگا نادات كەسێك دوای پەنا پێدران بكوژرێت ئیماندار هەرگیز ناپاكیو پەنا دراو ناكوژێت.**

٢٣- ثلاث من فعلهن فقد طعم طعم الإيمان من عبد الله وحده وأنه لا إله إلا الله وأعطى زكاة ماله طيبة بها نفسه رافدة عليه كل عام ولا يعطي الهرمة ولا الدرنة ولا المريضة ولا الشرط اللئيمة ولكن من أوسط أموالكم فإن الله لم يسألكم خيره ولم يأمركم بشره وزكى نفسه .

(صحيح) ( د ) عن عبدالله بن معاوية الغاضري . (الصحيحة ١٠٤٦)

**٢٣- سێ ئیش هەیە هەر كەس جێ بەجێ یان بكات ئەوە بەراستی تامو چێژی ئیمانی چەشتوە، هەر كەسێ خوای گەورەبەتاكو تەنها بپەرستێو بڕیار بدات هیچ پەرستراوێكی تر بە حەق جگە لە الله و بە پێی خۆشحاڵی و دڵ فراوانیەوە زەكاتی ماڵەكەی بدات، كە ساڵانە دووبارە دەبێتەوە، وە كە زەكاتی مەڕو ماڵات دەدات نابێ ئاژەڵی پیرو پەككەوتەو گەڕو لاوازو نەخۆشو قسرو بێ شیر بدات بەڵكو لە چینی مام**

---

[1] ( پێشەوا مسلم ڕەحمەتی خوای لێ بێت بەم شێوە گێراویەتەوە( بضع و سبعون )ئەمەش ڕاسترو بەهێزترە. السراج المنير ج١ ص٤١ ط١ )

[2] (( فتك ) واتە :ناپاكیكردن و كوشتنی كەسی پەنا دراو ،لەم پەر دانان لە هەڵسوكەوتدا )

**ناوەندی خوا داوای باشترین ئاژەڵتان لێ ناکات و فەرمانتان پێ ناکات ئاژەڵی خراپ بدەن بە زەکات بەڵکو دەرونی خۆتان ئاسودە بکەن .**

٢٤- ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الإيمان أن يكون الله ورسوله أحب إليه مما سواهما وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله وأن يكره أن يعود في الكفر بعد إذ أنقذه الله منه كما يكره أن يلقى في النار.

(صحيح) ( حم ق ت ن هـ ) عن أنس . (الروض النضير ٥٢)

**٢٤- سێ شت لەهەر کەسێکدا رەنگ بدەنەوە ئەوە شیرینی ئیمانی چەشتوە: خوای گەورەو پێغەمبەری( ﷺ ) لەهەموو شتێك خۆشتر بوێت و وە هەر کەسێکی خۆشویست تەنها لەبەرخاتری خوا خۆشی بوێت، وپاش (ئیمان) باوەر هێنان و موسڵمانێتی پێی ناخۆش بێت بگەرێتەوە ناوبێ بڕوایی بە ئەندازەی ئەوەی کە پێی ناخۆشە فرێ بدرێتە ناو ئاگرەوە .**

٢٥- أوثق عرى الإيمان الموالاة في الله والمعاداة في الله والحب في الله والبغض في الله عز وجل .

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٧٢٨)

**٢٥- توندترین گرێ و ئاڵقەی ئیمان دۆستایەتی کردنە لەبەر خواو دژایەتی کردنە لەبەر خوا ( جل جلالە )، هەروەها خۆشەویستی و رق لێبوون هەر لەبەرخاتری خوای دەسەلاتدار و شکۆدار.**

٢٦- ذاق طعم الإيمان من رضي بالله ربا وبالإسلام دينا وبمحمد رسولا .

(صحيح) ( حم م ت ) عن العباس بن عبدالمطلب. (المشكاة ٨)

**٢٦- بەراستی تام و چێژی ئیمانی چەشتوە کەسێك رازی بێت بەوەی ( الله ) ( جل جلالە ) پەروەردگاری بێت و ئیسلام بەرنامە و رێبازی بێت و موحەممەد( ﷺ )پێغەمبەری بێت.**

٢٧- قل آمنت بالله ثم استقم

(صحيح) ( حم م ت ن هـ ) عن سفيان بن عبدالله الثقفي (المشكاة ١٥)

**٢٧- بڵێ باوەرم بەخوای پەروەدگارە و ئینجا لەسەری بەردەوامبە.**

٢٨- كن ورعا تكن أعبد الناس وكن قنعا تكن أشكر الناس وأحب للناس ما تحب لنفسك تكن مؤمنا وأحسن مجاورة من جاورك تكن مسلما وأقل الضحك فإن كثرة الضحك تميت القلب.

(صحيح) ( هب ) عن أبي هريرة (الصحيحة ٩٢٧)

**٢٨- خۆت بگرەوە لە دونیا خواناس ترین کەس دەردەچیت، و رازیی بەو بەشەی خوای میهرەبان بۆی دیاری کردویت شوکرانە پێژترین کەس دەبێت، و ئەوەی بۆ خۆت پێت**

**خۆشە بۆ برایەکەشت پێت خۆش بێت دەبێتە ئیماندار و چاکبە لەگەڵ ئەوەی دراوسێ یەتیت دەکات موسڵمان دەردەچیت،وە کەم پێبکەنە چونکە زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێ .**

٢٩- لو أنكم تكونون على كل حال على الحالة التي أنتم عليها عندي لصافحتكم الملائكة بأكفهم ولزارتكم في بيوتكم ولو لم تذنبوا لجاء الله بقوم يذنبون كي يغفر لهم .

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٩٦٥)

**٢٩- ئەگەر پلە و حاڵەتی ئیمانی ئێوە هەمیشە وەك ئەوکاتە وابێ کە لەلای منن بەراستی فریشتەکان دێنە سەر زەوی و تەوقەتان لەگەڵ دەکەن دەست دەخەنە نێو دەستان ودێنە سەردانی ماڵەکانتان، وە ئەگەر بێت و گوناهیش نەکەن ئەوە خوای گەورە کەسانێك دروست دەکات کەگوناە بکەن بۆ ئەوەی لێیان خۆش بێت.**

٣٠- من زنى خرج منه الإيمان فإن تاب تاب الله عليه . (الصحيحة ٥٠٩)

(صحيح) ( طب ) عن شريك

**٣٠- هەر کەسێ زینا بکات ئیمانی لێ دەردەچێت جائەگەر تۆبەی کرد خوای میهرەبان تۆبەکەی گیرا دەکات**

٣١- من سرته حسنته وساءته سيئته فهو مؤمن .

(صحيح) ( طب ) عن أبي موسى. (المشكاة ٣٠٠٢)

**٣١- هەر کەس کردەوە چاکەکانی دڵخۆشی دەکرد و کردەوە خراپەکانیشی بێزارو دڵتەنگی کرد ئەوە ئیمانداره.**

٣٢- من شهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأن محمدا عبده ورسوله وأن عيسى عبده ورسوله وابن أمته وكلمته ألقاها إلى مريم وروح منه وأن الجنة حق وأن النار حق وأن البعث حق أدخله الله الجنة على ما كان من عمل من أي أبواب الجنة الثمانية شاء .

(صحيح) ( حم ق ) عن عبادة بن الصامت. (المشكاة ٢٧)

**٣٢- هەر کەسێ شایەتی بدات کەهیچ پەرستراوێك نییە جگە لە زاتی ( الله ) ی تاك و بێ هاوتا و ( محمد ) یش ( ﷺ ) بەندەو نێردراوی ئەوە و عیساش سەلامی خای لەسەر بێت بەندەونێردراوی خوای گەورەیە ولەنەوەی ئادەم و حەوایە وەبەهەشت حەقە ، دۆزەخ حەقە، زیندوبوونەوە حەقە، خوای گەورە ئەو کەسە دەخاتە بەهەشتەوە هەر کردەوەیەکی ئە نجام دابێت، لەهەر کام لە هەشت دەرگاکەی بەهەشتەوە بیەوێ دەچێتە ژوورەوە.**

٣٣- و الذي نفسي بيده لو كنتم تكونون في بيوتكم على الحالة التي تكونون عليها عندي لصافحتكم الملائكة ولأظلتكم بأجنحتها ولكن يا حنظلة ساعة وساعة .

(صحيح) ( حم م ت هـ ) عن حنظلة الأسدي. (الصحيحة ١٩٤٨)

**٣٣- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە گەر هەمیشە لە ماڵەکانتاندا وەك ئەو ساتانە بن کە لەلای منن فریشتەکان تەوقەتان لەگەڵ دەکەن و بە باڵەکانیان داتان دەپۆشن بەڵام ئەی حەنزەڵە ئیمان کاتە و کاتە.** [1]

٣٤- و الذي نفسي بيده لا يؤمن عبد حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه من الخير .

(صحيح) ( حم ن ) عن أنس. (الصحيحة ٧٣)

**٣٤- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ بەندەیەك ئیمانی تەواوی نییە هەتا چی بۆ خۆی پێ خۆشە لە خێرو چاکە بۆ برا موسڵمانەکەشی پێی خۆش نەبێت.**

٣٥- لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن ولا يسرق السارق حين يسرق وهو مؤمن ولا يشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن والتوبة معروضة بعد .

(صحيح) ( م ٣ ) عن أبي هريرة (المشكاة ٥٣)

**٣٥- هیچ زیناکارێك زینا ناکات وکاتی زیناکردنەکەی ( ئیماندار ) باوەڕدار بێت، وە هیچ کەسێك نییەدزی بکات وکاتی دزی کردنەکەی ( ئیماندار )باوەڕدار بێت، و هیچ کەسێك عارەق ناخواتەوە و کاتی خواردنەوەکەی ( ئیماندار ) باوەڕدار بێت، تەوبەو پەشیمانیش پاشتر دێتە ئاراوە و پیشان ئەدرێت.**

٣٦-لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن ولا يسرق السارق حين يسرق وهو مؤمن ولا يشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن والتوبة معروضة بعد .

(صحيح) ( م ٣ ) عن أبي هريرة (الصحيحة ٣٠٠٠)

**٣٦- هیچ بەندەیەك زینا ناکات وکاتی زیناکردنەکەی ( ئیماندار ) باوەڕدار بێت، وە هیچ بەندەیەك دزی ناکات وکاتی دزی کردنەکەی ئیماندار بێت، وە هیچ بەندەیەك عارەق ناخواتەوەو کاتی خواردنەوەکەی ئیماندار بێت، و دواتر تەوبە پیشان دەدرێت.**

---

[1] واتە :بە پێی کۆڕو مجلیسی چاك و خراپ زیاد و کەم دەکات )

٣٧- لا يزني الزاني حين يزني وهو مؤمن ولا يشرب الخمر حين يشربها وهو مؤمن ولا يسرق السارق حين يسرق وهو مؤمن ولا ينهب نهبة ذات شرف يرفع الناس إليه فيها أبصارهم حين ينتهبها وهو مؤمن .

(صحيح) ( حم ق ن هـ ) عن أبي هريرة زاد ( حم م ): ولا يغل أحدكم حين يغل وهو مؤمن فإياكم إياكم. (المشكاة ٥٣)

**٣٧- هيچ زيناكارێك زينا ناكات و كاتى زيناكردنەكەى (ئيماندار) باوەڕدار بێت، وە هيچ كەسێك نييە دزى بكات وكاتى دزى كردنەكەى (ئيماندار) باوەڕدار بێت، وە هيچ كەسێك عارەق ناخواتەوە و كاتى خواردنەوەكەى (ئيماندار) باوەڕدار بێت.**

٣٨- إن الدين يسر ولا يشاد الدين أحد إلا غلبه فسددوا وقاربوا وأبشروا واستعينوا بالغدوة والروحة وشيء من الدلجة. (الصحيحة ١١٦١)

**٣٨- بەڕاستى دينى ئيسلام ئاسانە و هيچ كەسێكيش نييە زۆرانبازى لەگەڵ ديندا بكات و دين بەسەر زەويدا زاڵ نەبێت ، بۆيە پێويستە هەميشە ئاراستەى ڕێك بگرن- فسددوا- وە نزيك بن لەسونەت-وقاربوا- چونكە ناتوانن بگەنە چلە پۆپە و كۆتايى، وە مژدەدەرو ئاسانكار بن، بۆ بەردەوام بوونيش لەجێبەجێ كردنى پەرستنەكاندا پشت ببەستن بە بەيانيان و ئێواران و هەندێك لە كۆتايى شەو.[1]**

٣٩- المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا.

(صحيح) ( ق ت ن ) عن أبي موسى . (المشكاة ١٠٤)

**٣٩- (ئيماندار)بڕوادار بۆ براى بڕوادارى وەك ديوار وايە هەندێكى ئەوى تر چوست دەكات.**

٤٠- المؤمن مرآة المؤمن .

(صحيح) ( طس الضياء ) عن أنس. (الصحيحة ٧٢٣)

**٤٠- باوەڕدار ئاوێنەى برا باوەڕدارەكەيەتى.**

٤١- المؤمن مرآة المؤمن والمؤمن أخو المؤمن يكف عليه ضيعته ويحوطه من ورائه.

(صحيح) ( خد د ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٩٢٦)

**٤١- باوەڕدار ئاوێنەى باوەڕدارە وە باوەڕدار براى باوەڕدارە و كۆمەكى دەكات و بە سوودە بۆى، پارێزگارى لێ دەكات و ڕێز و كەرامەتى دەپارێزێ.**

٤٢- المؤمن مكفر .

---

[1] **(چونكە ئەو كاتانە كاتى ووزەو توانا و حەسانەوە و چوست و چالاكيە )**

(صحيح) ( ك ) عن سعد. (الصحيحة ٢٣٦٧)

**٤٢- باوەردار گوناه وەريوه.**

٤٣- المؤمن من أهل الإيمان بمنزلة الرأس من الجسد يألم المؤمن لأهل الإيمان كما يألم الجسد لما في الرأس .

(صحيح) ( حم ) عن سهل بن سعد (الصحيحة ١١٣٧)

**٤٣- باوەردار بۆ خاوەن باوەر لە ئاستی سەردایە بۆ لاشە، باوەردار بە ئێش و ژانی خاوەن باوەر ئازار دەچێژێ وەك چۆن لاشە ئازار دەچەژێ بە ژانەسەر .**

٤٤- المؤمن يألف ولا خير فيمن لا يألف ولا يؤلف

(صحيح) ( حم ) عن سهل بن سعد (الصحيحة ٤٢٥)

**٤٤- باوەردار هۆگر و گونجاوە لەگەڵ خەڵكیدا، خێریش لە كەسێكدا نییە كە نە هۆگری خەڵكی بێت نە خەڵكیش هۆگری بێت.** [1]

٤٥- المؤمن يألف ويؤلف ولا خير فيمن لا يألف ولا يؤلف وخير الناس أنفعهم للناس.

(صحيح) ( قط في الأفراد الضياء ) عن جابر (الصحيحة ٤٢٦)

**٤٥- ئیماندار بە ئولفەت و هۆگرە لەگەڵ موسڵماناندا و ئەوانیش دەتوانن هۆگربن خێر و چاكەش نییە لە لە كەسێكدا نیە هۆگری كەس نەبێت و كەسیش هۆگری نەبێت و باشترین كەسیش ئەوەیە سوودمەنترین كەس بێت بۆخەڵكی.**

٤٦- المؤمن يغار والله أشد غيرا .

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٥١٥)

**٤٦- ئیماندار غیرەتی دەجوڵێ و تورِ دەبێ [2] بەڵام بێگومان خوای گەورە زۆربەغیرەتترە.** [3]

---

[1] (ئەمە نیشانەی ئیمان لاوازی وتەبیعەت خراپیە چونكەهۆگری و ئولفەت هۆی سەرەكی برایەتی ودەست گرتنە بە حەبلی خواوەو دەستە جەمعی موسڵمانانەوە.. خوای گەورە ئەفەرموی﴿ وأعتصموا بحبل الله جميعاً﴾ تا دەگاتە ﴿ فألف بين قولبكم فاصبحتم بنعمته إخواناً﴾ السراج المنير ج١ ص٤٥)

[2] (كاتێ بینی سنوری شەرع بەزێنراوە، حەرامێك پیادە دەكرێت)

[3] (ئیمامی مەناوی ئەفقەرموێت( بەرێزترین خەڵك و بەهیمەترینیان ئەوانەیانن كە زۆر بەغیرەتن، بێگومان ئەو ئیماندارەی كە دەبینێ حەرامێك ئەنجام دەدرێت شوێنی خۆیەتی تورە بێت و ئەو غیرەت و تورە بوونەش بۆ شەرع سیفەتێكە لە سیفەتەكانی پەروەردگار ، هەر كەسێكیش هەڵگری ئەو سیفەتەبێت بێگومان خوای گەورە خۆشی دەوێت و لە خۆی نزیك دەكاتەوەو رەحمەتی بەسەردا دەرژێنێت. )

٤٧- المؤمن يموت بعرق الجبين.

(صحيح) ( حم ت ن ه ك ) عن بريدة (المشكاة ١٦١٠)

**٤٧- ئیماندار بەعەرەقی نێوچاوانی دەمرێت .** [1]

٤٨- المؤمنون كرجل واحد إن اشتكى رأسه تداعى له سائر الجسد بالحمى والسهر .

(صحيح) ( حم م ) عن النعمان بن بشير (الصحيحة ١١٣٨)

**٤٨- ئیمانداران وەك یەك كەسن ئەگەر سەری ئێشی هەبوو هەموو لاشەی ئازاردەچێژێتو تاو و شەو نخوونی دایدەگرێت.**

٤٩- المؤمنون كرجل واحد إن اشتكى رأسه اشتكى كله وإن اشتكى عينه اشتكى كله .

(الصحيحة ١١٣٨)

**٤٩- ئیمانداران وەك یەك كەسن گەر سەری ئێشی هەبوو هەموو لاشەی ئێش و ژان دایدەگرێ، و ئەگەر چاوی ئێشی هەبوو هەموو لاشەی ئێشو ئازاری هەیە.**

٥٠- المؤمنون هينون لينون كالجمل الأنف إن قيد انقاد وإذا أنيخ على صخرة استناخ .

(صحيح) ( ابن المبارك ) عن مكحول مرسلا ( هب ) عن ابن عمر (الصحيحة ٩٣٢)

**٥٠- ئباوەرداران خەڵكانی رۆح سووكو نەرمو نیانن وەك ووشتری باربەرولووت نەرم وایە بۆ هەر كوێ كێش بكرێت دروات وە كاتێ (یخ)ی لێ بكرێت بالەسەر بەردێكیش بێت مل دەداو دادەنەوێ بۆ خاوەنەكەی.**

٥١- و الذي نفسي بيده لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من والده وولده .

(صحيح) ( حم خ ن ) عن أبي هريرة

**٥١- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هیچ كام لە ئێوە باوەری تەواو نییە هەتا منی خۆشتر نەوێت لە باوكو كورِی.**

٥٢- لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من ولده ووالده والناس أجمعين .

(صحيح) ( حم ق ن هـ ) عن أنس (المشكاة ٧)

**٥٢- هیچ كام لە ئێوە باوەری تەواو نییە هەتا منی خۆشتر نەوێت لە كورِەكەیو لە باوكی لەهەموو خەڵكی بە گشتی.**

---

[1] (واتە عەرەق كردنی نێو چاوانی ئیماندار لەكاتی سەرەمەرگیدا نیشانەی ئیمانداریەتێتییە )

٥٣- لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه .

(صحيح) ( حم ق ت ن هـ ) عن أنس (الصحيحة ٧٣)

**٥٣- هیچ یەکێکتان باوەری تەواوی نییە هەتا هەر چی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ برا موسلمانەکەشی پێی خۆش نەبێت.**

## بابەتی پلە و گەورەیی ( ئیمان )باوەڕ

٥٤- أبشروا وبشروا من وراءكم أنه من شهد أن لا إله إلا الله صادقا بها دخل الجنة .

(صحيح) ( حم طب ) عن أبي موسى . (الصحيحة ٧١٢)

**٥٤- موژدە بێت لێتان و موژدەش بدەن بە کەسانی دوای خۆتان، بەوەی هەر کەس بەراستی شایەتی بدات کە هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە جگە لە زاتی ( الله ) دەچێتە بەهەشتەوە .**[1]

٥٥- أتاني جبريل فبشرني أنه من مات من أمتك لا يشرك بالله شيئا دخل الجنة فقلت وإن زنى وإن سرق فقال وإن زنى وإن سرق .

(صحيح) ( ق ) عن أبي ذر (الصحيحة ٨٢٤)

**٥٥- جیبریل –سەلامی خوای لێبێت- هات بۆلام و موژدەی پێدام کە هەر کەس لە ئوممەتەکەت مردوو هاوەڵی بۆ خوا بریار نەدات بێت بەهیچ شێوەیەك و لەهیچ شتێکدا دەچێتە بەهەشتەوە منیش پێم ووت: بازینا و دزیش بکات؟ ووتی با زینا و دزیش بکات.**

٥٦- أتاني جبريل فقال بشر أمتك أنه من مات لا يشرك بالله شيئا دخل الجنة قلت يا جبريل وإن سرق وإن زنى قال نعم قلت وإن سرق وإن زنى قال نعم قلت وإن سرق وإن زنى قال نعم وإن شرب الخمر.

(صحيح) ( حم ت ن حب ) عن أبي ذر . (الصحيحة ٨٢٦)

**٥٦- جیبریل –سەلامی خوای لێبێت- هاتە لام و ووتی: موژدە بدە بە ئوممەتەکەت هەرکەس بمرێت و لەهیچ شتێکدا هاوەڵ بۆ خوا بریار نەدات دەچێتە بەهەشتەوە منیش**

---

[1] ئیمامی مەنناوی ئەفەرموێت: تاقمی ( خەواریجەکان ) دەڵێن ئەوەی گوناهی گەورە ئەنجام بدات بێ باوەر دەبێت وە تاقمی ( موعتەزیلەکان ) دەڵێن: بێگومان ئەوەی گوناهی گەورە ( الکبیرە ) بکات هەتا هەتایە لەناو دۆزەخدا دەمێنێتەوە، بە بەڵگەی عەقڵی خۆیان کە دەڵێن هەرگیز دروست نییە لێ بوردن و چاوپۆشی لە ئەنجام دەری گوناهی(کبیرە ) هەروەك چۆن ودروست نییە تۆڵە و سزا لە موسلمانێکی گوێڕایەڵ بسەنرێت ئەمەش بێگومان درۆ و قسەی هەڵبەستنە بەناوی خواوەو پێچەوانەی ئەم فەرمودە صەحیحانەیە )

**ووتم: ئەی جیبریل ! بادزی وزیناش بکات؟ ووتی: بەڵێ، ووتم بادزی و زیناش بکات؟ ووتی: بەڵێ با زیناو دزیش بکات؟ ووتی بەڵی با عارەقیش بخواتەوە .**

٥٧- اخرج فناد في الناس من شهد أن لا إله إلا الله وجبت له الجنة .

(صحيح) ( ع ) عن أبي بكرة . (الصحيحة ١١٣٥)

**٥٧- بڕۆ دەرەوە هاوار بکە لەناوخەڵکدا : هەر کەس شایەتی بدات کە هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە جگە لە زاتی ( الله ) ئەوە بەهەشتی بۆ مسۆگەر بووە.**

٥٨- أذن في الناس أنه من شهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له مخلصا دخل الجنة .

(صحيح) ( البزار ع ) عن عمر . (الصحيحة ١١٣٥)

**٥٨- بانگەواز بکە لەناو خەڵکدا کە: هەر کەس شایەتی بدات بە دڵسۆزی لەناخی دڵیەوە هیچ پەرستراوێك نییە بەحەق جگە لە زاتی ( الله ) کە تاك و تەنها وبێ هاوتایە دەچێتە بەهەشتەوە.**

٥٩- اذهب بنعلي هاتين فمن لقيت من وراء هذا الحائط يشهد أن لا إله إلا الله مستيقنا بها قلبه فبشره بالجنة.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٩٨١)

**٥٩- ئەم جووتە نەعلەی من بەرەو بڕۆ هەرکەسێکت دی لە پشت ئەم دیوارەوە شایەتی دەدا لەتەواوی دڵیەوە بەوەی کە هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە جگە لە زاتی ( الله ) موژدەی چوونە بەهەشتی پێ بدە.**

٦٠- أسعد الناس بشفاعتي يوم القيامة من قال لا إله إلا الله خالصا مخلصا من قلبه .

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٥٥٧٤)

**٦٠- بەختەوەرترین کەس لە رۆژی قیامەتدا بە تکای من ئەو کەسەیە کە بەدڵسزو دڵسۆزانە بڵێت: هیچ پەرستراوێك بە حەق نییە جگە لە زاتی گەورەی ( الله ) .**

٦١- أشهد أن لا إله إلا الله وأني رسول الله لا يلقى الله بهما عبد غير شاك فيهما إلا دخل الجنة .

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٥٩١٢)

**٦١- هەر کەس بڕیار بدات کەهیچ پەرستراوێك بە حەق نییە جگە لە ( الله )وە منیش نێدراوی خوام، هەر بەندەیەك بێ دوو دڵی لەم بڕیارەدا بگاتە خزمەتی پەروەردگار، بێگومان دەچێتە بەهەشتەوە**

٦٢- أفضل الأعمال الإيمان بالله وحده ثم الجهاد ثم حجة مبرورة تفضل سائر الأعمال كما بين مطلع الشمس إلى مغربها .

(صحيح) ( حب حم ) عن ماعز . (الترغيب ١١٠٣)

**٦٢- باشترین کردەوە باوەڕ بوونە بە خوای تاك و تەنهاو پاشان جیهاد لە پێناوی خواداو پاشان حەجێکی ( چاك ) وەرگیراوو، ئەمانە لە باشترینی ئەو کردەوانەن کە لە نێوان خۆرهەڵاتن و خۆرئاوا بوندا.**

٦٣- أفضل العمل إيمان بالله وجهاد في سبيل الله .

(صحيح) ( حب ) عن أبي ذر . (الصحيحة ١٤٩٠)

**٦٣- باشترین کردەوە باوەڕ بوونە بەخوای گەورەو جیهادکردنە لە پێناوی ئەودا.**

٦٤- إن الله سيخلص رجلا من أمتي على رءوس الخلائق يوم القيامة فينشر عليه تسعة وتسعين سجلا كل سجل مثل مد البصر ثم يقول أتنكر من هذا شيئا أظلمك كتبتي الحافظون فيقول لا يا رب فيقول أفلك عذر فيقول لا يا رب فيقول بلى إن لك عندنا حسنة وإنه لا ظلم عليك اليوم فتخرج بطاقة فيها أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله فيقول احضر وزنك فيقول يا رب ما هذه البطاقة مع هذه السجلات فيقال فإنك لا تظلم فتوضع السجلات في كفة والبطاقة في كفة فطاشت السجلات وثقلت البطاقة ولا يثقل مع اسم الله تعالى شيء .

(صحيح) ( حم ت ك هب ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ١٣٥)

**٦٤- بەراستی خوا لە ڕۆژی دواییدا پیاوێك بەرەندە دەکات لە ئومەتی من لە بەرچاوی هەموو درووستکراوەکان، نەوەد و نۆ تۆمارگە ( تسجيل )ی بۆ بلاوکردەوە کە هەر یەکێکیان هەتا چاو بر بکات گەورەن، ئینجا پێی دەفەرمووێ ئینکاری لە هیچ شتێك دەکەی؟ئایا نوسەر و پارێزەری کردەوەکان ستەمیان لێکردووی؟دەڵێ نەخێر پەروەردگارا، دەفەرمووێ ئایا بیانوت هەیە؟دەڵێ نەخێر پەروەردگارا، دەفەرمووێ بەڵێ تۆ بەراستی تۆ لەلای ئێمە چاکەیەکت هەیە و ئەمرۆش ستەمت لێ ناکرێت، یەکسەر بیتاقەیەکی دەردێنێ کە( أشهد ان لا اله الا الله و أشهد أنَّ محمداً عبده و رسوله ) ی تێدایە دەفەرمووێ: ئامادەی کێشانەکەت بە، دەڵێ: پەروەردگارا!ئەو بیتاقەیە چیە لەگەڵ تۆمارگەکان (سجیلەکان )؟دەوترێ بەراستی ستەمت لێ ناکرێ، تۆمارگەکان دەخرێنە تاکێکی تەرازووەکە و بیتاقەکەش دەخرێتە تاکەکەی تری، بیتاقەکە قورس دەبێت و تۆمارگەکان بە حەوادا دەبات لە بەرامبەر ناوی ( الله )هیچ شتێك سەنگی نیە.**

٦٥- إن الله تعالى قد حرم على النار من قال لا إله إلا الله يبتغي بذلك وجه الله.

(صحيح) ( ق ) عن عتبان بن مالك .

**٦٥- بێگومان خوای گەورە حەرامی کردووە لە سەر ئاگر کەسێك بسوتێنێت کە بەدڵ سافیو لەبەر خاتری خوا وتبێتی ( لا إله إلا الله ).**

٦٦- بشر الناس أنه من قال:لا إلا الله وحده لا شريك له وجبت له الجنة.

صحيح (ن)عن سهل بن حنيف[1]،و عن زيد بن خالد الجهني. (الصحيحة ٧١٢)

**٦٦- مژدە بدە بەخەڵك بەوەی کەهەرکەس بڵێ ( لا إله إلا الله وحده لا شريك له ) بەهەشتی بۆ مسۆگەر بووە.**

٦٧- قال لي جبريل من مات من أمتك لا يشرك بالله شيئا دخل الجنة قلت وإن زنى وإن سرق قال وإن زنى وإن سرق.

(صحيح) ( خ ) عن أبي ذر. (الصحيحة ٨٢٦)

**٦٧- جيبريل –سەلامی خوای لێ بێت- پێی ووتم: هەرکەس لە ئوممەتی تۆ بمرێتو هاوەڵی بۆخوا بریار نەدابێت لەهیچ شتێك دەچێتە بەهەشتەوە منیش پێم ووت: ئەی ئەگەر زیناو دزی کردبێت؟ ئەویش ووتی: بازیناو دزیشی کردبێت.**

٦٨- لن يُوافَي عَبْدٌ يوم القيامة يقول لا إله إلا الله يبتغي بها وجه الله إلا حرم الله عليه النار.

(صحيح) ( حم خ ) عن عثمان بن مالك.

**٦٨- هیچ شتێك مافی بەندەیەك نییە کە لەبەر خاتری خوا بڵێ ( لا إله إلا الله ) تەنها ئەوە نەبێت کە خوا ئاگری لێ قەدەغە دەکات.**

٦٩- ما قال عبد لا إله إلا الله قط مخلصا إلا فتحت له أبواب السماء حتى تفضي إلى العرش ما اجتنب الكبائر.

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٣١٤)

**٦٩- هەرگیز هیچ بەندەیەك نییە بڵێ ( لا إله إلا الله ) بەدڵسۆزی مەگەر دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە تا دەگاتە عەرشی پەروەردگار بەو مەرجەی خۆی بەدوور گرتبێت لەگوناهە گەورەکان.**

٧٠- ما مَن عبد قال لا إله إلا الله ثم مات على ذلك إلا دخل الجنة و أن زنى و سرق،وأن زنى و سرق، و أن رغنم أنفٌ أبى ذر.

---

[1] (الذي في النائي : عن أبي أمامة بن سهل بن حنيف.السراج المنير ج١ ص٤٩ ط١)

**٢٠٤- تاقیکردنەوەو گرفتلری مرۆڤ لە خێزانو ماڵو گیان منداڵو دراوسێکەیدا ڕۆژوو و نوێژو ماڵ بەخشینو فەرمان بەچاکەو بەرگری لە خراپە گوناهەکانی پێ دەسڕیتەوە.**

٢٠٥- ما من قوم يعمل فيهم بالمعاصي هم أعز وأكثر ممن يعمله ثم لم يغيروه إلا عمهم الله تعالى منه بعقاب .

(صحيح) ( حم د ه حب ) عن جرير. (المشكاة ٥١٤٢)

**٢٠٥- هیچ گەلێك نییە گوناهو تاوانیان تیا ئەنجام بدرێتو خۆشیان زۆرینەی چاکەبنو خراپەکاران کەمتر بنو لە گەڵ ئەوەشدا چاکەکاران کە زۆرینەو بە دەسەڵاتن قسە نەکەنو بەرگریان لێ نەکەن، ئەوە بێگومان خوای گەورە سزاو تۆڵە بەسەر هەموویاندا دەبارێنێت.**

٢٠٦- ما من نبي بعثه الله في أمة قبلي إلا كان له من أمته حواريون وأصحاب يأخذون بسنته ويتقيدون بأمره ثم إنها تخلف من بعدهم خلوف يقولون ما لا يفعلون ويفعلون ما لا يؤمرون فمن جاهدهم بيده فهو مؤمن ومن جاهدهم بلسانه فهو مؤمن ومن جاهدهم بقلبه فهو مؤمن ليس وراء ذلك من الإيمان حبة خردل .

(صحيح) ( حم م ) عن ابن مسعود. (المشكاة ١٥٧)

**٢٠٦- هیچ پێغەمبەرێك نییە خوای گەورە ناردبێتی بۆ هەر ئوممەتێك لە پێش مندا مەگەر لەنێو ئەو ئوممەتەدا یاریدەدەرو پشتگیریو هاوەڵی بوون کە بەردەوام سونەتو ڕێبازی ئەو پێغەمبەرەیان جێبەجێ کردووە، پاشان کۆمەڵێك جێنشین بەدوای ئەواندا هاتوون ئەوەی کە دەیانگوت جێبەجێیان نەدەکرد، وە کارو ڕەفتاریکیش کەدەیان کرد فەرمانیان پێ نەکرابوو بیکەن، جاهەر کەس بەدەست جیهادیان لە دژ بکات ئەوە باوەڕدارە، و هەر کەسیش بەدڵ جیهادیان لەدژ بکات ئەوە باوەڕدارە، بەڵام لەدوای ئەو سێ قۆناغەوە بەدەست یان بەزمانو دڵ بەئەندازەی دەنکە خەرتەلەیەك ئیمان لەدڵیدا نەماوە نامێنێت.**

٢٠٧- مثل القائم على حدود الله والمدهن فيها كمثل قوم استهموا على سفينة في البحر فأصاب بعضهم أعلاها وأصاب بعضهم أسفلها فكان الذين في أسفلها إذا استقوا من الماء مروا على من فوقهم فقال الذين في أعلاها لا ندعكم تصعدون فتؤذونا فقالوا لو أنا خرقنا في نصيبنا خرقا ولم نؤذ من فوقنا فإن يتركوهم وما أرادوا هلكوا جميعا وإن أخذوا على أيديهم نجوا ونجوا جميعا .

(صحيح) ( حم خ ت ) عن النعمان بن بشير (الصحيحة ٦٩)

**٢٠٧- نمونەی ئەو کەسەی پارێزگاری لە فەرمانو سنورەکانی پەروەردگار دەکات وە ئەوەش کە ڕیابازەو لە بەر دڵ وترسی خەڵك بێ دەنگ دەبێت لە ئاست خراپەکاری وەك نمونەی ئەو کۆمەڵە خەڵکە وایە کە لەناو دەریایەکدا سواری کەشتیەك بوون هەندێکیان لە قاتی سەرەوەو ئەوانی تریش لەخوارەوە جا ئەوانەی کە لەخوارەوەن کاتێ بیانەوێت ئاو بخۆنەوە دەبێت بێنە شوێنی ئەمانەی سەرەوەو ئەزیەتیان بدەن، بۆیە ئەمانەی سەرەوە دەڵێن ڕێگاتان پێ نادەین سەرکەونە لای ئێمەو ئازارمان بدەن، جاگەر ئەوانەی خوارەوەش بڵێن کەواتە با لە ئاستی خۆمان کونێك بکەینە کەشتیەکە و ئازاری ئەوان نەدەین ئەو جا بێگومان گەر ئەوانەی سەرەوە بێدەنگ بنو وازیان لێبهێنن کەشتیەکە کون بکەن هەموویان پێکەوە دەخنکێن، بەڵام گەر دەستیان بگرنو بەرگریان لێ بکەن هەموویان پێکەوە رزگاریان دەبێت.**

٢٠٨- مروا بالمعروف وانهوا عن المنكر قبل أن تدعوا فلا يستجاب لكم.

(صحيح) ( ه ) عن عائشة. (الترغيب ٢٣٢٥)

**٢٠٨- فەرمان بکەن بە چاکەو بەرهەڵستی خراپەش بکەن پێش ئەوەی داوا و نزا لە خوا بکەن چونکە ئەویش وەڵامتتان نەداتەوە.**

٢٠٩- من رأى منكم منكرا فليغيره بيده فإن لم يستطع فبلسانه فإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الإيمان .

(صحيح) ( حم م ٤ ) عن أبي سعيد (صحيح أبي داود ١٠٣٤)

**٢٠٩- هەرکەس لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بەدەستو بازو بیگۆڕێت گەر بۆی نەکرا با بەزمان بیگۆڕێت گەر نەیتوانی با بەدڵ رقی لێی بێت و دژایەتی بکات، هەر چەندە دژایەتی کردن بەدڵ وتەنها پێناخۆش بوون لاوازترین پلەی ئیمانە.**

٢١٠- و الذي نفسي بيده لتأمرن بالمعروف ولتنهون عن المنكر أو ليوشكن الله أن يبعث عليكم عقابا من عنده ثم لتدعنه فلا يستجيب لكم..

(صحيح) ( حم ت ) عن حذيفة. (المشكاة ٥١٤٠)

**٢١٠- سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەسە دەبێت فەرمان بە چاكە بكەن و قەدەغەی خراپە بكەن ئەگەر نا نزیكە خوای گەورە بەڵاو سزایەك دابەزێنێت بەسەرتاندا ئەو كات دۆعاش بكەن وەڵامتان ناداتەوە.**

٢١١- و الله لأن يهدى بهداك واحد خير لك من حمر النعم .

(صحيح) ( د ) عن سهل بن سعد. (المشكاة ٦٠٨٠)

**٢١١- سوێند بەخوای گەورە گەر بەهەوڵو كرداری تۆ پەروەردگار رێنوێنی یەك كەس بدات بۆ تۆ زۆر باشترە لە رەوە وشتری سور.**

٢١٢- لا ينبغي لمؤمن أن يذل نفسه يتعرض للبلاء لما لا يطيق .

(صحيح) ( حم ت ه ) عن حذيفة. (الصحيحة ٦١٥)

**٢١٢- ناگونجێ ونەشیاوە بۆهیچ باوەردارێك خۆی تووشی زەلیلی بكات بەوەی شان بداتە ژێر ئیشو كارو گرفتێك كەلە كێشو توانای خۆیدا نەبێت.**

## بابەتی وەسوەسەو دوو دڵی

٢١٣- إن أحدكم يأتيه الشيطان فيقول من خلقك فيقول الله فيقول فمن خلق الله فإذا وجد ذلك أحدكم فليقل آمنت بالله ورسوله فإن ذلك يذهب عنه .

(صحيح) ( حم ) عن عائشة . (الصحيحة ١١٦)

**٢١٣- شەیتان دێتە لای یەكێك لە ئێوەو پێی دەڵێت :كێ تۆی دروست كردووە؟ ئەمیش دەڵێت: خوا( جلا جلاله ) شەیتانیش دەڵێت: ئەی كێ خوای دروست كردووە؟ جاهەر كەس لە ئێوە شتی وای بۆ دروست بوو با بڵێ: ( ئیمانم بەخواو پێغەمبەرەكەی هەیە چونكە بەم ووتەیە ئەو وەسوەسەو دوو دڵییە دەڕوات ).**

٢١٤- إن الشيطان يأتي أحدكم فيقول من خلق السماء فيقول الله فيقول من خلق الأرض فيقول الله فيقول من خلق الله فإذا وجد ذلك أحدكم فليقل آمنت بالله ورسوله .

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ١١٦)

**٢١٤- بێگومان شەیتان دێتە لای یەکێکتان و پێی دەڵێت: کێ ئاسمانی دروست کردووە؟ ئەمیش دەڵێت: خوا ( جل جلاله ) ، دەڵێت: کێ زەوی دروست کردووە؟ ئەمیش دەڵێت ( خوا جل جلاله ) دەڵێت : ئەی کێ خوای دروست کردووە؟ جا هەر کەس لە ئێوە شتی وای بینی با بڵێ : باوەڕم بەخواو پێغەمبەرانی هەیە.**

٢١٥- إن الشيطان يأتي أحدكم فيقول من خلقك فيقول الله فيقول فمن خلق الله فإذا وجد أحدكم ذلك فليقل آمنت بالله ورسله فإن ذلك يذهب عنه .

(صحيح) ( ابن أبي الدنيا في مكايد الشيطان ) عن عائشة . (الصحيحة ١١٦)

**٢١٥-بێگومان شەیتان دێتە لای یەکێکتان و دەڵێ: کێ دروستی کردووی؟ ئەمیش دەڵێ خوا( جل جلاله ) دەڵێت: ئەی کێ خوای دروست کردووە؟ جاهەر کەس لە ئێوە شتی وای بۆ دروست بوو با بڵێ: باوەڕم بەخوداو پێغەمبەرانی هەیە، بەم ووتەیە ئەو وەسوەسەیە دەڕوات.**

٢١٦- تفكروا في آلاء الله ولا تفكروا في الله .

(صحيح) ( أبو الشيخ طس عد هب ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١٧٨٨)

**٢١٦- هەمیشە بیر لە بەهرەکانی خوا بکەنەوە نەك بیر لە خودی پەروەردگار.**

٢١٧- تفكروا في خلق الله ولا تفكروا في الله .

(صحيح) ( حل ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٧٨٨)

**٢١٧- بیر لە دروستکراوەکانی خودا بکەنەوە نەك بیر لە خودی پەروەردگار.**

٢١٨- قال الله تعالى إن أمتك لا يزالون يقولون ما كذا ما كذا حتى يقولوا هذا الله خلق الخلق فمن خلق الله تعالى.

(صحيح) ( حم م ) عن أنس. (المشكاة ٧٦)

**٢١٨- خوای پەروەردگار ئەفەرموێت: ئەی محمد( ﷺ )بەڕاستی ئوممەتەکەت بەردەوام دەڵێن: ئەوە فلانە شت چۆنەو چییە؟ فلانە شتی تر چۆن چۆنییە؟ هەتا دەڵێن ئەوە پەروەردگارە بوونەوەری دروست کردووە ئەی کێ پەروەردگاری دروست کردووە؟**

٢١٩- لن يبرح الناس يتساءلون هذا الله خالق كل شيء فمن خلق الله .

(صحيح) ( خ ) عن أنس. (المشكاة ٧٦)

**٢١٩- خەڵك کۆڵ نادەن بەردەوام پرسیار دەکەن: ئەوە خوای مەزنەو بەدیهێنەری هەموو شتێکە ئەی کێ خوای دروست کردووە.**

٢٢٠- من وجد من هذا الوسواس فليقل آمنا بالله ورسوله ( ثلاثا ) فإن ذلك يذهب عنه .

( ابن السني ) عن عائشة (الصحيحة ١١٦)

**٢٢٠- هەر كەس لەو وەسوەسانەی بۆ پەیدابوون با بڵێ: بڕوامان بەخواو پێغەمبەرەكەی هەیە بێگومان ئەوكات رزگاری دەبێت لەو دوو دڵیە.**

٢٢١- لا يزال الناس يتساءلون حتى يقال هذا خلق الله الخلق فمن خلق الله فمن وجد من ذلك شيئا فليقل آمنت بالله ورسوله .

(صحيح) ( م د ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١١٦)

**٢٢١- بەردەوام خەڵك لە نێوخۆیاندا پرسیار لەیەك دەكەن هەتا دەگوترێ : ئەوە خوای مەزنە بوونەوەری دروست كردووە ئەی كێ خوای دروست كردووە. جا هەر كەس شتی وای بۆ دروست بوو با بڵێ (باوەڕم بە خوای مەزن و پێغەمبەرەكەی هەیە.**

٢٢٢- يأتي الشيطان أحدكم فيقول من خلق كذا من خلق كذا حتى يقول من خلق ربك فإذا بلغه فليستعذ بالله ولينته.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١١٧)

**٢٢٢- شەیتان دێتەلای یەكێكتان و دەڵێت: كێ ئەو شتەی دروست كردووە؟كێ ئەو شتەی تری دروست كردووە؟ هەتا دەڵێت: ئەی كێ پەروەردگار تۆی دروست كردوە؟ جاهەر كەس حاڵەتی وای بۆ دروست بوو با پەنا بگرێت لە پەروەردگارو وازبهێنێ.**

٢٢٣- يوشك الناس يتساءلون حتى يقول قائلهم هذا الله خلق الخلق فمن خلق الله فإذا قالوا ذلك فقولوا { الله أحد الله الصمد لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفوا أحد } ثم ليتفل عن يساره ثلاثا وليستعذ من الشيطان .

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١١٨)

**٢٢٣- نزیكە خەڵك لەنێو خۆیاندا پرسیار لە یەكتر بكەن هەتا یەكێكیان دەڵێت: ئەوە خوای گەورەیە بوونەوەری دروست كردووە، ئەی كێ خوای دروستكردووە؟ جاهەر كات وایان گوت ئێوەش بڵێن( الله أحد ، الله الصمد، لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفوا أحد ) واتە ئەوە خوای تاك وتەنیایە، ئەو خوایەی بێ نیازو جێی نیازو ئومێدە، كەسی لێ نەبووەو لەكەس نەبووەو هەرگیز هیچ كەس هاوشێوەو هاوتای نییە، پاشتریش باسێ جار تف لەلای چەپی بكات و پەنا لەخوا بگرێت لە شەیتان.**




## بابەتى پلەوپايەى فێربوونى زانستو پلەوپايەو ڕێزى زاناو فێرخواز

٢٢٤- أربع من عمل الأحياء تجري للأموات رجل ترك عقبا صالحا يدعو له ينفعه دعاؤهم ورجل تصدق بصدقة جارية من بعده له أجرها ما جرت بعده ورجل علم علما فعمل به من بعده له مثل أجر من عمل به من غير أن ينقص من أجر من يعمل به شيء .

(صحيح) ( طب ) عن سلمان . (الصحيحة ٣٩٨٤)

**٢٢٤- لە ئيشو كارى خەڵكانى زيندوو چوار كردەوە هەيە خێرو پاداشتى دەگاتە مردووەكان: كەسێك نەوەيەكى صالح لەدواى خۆى بەجێبهێڵێتو ئەويش نزايى خێرى بۆ بكات، وە كەسێك ماڵێك ببەخشێتو بەردەوامى هەبێت لەدواى مردنى، هەتا ئەو شتە بمێنێتەوە خێرو پاداشت بۆ خاوەنەكەى دەچێت، وە كەسێك زانستێ فێرى خەڵك بكاتو پاش خۆى ئەو زانستە بلاو بێتەوە، چەند كەس ئيشى پێ بكاتو پاداشت وەرگرێت لەسەرى ئەويش وەك ئەوان پاداشتى بۆ دەڕوات بێ ئەوەى هيچ لە پاداشتى ئەمان كەم بكاتەوە.**

٢٢٥- إن الله أوحى إلي أنه من سلك مسلكا في طلب العلم سهلت له طريق الجنة ومن سلبت كريمتيه أثبته عليهما الجنة وفضل في علم خير من فضل في عبادة وملاك الدين الورع .

(صحيح) ( هب ) عن عائشة . (المشكاة ٢٥٥)

**٢٢٥- خواى گەورە نيگاى بۆ كردم و ئاگادارى كردمەوە كە : هەر كەس ڕێگايەك لە ڕێگاكانى بەدەست هێنانى زانست بگرێتە بەر خواى گەورە ڕێگاى بەهەشتى بۆ ئاسان دەكات و هەركەس چاوى لە دەستدا لە جياتيان بەهەشتومردەگرێت و پلەو پايەى زانست بەرزتروو خێرترە لە پلەوپايەى خواپەرستى، كۆڵەكەو پوختەو كرۆكى دين خۆگرتنەوە و سڵەمينەوەيە لە گوناه و تاوان.**

٢٢٦- إذا مات الإنسان انقطع عمله إلا من ثلاث صدقة جارية أو علم ينتفع به أو ولد صالح يدعو له .

(صحيح) ( خد م ٣ ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٥٨٠)

**٢٢٦- بەمردنى مرۆڤ كردەوەكانى كۆتايى دێت تەنها لە سێ شت نەبێت بەخشینو خێرێكى بەردەوام[1] یا زانستو زانیاریەكى كە سودى لێ ببینرێت[2] یاخود نەوەو منداڵێكى چاك نزاى خێرى بۆ بكات.**

٢٢٧- إن الله لم يبعثني معنتا ولا متعنتا ولكن بعثني معلما ميسرا .

(صحيح) ( م ) عن عائشة . (المشكاة ٣٢٤٩)

**٢٢٧- خواى گەورە منى نەناردووە ببمە نەگبەتى بۆ خەڵك یو دینیان لەسەر قورس و نارەحەت بكەم بەڵكو منى ناردووە كە مامۆستاو ئاسانكار بم.**

٢٢٨-إن الله وملائكته حتى النملة في جحرها وحتى الحوت في البحر ليصلون على معلم الناس الخير.

(صحيح) ( طب الضياء ) عن أبي أمامة . (الترغيب ٨١)

**٢٢٨- بە راستى خواى گەورە و فریشتەكانى، تەنانەت مێروو لە هێلانەو كونى خۆیدا و نەهەنگ(ماسیش ) لەنێو دەریادا هەموویان بەزەیى و نزا دەنێرن بۆ ئەو كەسەى مامۆستاو فێركارى چاكەى خەڵكە.**

٢٢٩- إن الله تعالى يبغض كل عالم بالدنيا جاهل بالآخرة .

(صحيح) ( ك في تاريخه ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٩٥)

**٢٢٩- بەراستى خواى گەورە هەموو كەسێكى زانا بەدونیاو نەزانو بێ ئاگا لە رۆژى دوایى رق لێ یە.**

٢٣٠- إن الملائكة لتضع أجنحتها لطالب العلم رضا بما يطلب

(صحيح) ( الطيالسي ) عن صفوان بن عسال . (الترغيب ٨٥)

**٢٣٠- بێگومان فریشتە هەمیشە باڵ رادەخەن بۆ ئەوانەى بە شوێن زانستدا دەگەڕێن لە رێزو خۆشەویستیاندا بۆ فێرخوازى.**

---

[1] مەبەست لێ ى دروست كردنى مزگەوتە، یا قوتابخانە و پرد و نەخۆشخانە و.....هتد.

[2] مەبەست لێ ى نوسینى كتێبى بەكەڵك و پێگەیاندنى خەڵكى چاك كەخزمەت بەدین و پێشكەوتن و رەوشى كۆمەڵگا بكات.

٢٣١- إنما العلم بالتعلم وإنما الحلم بالتحلم ومن يتحر الخير يعطه ومن يتق الشر يوقه .

(صحيح) ( الدارقطني في الأفراد خط ) عن أبي هريرة ( خط ) عن أبي الدرداء . (الصحيحة ٣٤٢)

**٢٣١- بەدەست هێنانی زانست تەنها بەفێربوون و خوێندنێتی، وە بە دەستهێنانی نەرم ونیانی و ئارامی بە خۆرازاندنەوەیە پێی ، هەر کەسیش بەدوای خێر وچاکەدا بگەڕێ پێی دەبەخشرێت، وهەر کەس خۆی لە خراپەکاری و شەڕ بەدوور بگرێت دەپارێزێ لێی.**

٢٣٢- خير ما يخلف الإنسان بعده ثلاث ولد صالح يدعو له وصدقة تجري يبلغه أجرها وعلم ينتفع به من بعده.

(صحيح) ( ه حب ) عن أبي قتادة . (الإرواء ١٠٧٩)

**٢٣٢- باشترین شتێ کە مرۆڤ لە پاش خۆی بەجێی دەهێڵێت سێ شتە: منداڵێکی چاك کە نزای خێری بۆ بکات،و خێرو ماڵ بەخشینێك بمێنێتەوە[1] و زانستێك لە دوای خۆی سودی لێ ببینرێت**

٢٣٣- الخلق كلهم يصلون على معلم الخير حتى نينان[2] البحر .

(صحيح) ( فر ) عن عائشة . (الصحيحة ١٨٥٢)

**٢٣٣- گیانلەبەران هەموویان نزایی خێر دەکەن بۆ ئەوانەی خەڵکی فێری چاکەو سەر راستی دەکەن هەتا نەهەنگەکانیش لەنێو بەحردا.**

٢٣٤- الخير عادة والشر لجاجة ومن يرد الله به خيرا يفقهه في الدين

(صحيح) ( حم ق ) عن معاوية ( حم ت ) عن ابن عباس ( ه ) عن أبي هريرة (الصحيحة ٦٥١)

**٢٣٤- خێرو چاکەخوازی سروشتی پاکی مرۆڤە و شەڕ و خراپەکاریش سەرکەشی بوون و ملەجەڕێ کردنە، وە هەر کەس خوای گەورە بیەوێت خێری بۆی بوێ لەدین شارەزای دەکات.**

٢٣٥- الدنيا ملعونة ملعون ما فيها إلا ذكر الله وما والاه وعالما أو متعلما .

(صحيح) ( ت ه ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٢٧٩٧)

**٢٣٥- دونیا نەفرەت لێکراوە ئەو شتانەش کە تێدایەتی هەر نەفرەت لێکراون تەنها یادی خودا نەبێت ئەوەی لە ڕەزامەندی ئەودا بەسەر ببرێت، هەروەها کەسی زانا و فێرخواز.**

---

[1] ( مەبەست لێی دروستکردنی مزگەوت ، نەخۆشخانە، پرد...هتد) وە زانستو زانیاریەك سوود بە خەڵکی بگەیەنێت لە پاش خۆی)

[2] ( نینان: جەمعی ( نون )ە کە بە واتای ( جوتە، نەهەنگە، فیلەتەن. السراج المنير ج١ ص٧٦ )

٢٣٦- سبع يجري للعبد أجرهن وهو في قبره بعد موته من علم علما أو أجرى نهرا أو حفر بئرا أو غرس نخلا أو بنى مسجدا أو ورث مصحفا أو ترك ولدا يستغفر له بعد موته .

(صحيح) ( البزار سمويه ) عن أنس (الترغيب ٧٣)

**٢٣٦- حەوت شت هەن لە پاش مردنی خاوەنەکەی کە لە گۆردایە وپاداشتیان بەردەوام بۆی دەچێت زانستێکی فێری خەڵکی کردبێت، یا جۆگاو رووبارێکی ئاوی راکێشا بێت، یا بیرێکی ئاوی هەڵکەند بێت یان دارخورمایەکی ناشتبێت، یا مزگەوتێکی دروست کردبێ یا قورئانێکی بەجێهێشت بێت، یامنداڵێکی چاکی هەبێتو نزای خێری بۆ بکات لە پاش مردنی.**

٢٣٧- سلوا الله علما نافعا وتعوذوا بالله من علم لا ينفع .

(صحيح) ( ه حب ) عن جابر. (الصحيحة ١٥١١)

**٢٣٧- داوای زانستی بەکەڵك لە خوا بکەن و پەنا بگرن بە خوا لە زانستێك سوود نەبەخشێت.**

٢٣٨- سيأتيكم أقوام يطلبون العلم فإذا رأيتموهم فقولوا لهم مرحبا بوصية رسول الله وأفتوهم.

(صحيح) ( ه ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٢٨٠)

**٢٣٨- لەمەو دوا کەسانێك لەناوتاندا پەیدا دەبن بەدوای فێربوونی زانستدا دەگەرێن، جا ئەگەر بینیتان پێیان بڵێن:مەرحەبا لە میراتگرەکانی پێغەمبەر خوا( ﷺ )و پرسیاریان لێ بکەن و داوای فەتوایان لێ بکەن.**

٢٣٩- صاحب العلم يستغفر له كل شيء حتى الحوت في البحر .

(صحيح) ( ع ) عن أنس. (الصحيحة ٣٠٢٤)

**٢٣٩- خاوەن زانست و زانیاری هەموو شت نزای خێرو داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن هەتا نەهەنگیش( ماسیش ) لە نێو دەریادا.**

٢٤٠- طلب العلم فريضة على كل مسلم .

(صحيح) ( عد هب ) عن أنس ( طص خط ) عن الحسين بن علي ( طس ) عن ابن عباس (تمام) عن ابن عمر ( طب ) عن ابن مسعود ( خط ) عن علي ( طس هب ) عن أبي سعيد. (المشكاة ٨٦)

**٢٤٠- بەشوێن زانستو زانیاریدا گەران ئەرکە لەسەر هەموو موسڵمانێك[1] .**

---

[1] **وەك فێربوونی زانستی یەکتاپەرستی خوا ( التوحيد ) وە زانستی فێربوونی نوێژ.**

٢٤١-طلب العلم فريضة على كل مسلم وإن طالب العلم يستغفر له كل شيء حتى الحيتان في البحر.
(صحيح) ( ابن عبدالبر في العلم ) عن أنس (المشكاة ٨٦)

**٢٤١- بەشوێن زانستا گەران لەسەر هەموو موسڵمانێك پێویستە ، بە راستی فێرخواز، هەمووو شتێك نزای خێرو لێخۆشبوونی بۆ دەكەن، هەتا نەهەنگەكانی( ماسیەكانی ) نێو دەریاش.**

٢٤٢- علموا ويسروا ولا تعسروا وبشروا ولا تنفروا وإذا غضب أحدكم فليسكت .
(صحيح) ( حم خد ) عن ابن عباس (الصحيحة ١٣٧٥)

**٢٤٢- فێری زانست ببن‌و ئەم دینە بۆ خەڵك ئاسان پیشان بدەن‌و قورسی مەكەن وەهەمیشە موژدە بەخش بن وخەڵكی مەتارێنن‌و پەرتەوازە مەكەن، وە هەر یەك لە ئێوە كاتێك تووڕە بوو با بێ دەنگ بێت.**

٢٤٣- فضل العالم على العابد كفضل القمر ليلة البدر على سائر الكواكب .
(صحيح) ( حل ) عن معاذ (المشكاة ٢١٢)

**٢٤٣-پلەو پایەی زانا بەسەر خواپەرستی نەخوێندەواردا وەكو پلەوپایەی مانگی چواردەوایە بەسەر تەواوی ئەستێرەكاندا.**

٢٤٤- فضل العالم على العابد كفضلي على أدناكم إن الله عز وجل وملائكته وأهل السموات والأرض حتى النملة في جحرها وحتى الحوت ليصلون على معلم الناس الخير .
(صحيح) ( ت ) عن أبي أمامة (المشكاة ٢١٣)

**٢٤٤- پلەوپایەی زانا بەسەر كەسانی نەخوێندەواردا وەك پلەوپایەی من وایە بەسەر سادە كەس لە ئێوەیە، بێگومان خوای گەورەو فریشتەكان‌و خەڵكی ئاسمانەكان و زەوی و هەتا مێروو لە هێلانەكەیداو حوت لە دەریادا نزای دۆعای خێر بۆ ئەو كەسانە دەكەن كە خەڵك فێری خێرو چاكە دەكەن.**

٢٤٥- فضل العلم أحب إلي من فضل العبادة وخير دينكم الورع .
(صحيح) ( البزار طس ك ) عن حذيفة ( ك ) عن سعد. (الترغيب ٦٨)

**٢٤٥- زانیاری و زانستی زیادم پێ خۆشترە لە خواپەرستی زیاد[1] ، خۆپارێزیش لە شوبهە باشترین حاڵەتی دینداریتانە.**

٢٤٦- ما خرج رجل من بيته يطلب علما إلا سهل الله له طريقا إلى الجنة .

---

[1] فێربونی زیادە چاكترە لە نیش و كردەوەی زیادە،هەروەكو زانستێك پێویست بێت لە پێشترە و باشترە لە نیش و كردەوەی زیادە. السراج المنير ج١ج١ ص٧٨

(صحيح) ( طس ) عن عائشة.

**٢٤٦- هی كەسێك نییە لەماڵی خۆیەوە دەربچێت بە شوێن زانستێكدا بگەڕێت مەگەر خوای گەورە ڕێگایەكی چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەكات.**

٢٤٧- ما من خارج خرج من بيته في طلب العلم إلا وضعت له الملائكة أجنحتها رضا بما يصنع حتى يرجع. (الترغيب ٨٥)

(صحيح) ( حم ه حب ك ) عن صفوان بن عسال.

**٢٤٧- هیچ كەسێك نییە لەماڵ دەرچوو بێت بەمەبەستی فێر بوونی زانست مەگەر فریشتەكان باڵی بەزەییو سۆزی بۆ رادەخەن ، لە رەزامەندیو دڵخۆشیان بەكارەكەی تا دەگەڕێتەوە.**

٢٤٨- ما من رجل يسلك طريقا يطلب فيه علما إلا سهل الله له طريق الجنة ومن أبطأ به عمله لم يسرع به نسبه . (الترغيب ٦٩)

(صحيح) ( د ك ) عن أبي هريرة.

**٢٤٨- هیچ كەسێك نییە ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ فێربوونی زانستێك مەگەر خوای گەورە ڕێگای چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەكات، وە هەر كەس كردەوەكانی بەخاوی و هێواشی بیبات و دوای بخات هەرگیز نەسەبو رەچەڵەكی پێشی ناخات.**

٢٤٩- مثل العالم الذي يعلم الناس الخير وينسى نفسه كمثل السراج يضيء للناس ويحرق نفسه.

(صحيح) ( طب الضياء ) عن جندب (اقتضاء العلم ٧٠)

**٢٤٩- نمونەی ئەو زانایەی كە خەڵك فێری چاكە دەكاتو خۆی لەیاد دەكات وەك چرایەك وایە كە ڕووناكی دەدات بەخەڵك بەڵام خۆی دەسوتێنێت.**

٢٥٠- مثل الذي يعلم الناس الخير وينسى نفسه مثل الفتيلة تضيء للناس وتحرق نفسها .

(صحيح) ( طب ) عن أبي برزة وجندب (الترغيب ١٣٠)

**٢٥٠- نمونەی ئەو كەسەی خەڵك فێری خێر و چاكە دەكات و خۆی لە یاد دەكات وەك فتیلەی چرا وایە كە ڕووناكی دەداتە خەڵك و خۆی دەسوتێنێت.**

٢٥١- مثل ما بعثني الله به من الهدى والعلم كمثل الغيث الكثير أصاب أرضا فكان منها نقية قبلت الماء فأنبتت الكلأ والعشب الكثير وكانت منها أجادب أمسكت الماء فنفع الله بها الناس شربوا منها وسقوا ورعوا وأصاب طائفة منها أخرى إنما هي قيعان لا تمسك ماء ولا

تنبت كلأ فذلكم مثل من فقه في دين الله ونفعه ما بعثني الله به فعلم وعلم ومثل من لم يرفع بذلك رأسا ولم يقبل هدى الله الذي أرسلت به .

(صحيح) ( ق ) عن أبي موسى. (المشكاة ١٥٠)

**٢٥١- نمونەی ئەوەی خوا بە مندا رەوانەی کردەوە لە رێنوێنی وزانست وەك نمونەی بارانێکی زۆری بەقەدر وایە کە برژێ بەسەر زەویەکدا جا ئەوەی بە پیتە جوان ئاوەکە هەڵدەمژێتو گیاو لەوەڕی باشی پێ دەروێت، یان برژێت بەسەر زەویەکی گرۆکدا ئاوەکە لەخۆی بگرێتو کۆی کاتەوە، خوای گەورە سوودی پێ بگەیەنێت بۆ خەڵك لە خواردنەوەو مەڕو ماڵات پێ ئاودانو کشتوکاڵ پێ کردن بەکاری بهێنن، هەندێ جاریش ئەو بارانە بەر زەویەکی تەختو ساف دەکەوێت نە گژو گیاو لەوەڕگا دەڕوێنێت وە نە ئاوەکەش هەڵدەگرێت و کۆی دەکاتەوە جا نمونەی یەکەمو دووەم نمونەی کەسێکە لەدینی خوا چاك شارەزا بێتو بیگەیەنێتە خەڵكو سوود پێ بگەیەنێت پێیان واتە ئەو ڕێ روونیو زانیاریەی کەخوای گەورە بۆی ناردووم ئەو کەسە خۆی لێی تێگەشتووەو فێر بووەو خەڵکیش فێر دەکات، وە نمونەی سێیەمیش (زەوی تەختو ساف) نمونەی کەسێکە هیچ لەدین حاڵی نەبووبێتو پێی بەهرەمەندو سەربەرز بوبێت چونکە ئەو ڕێنمونیەی کە بۆمن هاتووە وەرێنەگرتووە.**

٢٥٢- معلم الخير يستغفر له كل شيء حتى الحيتان في البحر .

(صحيح) ( طس ) عن جابر ( البزار ) عن عائشة. (الترغيب ٨٢)

**٢٥٢- فێرکاری خێرو چاکە لەناو خەڵکدا، هەموو دروستکراوەکان داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەن هەتا نەهەنگی( ماسیش )ی نێو دەریاکانیش.**

٢٥٣- من جاء مسجدي هذا لم يأته إلا لخير يتعلمه أو يعلمه فهو في منزلة المجاهد في سبيل الله ومن جاءه لغير ذلك فهو بمنزلة الرجل ينظر إلى متاع غيره .

(صحيح) ( ه ك ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٨٧)

**٢٥٣- هەر کەسێك هاتبێتە ئەم مزگەوتەی من و تەنها بۆ فێربوونی خێرو چاکە یاخود فێرکردنی خەڵك هاتبیت ،ڕێزی ئەو کەسە لە پلەو پایەی ئەو موجاهیدەدایە کە لە پێناوی خوادا خەبات دەکات بەڵام هەر کەسێك بۆ ئەو مەبەستە خێرە نەهاتبێت ئەوە وەك ئەو کەسە وایە سەیری کەل وپەلی خەڵکی بکات.**

٢٥٤- من خرج في طلب العلم فهو في سبيل الله حتى يرجع .

(صحيح) ( ت الضياء ) عن أنس (الترغيب ٨٨)

**٢٥٤- هەر كەس لە پێناوی فێربوونی زانستا لەماڵ دەربچێت وەك ئەو كەسە وایە لە پێناوی خوادا بۆ جیهاد دەرچوو بێت تا دەگەڕێتەوە.**

٢٥٥- من سلك طريقا يطلب فيه علما سلك الله به طريقا من طرق الجنة وإن الملائكة لتضع أجنحتها لطالب العلم رضا بما يصنع وإن العالم ليستغفر له من في السموات ومن في الأرض والحيتان في جوف الماء وإن فضل العالم على العابد كفضل القمر ليلة البدر على سائر الكواكب وإن العلماء ورثة الأنبياء وإن الأنبياء لم يورثوا دينارا ولا درهما إنما ورثوا العلم فمن أخذه أخذ بحظ وافر .

(صحيح) ( حم ٤ حب ) عن أبي الدرداء. (الترغيب ٧٠)

**٢٥٥- هەر كەس ڕێگایەك بگرێتە بەر و تێیدا بەشوێن زانستدا بەگەڕێت خوای گەورە ئەو كەسە بەڕێگایەك لەڕێگاكانی بەهەشتدا دەبات وە بێگومان فریشتە باڵەكانی ڕادەخات بۆ ئەو كەسەی بەدوای فێربوونی زانستا دەگەڕێت وەك دەربەرینی ڕەزامەندی بۆ ئەو كارەی دەیكات، و بەڕاستی هەر چی لە ئاسمانەكان و زەوی و ماسی نێو دەریاكان هەیە داوای لێخۆشبوون بۆ زانا دەكەن، وە پلە و پایەی كەسانی زانا بەسەر موسڵمانانی نەخوێندەوارەوە وەك پلەو پایەی مانگی چواردە وایە بەسەر ئەستێرەكانی تردا، و بەڕاستی زاناكان میراتگری پێغەمبەرانن، بێگومان پێغەمبەرەكان -سەلامی خوایان لێبێت- لە پاش خۆیان درهەم و دیناریان بەجێ نەهێشتووە بەڵكو زانستیان بەجێهێشتووە ، جا هەر كەس ئەو زانستەی وەرگرتبێت بەڕاستی بەشێكی چاك و باشی وەرگرتووە.**

٢٥٦- من سلك طريقا يلتمس فيه علما سهل الله له طريقا إلى الجنة .

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة (الترغيب ٦٩)

**٢٥٦- هەر كەس ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ فێربوونی زانستێك خوای گەورە ڕێگای چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەكات.**

٢٥٧- من علم علما فله أجر من عمل به لا ينقص من أجر العامل .

(صحيح) ( ه ) عن معاذ بن أنس (الترغيب ٨٠)

**٢٥٧- هەر كەس زانستێك فێرى خەڵك بكات و پاشتر فێربووەكان ئيشى پێ بكەن پاداشت بۆ ئەم دەنوسرێت بێ ئەوەى هيچ لە پاداشتى ئەوەى ئيشى پێ كردووە كەم بكاتەوە.**

٢٥٨- من نفس عن مؤمن كربة من كرب الدنيا نفس الله عنه كربة من كرب يوم القيامة و من يسر على معسر يسر الله عليه في الدنيا و الآخرة و من ستر مسلما ستره الله في الدنيا و الآخرة و الله في عون العبد ما كان العبد في عون أخيه و من سلك طريقا يلتمس فيه علما سهل الله له طريقا إلى الجنة و ما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله يتلون كتاب الله و يتدارسونه بينهم إلا نزلت عليهم السكينة و غشيتهم الرحمة و حفتهم الملائكة و ذكرهم الله فيمن عنده و من أبطأ به عمله لم يسرع به نسبه.

( حم م د ت ه ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٦٩)

**٢٥٨- هەر كەس تەنگانە و ناخۆشيەك لەسەر باوەردارێك لەدونيادا لابەرێت خواى گەورە لەرۆژى قيامەتدا گرفت و تەنگانەيەك لەسەر ئەو لادەبات وە هەر كەسێ هاوكارى نەدارو كەم دەستێ بكات خواى گەورە لە دونياو دوا رۆژدا هاوكارىو كارئاسانى بۆ دەكات و هەركەسێ كەم و كورى موسڵمانێ داپۆشێ خواى گەورە لە دونياو دوارۆژدا عەيبەكانى ئەو دادەپۆشێ، خواى گەورەش هەميشە ياريدەدەرو پشتگيرى ئەو بەندەيە دەكات كە هاوكارو پشتگيرى براكەى دەكات، وەهەر كەس رێگايەك بگرێتە بەر بۆ فێر بوونى زانستێك خواى گەورە رێگايەكى چوونە بەهەشتى بۆ ئاسان دەكات، وە هيچ كۆمەڵو تاقميك نى يە لەماڵێك لە ماڵەكانى خوادا-جل جلالە- كۆببنەوەو قورئان بخوێننو راڤەى بكەن لەنێو خۆياندا بێگومان دڵ ئارامى و رەحمەتى پەروەردگار دايان دەپۆشێتو فريشتەكان دەوريان دەدەنو خواى گەورەش بەخێرو چاكە باسيان دەكات، وە هەر كەس كردەوەكانى دواى بخات هەرگيز رەچەڵەكو نەسەبى پێشى ناخات.**

٢٥٩- من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين .

(صحيح) ( حم خ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١١٩٤)

**٢٥٩- هەركەسێ خواى گەورە ويستيى خێرى پێى هەبێت شارەزاى دەكات لە ئيسلام وتێى دەگەيەنێت.**

٢٦٠- من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين وإنما أنا قاسم والله يعطي ولن تزال هذه الأمة قائمة على أمر الله لا يضرهم من خالفهم حتى يأتي أمر الله عز وجل .

(صحيح) ( حم ق ) عن معاوية. (الصحيحة ١١٩٥)

**٢٦٠- هەر کەس خوای گەورە ویستی خێری پێی هەبێت تێگەشتنی لەدین بۆ پێدەدات، من تەنها ( دابەشکەری ) ماڵو داهاتم خوای گەورە دەییەخشێت وە بەردەوام ئەم ئوممەتە راوەستاو دەبێت لەسەر دینی خواوە ئەوانەی پێچەوانەی ئەمان دەجوڵێنەوە هەرگیز ناتوانن زیانیان پێ بگەیەنن هەتا ئەو رۆژەی دونیا مابێتو بریاری پەروەردگار دەردەچێت بە کۆتایی هاتنی دونیا.**

٢٦١- منهومان لا يشبعان طالب علم وطالب دنيا .

(صحيح) ( عد ) عن أنس ( البزار ) عن ابن عباس. (المشكاة ٢٦٠)

**٢٦١- دوو چین چینی هەڵپەکار هەن هەرگیز تێر نابن، زانست خوازو دونیا ویست.**

## بابەتی ئاگادارکردنەوەی فێرخوازی بۆ غەیری خوا

٢٦٢-من ابتغى العلم ليباهي به العلماء أو يماري به السفهاء أو تقبل أفئدة الناس إليه فإلى النار.

(صحيح) ( ك هب ) عن كعب بن مالك. (المشكاة ٢٢٥)

**٢٦٢- هەر کەس بەدوای زانستو زانیاریدابگەڕێ بەمەبەستی ئەوەی شانازی بکات بەسەر زاناياندا و بەرەنگاریان بێتەوە یان مشت و مڕو دەمەدەمێ ی پێ بکات لەگەڵ نەزاناندا یان دڵی خەڵکی پێ راکێشێت بۆلای خۆی ئەوە بەرەو دۆزەخ دەڕوات.**

٢٦٣- من تعلم العلم ليباهي به العلماء أو يماري به السفهاء أو يصرف به وجوه الناس إليه أدخله الله جهنم .

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة. (اقتضاء العلم ١٠٢)

**٢٦٣- هەرکەسێ زانست و زانیاری فێر بێت بەمەبەستی ئەوەی خۆی پێ هەڵکێشێ و شانازی بکات بەسەر زاناياندا و بەرامبەریان بوەستێت، یان مشت و مڕو دەمەدەمێ ی پێ بکات لەگەڵ نەزاناندا، یان ڕووی خەڵکی پێ وەرگێڕێ بۆ لای خۆی، ئەوە خوای گەورە دەیخاتە دۆزەخەوە.**

٢٦٤- من تعلم علما مما يبتغى به وجه الله لا يتعلمه إلا ليصيب به عوضا من الدنيا لم يجد عرف الجنة يوم القيامة.

(صحيح) ( حم د ه ك ) عن أبي هريرة. (اقتضاء العلم ١٠٢)

**٢٦٤- هەر کەسێ فێری زانستێك ببێت لەو زانستانەی کە بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە بەکاردێن بەڵام ئەم خۆی فێر بکات بە مەبەستی هەندێ دەستکەوتی دونیایی ئەوە بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا بۆنی بەهەشت ناکات.**

٢٦٥- من طلب العلم ليباهي به العلماء أو ليماري به السفهاء أو ليصرف به وجوه الناس إليه فهو في النار .

(صحيح) ( ه ) عن ابن عمر. (المشكاة ٢٢٥)

**٢٦٥- هەر کەس بە داوای زانستێکدا بگەڕێت بۆ ئەوەی شانازی پێوە بکات و خۆی پێ هەڵکێشێ بەسەر زانایاندا، یان بۆ مشت و مڕو دەمەدەمێ لەگەڵ نەزانانـدا، یان بۆ وەرچەرخانی ڕووی خەڵك بۆ لای خۆی ئەوە لەدۆزەخدایە.**

٢٦٦- من طلب العلم ليجاري به العلماء أو ليماري به السفهاء أو يصرف به وجوه الناس إليه أدخله الله في النار .

(صحيح) ( ت ) عن كعب بن مالك (المشكاة ٢٢٥)

**٢٦٦- هەر کەس فێری زانستو زانیاری بێت بۆ ئەوەی مشتو مڕی پێ بکات لەگەڵ زانایاندا بۆ خۆ نواندن یا شەرە قسەی پێ بکات و خۆی پێ هەڵنێ بەسەر نەخوێندەوارو نەرانەکاندا یا بۆ ڕاکێشانی سەرنجی خەڵکی بۆلای خۆی ئەوە خوا دەیخاتە نێو ئاگرەوە.**

٢٦٧- لا تعلموا العلم لتباهوا به العلماء أو تماروا به السفهاء ولا لتجترئوا به المجالس فمن فعل ذلك فالنار النار .

(صحيح) ( ه حب ك ) عن جابر. (الترغيب ١٠٧)

**٢٦٧- فێری زانستو زانیاری مەبن بۆ بۆ خۆ هەڵنان و شانازی کردن بەسەر زانایاندا یان بۆ خۆ نواندن بەسەر نەفاماندا یا بۆ ئەوەی سەری مەجلیسەکانی پێ بگرن، هەر کەس وابکات ئەوە دەچێتە دۆزەخ.**

٢٦٨- لا تعلموا العلم لتباهوا به العلماء أو لتماروا به السفهاء أو لتصرفوا به وجوه الناس إليكم فمن فعل ذلك فهو في النار.

(صحيح) ( ه ) عن حذيفة. (الترغيب ١٠٩)

**٢٦٨- فێری زانست و زانیاری مەبن لەپێناوی ئەوەی خۆتانی پێ هەڵكێشن بەسەر زانایاندا، یان مشت و مڕو دەمە دەمی پێ بكەن لەگەڵ نەزانانندا، یان سەرنجی خەڵكی پێ ڕاكێشن بۆ لای خۆتان ، جا هەر كەس وا بكات بێگومان ئەوە لەدۆزەخدایە.**

## بابەتی ڕێزنان لە زانایان

٢٦٩- البركة مع أكابركم .

(صحيح) ( حب حل ك هب ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٧٧٨)

**٢٦٩- فەڕو بەركەت لەگەڵ پیاوە گەورەكانتاندایە[1] .**

٢٧٠- كَبِّرْ كبر .

(صحيح) ( حم ق د ) عن سهل ابن أبي حثمة ( حم ) عن رافع بن خديج (الإرواء ١٦٤٥)

**٢٧٠- با كەسی گەورەت دەست پێ بكات... كەسی گەورە دەست پێ بكات.[2]**

**( واتە پێغەمبەر ڕێنمایمان دەكات كە لە كۆڕو مەجلیسەكانماندا با كەسانی بە تەمەنو زانا لە پێشەوە دەست بە قسە بكەن.**

٢٧١- الكُبْرَ الكُبْرَ.

(صحيح) ( ق د ) عن سهل بن أبي حثمة. (الإرواء ١٦٤٦)

**٢٧١- با لە كەسی گەورەتانەوە دەست بە قسە بكرێت.. لەكەسی گەورەتانەوە.**

٢٧٢- ليس منا من لم يرحم صغيرنا ويوقر كبيرنا.

(صحيح) ( حم ت ك ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٢١٩٦)

**٢٧٢- لە ئێمە نییە كەسێك بەزەیی بە بچوكەكانماندا نەیەتەوەو ڕێز لە گەورەكانمان نەگرێت.**

٢٧٣- ليس منا من لم يجل كبيرنا ويرحم صغيرنا ويعرف لعالمنا حقه .

(صحيح) ( حم ك ) عن عبادة بن الصامت. (الترغيب ١٠١)

---

**[1] ( ئەوانەی خاوەن ئەزموونو دونیا دیەدەنو دامەزراون هەمیشە بە شوێن كاری باش وپاداشتی زۆرەوەن، لەگەڵیان دانیشن تا لێیان بەهرەمەند بن ).**

**[2] ( واتە لە قسەكردندا با گەورە دەست پێ بكات، بەڵام لە ئاوگێران و وێنەی ئەودا لە لای ڕاستەوە دەستپێ دەكات ).**

**٢٧٣- لە ئێمە نییە كەسێك بە ڕێز و شكۆ لە گەورەكانمان نەڕوانێتو بەزەیی بە بچوكەكانماندا نەیەتەوەو مافو ڕێزی زاناكانمان نەزانێت.**

٢٧٤- ليس منا من لم يرحم صغيرنا ويعرف شرف كبيرنا.

(صحيح) ( حم ت ك ) عن ابن عمرو . (الترغيب ١٠٣)

**٢٧٤- لە ئێمە نییە كەسێك بەزەیی بە بچوكەكانماندا نەیەتەوەو گەورەی و ڕێزی گەورەكانمان نەزانێت.**

## بابەتی گێڕانەوەی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)ونوسینەوەیان

٢٧٥- إذا سمعتم الحديث عني تعرفه قلوبكم وتلين له أشعاركم وأبشاركم وترون أنه منكم قريب فأنا أولاكم به وإذا سمعتم الحديث عني تنكره قلوبكم وتنفر منه أشعاركم وأبشاركم وترون أنه بعيد منكم فأنا أبعدكم منه .

(صحيح) ( حم ع ) عن أبي أسيد وأبي حميد . (الصحيحة ٧٣١)

**٢٧٥- كاتێ فەرموودەیەكی من دەبیستن دڵەكانتان وەریدەگرێت وە مووەكانو پێستی لاشەتان بۆی نەرم دەبێتو دەبینن كە ئەو فەرموودەیە لێتانەوە نزیكە، بێگومان من لە پێشترم لە ئێوە لەو فەرمودەیە، وە هەر كاتێ فەرموودەیەكی منتان بیستو دڵەكانتان وەری نەگرتو موو پێستی لاشەتان گرژو بێزار دەبوو لێی وواتان دەبینی كە ئەو فەرمودەیە دوورە لە ئێوەوە، ئەو كات بزانن كەمن دوورترم لە ئێوە لەو فەرمودەیە[1].**

٢٧٦- اكتب فوالذي نفسي بيده ما يخرج منه إلا حق .

(صحيح) ( حم د ك ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ١٥٣٢)

**٢٧٦- بنوسە/ سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە، جگە لە حەق هیچ لەدەمی من نایەتە دەرەوە.**

٢٧٧- إني أحدثكم الحديث فليحدث الحاضر منكم الغائب .

(صحيح) ( طب ) عن عبادة بن الصامت . (الصحيحة ١٧٢١)

---

[1] **(شێخی ئەلبانی لە (صحيح الجامع)دا ئەفەرموێ (ئەی فەرمودەو وتارەی پێغەمبەر (ﷺ). تایبەتە بەهاوەڵانی پێغەمبەر و شارەزایانی بواری فەرموودە (علماء الحديث) چونكە ئەمانیش لەدڵ و دەروون پاكی و شارەزایی لەژیان فەرموودەی پێغەمبەر وەك هاوەڵانن سەلامی خوایان لێ بێت.)**

**٢٧٧- من فەرمودە بەئێوە دەڵێم، جا هەر كەس ئامادە دەبێت با بیگێڕێتەوە بۆ ئەوانەی لێرە نەبوون.**

٢٧٨- تسمعون ويسمع منكم ويسمع ممن يسمع منكم.

(صحيح) ( حم د ك ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٧٨٤)

**٢٧٨- ئێوە فەرمودە دەبیستن‌و خەڵكیش لە ئێوە دەبیستێ‌و خەڵكی تریش لەوانەوە دەبیستن كە لە ئێوەیان بیستوە.**

٢٧٩- قيدوا العلم بالكتاب.

(صحيح) ( الحكيم سمويه ) عن أنس ( طب ك ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٢٠٢٦)

**٢٧٩- زانست ببەستتەوە بە نوسینەوە**[1].

٢٨٠- ليبلغ الشاهد الغائبَ.

(صحيح) ( طب ) عن وابصة.

**٢٨٠- با ئەو كەسانەی ئامادەی وتارو فەرمودەكانم بوون بیگەیەنن بەو كەسانەی ئامادە نەبوون.**

٢٨١- نضر الله امرءا سمع منا حديثا فحفظه حتى يبلغه غيره فرب حامل فقه إلى من هو أفقه ورب حامل فقه ليس بفقيه .

(صحيح) ( ت الضياء ) عن زيد بن ثابت. (الصحيحة ٤٠٣)

**٢٨١- خوای گەورە ڕووی ئەو كەسە سپی بكات كە فەرمودەیەكی لە ئێمەوە بیستوەو جوان لەبەری كردووە تا بیگەیەنێت بەغەیری خۆی، چونكە زۆر كەس كە (فقه) و تێگەشتنێكی لابێت لەوانەی بیگەیەنێت بە كەسێك كە باشترو شارمزاتر بێت لەخۆی‌و زیاتر مانای لێ دەربهێنێت، چونكە هەندێ جار هەڵگری (فقه) و ئەو كەسەی لەبەری كردووە بۆ خۆی لەوانەیە (فقیە) نەبێت و باش لێی تێ نەگات.**

٢٨٢- نضر الله امرءا سمع منا شيئا فبلغه كما سمعه فرب مبلغ أوعى من سامع .

(صحيح) ( حم ت حب ) عن ابن مسعود. (الترغيب ٨٩)

**٢٨٢- خوای گەورە ڕووی ئەو كەسە سپی بكات شتێكی لە من بیستوە چۆن بیستویەتی وەك خۆی ڕای بگەیەنێت، چونكە لەوانەیە ئەو كەسەی پێی ڕادەگەیەنرێت باشتر لێی تێبگات لەوەی كە لەمنەوە بیستویەتی.**

---

[1] (چونكە ئینسان زۆر دەبیستێ‌و ناتوانێ هەمووی لەبەربكات).

٢٨٣- نضر الله عبدا سمع مقالتي فوعاها ثم بلغها عني فرب حامل فقه غير فقيه ورب حامل فقه إلى من هو أفقه منه .

(صحيح) ( حم ه ) عن أنس. (الترغيب ٩١)

**٢٨٣- خوای گەورە ڕووی ئەو کەسە سپی بکات فەرمودەی من دەبیستێت‌و چاك لێی تێ دەگات‌و پاشان دەیگەیەنێت بە خەڵك، لەوانەیە هەڵگری (فقه)و زانستێك بۆ خۆی (لێی تێ نەگات) و زانا نەبێت تیایدا، و ئەگونجێت هەڵگری (فقه) و زانستێك زۆر موحتاج بێت بە کەسێ لەخۆی شارەزاتر بۆی لێك بداتەوە.**

٢٨٤- نضر الله عبدا سمع مقالتي فوعاها وحفظها ثم أداها إلى من لم يسمعها فرب حامل فقه غير فقيه ورب حامل فقه إلى من هو أفقه منه ثلاث لا يغل عليهن قلب امرئ مسلم إخلاص العمل لله والنصح لأئمة المسلمين ولزوم جماعتهم فإن دعوتهم تحوط من وراءهم .

(صحيح) ( حم ه ك ) عن جبير بن مطعم ( د ه ) عن زيد بن ثابت ( ت ه ) عن ابن مسعود. (الترغيب ٨٩)

**٢٨٤- خوای گەورە ڕووی ئەو کەسە سپی بکات فەرمودەی من دەبیستێت‌و چاك لێی تێ دەگات‌و لەبەری دەکات، پاشان دەیگەیەنێت بە کەسێ کە نەیبیستوە، دەگونجێ هەڵگری (فقه) و زانستێك بۆ خۆی (لێی تێ نەگەیشتبێت) و زانا نەبێت، وە ڕەنگە هەڵگری(فقه) و زانستێك زۆر پێویستی هەبێت بەکەسێ لەخۆی شارەزاتر بۆی لێك بداتەوە، سێ شت هەیە هەرگیز دڵی هیچ موسڵمانێك خەشم‌و قینی بەرامبەریان نییە، ئیش‌و کار تەنها لەبەر خاتری خوا ئەنجامدان، وە ئامۆژگاری پێشەوای موسڵمانان وە پابەند بوون بەکۆمەڵی موسڵمانانەوە. چونکە دوعا و نزای پێشەوایان لە پشتەوە دەوری موسڵمانان دەدات و دەیانپارێزێ.**

٢٨٥- لا تكتبوا عني شيئا إلا القرآن فمن كتب عني غير القرآن فليمحه وحدثوا عني ولا حرج ومن كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار .

(صحيح) ( حم م ) عن أبي سعيد.

**٢٨٥- لەفەرمودەکانی من هیچ مەنوسنەوە جگە لە قورئان نەبێت، وەهەر کەس شتێکی لەمنەوە نوسیوە جگە لەقورئان با بیسرێتەوە[1] وە بێ ترس قسەکانی من بگێڕنەوە بۆخەڵك، وەهەر کەس بە ئەنقەست درۆ بەدەم منەوە هەڵبەستێ با جێگای خۆی لەدۆزخەدا ئامادە بکات.**

---

[1] ( ئەم بەرگرییە لە نوسینەوەی فەرمودە لە سەرەتای ئیسلامەوە بووەو پاشتر (نەسخ) هەڵوەشاوەتەوەو هەموو موسڵمانان(اجماع) کۆدەنگیان هەیە لەسەر نوسینەوەی فەرمودەکان )

## بابەتی ئاگادارکردنەوەو ترساندن لە درۆ هەڵبەستن بەدەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ)

٢٨٦- إن الذي يكذب علي يبنى له بيت في النار.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١٦١٨)

**٢٨٦-بێگومان ئەو کەسەی درۆ بەدەم منەوە دەکات ماڵێك بۆخۆی دروست دەکات لەناو ئاگردا.**

٢٨٧- إن كذبا علي ليس ككذب على أحد فمن كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار.

(صحيح) ( ق ) عن المغيرة ( ع ) عن سعيد بن زيد . (الترغيب ٩٦)

**٢٨٧- درۆکردن بەدەم منەوە وەك درۆکردن نییە بەدەم هەر کەسێکی ترەوە، چونکە هەرکەس ئەنقەست درۆ بەدەم منەوە هەڵبەستێ با جێگای خۆی لە دۆزەخدا ببینێتەوە (درۆکردن بەدەم پێغەمبەری خواوە (ﷺ) گەورەترین جۆری درۆیە چونکە دەبێتە هۆی تێکدانی بنەماکانی دین و گەندەڵی لە شەریعەتدا و بەتاڵکردنەوەی حوکمەکانی شەرع)**

٢٨٨- إياكم وكثرة الحديث عني فمن قال علي فليقل حقا أو صدقا ومن تقول علي ما لم أقل فليتبوأ مقعده من النار .

(صحيح) ( حم ك ) عن أبي قتادة . (الصحيحة ١٧٥٣)

**٢٨٨- ئاگادارتان دەکەمەوە لە خۆتانەوە فەرمودەکانی من زۆر مەگێڕنەوە وە هەر کەس فەرمودەی گێڕایەوە با هەق و راستی بڵێت هەرکەس شتێك بە ناوی منەوە بڵێت من نەمگوتبێت با شوێنیْ لە دۆزەخدا بۆ خۆی ئامادەبکات.**

٢٨٩- من تقول علي ما لم أقل فليتبوأ مقعده من النار .

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٥٩٤٠)

**٢٨٩- هەر کەس بەدەم منەوە شتێ بڵێت و من نەمگوتبێت با جێگای خۆی لە دۆزەخدا ئامادە بکات.**

٢٩٠- من حدث عني بحديث يرى أنه كذب فهو أحد الكاذبين.

(صحيح) ( حم م ه ) عن سمرة. (المشكاة ١٩٩)

**٢٩٠- هەر كەس فەرمودەيەك لە منەوە بگێڕێتەوەو بشزانێت كە ئەوە درۆيەو فەرمودە نييە، ئەوە بێگومان يەكێكە لە درۆزنان.**

٢٩١- من كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار .

(صحيح) ( حم ق ت ن ه ) عن أنس ( حم خ د ن ه ) عن الزبير ( م ) عن أبي هريرة ( ت ) عن علي حم ه عن جابر وأبي سعيد ( ت ه ) عن ابن مسعود ( حم ك ) عن خالد بن عرفطة وزيد بن أرقم ( حم ) عن سلمة بن الأكوع وعقبة بن عامر ومعاوية بن أبي سفيان ( طب ) عن السائب بن يزيد وسلمان بن خالد الخزاعي وصهيب وطارق بن أشيم وطلحة بن عبيدالله وابن عباس وابن عمر وعتبة بن غزوان والعرس بن عميرة وعمار بن ياسر وعمران بن حصين وعمرو بن حريث وعمرو بن عبسة وعمرو بن مرة الجهني والمغيرة بن شعبة ويعلى بن مرة وأبي عبيدة بن الجراح وأبي موسى الأشعري ( طس ) عن البراء ومعاذ بن جبل ونبيط بن شريط وأبي ميمون (الدارقطني في الأفراد ) عن أبي رمثة وابن الزبير وأبي رافع وأم أيمن ( خط ) عن سلمان الفارسي وأبي أمامة ( ابن عساكر ) عن رافع ابن خديج ويزيد بن أسد وعائشة ( ابن صاعد في طرقه ) عن أبي بكر الصديق وعمر بن الخطاب وسعد بن أبي وقاص وحذيفة بن أسيد وحذيفة بن اليمان ( أبو مسعود بن الفرات في جزئه ) عن عثمان بن عفان ( البزار ) عن سعيد بن زيد (عد) عن أسامة بن زيد وبريدة وسفينة وأبي قتادة ( أبو نعيم في المعرفة ) عن جندع بن عمرو وعن سعد بن المدحاس وعبدالله بن زغب ( ابن قانع ) عن عبدالله بن أبي أوفى ( الحاكم في المدخل ) عن عفان بن حبيب ( عق ) عن غزوان وأبي كبشة ( ابن الجوزي في مقدمة الموضوعات) عن أبي ذر وعن أبي موسى الغافقي ) . (الصحيحة ١٣٨٣)

**٢٩١- هەر كەس بە ئەنقەست درۆ بەدەم منەوە هەڵبەستێ با جێگای خۆی لە دۆزەخدا ئامادە بكات.**

٢٩٢- لا تكذبوا علي فإن الكذب يولج النار .

(صحيح) ( ه ) عن علي. (صحيح ابن ماجه ٣١)

**٢٩٢- درۆ مەكەن بەدەممەوە چونكە درۆكردن بەدەم منەوە خاوەنەكەی دەخاتە ناو دۆزەخەوە.**

٢٩٣- لا تكذبوا علي فإنه من يكذب علي فليلج النار .

(صحيح) ( حم ق ت ) عن علي.

**٢٩٣- درۆ مەكەن بەدەم منەوە چونكە هەر كەس درۆ بەدەممەوە بكات با بچێتە درۆزەخەوە.**

# بابەتی ئاگادار كردنەوە لە شاردنەوەی عیلم

٢٩٤- إن علما لا ينتفع به ككنز لا ينفق منه في سبيل الله .

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن أبي هريرة . (الترغيب ١٢٢)

**٢٩٤- ئەو زانستەی سوودی لیٚ وەرنەگیریٚ وەك گە نجینەیەك وایە هیچی لیٚ نەبەخشریٚ لە پیٚناوی خوادا.**

٢٩٥- أيما رجل آتاه الله علما فكتمه ألجمه الله يوم القيامة بلجام من نار.

(صحيح) ( طب ) عن ابن مسعود . (الترغيب ١٢١)

**٢٩٥- هەر كەسیٚك خوای گەورە زانستیٚكی پیٚ ببەخشیٚتو نەیگەیەنیٚتو لە خەڵكی بیشاریٚتەوە، لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە بەلغاویٚكی ئاگرین لغاوی دەكات.**

٢٩٦- علم لا يقال به ككنز لا ينفق منه .

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن ابن عمر. (الترغيب ١٢٢)

**٢٩٦- زانستیٚك سوودی لیٚ وەرنەگیریٚ وەك گە نجینەیەك وایە لیٚی نەبەخشریٚت.**

٢٩٧- علم لا ينفع ككنز لا ينفق منه .

(صحيح) ( القضاعي ) عن ابن مسعود. (الترغيب ١٢٢)

**٢٩٧- زانستیٚك سوود نەگەیەنیٚت وەك گە نجینەیەك وایە لیٚی نەبەخشریٚت.**

٢٩٨- ما من رجل يحفظ علما فكتمه إلا أتى يوم القيامة ملجما بلجام من نار.

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٢٠)

**٢٩٨- هیچ كەسیٚك نییە عیلمو زانستیٚكی لەبەر بیٚت و بیزانیٚت، وەنەیگەیەنیٚت بەخەڵك و بیشاریٚتەوە، حەتمەن لە ڕۆژی دوایدا لغاوكراوە بەلغاویٚكی ئاگرین.**

٢٩٩- مثل الذي يتعلم العلم ثم لا يحدث به كمثل الذي يكنز الكنز فلا ينفق منه.

(صحيح) ( طس ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٨٠)

**٢٩٩- نموونەی ئەو كەسەی زانستیٚك فیٚر دەبیٚتو نایگەیەنیٚت بەخەڵك وەك نموونەی ئەو كەسە وایە گە نجینەیەك سەروەتو سامان هەڵبگریٚتو لیٚی نەبەخشیٚت.**

٣٠٠- من سئل عن علم فكتمه ألجمه الله يوم القيامة بلجام من نار .

(صحيح) ( حم ٤ ك ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٢٣)

**٣٠٠- هەر كەسێك پرسیاری دەربارەی زانستێك لێ بكرێتو بیشارێتەوە خوای گەورە لە رۆژی دوایدا بەلغاوێكی ئاگرین لغاوی دەكات.**

٣٠١- من كتم علما عن أهله ألجم يوم القيامة لجاما من نار .

(صحيح) ( عد ) عن ابن مسعود. (الترغيب ١٢١)

**٣٠١- هەر كەس زانستێك بیشارێتەوە لە رۆژی قیامەتدا لغاو دەكرێت بە لغاوێكی ئاگر.**

## بابەتی
## ( ترساندن لەوەی كە ئینسان فێری زانستێك ببێتو ئیشی پێ نەكات )

٣٠٢- أتيت ليلة أسري بي على قوم تقرض شفاههم بمقاريض من نار كلما قرضت وفت فقلت يا جبريل من هؤلاء قال خطباء أمتك الذين يقولون ما لا يفعلون ويقرءون كتاب الله ولا يعملون به .

(صحيح) ( هب ) عن أنس . (الصحيحة ٢٩١)

**٣٠٢- ئەو شەوەی كە شەو ڕەوییم پێكرا بەلای كەسانێكدا تێپەڕیم هەردوو لێوەكانیان دەقرتاندن بەمەقەستی ئاگر، هەر چەند دەیانقرتاند خێرا وەك خۆی لێدەهاتەوە ، منیش بە جوبرەئیلم ووت، ئەمانە كێن؟ فەرمووی ئەمانە وتاربێژەكانی ئومەتی تۆن ئەوانەی قسە دەكەنو بۆخۆیان جێبەجێی ناكەن،و قورئان دەخوێننو ئیشی پێ ناكەن.**

٣٠٣- إن الله إذا كان يوم القيامة ينزل إلى العباد ليقضي بينهم وكل أمة جاثية فأول من يدعو به رجل جمع القرآن ورجل قُتل في سبيل الله ورجل كثير المال فيقول الله للقارئ ألم أعلمك ما أنزلت على رسولي قال بلى يا رب قال فماذا عملت بما علمت قال كنت أقوم به آناء الليل وآناء النهار فيقول الله له كذبت وتقول له الملائكة كذبت ويقول الله له بل أردت أن يقال فلان قارئ فقد قيل ذلك " ويؤتى بصاحب المال فيقول الله له ألم أوسع عليك حتى لم أدعك تحتاج إلى أحد قال بلى يا رب قال فماذا عملت فيما آتيتك قال كنت أصل الرحم وأتصدق فيقول الله له كذبت وتقول الملائكة كذبت ويقول الله بل أردت أن يقال فلان جواد فقد قيل ذلك " ويؤتى بالذي قتل في سبيل الله فيقول الله في ماذا قتلت فيقول أمرت بالجهاد في سبيلك فقاتلت حتى قتلت

فيقول الله له كذبت وتقول له الملائكة كذبت ويقول الله بل أردت أن يقال فلان جريء فقد قيل ذلك " يا أبا هريرة أولئك الثلاثة أول خلق الله تسعر بهم النار يوم القيامة .

(صحيح) ( ت ك ) عن أبي هريرة . (الترغيب ٢٢)

**٣٠٣- كاتێ قیامەت دەست پێ دەکات خوای گەورە دادەبەزێت بۆلای بەندەکانی بۆ دادگایی کردنیان و هەموو ئوممەتەکانیش بەچۆکا کەوتوون ، جا یەکەم کەسێ بانگ دەکرێت، پیاوێکە کە قورئانی کۆکردۆتەوە، وە پیاوێکە کوژراوە لە پێناوی خوادا، وە پیاوێکە کە ماڵ و سەروەتی زۆر بووە، خوای گەورە بە قورئان خوێنەکە ئەفەرموێت ئایا ئەوەی ناردم بۆ پێغەمبەرەکەم فێرم نەکردی؟ دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، خوای گەورە پێی ئەفەرموێت: ئایا ئەوەی فێرم کردیت کارت پێ کرد؟ دەڵێ : من شەوو رۆژ ئەم خوێندنەوەو ئیشم پێ دەکرد، خوای گەورە پێی ئەفەرموێت: درۆت کرد، وەفریشتەکانیش پێی دەڵێن: درۆت کرد، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: بەڵکو مەبەستت بوو خەڵکی پێت بڵێن فلان کەس قورئان خوێنە دەی لەدونیا پێیان وتیت، پاشان خاوەن ماڵ و سەروەرتەکە دێنن و خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئایا ئەوەندە ماڵ و سەروەتم پێ نەبەخشیت کە پێویستیت بەکەس نەبێت؟ دەڵێ : بەڵێ ئەی پەرورەدگارم ،خوای گەورەش پێی دەفەرموێت: ئەی چیت کرد بەو ماڵەی پێم بەخشیت ئەڵێ :منیش پەیوەندی خزمایەتیم پێ جێبەجێ دەکردو لێم دەبەخشی؟ خوای گەورەش دەفەرموێت: درۆت کرد ، پاشان فریشتەکانیش پێی دەڵێن : درۆت کرد ، دیسان خوای گەورە پێی دەفەرموێت بەڵکو مەبەستت بوو کە خەڵك پێت بڵێن فلانە کەس بەخشندەیەو ئەوەش وتراوە لەدونیادا. ئەوجا ئەو کەسە دەهێنن لە پێناوی خوادا کوژراوە خوای گەورە پێی ئەفەرموێت: لە پێناوی چیدا کوژرایت؟ ئەویش دەڵێت: فرمانت دا بەجیهاد لە پێناوی خۆتدا، منیش جەنگام هەتا کوژرام خوای گەورەش پێی دەفەرموێت: درۆت کرد، فریشتەکانیش پێی دەڵێن: درۆت کرد، پەروەردگار پێی دەڵێتەوە: بەڵکو مەبەستت بوو خەڵکی پێت بڵێن فلانە کەس بوێرە، دەی ئەوەیش لەدونیادا وتراوە، ئەی ئەبو هورەیرە! ئەو سێ کەسانە یەکەمین خەڵکانی خوان کەدۆزەخیان پێ تاو دەدرێت دەکرێت لەرۆژی قیامەتدا.**

٣٠٤- يجاء بالرجل يوم القيامة فيلقى في النار فتندلق أقتابه فيدور بها في النار كما يدور الحمار برحاه فيطيف به أهل النار فيقولون يا فلان ما أصابك ألم تكن تأمرنا بالمعروف وتنهانا عن المنكر فيقول بلى قد كنت آمركم بالمعروف ولا آتيه وأنهاكم عن المنكر وآتيه .

(صحيح) ( حم ق ) عن أسامة بن زيد. (الصحيحة ٢٩١)

**٣٠٤- لەرۆژی قیامەتدا پیاوێك دەهێنن و فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە و لەتوندی فڕێدانەکەی گەدەو ڕیخۆڵەکانی دێنە دەرەوە و لە نێو دۆزەخدا بەدەوری خۆیدا دەیسوڕێنێتەوە هەر وەك چۆن کەر دەستاڕی ئاش(جەنجەر) بەدەوری خۆیدا دەخولێنێتەوە، خەڵکی دۆزەخیش لێی خڕ دەبنەوەو پرسیاری لێ دەکەن ئەوە فلان کەس چیت لێ قەوماوە؟ مەگەر تۆ نەبووی لەدونیادا فرمانت پێ دەکرین بەچاکەو بەرگریت لێ دەکردین لە خراپە؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ من فرمانم پێ دەکردن بەچاکە و خۆم جێ بەجێم نەکردووە بەرگریم لێ دەکردن لەخراپە وخۆم پێی هەڵدەستام.**

## بابەتی خراپی زۆر پرسیارکردن

٣٠٥- اتركوني ما تركتكم فإذا حدثتكم فخذوا عني فإنما هلك من كان قبلكم بكثرة سؤالهم واختلافهم على أنبيائهم .

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٨٥٠)

**٣٠٥- وازم بێنن لەوەی کەمن باسی ناکەم و وازم لێهێناوە، هەر کاتێك فەرمودەیەکم پێ گووتن لێم وەربگرن، چونکە بەڕاستی ئەوانەی پێش ئێوە بەهۆی پرسیارکردنی زۆرو جیاوازیان لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان تیاچوون.**

٣٠٦- إن أعظم المسلمين في المسلمين جرما من سأل عن شيء لم يحرم على المسلمين فحرم عليهم من أجل مسألته .

(صحيح) ( حم ق د ) عن سعد . (الصحيحة ٣٢٧٦)

**٣٠٦- گەورەترین تاوانبار لەنێو موسڵماناندا ئەو موسڵمانەیە کە: پرسیار لەشتێ بکات لەسەر موسڵمانان حەرام نەکرا بێت و بەهۆی پرسیارەکەی ئەوەوە لەسەریان حەرام بکرێت.**

٣٠٧- إن الله تعالى يرضى لكم ثلاثا ويكره لكم ثلاثا فيرضى لكم أن تعبدوه ولا تشركوا به شيئا وأن تعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا وأن تناصحوا من ولاه الله أمركم ويكره لكم قيل وقال وكثرة السؤال وإضاعة المال .

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٦٨٥)

**٣٠٧- خوای گه‌وره سێ شتی بۆ ئێوه‌وه پێخۆشه‌و سێ شتی تریشی پێ ناخۆشه بۆتان ، جا ئه‌وه‌ی كه پێی خۆشه‌و جێگای ره‌زامه‌ندیه‌تی ئه‌وه‌یه كه بیپه‌رستن‌و له‌هیچ شتێكدا هاوبه‌شی بۆ بریار نه‌ده‌ن، وه به كۆمه‌ڵ ده‌ست بگرن به حه‌بل (دینی خواوه) و په‌رته‌وازه مه‌بن، وه دڵسۆزی و ئامۆژگاری ئه‌وانه بكه‌ن كه خوای گه‌وره ده‌یانكاته فه‌رمانڕه‌وا به‌سه‌رتانه‌وه[1]. ئه‌و شتانه‌ش كه پێی ناخۆشه: قسه‌و قسه‌ڵۆك (ووتی ووتی )و زۆر پرسیار كردن، به‌فیڕۆدانی سه‌روه‌ت‌و سامان.**

٣٠٨- ذروني ما تركتكم فإنما هلك من كان قبلكم بكثرة سؤالهم واختلافهم على أنبيائهم فإذا أمرتكم بشيء فأتوا منه ما استطعتم وإذا نهيتكم عن شيء فدعوه.

(صحيح) ( حم م ن ه ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٨٥٠)

**٣٠٨- وازم لێ بهێنن له‌وه‌ی كه بۆم واز لێ هێناون چونكه به‌راستی ئوممه‌ته‌كانی پێش ئێوه كه تیا چوون هۆی ئه‌وه بووه كه پرسیاری زۆرو راجیاییان له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ركانیاندا كردووه، جا هه‌ر فرمانێكم پێ كردن به پێی توانا جێبه‌جێی بكه‌ن و هه‌رچیشم لێ قه‌ده‌غه كردن خۆتانی لێ به‌دوور بگرن.**

٣٠٩- ما نهيتكم عنه فاجتنبوه وما أمرتكم به فافعلوا منه ما استطعتم فإنما أهلك الذين من قبلكم كثرة مسائلهم واختلافهم على أنبيائهم .

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٨٥٠)

**٣٠٩- ئه‌وه‌ی قه‌ده‌غه‌ی ده‌كه‌م لێتان خۆتانی لێ به‌دووربگرن، وه ئه‌وه‌ی فرمانتان پێ ده‌كه‌م جێبه‌جێی بكه‌ن ئه‌وه‌نده‌ی له‌تواناتاندا هه‌یه، چونكه ئوممه‌ته‌كانی پێش ئێوه له‌سه‌ر زۆر پرسیاركردن‌و راجیاییان به‌رانبه‌ر پێغه‌مبه‌ره‌كانیان تیاچوون.**

---

[1] **( مه‌به‌ست له‌( نه‌سیحه‌ت )دلسۆزی و پشتگیری كردنیان‌و دۆعای خێر بۆ كردنیان‌و راستكردنه‌وه‌ی هه‌ڵه‌كانیان به‌نه‌رم‌و نیانی‌و حیكمه‌ت ).**

# بابەتی ترساندن لە فەتوادان بەبێ عیلم

٣١٠- قتلوه قتلهم الله ألا سألوا إذا لم يعلموا فإنما شفاء العي السؤال إنما كان يكفيه أن يتيمم.

(صحيح) ( د ) عن جابر. (صحيح ابي داود ٣٦٣)

**٣١٠- كوشتیان خوا بیانكوژێت [1] چونكە بەراستی چارەسەری نەزانین پرسیاركردنە بەراستی ئەو تەنها تەیمومی بكردایە بەسی بوو.**

٣١١- قتلوه قتلهم الله ألم يكن شفاء العي السؤال .

(صحيح) ( حم د ك ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٠٥)

**٣١١- كوشتیان خوا بیانكوژێ ئەرێ چارەسەری نەزانین پرسیاركردن نییە؟**

٣١٢- من أفتى بغير علم كان إثمه على من أفتاه ومن أشار على أخيه بأمر يعلم أن الرشد في غيره فقد خانه .

(صحيح) ( د ك ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٤٢)

**٣١٢- هەر كەس فەتوا بدات بەبێ زانیاری گوناهەكەی لەسەر ئەو كەسەیە فەتواكەی داوە، وە هەر كەس رێنمایی و ئاماژە بدات بە برایەكی ئیمانداری كە فلانە ئیش بكات باشە، لە واقعیشدا بزانێت كە ئەو ئیشە باش نییەو چاكەو خێر لە غەیری ئەو ئیشەدایە، ئەو خیانەتی لەو برایە كردووە.**

٣١٣- من أفتى بفتيا غير ثبت فإنما إثمه على من أفتاه .

(صحيح) ( ه ك ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٤٢)

**٣١٣- هەر كەس هەر فەتوایەك بدات و دڵنیا نەبێت لەراستی و دروستی فەتواكە، ئەوە گوناهەكەی لەسەر ئەو كەسەیە كەداوای فەتواكەی لێ كردووە.**

٣١٤- إن الله تعالى لا يقبض العلم انتزاعا ينتزعه من العباد ولكن يقبض العلم بقبض العلماء حتى إذا لم يبق عالما اتخذ الناس رءوساء جهالا فسئلوا فأفتوا بغير علم فضلوا وأضلوا.

(صحيح) ( حم ق ت ه ) عن ابن عمرو . (المشكاة ٢٠٦)

---

[1] ( ئەم فەرمودەیە پێغەمبەر(ﷺ) سەبارەت بەو كەسە فەرمووی كە لە سەفەردا سەری بریندار بوو بوو شەویش دوچاری لەشی گران بوو، بەیانی كە هەستا بۆ نوێژ پرسیاری كرد چی بكات؟ ئەوانەی لە گەڵیدا بوون پێیان ووت دەبێت خۆت بشۆریتو چاری ترت نیە و خۆشۆرنەكەشی بوو بەهۆی گیانی لەدەستدانی!! ) باشە بۆ پرسیار ناكەن كە نازانن؟

**٣١٤- خوای گه‌وره هه‌رگیز زانست وه‌رناگرێته‌وه‌و له‌ناو مرۆڤه‌كاندا و ریشه‌كیشی ناكات، به‌ڵكو زانست ده‌كێشێته‌وه‌ به‌ گیان كێشان‌و مردنی زانایان، هه‌تا ئه‌گه‌ر كه‌سانی زانا نه‌مان پرسیاریان لێ بكرێت خه‌ڵك كه‌سانی نه‌زان ده‌كه‌نه‌ سه‌رۆك‌و پێشه‌وای خۆیان ئه‌و كاته‌ پرسیاریان لێ ده‌كرێت‌و به‌بێ زانیاری فه‌توایان بۆ ده‌ده‌ن، جا خۆشیان گومرا ده‌كه‌ن و خه‌ڵكیش گومڕا و سه‌ر لێشێواو ده‌كه‌ن.**

## بابه‌تی نه‌مانی عیلم‌و به‌ده‌ركه‌وتنی نه‌فامی

٣١٥- هذا أوان يختلس العلم من الناس حتى لا يقدروا منه على شيء ثكلتك أمك يا زياد إن كنت لأعدك من فقهاء أهل المدينة هذه التوراة والإنجيل عند اليهود والنصارى فماذا يغني عنهم .

(صحيح) ( ت ك ) عن أبي الدرداء ( حم ه ك ) عن زياد بن لبيد. (المشكاة ٢٧٧)

**٣١٥- ئێستا كاتی ئه‌وه‌یه‌ زانست له‌خه‌ڵك بدزرێ به‌رِاده‌یه‌ك كه‌س ده‌سه‌ڵات و توانایان به‌سه‌ر هیچیدا نه‌مێنێ، دایكت شینت بۆ بكات ئه‌ی زیاد! خۆمن تۆم له‌ كه‌ڵه‌ پیاوانی شارەزای مه‌دینه‌ بیت ده‌ژمارد، ئه‌م ته‌ورات و ئینجیله‌ لای جوله‌كه‌ و گاور چ سوودی هه‌یه‌ بۆیان؟!**

٣١٦- إن الله لا ينزع العلم منكم بعدما أعطاكموه انتزاعا ولكن يقبض العلماء بعلمهم ويبقى جهال فيسألون فيفتون فيضلون ويضلون .

(صحيح) ( طس ) عن أبي هريرة .

**٣١٦- خوای گه‌وره زانست له‌ ئێوه‌ ناكێشێته‌وه‌ دوای ئه‌وه‌ی كه‌ پێی به‌خشیون، به‌ڵام زانایان كه‌ ده‌مرن زانسته‌كه‌ش له‌گه‌ڵ خۆیان ده‌به‌ن، ئه‌و كات خه‌ڵكانی نه‌فام دێنه‌ پێشه‌وه‌و پرسیاریان لێ ده‌كرێت‌و فه‌توایان بۆ ده‌ده‌ن جا بۆ خۆیان گومڕا و سه‌رلێشێواو ده‌بن‌و خه‌ڵكیش گومڕا ده‌كه‌ن.**

## بابه‌تی گێڕانه‌وه‌ی قسه‌و وه‌رگرتنی له‌ ئه‌هلی كیتاب

٣١٧- ما حدثكم أهل الكتاب فلا تصدقوهم ولا تكذبوهم وقولوا آمنا بالله وكتبه ورسله فإن كان باطلا لم تصدقوه وإن كان حقا لم تكذبوه .

(صحيح) ( حم د حب هق ) عن أبي نملة الأنصاري. (الصحيحة ٤٢٢)

٣١٧- ئەوەی ئەهلی کیتاب (گاورو جولەکە ) بۆتان دەگێڕنەوە نەبەراستی بزانن وە نە بەدرۆشیان بخەنەوە، بڵێن: ئێمە باوەڕمان بەخوای گەورەو کتێبەکانی و پێغەمبەرانی هەیە، جا ئەگەر ئەو شتە باتڵ و پووچ بێت ئێوە بە راستتان نەزانیوە و باوەرتان پێ نەکردووە ئەگەر راستیش بوبێت بە درۆتان نەزانیوە.

## بابەتی ئەو کەسانەی تەکلیفیان لەسەر هەڵگیراوەو هیچ لەسەریان نانوسرێت

٣١٨- رفع القلم عن ثلاثة عن المجنون المغلوب على عقله حتى يبرأ وعن النائم حتى يستيقظ وعن الصبي حتى يحتلم.

(صحيح) ( حم د ك ) عن علي وعمر. (الإرواء ٢٩٧)

**٣١٨- سێ کەس هەن هیچیان لەسەر نا نوسرێت : ئەو کەسەی شێت بووەو ژێری لە دەست داوە، تاچاك دەبێتەوە، وە ئەو کەسەی کە خەوتووە تا بەخەبەر دەێت، وە منداڵ تا پێ دەگات.**

٣١٩- رفع القلم عن ثلاثة عن النائم حتى يستيقظ وعن المبتلى حتى يبرأ وعن الصبي حتى يكبر .

(صحيح) ( ت ه ك ) عن علي. (الإرواء ٢٩٧)

**٣١٩- خامەی گوناه نوسین لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: کەسێ خەوتبێت تا بەخەبەر دێت، وە کەسێ ژێری لەدەست دا بێت و شێت بوو بێت تا چاك دەبێتەوە، وە کەسێ منداڵ بێت تا گەورە دەبێت.**

٣٢٠- رفع القلم عن ثلاث عن النائم حتى يستيقظ وعن الصبي حتى يشب وعن المعتوه حتى يعقل.

(صحيح) ( ت ه ك ) عن علي. (الإرواء ٢٩٧)

**٣٢٠- سێ کەس گوناهیان لەسەر نانوسرێت،خەوتوو تا بەخەبەر دێتەوە ومنداڵ تا دەبێتە گەنج و باڵغ دەبێت، گەلۆر هەتا عەقڵ دەگرێت.**

## بابەتێك لە باسی خەواریج

٣٢١- الخوارج كلاب النار.

(صحيح) ( حم ه ك ) عن ابن أبي أوفى ( حم ك ) عن أبي أمامة . (المشكاة ٣٥٥٤)

**٣٢١- خەواریج [١] سەگەلی دۆزەخن [٢].**

٣٢٢- معاذ الله أن يتحدث الناس أني أقتل أصحابي إن هذا وأصحابه يقرءون القرآن لا يجاوز حناجرهم يمرقون من الدين مروق السهم من الرمية .

(صحيح) ( ق ) عن علي.

**٣٢٢- پەنا بەخوا باس لەوە بكرێتو لە نێوەندی خەڵكدا بگوترێت كەمن ( محمد(ﷺ ) ) هاوەڵانی خۆم دەكوژم، بێگومان ئەو كەسەو هاوەڵەكانی قورئان دەخوێنن بەڵام لە قورگیان تێنا پەڕێت لەدین دەردەچن وەك دەرچونی چۆن تیر لە كەوانەن.**

٣٢٣- من يطيع الله إذا عصيته أيأمنني الله على أهل الأرض ولا تأمنوني إن من ضئضئ هذا قوما يقرءون القرآن لا يجاوز حناجرهم يمرقون من الدين مروق السهم من الرمية يقتلون أهل الإسلام ويدعون أهل الأوثان لئن أنا أدركتهم لأقتلنهم قتل عاد .

(صحيح) ( خ ) عن أبي سعيد. (السنة ٩١٠)

**٣٢٣- ئەبێ كێ گوێڕایەڵی پەروەردگار بكات گەر من نەیكەم؟! باشە خوای گەورە منی بە ئەمیندار داناوە بۆ خەڵكی سەرزەوی ئێوە بە ئەمینم نازانن؟! بێگومان لەوەچەو بەرەی ئەمە كەسانێك پەیدا دەبن قورئان دەخوێننو لە قورگیان تێناپەڕێت، لەدین دەردەچن وەك دەرچونی تیر لە كەوان، شوێنكەوتوانی ئیسلام دەكوژنو بت پەرستان پشتگوێ دەخەن، گەر من بگەم بەمانە هەموویان دەكوژم وەك چۆن خوا كوشتاری گەلی عادی كرد.**

٣٢٤- لا يتحدث الناس أن محمدا يقتل أصحابه .

(صحيح) ( خ ) عن جابر. (الصحيحة ٣١٥٥)

**٣٢٤- تا خەڵك باس نەكەن كە گوایە محمد(ﷺ ) هاوەڵانی خۆی دەكوژێت.**

[١] (ئەو كۆمەڵەن لە سەردەمی پێشەوا عەلییدا سەریان هەڵداو پێیان بوو هەر موسڵمانێك گوناهی گەورە (كبیرە) گوناهە گەورەكان بكات كافر دەبێتو تاهەتایە لەدۆزخدا دەمێنێتەوە)

[٢] ئیمامی (مەناوی) ئەفەرموێت: ئیماندار كەسی بەبەزەییەو هەمیشە نومێدی بەسۆزو لێخۆشبوونی خواهەیەو گوناهی برای موسڵمانی دادەپۆسێ ، بەڵام خەڵكی خەواریج هەمیشە گوناهی موسڵمان ئاشكرا دەكەنو ناو ناتۆرەی خراپی لێدەنێنو نا ئومێدە لە بەزەیی خوا ئەمانەش رەوشتو كردەوەی سەگن پەنا بەخوای گەورە.

٦٦٩- إذا اشتد الحر فأبردوا بالظهر فإن شدة الحر من فيح جهنم.

(صحيح) ( خ ه ) عن أبي سعيد ( حم ك ) عن صفوان بن مخرمة ( ن ) عن أبي موسى ( طب ) عن ابن مسعود ( عد ) عن جابر ( ه ) عن المغيرة بن شعبة . (صحيح أبي داود ٤٣١)

**٦٦٩- کاتێ گەرما تینی سەند نوێژی نیوەڕۆ بە فێنکی بکەن چونکە تینی گەرما لە گڕەی دۆزەخەوەیە.**

٦٧٠- إذا بدا حاجب الشمس فأخروا الصلاة حتى تبرز وإذا غاب حاجب الشمس فأخروا الصلاة حتى تغيب .

(صحيح) ( م ) عن ابن عمر . (الصحيحة ٣٩٦٦)

**٦٧٠- گەر زەردی خۆر بەرەو هەڵهاتن وە دەرکەوت ئەوە نوێژی چێشتەنگاو دوا بخەن تا تەواو هەڵدێتو بەرز دەبێتەوە، وە گەر خۆر بەرەوە ئاوابوون دەچوو ئەوە نوێژ دوا بخەن تا تەواو ئاوا دەبێتو لەچاو وون دەبێت.**

٦٧١- إذا نسي أحدكم صلاة أو نام عنها فليصليها إذا ذكرها .

(صحيح) ( ت ) عن أبي قتادة . (صحيح أبي داود ٤٦٢)

**٦٧١- ئەگەر هەر یەك لە ئێوە لەیادی چوو نوێژ بکات یان خەوی لێکەوت با کاتێ بیریهاتەوە خێرا بیکات.**

٦٧٢- أسفر بصلاة الصبح حتى يرى القوم مواقع نبلهم .

(صحيح) ( الطيالسي ) عن رافع بن خديج . (الإرواء ٢٥٨)

**٦٧٢- نوێژی بەیانی دوا بخە بۆ کاتێ دونیا ڕووناك دەبێت بە شێوەیەك خەڵکی شوێنی گەشتنی ئەو تیرە ببینێ کە دەیهاوێژێ.**

٦٧٣- أسفروا بالفجر فإنه أعظم للأجر.

(صحيح) ( ت ن حب ) عن رافع . (الإرواء ٢٥٨)

**٦٧٣- نوێژی بەیانیان کاتێ بکەن کە دونیا بەرەو دەرکەوتنی زەرد دەڕوات چونکە ئەوە پاداشتی گەورەترە.**

٦٧٤- ما أسفرتم بالصبح فإنه أعظم للأجر.

(صحيح) ( ن ) عن رجال من الأنصار. (صحيح أبي داود ٤٥١)

**٦٧٤- ئەوەی کە کاتی نوێژی بەیانیانتان دواخستووە بۆ کاتێ دونیا ڕووناك دەبێتەوە ئەوە پاداشتی گەورەترە.**

٦٧٥- أفضل الأعمال الصلاة في أول وقتها.

(صحيح) ( د ت ك ) عن أم فروة . (المشكاة ٦٠٧)

**٦٧٥- باشترینی كردەوەكان نوێژكردنە لە سەرەتای كاتیدا .**

٦٧٦- أفضل الأعمال الصلاة لوقتها وبر الوالدين.

(صحيح) ( م ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٤٨٩)

**٦٧٦- باشترین كردەوەكان نوێژكردنە لەكاتی خۆیداو چاكەكردنە لەگەڵ باوكو دایكدا.**

٦٧٧- أفضل الأعمال الصلاة لوقتها وبر الوالدين والجهاد في سبيل الله.

(صحيح) ( خط ) عن أنس . (الصحيحة ١٤٨٩)

**٦٧٧- باشترین كردەوەكان نوێژكردنە لەكاتی خۆیداو چاكەكردنە لەگەڵ باوكو دایكداو جیهادكردنە لە پێناوی خوادا.**

٦٧٨- إن خيار عباد الله الذين يراعون الشمس والقمر والنجوم والأظلة لذكر الله.

(صحيح) ( طب ك ) عن ابن أبي أوفى . (الصحيحة ٣٤٤٠)

**٦٧٨- باشترین عەبدەكانی پەروەردگار ئەوانەن كە چاودێری خۆروو مانگ و ئەستێرەو سێبەرەكان دەكەن بۆ كاتی نوێژەكان.**

٦٧٩- إنه سيكون أمراء يؤخرون الصلاة عن مواقيتها ألا فصل الصلاة لوقتها ثم ائتهم فإن كانوا قد صلوا كنت قد أحرزت صلاتك وإلا صليت معهم فكانت تلك نافلة .

(صحيح) ( حم م ن ) عن أبي ذر . (صحيح أبي داود ٤٦٠)

**٦٧٩- بەراستی لەمەودوا كۆمەڵێك فەرمانڕەوا پەیدا دەبن نوێژ لەكاتەكانی خۆیدا دوا دەخەن، جا ئاگاداربە! نوێژ لەكاتی خۆیدا بكە، پاشان وەرە بۆ لایان ، جا گەر ئەوان نوێژیان كردبوو، ئەوە تۆ لەكاتی خۆیدا نوێژی خۆتت كردووە، وە گەر نا لەگەڵ ئەمان بەكۆمەڵ بیكەو ئەوەی كە كردوتە دەبێتە سوننەت.**

٦٨٠-صل الصلاة لوقتها فإن أدركت الإمام يصلي بهم فصل معهم وقدأحرزت صلاتك وإلا فهي نافلة لك.

(صحيح) ( ە ) عن أبي ذر. (الإرواء ٤٧٦)

**٦٨٠- نوێژەكەت بكە لەكاتی خۆیدا، جا ئەگەر بە پێش نوێژ ڕاگەشتیت كە نوێژی بۆ دەكردن ئەوە تۆش نوێژ بكە لە گەڵیانداو ئەو نوێژەی كە كردوتە پێشتر بۆت حیسابە وە گەر نا ئەوە دەكەوێتە بری سوننەت بۆت.**

٦٨١- صل الصلاة لوقتها فإن أدركت معهم فصل ولا تقل إني قد صليت فلا أصلي .

(صحيح) ( ن حب ) عن أبي ذر. (الإرواء ٤٧٦)

**٦٨١- نوێژ لەكاتی خۆیدا بكە، وە ئەگەر پێڕاگەیشتی لەگەڵیان نوێژ بكەو مەڵێ من نوێژم كردووە نوێژ ناكەم.**

٦٨٢- كيف أنت إذا كانت عليك أمراء يؤخرون الصلاة عن وقتها صل الصلاة لوقتها فإن أدركتها معهم فصل فإنها لك نافلة.

( م ٤ ) عن أبي ذر. (صحيح أبي داود ٤٥٧)

**٦٨٢- حاڵت چۆنە گەر هەندێ لەوانەی كە بوون بە ئەمیر بەسەرتەوە نوێژیان دواخست لەكاتی خۆیدا؟ تۆ نوێژ لەكاتی خۆیدا ئەنجام بدەو كە هاتی بۆ جەماعەتو پێڕاگەشتی لەگەڵیان جەماعەت بكە ئەوە دەبێتە سوننەت بۆت.**

٦٨٣- لعلكم ستدركون أقواما يصلون الصلاة لغير وقتها فإن أدركتموهم فصلوا الصلاة لوقتها وصلوا معهم واجعلوها سبحة .

(صحيح) ( حم ن ه ) عن ابن مسعود. (صحيح أبي داود ٤٥٩)

**٦٨٣- لەوانەیە بگەن بە كەسانێك لەمەودوا نوێژەكان لە غەیری كاتی خۆیدا بكەن، جا ئەگەر كەوتنە زەمەنی ئەوان ئەوە ئێوە نوێژ لەكاتی خۆیدا بكەنو لەگەڵ ئەوانیشدا هەر بیكەنبە نوێژی سونەت[1] حسابە بۆ خۆتان.**

٦٨٤- لا تزال أمتي على الفطرة ما لم يؤخروا المغرب إلى اشتباك النجوم .

(صحيح) ( حم د ك ) عن أبي أيوب وعقبة بن عامر ( ه ) عن العباس. (الإرواء ٨٩٩)

**٦٨٤- بەردەوام ئوممەتی من لەسەر فیترەت و سوننەت دەمێننەوە تا ئەو كاتەی نوێژی وئێوارە دوانەخەن بۆ كاتی دەركەوتنی ئەستێرەكان[2].**

٦٨٥- إن للصلاة أولا وآخرا وإن أول وقت صلاة الظهر حين تزول الشمس وآخر وقتها حين يدخل وقت العصر وإن أول وقت العصر حين يدخل وقتها وإن آخر وقتها حين تصفر الشمس وإن أول

---

[1] **تسبيحە :واتە نوێژی سوننەت.**

[2] **( شێخی مەناوی دەڵێت: دەركەوتنی ئەستێرەكان واتە رووناكی هەموویان تێكەڵ بێنو بدەن لەیەك تا ئەستێرەی گەورە و بچوك لێك جودادەكرێنەوە، ئەمەش بەڵگە یە دژی شیعەكان كە نوێژی ئێوارە دوادەخەن تا ئەستێرەكان تەواو دەردەكەون ).**

وقت المغرب حين تغرب الشمس وإن آخر وقتها حين يغيب الشفق وإن أول وقت العشاء الآخرة حين يغيب الشفق وإن آخر وقتها حين ينتصف الليل وإن أول وقت الفجر حين يطلع الفجر وإن آخر وقتها حين تطلع الشمس .

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٦٩٦)

**٦٨٥- بێگومان نوێژ كاتی سەرەتاو كاتی كۆتایی هەیە، سەرەتای نوێژی نیوەڕۆ ئەو كاتەیە خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لابدات بەلای رۆژئاوادا،كۆتایی كاتەكەشی هاتنی كاتی عەسرە، و سەرەتای كاتی عەسر لەو كاتەوە دەست پێ دەكاتو كۆتاییەكەشی كاتێكە خۆر زەرد دەبێت، و سەرەتای كاتی ئێوارەش بە ئاوا بوونی خۆر دەست پێ دەكات، وە كۆتایی كاتەكەشی ئەو كاتەیە سورایی كەناری ئاسمان ئاوا دەبێت و دونیا بەرەو تاریكی دەچێت، وە سەرەتای كاتی نوێژی خەوتنان ئاوابوونی سورایی كەناری ئاسمانەو كۆتایی كاتەكەشی ئەوەیە نیوەی شەوە، وە سەرەتای كاتی بەیانیش هەڵهاتنی سپێدەی بەیانیە و كۆتایی كاتەكەشی كاتی رۆژ هەڵاتنە.**

٦٨٦- إنكم تنتظرون صلاة ما ينتظرها أهل دين غيركم ولولا أن يثقل على أمتي لصليت بهم هذه الساعة .

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمر . (صحيح أبي داود ٤٤٦)

**٦٨٦- ئێوە چاوەڕوانی نوێژێك دەكەن[1]، هیچ دینێكی تر ئاوا چاوەڕوانی ناكەن، وە ئەگەر گران و قورس نەبایە لەسەر ئوممەتەكەم هەمیشە لەم كاتەدا نوێژم پێ دەكردن.**

٦٨٧- إنه ليس في النوم تفريط إنما التفريط في اليقظة فإذا نسي أحدكم صلاة أو نام عنها فليصلها إذا ذكرها لوقتها من الغد .

(صحيح) ( ٤ ) عن أبي قتادة . (صحيح أبي داود ٤٦٧)

**٦٨٧- بەراستی كەم تەرخەمی لەكاتی خەودا نییە بەڵكو تەنها كەمتەرخەمی لەكاتی بە ئاگا و بەخەبەر بووندایە، بۆیە ئەگەر یەكێكتان نوێژێكی لە بیرچوو یان خەوتبوو با سبەینێ كە لە كاتی خۆیدا كە بیری كەوتەوە بیكات.**

٦٨٨- إنها ستكون عليكم بعدي أمراء يشغلهم أشياء عن الصلاة لوقتها حتى يذهب وقتها فصلوا الصلاة ، لوقتها قال رجل إن أدركتها معهم أصلي معهم قال نعم إن شئت .

(صحيح) ( حم د الضياء ) عن عبادة بن الصامت . (صحيح أبي داود ٤٥٩)

---

[1] **مەبەست لەنوێژی عیشایە.**

**٦٨٨- بێگومان لە دواى من كۆمەڵێك فەرماندەتان دەبن ئیشو سەرقاڵی خۆیان وایان لێ دەكات نوێژ لەكاتی خۆیدا ناكەن تا كاتەكەی بەسەر دەچێت، جا ئێوە نوێژەكانتان لەكاتی خۆیدا بكەن، پیاوێك ووتی ئەگەر وافریا كەوتم لەگەڵ ئەوان نوێژەكەم بكەم ئایا نوێژ لەگەڵیاندا بكەم؟ فەرمووی بەڵێ ئەگەر ویستت.**

٦٨٩- ستكون أمراء تشغلهم أشياء يؤخرون الصلاة عن وقتها فاجعلوا صلاتكم معهم تطوعا.

(صحيح) ( ه ) عن عبادة بن الصامت. (صحيح أبي داود ٤٥٩)

**٦٨٩- لەمەودوا كۆمەڵێك ئەمیر پەیدا دەبن هەندێ شت سەرقاڵیان دەكاتو نوێژ دوادەخەن لەكاتی خۆیدا نایكەن ، جا نوێژەكانتان لەگەڵ ئەواندا وەك خۆبەخش و سوونەتبكەن.**[1]

٦٩٠- ستكون بعدي أئمة يؤخرون الصلاة عن مواقيتها صلوها لوقتها فإذا حضرتم معهم الصلاة فصلوا .

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمرو. (صحيح أبي داود ٤٦١)

**٦٩٠- - لەمەودوا كۆمەڵێك پێشەوا پەیدا دەبن نوێژ لەكاتەكانی خۆیدا دوا دەخەن، ئێوە لەكاتی خۆیدا بیكەن، وەهەر كاتێكیش ئامادەی نوێژ بوون لەگەڵ ئەواندا بیكەن.**

٦٩١- صلوا صلاة المغرب مع سقوط الشمس بادروا بها طلوع النجم .

(صحيح) ( طب ) عن أبي أيوب. (الصحيحة ١٩١٥)

**٦٩١- نوێژی ئێوارە بكەن لەگەڵ خۆر داكەوتن دەكەوێت ، دەست پێشخەری بكەن لە ئەنجام دانیدا پێش هەڵهاتنی ئەستێرەكان.**

٦٩٢- يا أبا ذر إنه سيكون بعدي أمراء يميتون الصلاة فصل الصلاة لوقتها فإن صليت لوقتها كانت لك نافلة وإلا كنت قد أحرزت صلاتك .

(صحيح) ( م ت ) عن أبي ذر. (المشكاة ٦٠٠)

**٦٩٢- ئەی ئەبا زەڕ! بێگومان پاش من كۆمەڵێك ئەمیر پەیدا دەبن نوێژ دەمرێنن ( دوای دەخەن ) تۆ نوێژ لەكاتی خۆیدا بكە، جا ئەگەر لەكاتی خۆیدا كردت ئەوە دەبێتە سوننەت بۆ تۆ، ئەگەر نا ئەوە تۆ نوێژی خۆتت كردووە.**

---

[1] **واتە :نوێژە فەرزەكانتان لەكاتی خۆیدا بكەن و دوای مەخەن.**

٦٩٣-أمَّنِي جبريل عند البيت مرتين فصلى بي الظهر حين زالت الشمس وكانت قدر الشراك وصلى بي العصر حين كان ظله مثله وصلى بي المغرب حين أفطر الصائم وصلى بي العشاء حين غاب الشفق وصلى بي الفجر حين حرم الطعام والشراب على الصائم فلما كان الغد صلى بي الظهر حين كان ظله مثله وصلى بي العصر حين كان ظله مثليه وصلى بي المغرب حين أفطر الصائم وصلى بي العشاء إلى ثلث الليل وصلى بي الفجر فأسفر ثم التفت إلي وقال يا محمد هذا وقت الأنبياء من قبلك والوقت ما بين هذين الوقتين .

(صحيح) ( حم د ت ك ) عن ابن عباس. (صحيح أبي داود ٤١٦)

**٦٩٣- لەلای ماڵی خوادا (کەعبە) جیبرییل دووجار پێش نوێژی بۆ کردم، نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردم کاتێ خۆر لەناوەڕاستی ئاسمانلایدابوو ە ئەندازەی قەیتانێك وە نوێژی عەسری بۆ کردم ئەو کاتەی سێبەری هەر شتێك بە ئەندازەی خۆی لێهات وە نوێژی ئێوارەی بۆ کردم ئەو کاتەی کە ڕۆژوەوان ڕۆژوو دەشکێنێت وە نوێژی خەوتنانی بۆ کردم ئەو کاتەی سوورایی کەناری ئاسمان ئاوابوو وە نوێژی بەیانی بۆ کردم ئەو کاتەی کە خواردن و خواردنەوە لەسەر ڕۆژوەوان هەڵدەگیرێت، ئیتر بۆ ڕۆژی دوایی نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردم ئەو کاتەی کە سێبەری هەر شتێك بە ئەندازەی خۆی لێهات، وە نوێژی عەسری بۆ کردم ئەو کاتەی کە سێبەری خۆی دوو هێندەی خۆی لێهات ، وە نوێژی ئێوارەی بۆ کردم ئەو کاتەی کە ڕۆژوەوان ڕۆژوو دەشکێنێت وە نوێژی عیشای بۆ کردم کە سێ یەکی شەو ڕۆیشتبوو، وە نوێژی بەیانی بۆ کردم ئەو کاتەی زەردە هەڵاتبوو، پاشان ئاوڕی لێ دامەوەو ووتی ئەی محمد ئەوە کاتی پێغەمبەرانی پێش تۆیەو کاتی نوێژەکانیش لە نێوان ئەو دوو کاتەدایە.**

٦٩٤- أعتموا بهذه الصلاة فإنكم قد فضلتم بها على سائر الأمم ولم تصلها أمة قبلكم .

(صحيح) ( د ) عن معاذ بن جبل . (المشكاة ٦١٢)

**٦٩٤- نوێژی خەوتنان لە کاتی وشتر دۆشدا بکەن چونکە ئێوە بەم نوێژی خەوتنانە چاکەتان لەگەڵکراوە بەسەر هەموو ئوممەتەکانی تردا و هیچ ئوممەتەیکی تر پێش ئێوە نەیانکردووە.**

٦٩٥- كان إذا اشتد البرد بكر بالصلاة وإذا اشتد الحر أبرد بالصلاة .

(صحيح) ( خ ن ) عن أنس. (الضعيفة ٩٥٣)

**٦٩٥- پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ سەرماوسۆڵە بوایە نوێژی نیوەڕۆی زوو دەکرد، وەکاتێ گەرما تینی بهێنایە نوێژی نیوەڕۆی دوادەخست بۆ کاتێ فێنیکی بکردایە[1] .**

٦٩٦- ملأ الله بيوتهم وقبورهم نارا كما شغلونا عن الصلاة الوسطى حتى غابت الشمس

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن علي ( م ه ) عن ابن مسعود. (صحيح أبي داود ٤٣٧)

**٦٩٦- خوای گەورە ماڵو گۆڕەکانیان پڕ بکات لە ئاگر ، وەکو ئێمەیان سەرقاڵ کرد لەکردنی نوێژی عەسر هەتا خۆر ئاوابوو.**

٦٩٧- إذا حضر أحدكم الأمر يخشى فواته فليصل هذه الصلاة - يعني الجمع بين الصلاتين-

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١٣٧٠)

**٦٩٧- ئەگەر هەر کەس لە ئێوە ئیشێکی هەبوو ترسا نوێژەکەی بچێت با ئەم نوێژە بکات( جمع ) واتە کۆکردنەوە لە نێوان دوو نوێژدا.**

٦٩٨- بادروا بصلاة المغرب قبل طلوع النجم .

(صحيح) ( حم قط ) عن أبي أيوب . (صحيح أبي داود ٤٤٤)

**٦٩٨- خێرا بکەن لەکردنی نوێژی ئێوارەدا پێش هەڵهاتنی ئەستێرە .**

٦٩٩- خذوا مقاعدكم فإن الناس قد صلوا وأخذوا مضاجعهم وإنكم لن تزالوا في صلاة ما انتظرتم الصلاة ولولا ضعف الضعيف وسقم السقيم وحاجة ذوي الحاجة لأخرت هذه الصلاة إلى شطر الليل .

(صحيح) ( حم د ) عن أبي سعيد . (صحيح أبي داود ٤٤٨)

**٦٩٩- باهەر کەس شوێنی خۆی بگرێت، بەراستی خەڵك نوێژیان کردووەو چوونەتەوە جێگای خۆیان، بێگومان ئێوە بەردەوام لەناو نوێژدان مادەم چاوەڕوانی نوێژی دواتر دەکەن، وە ئەگەر بێ هێزی لاوازەکانو نەخۆشی نەخۆشەکانو پێویستی خاوەن پێویستیەکان نەبوایە نوێژی خەوتنانم دوادەخست بۆ سێ یەکی شەو یان نیوەی شەو.**

٧٠٠- لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم أن يؤخروا العشاء إلى ثلث الليل أو نصفه .

(صحيح) ( حم ت ه ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٣٦)

**٧٠٠- ئەگەر ناڕەحەت نەبوایە لەسەر ئوممەتەکەم فەرمانم پێ دەکردن کە نوێژی خەوتنان دوا بخەن بۆ سێیەکی شەو یان نیوەی شەو.**

---

[1] ( واتە بۆ ئەو کاتەی دیوار سێبەری دەکردو خەڵك لە سێبە ری دیوارەکانەوە دەچوون بۆ جەماعەت )

٧٠١- لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم أن يصلوها هكذا - يعني العشاء نصف الليل-.

(صحيح) ( حم خ ن ) عن ابن عباس ( م ) عن ابن عمر وعائشة. (صحيح أبي داود ٣٦)

**٧٠١- ئەگەر نارەحەت نەبوایە لەسەر ئوممەتم فەرمانم پێ دەکردن کەبەم شێوەیە نوێژ بکەن واتە نوێژی خەوتنان دوا بخەن بۆ نیوەی شەو.**

٧٠٢-لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل صلاة ولأخرت العشاء إلى ثلث الليل.

(صحيح) ( حم ت الضياء ) عن زيد بن خالد الجهني. (صحيح أبي داود ٣٧)

**٧٠٢- ئەگەر گرانو قورس نەبایە لەسەر ئوممەتم فەرمام پێ دەکردن بە سیواك کردن لەهەموو نوێژێکدا وە نوێژی خەوتنانیشم دوادەخست بۆ سێ یەکی کۆتایی شەو.**

٧٠٣- لولا ضعف الضعيف وسقم السقيم لأخرت صلاة العتمة .

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس. (صحيح أبي داود ٤٤٨)

**٧٠٣-ئەگەر بێهێزی لاوازەکانو نەخۆشی نەخۆشەکان نەبایە نوێژی خەوتنانم[1] (عیشا) م دوادەخست**

٧٠٤- لا تغلبنكم الأعراب على اسم صلاتكم العشاء فإنها في كتاب الله العشاء وهم يعتمون بحلاب الإبل .

(صحيح) ( حم م د ن ه ن ) عن ابن عمر. (المشكاة ٦٣١)

**٧٠٤- بەزمانی عەرەبە دەشتەکیەکان زاڵ نەبێت بەسەرتانداو ناوی ووشەی (عیشا) بگۆڕن چونکە لە قورئان دا بە (العشاء) هاتووە ئەوانیش پێی دەڵێن (عەتەمە) ووشتر دۆش[2]**

---

[1] (وشەی (العتمە)واتە وشتر دۆش،عەرەبەکان داب و نەریتیان وابوو هەتا دونیا تاریك نەبوایە وشتریان نەدەدۆشی لەترسی چاوەزار).

[2] ( عەرەبە دەشتەکیەکان بە (عیشایان) ووتوە (عتمە) لە فەرمودە صەحیحەکانی پێغەمبەریشدا ووشەی (عتمە) لە بری ووشەی (عیشا) هاتووە ، زانایانیش بەدووخاڵ وەڵامیان داوەتەوە: ١- پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆیە ووشەی (عتمە) ی بەکارهێناوە بۆ ئەوەی بزانین کە بەکارهێنانی دروستە وەنەهی کردنیش لە بەرکاهێنانی ووشەی (عتمە) بۆ خۆ لادانە لێی نەك (حەرام) بێت بەکاری بهێنێ، ٢- لەوانەیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە قسەی لەگەڵ بەرامبەرکەیدا کردووە وشەی (عتمة)ی بەکارهێناوە بۆ ئەوە بووە کە لایەنی بەرامبەر نەیزانیوە وشەی (عیشا) چ کاتێك دەکات، بۆیە بە زمانی خۆی قسەی لەگەڵدا کردووە چونکە لای عەرەبە دەشتەکیەکان وا باو بووە کە وشەی (عیشا) یان بۆ کاتی مەغریب بەکارهێناوە ، بۆیە

٧٠٥- لاتغلبنكم الأعراب على اسم صلاتكم فإنما هي العشاء وإنما يقولون العتمة لإعتامهم بالإبل.

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٦٣١)

**٧٠٥- بازمانی عەرەبە دەشتەکیەکان زاڵ نەبێت بەسەرتاندا سەبارەت بەناوی نوێژەکەتان کەناوی (العشاء) چونکە ئەوان پێی دەڵێن (العتمة) وشتر دۆش لەبەر ئەوەی ئەوان بەتاریکی شەو ووشتر دەدۆشن.**

٧٠٦- نزل جبريل فأمني فصليت معه ثم صليت معه ثم صليت معه ثم صليت معه ثم صليت معه ثم قال بهذا أمرت.

(صحيح) ( ق د ن ه ) عن أبي مسعود. (المشكاة ٤١٧)

**٧٠٦- جیبریل دابەزی‌و پێش نوێژی بۆ کردم، منیش نوێژم لەگەڵدا کرد، پاشان نوێژم لەگەڵدا کرد، پاشان نوێژم لەگەلدا کرد، پاشان نوێژم لەگەڵدا کرد، پاشان نوێژم لەگەڵدا کرد، پاشان ووتی بەم شێوەیە فەرمانم پێ کراوە.**

٧٠٧- وقت صلاة الظهر إذا زالت الشمس وكان ظل الرجل كطوله ما لم يحضر العصر ووقت صلاة العصر ما لم تصفر الشمس ووقت صلاة المغرب ما لم يغب الشفق ووقت صلاة العشاء إلى نصف الليل الأوسط ووقت صلاة الصبح من طلوع الفجر ما لم تطلع الشمس فإذا طلعت الشمس فأمسك عن الصلاة فإنها تطلع بين قرني الشيطان .

(صحيح) ( حم م د ن ) عن ابن عمرو. (المشكاة ٤٢٤)

**٧٠٧- کاتی نوێژی نیوەڕۆ ئەوەیە کە خۆر لەناوەڕاستی ئاسمان لابدات وە سێبەری ئینسان بە ئەندازەی خۆی درێژ بێت مادەم نوێژی عەسر نەهاتبێت وەکاتی نوێژی عەسر ئەوەیە کە خۆر زەرد نەبوو بێت، وەکاتی نوێژی ئێوارە ئەوەیە سوورایی کەناری ئاسمان ئاوا نەبوو بێت، وە کاتی نوێژی (عیشا) خەوتنان درێژ دەبێتەوە بۆ نیوەی ناوەڕاستی شەو، وەکاتی نوێژی بەیانی لەهەڵهاتنی سپێدەی بەیانیەوە هەتا پێش خۆر هەڵاتن، جا کاتێ خۆر هەڵهات واز لە نوێژکردن بهێنە، چونکە لەنێوان هەردوو شاخی شەیتاندا هەڵدێت.**

---

**پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێ (لو يعلمون مافى الصبح والعتمه لاتوهما ولو حبوا) واته گەر بزانن پاداشتی نوێژی بەیانی‌و (عیشا) خەوتنان چەندە خێرە بەگاگۆڵکەش بوایە بۆی دەهاتن !!.**

## بابەتی بانگ

٧٠٨- اجعل بين أذانك وإقامتك نفسا حتى يقضي المتوضئ حاجته في مهل ويفرغ الآكل من طعامه في مهل .

(صحيح) ( عم ) عن أبي ( أبو الشيخ في الأذان ) عن سلمان وعن أبي هرير .(الصحيحة ٨٨٥)

**٧٠٨- لەنێوان بانگو قامەتەکەدا پشوو بدە هەتا ئەو کەسەی کە دەست نوێژ دەگرێت بەئیسراحەت لێبێتەوە، وە ئەو کەسەش نان دەخوات بە ئیسراحەت بیخوات.**

٧٠٩- إذا أذنت المغرب فاحدرها مع الشمس حدرا .

(صحيح) ( طب ) عن أبي محذورة . (الصحيحة ٢٢٤٥)

**٧٠٩- هەر کات بانگی ( مەغریب ) ئێوارەت دا خێرا بکەو لەگەڵ خۆر ئاوا بوندا چۆن ئاوا دەبێ تۆش تەواوی بکە.**

٧١٠- إذا بلغت حي على الفلاح فقل الصلاة خير من النوم .

(صحيح) ( أبو الشيخ في كتاب الأذان ) عن أبي محذورة . (صحيح أبي داود ٥١٥)

**٧١٠- کاتێ گەشتبیتە ( حی علی الفلاح ) بڵێ ( نوێژ باشترە لەخەو )**[1] .

٧١١- إذا سمعت النداء فأجب داعي الله .

(صحيح) ( طب ) عن كعب بن عجرة . (الصحيحة ١٣٥٤)

**٧١١- کاتێ گوێت لە بانگ بوو وەڵامی بانگخوازی خوا بدەرەوە**[2] .

٧١٢- إذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل ما يقول ثم صلوا علي فإنه من صلى علي صلاة صلى الله عليه بها عشرا ثم سلوا الله لي الوسيلة فإنها منزلة في الجنة لا تنبغي إلا لعبد من عباد الله وأرجوا أن أكون أنا هو فمن سأل لي الوسيلة حلت عليه الشفاعة .

(صحيح) ( حم م ٣ ) عن ابن عمرو . (الإرواء ٢٤٢)

---

[1] (شیخ ناصر ئەلبانی دەڵێت: مەبەست لێ ی بانگی یەکەمی بەیانی بووە کە (الصلاه خیر من النوم) گوتراوە وەك لەم فەرمودەیەو فەرمودەی تریشدا هاتووە ، بەڵام شەیخ العثیمین دەڵێت: نەخێر لە بانگی دووەمی بەیانیاندا گوتراوە)

[2] (وەڵامدانەوە بە دوو جۆر دەبێت بە قسەو بەکردار ، بە قسە لەدوای بانگ دەرموە بیڵێیتەوە بەکرداریش ئامادەی جەماعەت بیت) .

**٧١٢- كاتێ گوێتان لەبانگدەر بوو چی دەگوت ئێوەش بیڵێنەوەو پاشان سڵاوات لەدیداری من بدەن، چونكە هەركەس یەك سڵاوتم لەسەر بدات خوای گەورە بەهۆی ئەو سڵاواتەوە دەر جار پاداشتو رەحمەتی لەسەر دەبارێنێت، پاشان لای پەروەردگار داوای وەسیلەم بۆ بكەن چونكە وەسیلە پلەو مەقامێكە لەبەهەشتدا خوای گەروە تەنها بەیەك بەندەی خۆی دەبخشێت منیش ئومێد دەكەم ئەو كەسە من بم ، جاهەر كەس داوای وەسیلەم بۆ بكات شەفاعەتی بۆ مسۆگەر دەبێت.**

٧١٣- إذا سمعتم المؤذن يثوب بالصلاة فقولوا كما يقول .

(صحيح) ( حم ) عن معاذ بن أنس . (الصحيحة ١٣٢٨)

**٧١٣- هەر كات گوێتان لە بانگ بێژ بوو قامەتی[1] كرد بۆ نوێژ ئەو چی ووت ئێوەش وەك ئەو بیڵێنەوە.**

٧١٤- إذا سمعتم النداء فقولوا مثل ما يقول المؤذن .

(صحيح) ( مالك حم ق ٤ ) عن أبي سعيد . (صحيح أبي داود ٥٣٥)

**٧١٤- هەركات گوێتان لە بانگ بوو، بانگدەر چی دەگوت ئێوەش بیڵێنەوە .**

٧١٥- إذا قال العبد لا إله إلا الله والله أكبر قال الله صدق عبدي لا إله إلا أنا وأنا أكبر فإذا قال لا إله إلا الله وحده قال صدق عبدي لا إله إلا أنا وحدي فإذا قال لا إله إلا الله لا شريك له قال صدق عبدي لا إله إلا أنا ولا شريك لي فإذا قال لا إله إلا الله له الملك وله الحمد قال صدق عبدي لا إله إلا أنا لي الملك ولي الحمد فإذا قال لا إله إلا الله ولا حول ولا قوة إلا بالله قال صدق عبدي لا إله إلا أنا ولا حول ولا قوة إلا بي من رزقهن عند موته لم تمسه النار .

(صحيح) ( ت ن ه حب ك ) عن أبي هريرة وأبي سعيد . (الصحيحة ١٣٩٠)

**٧١٥- هەر كات بەندە بڵێ ( لا إله إلا الله والله أكبر ) خوای گەورە ئەفەرموێت بەندەی خۆم راست دەكات ( لا إله إلا أنا وانا أكبر ) واتە هیچ پەرستراوێك نییە بەحەق جگە لە من و منیش گەورەترم، وەكاتێ دەڵێ ( لا إله إلا الله وحده ) خوای گەورە ئەفەرموێت بەندەی خۆم راست دەكات( هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خۆم بەتەنها ) وەكاتێ دەڵێ ( لا إله إلا الله لا شريك له ) خوای گەورە ئەفەرموێت بەندەی خۆم راست دەكات( هیچ پەرستراوێك بە**

---

[1] ( ثُوِّبَ بالصلاة:دعا الى إقامتها،المعجم الوسيط ص١٠٢. ) .

**حەق نییە جگە لە خۆمو هیچ هاوەڵیشم نییە ) وەکاتێ دەڵێ( لا إله إلا الله له الملك وله الحمد ) خوای گەورە ئەفەرموێت بەندەی خۆم راست دەکات( هیچ پەرستراوێك نییە بەحەق جگە لە خۆم و موڵكو ستایش تەنها بۆ من دەکرێت ) وەکاتێ بڵێ( لا إله إلا الله ولا حول ولا قوه إلا بالله ) خوای گەورە ئەفەرموێت بەندەی من راست دەکات( هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خۆمو هیچ خۆلادان لە خراپەو توانای چاکەکردن نییە مەگەر بەهۆی منەوە نەبێت، جا هەر کەس خوای گەورە لەکاتی مردنیدا ئەم زیکرو یادانەی پێببەخشێتو بیانلێتەوە پارێزراو دەبێت لەئاگر .**

٧١٦-إذا قال المؤذن الله أكبر الله أكبر فقال أحدكم الله أكبر الله أكبر ثم قال أشهد أن لا إله إلا الله قال أشهد أن لا إله إلا الله ثم قال أشهد أن محمدا رسول الله قال أشهد أن محمدا رسول الله ثم قال حي على الصلاة قال لا حول ولا قوة إلا بالله ثم قال حي على الفلاح قال لا حول ولا قوة إلا بالله ثم قال الله أكبر الله أكبر قال الله أكبر الله أكبر ثم قال لا إله إلا الله قال لا إله إلا الله من قلبه دخل الجنة .

(صحيح) ( م د ) عن عمر . (صحيح أبي داود ٥٣٩)

**٧١٦- هەر کات بانگدەر ووتی( الله أكبر الله أكبر ) هەر یەك لە ئێوەش بڵێ ( الله أكبر الله أكبر ) پاشان کە دەڵێ ( اشهد أن لا إله إلا الله ) ئەمیش بڵێ ( اشهد أن لا إله إلا الله ) پاشان کە دەڵێ ( أشهد أن محمداَ رسول الله ) ئەمیش بڵێ ( أشهد أن محمداً رسول الله ) پاشان کە دەڵێ ( حی علی الصلاه ) ئەمیش بڵێ( لا حول ولا قوه إلا بالله ) پاشان کە دەڵێ( حی علی الفلاح ) ئەمیش بڵێ ( لا حول ولا قو إلا بالله ) پاشان کە دەڵێ ( الله أكبر الله أكبر ) ئەمیش بڵێ( الله اكبر الله اكبر ) پاشان کە دەڵێت( ( لا إله إلا الله ) ئەمیش بڵێ ( لا إله إلا الله ) کاتی ئەمانە بەدڵ بڵێ دەچێتە بەهەشتەوە.**

٧١٧- إذا نودي بالصلاة أدبر الشيطان وله ضراط حتى لا يسمع التأذين فإذا قضي النداء أقبل حتى إذا ثوب بالصلاة أدبر حتى إذا قضي التثويب أقبل حتى يخطر بين المرء ونفسه يقول اذكر كذا واذكر كذا لما لم يكن يذكر حتى يظل الرجل لا يدري كم صلى .

(صحيح) ( مالك ق د ن ) عن أبي هريرة . (صحيح أبي داود ٥٢٩)

**٧١٧- كاتێ بانگدەدرێت بۆ نوێژ شەیتان پشت هەڵدەكاتو تڕ دەكەنێت تا گوێی لەبانگ نەبێت جاكاتێ بانگ تەواو دەبێت دەگەڕێتەوە هەتا ئەو كاتەی قامەت دەكرێت دوبارە پشت هەڵدەكات هەتا تەواو دەبێت ئەوجا قامەت دەكرێت ئینجا دەگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی مێشكو دەروونی نوێژ خوێن سەرقاڵ بكاتو پێی دەڵێت: بیر لە فلان شتو فلان شت بكەرەوە ئەوەی كە لەبیرو هۆشیدا نەبوو دەیهێنێتەوە خەیاڵی تاوا لەنوێژ خوێن دەكات نەزانێ چەند ركاتی كردووە!**

٧١٨- إذا نودي بالصلاة فتحت أبواب السماء واستجيب الدعاء .

(صحيح) ( الطيالسي ع الضياء ) عن أنس . (الصحيحة ١٤١٣)

**٧١٨- كاتێ بانگ دەدرێت بۆ نوێژ دەرگاكانی ئاسمان دەكرێنەوەو دۆعاش گیرا دەبێت.**

٧١٩- اشفع الأذان وأوتر الإقامة .

(صحيح) ( خط ) عن أنس ( الدارقطني في الأفراد ) عن جابر . (الصحيحة ١٢٧٦)

**٧١٩- ووتەكانی بانگ دوو دوو بڵێرەوە بەڵام بۆ قامەت یەك یەك[1] .**

٧٢٠- أطول الناس أعناقا يوم القيامة المؤذنون .

(صحيح) ( حم ) عن أنس . (المشكاة ٦٥٤)

**٧٢٠- ئەوانەی گەردنیان لەهەموو كەس بەرزترە لە ڕۆژی قیامەتدا بانگدەركانن.**

٧٢١- أمناء المسلمين على صلاتهم وسحورهم هم المؤذنون .

(صحيح) ( هق ) عن أبي محذورة . (الإرواء ٢٢١)

**٧٢١- ئەمینداری موسڵمانان بۆ نوێژو پارشێوەكانیان بانگبێژەكانن.**

٧٢٢- أنت إمامهم واقتد بأضعفهم واتخذ مؤذنا لا يأخذ على أذانه أجرا .

(صحيح) ( حم د ن ك ) عن عثمان بن أبي العاص . (الإرواء ١٤٨٧)

**٧٢٢- تۆ پێشەوای ئەوانی ، شوێن لاوازترینیان بكەوە ، بانگدەرێك دابنێ لەسەر بانگدانەكەی پارە وەرنەگرێت.**

---

[1] (شەیخ مەناوی ئەڵێت: زۆربەیان دوو دوو دەوترێت نەك هەموویان ئەوەتا (الله اكبر) لەسەرەتاوە چوارجار دەگوترێت وە (تهليل) لا إله إلا الله لە كۆتاییدا یەك جار دەگوترێت)

٧٢٣- إن الشيطان إذا سمع النداء بالصلاة أحال له ضراط حتى لا يسمع صوته فإذا سكت رجع فوسوس فإذا سمع الإقامة ذهب حتى لا يسمع صوته فإذا سكت رجع فوسوس .

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٥٠٦)

**٧٢٣- بەراستی شەیتان کاتێ گوێی لە بانگ دەبێت پشت هەڵدەکاتو بەدەم ڕاکردنەوە تڕ دەکەنێت تا گوێی لە دەنگی بانگەکە نەبێت، وەکاتێ بێ دەنگ بوو دێتەوەو دڵەو ختورە دروست دەکات، وە کاتێ گوێی لە قامەت دەبێت پشت هەڵدەکاتو دەڕوات تا گوێی لێ نەبێت، وەکاتێ قامەت تەواو دەبێت دەگەڕێتەوەو وەسوەسە دروست دەکات.**

٧٢٤- إن الشيطان إذا سمع النداء بالصلاة ذهب حتى يكون مكان الروحاء .

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٥٠٦)

**٧٢٤- شەیتان کاتێ گوێی لە دەنگی بانگ دەبێت دەڕوات تا دەگاتە شوێنێ** (روحاء )[1] .

٧٢٥- إن الله وملائكته يصلون على الصف المقدم والمؤذن يغفر له مد صوته ويصدقه من سمعه من رطب ويابس وله مثل أجر من صلى معه .

(صحيح) ( حم ن الضياء ) عن البراء . (الترغيب ٢٣٥)

**٧٢٥- خوای گەورەو فریشتەکانی ڕەحمەتو سەڵەوات دەنێرنە سەر ڕیزی پێشەوەی نوێژخوێنان ، وە بانگدەر لە گوناهی بووراوە تا ئەو شوێنەی دەنگی دەڕوات، وە لە تەڕ و ووشك چی گوێیان لە دەنگی بێت دووپاتی دەکەنەوەو بە وێنەی ئەو کەسەی نوێژ دەکات لە گەڵیدا پاداشت وەردەگرێت.**

٧٢٦- إن المؤذن يغفر له مدى صوته ويصدقه كل رطب ويابس سمع صوته والشاهد عليه خمس وعشرون درجة .

(صحيح) ( حم ) عن أبي هريرة . (الترغيب ٢٣٤)

**٧٢٦- بێگومان بانگدەر چاوپۆشی کراوە لە گوناهی بە ئەندازەی تا ئەو شوێنەی دەنگی دەگاتێ ، وەرهەچی تەڕو ووشکاییە کە دەنگی ببیستێت مۆرکی ڕاستی بۆلی دەدەن، ئەوەش شاهێدی لەسەر دەدات بیستو پێنج پلەی هەیە.**

---

[1] **( روحاء : شوێنێکە ٣٦ تا ٤٠ میل لە شاری مەدینەوە دوورە )**

٧٢٧- إني أراك تحب الغنم والبادية فإذا كنت في غنمك أو باديتك فأذنت للصلاة فارفع صوتك بالنداء فإنه لايسمع مدى صوت المؤذن جن ولا إنس ولا حجر ولا شيء إلا شهد له يوم القيامة.

(صحيح) ( حم مالك خ ن ه ) عن أبي سعيد . (الترغيب ٢٣٢)

**٧٢٧- بەراستی من تۆ وادەبینم حەزت لە مەڕو دەشت و دەرەکەتە ، جا ئەگەر تۆ لەنێو مەڕەکان یا لەدەشتدا بووی بانگت دا بۆ نوێژ تا ئەتوانی دەنگت بەرز بکەوە لە بانگدا چونکە هەتا دەنگی بانگدەر بڕواتو لەجنۆکەو ئینسانو بەردو هەر شتێکی تر ئەوە لە رۆژی قیامەتدا شایەتی بۆ بانگدەر دەدەن.**

٧٢٨- الأذان تسع عشرة كلمة والإقامة سبع عشرة كلمة .

(صحيح) ( ن ) عن أبي محذورة . (صحيح أبي داود ٥١٧)

**٧٢٨-بانگ نۆزدە ووشەیەو قامەتیش حەڤدە ووشەیە.**

٧٢٩- الإمام ضامن و المؤذن مؤتمن اللهم أرشد الأئمة و اغفر للمؤذنين.

( د ت حب هق ) عن أبي هريرة ( حم ) عن أبي أمامة . (الإرواء ٢١٨)

**٧٢٩- پێشەوا بەرعۆدە و ئەستۆگیرە ، بانگبێژ ئەمینداره ، دەی خوایە ڕێنوێنی پێشەواکان بکە و لە گوناهی بانگبێژان خۆشبە.**

٧٣٠ – بين كل أذانين صلاة لمن شاء.

( حم ق ٤ ) عن عبدالله بن مغفل . (صحيح أبي داود ١١٦٣)

**٧٣٠ – لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا[1] نوێژکردن هەیە ، بۆ هەرکەس بیەوێت.**

٧٣١ - قل كما يقولون فإذا انتهيت فسل تعط - يعني المؤذنين -.

( حم د ن حب ) عن ابن عمرو. (صحيح أبي داود ٥٣٦)

**٧٣١- بانگ بێژەکان چی دەڵێن ، تۆش وابڵێ و کە لێ بویتەوە داوا لە خوا بکە پێت دەبەخشرێ .**

٧٣٢ - كان إذا سمع المؤذن قال مثل ما يقول حتى إذا بلغ: حي على الصلاة حي على الفلاح قال: لا حول و لا قوة إلا بالله.

( حم ) عن أبي رافع. (الصحيحة ٢٠٧٥)

---

**[1] أذانين: دوو بانگەکە واتە بانگ و قامەت هەرچۆن بە دایك و باوك دەڵێن ( أبوين ) یان ( والدين ) لە شێوازی زمانی عەرەبیدا پێی دەڵێن ( تغليب ) .**

**٧٣٢- پێغه‌مبه‌ر سه‌لاَت و سه‌لامی خوای له‌سه‌ر بێت كه گوێ ی له بانگبێژ ده‌بوو ، وه‌كو ئه‌و ده‌یوته‌وه ، هه‌تا ده‌گه‌یشته ( حی علی الصلاة حي علی الفلاح ) له‌وێدا ده‌یفه‌رموو ( لا حول ولا قوة إلا بالله ).**

٧٣٣- كان إذا سمع المؤذن يتشهد قال: و أنا و أنا.

( د ك ) عن عائشة. (صحيح أبي داود ٥٣٨)

**٧٣٣- پێغه‌مبه‌ر سه‌لاَت و سه‌لامی خوای له‌سه‌ر بێت كه گوێ ی له بانگ بێژ بوایه ده‌ڵێ ( أشهد أن لا اله الا الله ) ده‌یفه‌رموو هه‌روه‌ها منیش هه‌روه‌ها منیش.**

٧٣٤- كان له مؤذنان: بلال و ابن أم مكتوم الأعمى.

( م ) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ٥٤٦)

**٧٣٤- پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) دوو بانگبێژی هه‌بوون : بلال و ئیبن ومكتومی نابینا.**

٧٣٥- من أذن ثنتي عشرة سنة وجبت له الجنة و كتب له بتأذينه في كل يوم ستون حسنة و بإقامته ثلاثون حسنة.

( ه ك ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٤٢)

**٧٣٥- هه‌ركه‌س دوانزه ساڵ بانگ بێژی بكات و بانگ بفه‌رموێت به‌هه‌شتی بۆ مسۆگه‌ر ده‌بێت ، به بانگ وتنه‌كه‌ی له جیاتی هه‌موو ڕۆژێك شه‌ست چاكه‌ی بۆ ده‌نوسرێ و به قامه‌ت كردنه‌كه‌شی سی ( ٣٠ ) چاكه.**

٧٣٦- من قال حين يسمع المؤذن: و أنا أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له و أشهد أن محمدا عبده و رسوله رضيت بالله ربا و بمحمد رسولا و بالإسلام دينا غفر الله له ما تقدم من ذنبه.

( حم م ٤ ) عن سعد. (صحيح أبي داود ٥٣٦)

**٧٣٦-هه‌ركه‌س كه گوێ ی له بانگ بوو بڵێ : منیش شه‌هاده‌ت ئه‌ده‌م كه هیچ په‌رستراوێك به‌هه‌ق نیه جگه له الله ته‌نهایه و هاوبه‌شی نیه وه شه‌هاده‌ت ئه‌ده‌م كه محمد به‌نده‌و ڕه‌وانه‌كراوی ئه‌وه ، ڕازیم به په‌روه‌ردگاریه‌تی خوا و پێغه‌مبه‌رایه‌تی محمد و ڕازیم ئیسلام دینم بێت ، خوا له گوناهه‌كانی ڕابردوی خۆش ده‌بێت.**

٧٣٧- من قال حين يسمع النداء: اللهم رب هذه الدعوة التامة و الصلاة القائمة آت محمدا الوسيلة و الفضيلة و ابعثه مقاما محمودا الذي وعدته حلت له شفاعتي يوم القيامة.

( حم خ ٤ ) عن جابر. (الإرواء ٢٤٣)

**٧٣٧- هەركەس كە گوێ ی لە بانگ بوو بڵێ : ( اللهم رب هذه الدعوة التامة و الصلاة القائمة آت محمدا الوسيلة و الفضيلة و ابعثه مقاما محمودا الذي وعدته ) ( شەفاعەتی ) تكای منی بۆ مسۆگەر دەبێت.**

٧٣٨- المؤذن يغفر له مد صوته و أجره مثل أجر من صلى معه.

( طب ) عن أبي أمامة. (الترغيب ٢٣٦)

**٧٣٨- بانگبێژ بە درێژایی دەنگی خوا لە گوناهی خۆش دەبێت و ، پاداشتی وەكو پاداشتی ئەو كەسەیە نوێژی لەگەڵ دەكات.**

٧٣٩- المؤذن يغفر له مدى صوته و يشهد له كل رطب و يابس و شاهد الصلاة يكتب له خمس و عشرون صلاة و يكفر عنه ما بينهما.

( حم د ن ه حب ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٦٦٧)

**٧٣٩- بانگبێژ ئەوەندەی دەنگی بڕوات خوا لە گوناهی خۆش دەبێت و ، هەرچی تەڕ و ووشك هەیە شاهیدی بۆ ئەدات ، ئەگەر ئامادەی نوێژ كردنیش بوو بیست و پێنج نوێژی بۆ دەنوسریت و لە گوناهی نێان نوێژەكانیشی چاوپۆشی دەكرێت.**

٧٤٠- المؤذنون أطول الناس أعناقا يوم القيامة.

( حم م ه ) عن معاوية. (المشكاة ٦٥٤)

**٧٤٠- بانگبێژ لە ڕۆژی دواییدا لە هەموو كەس گەردنیان بەرزترە.**

٧٤١- المؤذنون أمناء المسلمين على صلاتهم و حاجتهم[1] .

( هق ) عن الحسن مرسلا. (الإرواء ٢٢١)

**٧٤١-بانگبێژان ئەمینداری موسڵمانان بۆ كاتی نوێژەكانیان و پێویستیەكانیان.**

٧٤٢- المؤذنون أمناء المسلمين على فطرهم و سحورهم.

( طب ) عن أبي محذورة. (الإرواء ٢٢١)

**٧٤٢- بانگبێژان ئەمینداری موسڵمانانن بۆ كاتی بەربانگ و پارشێویان.**

٧٤٣- يعجب ربك من راعي غنم في رأس شظية بجبل يؤذن للصلاة و يصلي فيقول الله عز و جل: انظروا إلى عبدي هذا يؤذن و يقيم الصلاة يخاف مني قد غفرت لعبدي و أدخلته الجنة.

( حم د ن ) عن عقبة بن عامر. (الصحيحة ٤١)

---

[1] **وەكو بەربانگ و شتی وا.**

**٧٤٣- پەروەردگارت خۆشی دێت لە شوانێك لەسەر لوتکەی چیایەك بانگ دەڵێت و نوێژ دەکات ، خوا ( عز وجل ) دەفەرموێت: سەیری ئەو بەندەی من بکە بانگ دەڵێت و بە چاکی نوێژ دەکات ، و لە من دەترسێت بەڕاستی ئەوا لە بەندەی خۆم خۆشبووم و دەشیخەمە بەهەشت.**

٧٤٤- لا تؤذن حتى يستبين لك الفجر هكذا [1] .

( د ) عن بلال. (صحيح أبي داود ٥٤٥)

**٧٤٤- بانگ مەڵێ هەتا سپێدەت ئاوا بۆ دەرنەکەوێت.**

٧٤٥-..... لا تقوموا حتى تروني.

( ت ك ) عن جابر . (الإرواء ٢٢٨)

**٧٤٥-........... هەڵمەستن هەتا دەمبینن.**

٧٤٦- يا بلال ! أقم الصلاة أرحنا بها.

( حم د ) عن رجل. (المشكاة ١٢٥٣)

**٧٤٦-ئەی بیلال ! قامەت بکە و ئاسودەمان بکە پێ ی.**

## بابەتی پێویست بوونی نوێژ

٧٤٧- آمركم بأربع و أنهاكم عن أربع اعبدوا الله و لا تشركوا به شيئا و أقيموا الصلاة و آتوا الزكاة و صوموا رمضان و أعطوا الخمس من الغنائم و أنهاكم عن أربع: عن الدباء و الحنتم و المزفت و النقير.

( حم م ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ٣٩٥٧)

**٧٤٧- فەرمانتان پێ ئەکەم بە چوار شت و ڕێگریتان لێ ئەکەم لە چوار شت : خوا بپەرستن و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار مەدەن و ، نوێژەکانتان بە چاکی بکەن و ، زەکات بدەن و ، ڕۆژوی ڕەمەزان بگرن و ، پێنج یەکی دەست کەوت بدەن ، ڕێگریتان لە چوار شت دەکەم: لە کولەکە و ، و لە دیزە و گۆزەی سواڵەت و لە گۆزەی قیرزفت کراو ،لە دیبەگ(دۆڵ) [2] .**

٧٤٨- أتاني جبريل من عند الله تبارك و تعالى فقال: يا محمد ! إن الله عز و جل يقول: إني قد فرضت على أمتك خمس صلوات فمن وافى بهن على وضوئهن و مواقيتهن و ركوعهن و

---

[1] بە بیلالی فەرموو ، پێغەمبەریش سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت هەردوو دەستی بە باری پانی بڵاو کردەوە .

[2] ئەم چوار شتە لە سەردەمی نەفامیدا شەراب و مەیان تێدان دروست کراوە. وەرگێڕ.

سجودهن كان له عندي بهن عهد أن ادخله بهن الجنة و من لقيني قد انتقص من ذلك شيئا فليس له عندي عهد إن شئت عذبته و إن شئت رحمته.

( الطيالسي محمد بن نصر في كتاب الصلاة طب الضياء في المختارة ) عن عبادة بن الصامت . (الصحيحة ٨٤٢)

**٧٤٨- جيبريل له لايه‌ن خواوه هات بۆ لام ، فه‌رمووی : ئه‌ی محمد ! به‌ڕاستی خوا (عزوجل) ده‌فه‌رموێت: به‌ڕاستی من پێنج نوێژم له‌سه‌ر ئوممه‌ته‌كه‌ت پێویست كردووه ، جا هه‌ر كه‌س وه‌فایان پێ بكات و به ده‌ست نوێژیان و كاتیان و كرنوش و سوژده‌یانه‌وه ، ئه‌و كه‌سه به هۆیانه‌وه په‌یمانێكی له لای من هه‌یه كه بیخه‌مه به‌هه‌شته‌وه و ، هه‌ركه‌سیش بگات به من و شتێكی له‌وانه كه‌م كردبێته‌وه له لای من په‌یمانی نیه ، ئه‌گه‌ر بمه‌وێت سزای ئه‌ده‌م و ، ئه‌گه‌ر بمه‌وێت به‌زه‌یی خۆمی پێ ده‌به‌خشم.**

٧٤٩- قال الله تعالى: افترضت على أمتك خمس صلوات و عهدت عندي عهدا أنه من حافظ عليهن لوقتهن أدخلته الجنة و من لم يحافظ عليهن فلا عهد له عندي.

( ه ) عن أبي قتادة. (الصحيحة ٤٠٣٣)

**٧٤٩- خوا فه‌رمویه‌تی : له‌سه‌ر ئوممه‌تی تۆ پێنج نوێژم پێویست كردووه ، له لای خۆمه‌وه په‌یمانێكیشم داوه كه هه‌ركه‌س پارێزگاری له خۆیان و كاته‌كانیان بكات ده‌یخه‌مه به‌هه‌شته‌وه، هه‌ركه‌سیش پارێزگاریان لێ نه‌كات له لای من په‌یمانی نی یه.**

٧٥٠- اتقوا الله في الصلاة و ما ملكت أيمانكم[1] .

( خط ) عن أم سلمة . (الصحيحة ٨٦٨)

**٧٥٠- پارێزگاری له بێ فه‌رمانی خوا بكه‌ن ده‌رباره‌ی نوێژ و ئه‌وه‌ی به په‌یمان و به‌ڵێن وه‌رتان گرتووه و له‌به‌رده‌ستی ئێوه‌دان.**

٧٥١- أتيت بالبراق و هو دابة أبيض طويل فوق الحمار و دون البغل يضع حافره عند منتهى طرفه فركبته حتى أتيت بيت المقدس فربطته بالحلقة التي تربط بها الأنبياء ثم دخلت المسجد فصليت فيه ركعتين ثم خرجت فجاءني جبريل بإناء من خمر و إناء من لبن فاخترت اللبن فقال جبريل: اخترت الفطرة" ثم عرج بنا إلى السماء فاستفتح جبريل فقيل: من أنت ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال: محمد قيل: و قد بعث إليه ؟ قال: قد بعث إليه ففتح لنا فإذا أنا بآدم

---

[1] **له هه‌موو ئاده‌میزاد و ئاژه‌ڵی رێز لێ گیراو و شتی تریش .**

فرحب بي و دعا لي بخير" ثم عرج بنا إلى السماء الثانية فاستفتح جبريل فقيل: من أنت ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال: محمد قيل: و قد بعث إليه ؟ قال: قد بعث إليه ففتح لنا فإذا أنا بابني الخالة: عيسى بن مريم و يحيى بن زكريا فرحبا بي و دعوا لي بخير" ثم عرج بنا إلى السماء الثالثة فاستفتح جبريل فقيل: من أنت ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال: محمد قيل: و قد بعث إليه ؟ قال: قد بعث إليه ففتح لنا فإذا أنا بيوسف و إذا هو قد أعطي شطر الحسن فرحب بي و دعا لي بخير" ثم عرج بنا إلى السماء الرابعة فاستفتح جبريل فقيل: من هذا ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال: محمد قيل: و قد بعث إليه ؟ قال: قد بعث إليه ففتح لنا فإذا أنا بادريس فرحب بي و دعا لي بخير قال الله تعالى: ( و رفعناه مكانا عليا " ثم عرج بنا إلى السماء الخامسة فاستفتح جبريل فقيل: من هذا ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال: محمد قيل: و قد بعث إليه ؟ قال: قد بعث إليه ففتح لنا فإذا أنا بهارون فرحب بي و دعا لي بخير" ثم عرج بنا إلى السماء السادسة فاستفتح جبريل فقيل: من هذا ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال: محمد قيل: و قد بعث إليه ؟ قال: قد بعث إليه ففتح لنا فإذا أنا بموسى فرحب بي و دعا لي بخير" ثم عرج بنا إلى السماء السابعة فاستفتح جبريل فقيل: من هذا ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال: محمد قيل: و قد بعث إليه ؟ قال: قد بعث إليه ففتح لنا فإذا أنا بإبراهيم مسندا ظهره إلى البيت المعمور و إذا هو يدخله كل يوم سبعون ألف ملك لا يعودون إليه ثم ذهب بي إلى سدرة المنتهى و إذا ورقها كآذان الفيلة و إذا ثمرها كالقلال فلما غشيها من أمر الله ما غشي تغيرت فما أحد من خلق الله يستطيع أن ينعتها من حسنها فأوحى الله إلي ما أوحى ففرض علي خمسين صلاة في كل يوم و ليلة" فنزلت إلى موسى فقال: ما فرض ربك على أمتك قلت: خمسين صلاة قال: ارجع إلى ربك فسله التخفيف فإن أمتك لا تطيق ذلك فإني قد بلوت بني إسرائيل و خبرتهم فرجعت إلى ربي فقلت: يا رب خفف عن أمتي فحط عني خمسا" فرجعت إلى موسى فقلت: حط عني خمسا قال: إن أمتك لا يطيقون ذلك فارجع إلى ربك فسله التخفيف" فلم أزل أرجع بين ربي و بين موسى حتى قال: يا محمد إنهن خمس صلوات كل يوم و ليلة لكل صلاة عشر فذلك خمسون صلاة و من هم بحسنة فلم يعملها كتبت له حسنة فإن عملها كتبت له عشرا و من هم بسيئة فلم يعملها لم تكتب شيئا فإن عملها كتبت سيئة واحدة" فنزلت حتى انتهيت إلى موسى فأخبرته فقال: ارجع إلى ربك فسله التخفيف فقلت: قد رجعت إلى ربي حتى استحييت منه .

( حم م ) عن أنس . (الصحيحة ٣٩٥٦)

٧٥١- بوراقم بۆ هێنرا – كە وولاخێكی سپی درێژ بوو – لە گوێدرێژ گەورەتر و لە ئێستر بچوكتر، سمی دادەنا ئەوەندەی چاوی بڕی بكردایە ، سواری بووم هەتا گەیشتمە (بیت المقدس) خانوی بیگەرد ، لەوێ بەستمەوە بەو ئالقەی پێغەمبەرەكان ولاخیان پێوە دەبەستەوە، ئینجا چوومە مزگەوتەكەوە و دوو ركات نوێژم تێدا كرد ، ئینجا هاتمە دەرەوە ، یەكسەر جیبریل قاپێ مەی و قاپێ شیری بۆ هێنام ، شیرەكەم هەڵبژارد ، جیبریل فەرمووی : سروشتت هەڵبژارد ، ئینجا بەرزی كردینەوە بۆ ئاسمان و جیبریل داوای كرد دەرگا بكەنەوە، ووترا: تۆ كێ ی ؟ فەرمووی جیبریل ، وترا : كێت لەگەڵدایە؟ فەرمووی : محمد وترا: ئایا لە دووی نێردراوە ؟ فەرموی بەڵێ بەدوایدا نێردراوە دەرگامان بۆ كرایەوە و یەكسەر ئادەمم بینی پێشوازی لێ كردم و نزای چاكی بۆ كردم ئینجا بەرزیان كردینەوە بۆ ئاسمانی دووەم ، جبریل لە دەرگای دا ، ووترا تۆ كێ ی ؟ فەرموی: جبریل ، ووترا: كێت لەگەڵ دایە ؟ فەرموی : محمد ، وترا: ئایا لە دووی نێردراوە ؟ فەرمووی : بەڵێ بە دوایدا نێردراوە ، دەرگامان بۆ كرایەوە و یەكسەر دوو پورزای[1] یەكترم بینی كە عیسا ی كوڕی مەریەم و یحیی كوڕی زەكەریام بینی نزای خێریان بۆ كردم ، ئینجا ، ئینجا بەرزیان كردینەوە بۆ ئاسمانی سێ یەم، جبریل لە دەرگای دا ، ووترا تۆ كێ ی ؟ فەرموی: جبریل ، ووترا: كێت لەگەڵ دایە ؟ فەرموی : محمد ، وترا: ئایا لە دووی نێردراوە ؟ فەرمووی : بەڵێ بە دوایدا نێردراوە ، دەرگامان بۆ كرایەوە و یەكسەر یوسفم بینی ، بەڕاستی نیوەی جوانی پێ بەخشراوە پێشوازی لێ كردم و نزای خێری بۆ كردم ، ئینجا بەرزكراینەوە بۆ ئاسمانی چوارەم، جبریل لە دەرگای دا ، ووترا تۆ كێ ی ؟ فەرموی: جبریل ، ووترا: كێت لەگەڵ دایە ؟ فەرموی : محمد ، وترا: ئایا لە دووی نێردراوە ؟ فەرمووی : بەڵێ بە دوایدا نێردراوە ، دەرگامان بۆ كرایەوە یەكسەر ئیدریسم بینی و پێشوازی لێ كردم و نزای خێری بۆ كردم ،خوا دەفەرمەرموێت (ورفعنا مكانا عليا) ئینجا بەرزكراینەوە بۆ ئاسمانی پێنجەم، جبریل لە دەرگای دا ، ووترا تۆ كێ ی ؟ فەرموی: جبریل ، ووترا: كێت لەگەڵ دایە ؟ فەرموی : محمد ، وترا: ئایا لە دووی نێردراوە ؟ فەرمووی : بەڵێ بە دوایدا نێردراوە ، دەرگایان

---

[1] كوڕی پورم خوشكی دایكمی (ابن الخالە) عیسی م بینی كە بە جیا بوو سەلامی خوایان لێ بێت.

بۆ كردینەوە یەكسەر هارونم بینی، و پێشوازی لیّ كردم و نزای خێری بۆ كردم ، ئینجا بەرزكراینەوە بۆ ئاسمانی شەشەم، جبریل لە دەرگای دا ، ووترا تۆ كیّ ی ؟ فەرموی: جبریل ، ووترا: كێت لەگەڵ دایە ؟ فەرموی : محمد ، وترا: ئایا لە دووی نێردراوە ؟ فەرمووی : بەڵیّ بە دوایدا نێردراوە ، دەرگامان بۆ كرایەوە یەكسەر موسام بینی پێشوازی لیّ كردم و دوعای خێری بۆ كردم ،ئینجا بەرزكراینەوە بۆ ئاسمانی حەوتەم، جبریل لە دەرگای دا ، ووترا تۆ كیّ ی ؟ فەرموی: جبریل ، ووترا: كێت لەگەڵ دایە ؟ فەرموی : محمد ، وترا: ئایا لە دووی نێردراوە ؟ فەرمووی : بەڵیّ بە دوایدا نێردراوە ، دەرگامان بۆ كرایەوە یەكسەر ابراهیمم بینی ، پشتی دابوو بە بەیتولەعمورەوە ، كە رۆژی حەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناویەوە و جارێكی تر دووبارەی ناكەنەوە ، ئینجا بردیانم بۆ لای (سدرە المنتهی) گەڵاكانی وەكو گویّ ی فیل وابوون و میوەكەشی وەكو گۆزەی [1] هەجر وابوو كە فەرمانی خوای بەسەردا دەدرا، دەگۆڕدرا ، هیچ لە دروستكراوەكانی ناتوانیّ وەسفی بكات لە جوانیدا ، خوا سروشتی (نیگا)ی بۆ كردم و پەنجا نوێژی لەسەر پێویست كردم لە شەووڕۆژێكدا ، هاتمە خوار بۆ لای موسا ، فەرمووی پەروەردگارت چی لەسەر ئوممەتەكەت پێویست كرد؟ ووتم: پەنجا نوێژ، فەرموی بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت داوای ئاسانكاری لیّ بكە ، بەڕاستی ئوممەتەكەت ئەوەی لە تواناداا نیە ، بێگومان من بەنی ئیسرائیلم تاقی كردۆتەوە بۆم دەركەوتون ، گەڕامەوە بۆ لای پەروەردگارم ووتی ئەی پەروەردگارا ئاسانكاری بۆ ئوممەتەكەم بكە، پێنجی بۆ لابرد ، گەڕامەوە بۆ لای موسا ، ووتم: پێنجی بۆ لابردم ، فەرمووی: بەڕاستی ئوممەتەكەت توانای ئەوەی نیە، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت داوای ئاسانكاری لیّ بكە ، بەردەوام دەگەڕامەوە بۆ لای پەروەردگارم و دەگەڕامەوە بۆ لای مووسا هەتا فەرمووی: ئەی محمد! پێنج نوێژن لە شەوو ڕۆژێكدا هەر نوێژێكیش بە دە نوێژە ، ئەمە دەكاتە پەنجا نوێژ ، ئیتر هەركەس بە دڵی دا بێت و نەیكات یەك چاكەی بۆ دەنوسم، ئەگەر كردی دە چاكەی بۆ دەنوسریّ ، هەركەسیش بە دڵی دابێت خراپەیەك بكات

---

[1] القلال: گۆزە ، دیزە لە ڕیوایەتی تردا (قلال هجر) هاتووە واتە: گۆزەی گوندی هەجر (هەجر) گوندێكە لە بەحرەین و (الفلة) گۆزەی گەورە . السيرة النبوية – للصلابي ج١ ص ٣٩٠ ط١.

**و نەیكات هیچ نانوسرێت، ئەگەر كردی یەك خراپە دەنوسرێت، هاتمە خوار هەتا گەشتمە لای مووسا و هەواڵم دایە، فەرمووی : بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت و داوای ئاسانكاری لێ بكە، ووتم بەڕاستی ئەوەندە گەڕامەوە بۆ لای پەروەردگارم هەتا شەرمم كرد .**

٧٥٢- إن الله افترض على العباد خمس صلوات في كل يوم و ليلة.

( طس ) عن عائشة . (الترغيب ٣٧٠)

**٧٥٢- بەڕاستی خوا لەسەر بەندەكان پێنج نوێژی پێویست كردووە لە هەموو شەوو ڕۆژێكدا.**

٧٥٣- بين الرجل و بين الشرك و الكفر ترك الصلاة.

( م د ت ه ) عن جابر . (المشكاة ٥٦٩)

**٧٥٣- نێوانی كەسی بڕوادار و هاوبەش دانەر و بێ باوەڕ وازهێنانە لە نوێژ.**

٧٥٤- بين الكفر و الإيمان ترك الصلاة.

( ت ) عن جابر . (الروض ٢٢٤)

**٧٥٤- نێوانی بێ باوەڕی و باوەڕ وازهێنانە لە نوێژ.**

٧٥٥- خمس صلوات افترضهن الله عز و جل من أحسن وضوءهن و صلاهن لوقتهن و أتم ركوعهن و خشوعهن كان له على الله عهد أن يغفر له و من لم يفعل فليس له على الله عهد إن شاء غفر له و إن شاء عذبه.

( د هق ) عن عبادة بن الصامت . (صحيح أبي داود ٤٥١)

**٧٥٥- خوا پێنج نوێژی فەرز و پێویست كردون هەركەس بە چاكی دەست نوێژیان بۆ بگرێت و لە كاتی خۆیاندا بیانكات و بە كڕنوش و ملكەچی تەواوەوە بیانكات، ئەوە لە لای خوا پەیمانێكی هەیە كە لێی خۆش بێت، هەركەسیش ئەوە نەكات لە لای خوا پەیمانی نیە، ئەگەر بیەوێت لێ ی خۆش دەبێت و ئەگەر بیەوێت سزای دەدات.**

٧٥٦- خمس صلوات افترضهن الله عز و جل من أحسن وضوءهن و صلاهن لوقتهن و أتم ركوعهن و خشوعهن كان له على الله عهد أن يغفر له و من لم يفعل فليس له على الله عهد إن شاء غفر له و إن شاء عذبه.

( د هق ) عن عبادة بن الصامت . (صحيح أبي داود ١٢٧٦)

**٧٥٦- پێنج نوێژ كە خوا پێویستی كردون لەسەر بەندەكانی ، جا هەركەس بیانكات و هیچیان زایەیان نەكات و بە بێ هودە سەیریان نەكات و سوكایەتی بە مافەكانیان نەكات**

**. لە لای خوا پەیمانێکی هەیە کە بیخاتە بەهەشتەوە، هەرکەسیش نەیانکات لە لای خوا پەیمانی نیە، ئەگەر بیەوێت لێ ی خۆش دەبێت و ئەگەر بیەوێت سزای دەدات.**

٧٥٧- الصلاة و ما ملكت أيمانكم الصلاة و ما ملكت أيمانكم.

( حم ن ه حب ) عن أنس ( حم ه ) عن أم سلمة ( طب ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٨٦٨)

**٧٥٧- نوێژ و کەنیزەك و کۆیلەکانتان ، نوێژ و کەنیزەك و کۆیلەکانتان .**

٧٥٨- العهد الذي بيننا و بينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر.

( حم ت ن حب ك ) عن بريدة. (المشكاة ٥٧٤)

**٧٥٨- پەیمانی نێوان ئێمە و ئێوە نوێژ هەرکەس وازی لێ هێنا بەڕاستی بێ باوەڕە.**

٧٥٩- ليس بين العبد و الشرك إلا ترك الصلاة فإذا تركها فقد أشرك.

( ه ) عن أنس. (الترغيب ٨٥٦)

**٧٥٩- لە نێوان بەندەی موسوڵمان و هاوبەش داناندا تەنها ، نوێژ هەیە ، جا ئەگەر وازی لێ هێنا هاوبەشی داناوە.**

٧٦٠- ثلاث أحلف عليهن: لا يجعل الله تعالى من له سهم في الإسلام كمن لا سهم له و أسهم الإسلام ثلاثة: الصلاة و الصوم و الزكاة و لا يتولى الله عبدا في الدنيا فيوليه غيره يوم القيامة و لا يحب رجل قوما إلا جعله الله معهم و الرابعة لو حلفت عليها رجوت أن لا آثم: لا يستر الله عبدا في الدنيا إلا ستره يوم القيامة.

( حم ن ك هب ) عن عائشة ( ع ) عن ابن مسعود ( طب ) عن أبي أمامة . (الصحيحة ١٣٨٧)

**٧٦٠- سوێند لەسەر سێ شت دەخۆم ، ئەوانەی خوا پشکی لە ئیسلامدا بۆ داناون وەکو ئەوانە نین کە پشکیان نیە، ئیسلامیش سێ پشکە (بەشە) : نوێژ ڕۆژوو زەکات، هیچ بەندەیەك نیە خوا لە دنیادا سەرپەرشتی بکات و لە دواڕۆژدا بیداتە دەست کەسێکی تر، هیچ کەسێك نیە کەسانێکی خۆش بوێت خوا لەگەڵ ئەوان دایەنێت[1] ، چوارەمیش ئەگەر سوێندی لەسەر بخۆم ئومێدم وایە گوناهبار نەبم، هیچ بەندەیەك نیە خوا لە دنیادا دایپۆشێت و لە دواڕۆژدا داینە پۆشێت[2] .**

---

[1] هەرکەس چاکەکارانی خۆش ویست لەدواڕۆژدا لەگەڵ ئەواندا دەبێت و هەرکەسیش خراپەکاران و شەڕەنگێزانی خۆش بوێت لەگەڵ ئەواندا دەبێت.

[2] واتە: عەیب و عارو شتی ئابڕو بەری بۆ دا پۆشێت.

## بابەتی پلەو پایەی نوێژ

٧٦١- اعلم أنك لا تسجد لله سجدة إلا رفع الله لك بها درجة و حط عنك بها خطيئة.

( حم ع حب طب ) عن أبي أمامة . (الصحيحة ١٤٨٨)

**٧٦١- بزانە بەڕاستی تۆ یەك سوژدە بۆ خوا نابەیت كە خوا بەو كڕنوشە پلە یەك بەرزت نەكاتەوە و گوناهێكت بۆ نەسڕێتەوە.**

٧٦٢- أكثر من السجود فإنه ليس من مسلم يسجد لله تعالى سجدة إلا رفعه الله بها درجة في الجنة و حط عنه بها خطيئة.

( ابن سعد حم ) عن أبي فاطمة . (الصحيحة ١٥١٩)

**٧٦٢- زۆر سوژدە ببە چونكە بێگومان هیچ موسڵمانێك نیە سوژدە بۆ خوا بەرێت یەك سوژدە و خوا پلەیەك بەرزی نەكاتەومو گوناهێكی بۆ نەسڕێتەوە.**

٧٦٣- إن الصلوات الخمس يذهبن بالذنوب كما يذهب الماء الدرن.

( محمد بن نصر ) عن عثمان . (الصحيحة ١٦١٤)

**٧٦٣- بەڕاستی پێنج نوێژەكە گوناهەكان لادەبەن هەروەكو ئاو چڵك لادەبات.**

٧٦٤- إن العبد إذا قام يصلي أتي بذنوبه كلها فوضعت على رأسه و عاتقيه فكلما ركع أو سجد تساقطت عنه.

( طب حل هق ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١٣٩٨)

**٧٦٤- بەندەی موسڵمان كە هەستا نوێژ بكات هەموو گوناهەكانی دەهێنرێت و دەخرێنە سەرسەری و گەردنی جا هەر كە كڕنوش و سوژدەی برد دەكەونە خوارەوە.**

٧٦٥- أول ما يحاسب الناس به يوم القيامة من أعمالهم الصلاة يقول ربنا عز و جل لملائكته و هو أعلم: انظروا في صلاة عبدي أتمها أم نقصها ؟ فإن كانت تامة كتبت له تامة و إن كان انتقص منها شيئا قال: انظروا هل لعبدي من تطوع ؟ فإن كان له تطوع قال: أتموا لعبدي فريضته ثم تؤخذ الأعمال على ذاكم.

( حم د ن ك ) عن أبي هريرة . (صحيح أبي داود ٨١٠)

**٧٦٥- بێگومان یەكەم شتێك لێپرسینەوەی لەگەڵ بەندەدا لەسەر بكرێت لە ڕۆژی دواییدا نوێژە ، جا ئەگەر چاك بوو ئەوە دەرچووە و ڕزگاری بووە ، ئەگەر خراپیش بوو**

**بەڕاستی خەسارەمەند و زەرەری لێ کەوتووە ئەگەر لە فەرزێکدا کەمتەرخەمی هەبێت پەروەردگار دەفەرموێت: سەیرکەن ئاخۆ بەندەکەم سوننەت و خۆبەخشی هەیە ؟ کەم و کوڕی فەرزەکانی پێ تەواو بکەن ، ئینجا تەواوی کردەوەکانی بەو شێوەیە.**

٧٦٦- إن كل صلاة تحط ما بين يديها من خطيئة[1] .

( حم طب ) عن أبي أيوب . (الترغيب ٣٦٥)

**٧٦٦- بەڕاستی هەموو نوێژێك هەڵە و گوناهەکانی بەردەمی دەسڕێتەوە .**

٧٦٧- أول ما يحاسب الناس به يوم القيامة من أعمالهم الصلاة يقول ربنا عز و جل لملائكته و هو أعلم: انظروا في صلاة عبدي أتمها أم نقصها ؟ فإن كانت تامة كتبت له تامة و إن كان انتقص منها شيئا قال: انظروا هل لعبدي من تطوع ؟ فإن كان له تطوع قال: أتموا لعبدي فريضته ثم تؤخذ الأعمال على ذاكم.

( حم د ن ك ) عن أبي هريرة . (صحيح أبي داود ٨١٠)

**٧٦٧- یەکەم شتێك لەسەری لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵکیدا دەکرێت لە ڕۆژی دواییدا لە کردەوەکان نوێژە، پەروەردگارمان (عزوجل) بە فریشتەکانی دەفەرموێت کە خۆی زاناترە: سەیری نوێژی بەندەکەم بکەن بزانن بەتەواوی یان بەکەم و کوڕی کردونی ؟ جا ئەگەر تەواو بوون بە تەواوی بۆی بنوسن ئەگەر کەم و کوڕیشیان هەبوو فەرمووی : بزانن بەندەکەم سوننەت (خۆبەخشی) هەیە جا ئەگەر سوننەتی هەبێت دەفەرموێت فەرزەکانی بۆ تەواو بکەن ، ئینجا بەهەمان شێوە لەگەڵ کردەوەکان دەکرێت.**

٧٦٨- أول ما يحاسب به العبد الصلاة و أول ما يقضى بين الناس في الدماء.

( ن ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٧٤٨)

**٧٦٨- یەکەم شتێك لێپرسینەوەی بەندەی لەسەر دەکرێت نوێژە و ، یەکەم دادوەریش لە نێوان خەڵکیدا دەربارەی خوێنە[2] .**

٧٦٩- أول ما يحاسب به العبد يوم القيامة الصلاة فإن صلحت صلح له سائر عمله و إن فسدت فسد سائر عمله.

( طس الضياء ) عن أنس . (الصحيحة ١٣٥٨)

---

[1] چونکە نوێژی باوکی هەموو خوا پەرستیەکانەو یەکەم ئەرکە دوای باوەڕ. السراج المنير ج١ ص ١٥٦.

[2] خوێن : واتە کوشتن.

**٧٦٩- یەکەم شتێك لێپرسینەوەی بەندەی لەسەر دەکرێت نوێژە و ، جا ئەگەر چاك بوو هەموو کردەوەکانی چاکن ، ئەگەر خراپیش بوو هەموو کردەوەکانی خراپن.**

٧٧٠- أول ما يحاسب به العبد يوم القيامة صلاته فإن كان أتمها كتبت له تامة و أن لم يكن أتمها قال الله لملائكته: انظروا هل تجدون لعبدي من تطوع فتكملون بها فريضته ؟ ثم الزكاة كذلك ثم تؤخذ الأعمال على حسب ذلك.

( حم د ه ك ) عن تميم الداري . (صحيح أبي داود ٨١٢)

**٧٧٠- یەکەم شتێك لێپرسینەوەی بەندەی لەسەر دەکرێت لە ڕۆژی دواییدا نوێژەکەیەتی، جا ئەگەر بە تەواوی کردبوی بە تەواوی بۆی دەنوسرێت و ئەگەر بە تەواویش نەیکردبوو خوا بە فریشتەکانی دەفەرموێت : سەیرکەن ئاخۆ سوننەت بۆ بەندەکەم دەدۆزنەوە کە کردبێتی ئیتر فەرزەکانی پێ تەواو بکەن بۆی ، ئینجا زەکات بە هەمان شێوە و ، ئینجا کردەوەکان بەم شێوە وەردەگیرێن.**

٧٧١- تأكل النار ابن آدم إلا أثر السجود حرم الله عز و جل على النار أن تأكل أثر السجود.

( ه ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٥٨٨١)

**٧٧١- ئاگر هەموو لاشەی ئادەمیزاد دەخوات ( دەسوتێنێ ) جگە لە شوێنەواری سوژدە بخوات .**

٧٧٢- جعلت قرة عيني في الصلاة.

( طب ) عن المغيرة . (الصحيحة ١٨٠٩)

**٧٧٢- نوێژم کردۆتە فێنکی چاوم .**

٧٧٣- حبب إلي من دنياكم: النساء و الطيب و جعلت قرة عيني في الصلاة.

( حم ن ك هق ) عن أنس . (المشكاة ٥٢٦١)

**٧٧٣-لە دونیای ئێوەدا دوو شتم لا خۆشەویست کراوە : ئافرەت و بۆنی خۆش، نوێژ کراوەتە فێنکی چاوم.**

٧٧٤- ركعتان خفيفتان بما تحقرون و تنفلون يزيدهما هذا في عمله أحب إليه من بقية دنياكم.

( ابن المبارك ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٣٨٨)

**٧٧٤- دوو ڕکات نوێژی سادە کە بە کەم و بێ ئەهەمیەتیان ئەزانن لە سوننەتەکانتان لە کردەوەکانیان زیاد دەکەن لە لای من لە هەموو دونیاتان خۆشەویستترن.**

٧٧٥- صلاة في إثر صلاة لا لغو بينهما كتاب في عليين .

( د ) عن أبي أمامة. (صحيح أبي داود ٥٦٧)

**٧٧٥- نوێژ بە شوێن نوێژدا شتی پڕوپوچیان لە نێوان نەبێت لە پەڕاوی هەرە بەرزدان .**

٧٧٦- الصلاة خير موضوع فمن استطاع أن يستكثر فليستكثر .

( طس ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٣٩٠)

**٧٧٦- نوێژ باشترین شتێکە خوا داینابێت[1] ، جا هەرکەس دەتوانێت لێ ی زیاد بکات با لێ ی زیاد بکات.**

٧٧٧- الصلوات الخمس كفارة لما بينهن ما اجتنبت الكبائر و الجمعة إلى الجمعة و زيادة ثلاثة أيام .

( حل ) عن أنس. (الصحيحة ١٩٢٠)

**٧٧٧- پێنج نوێژە قەرەبوی گوناهی نێوانیانن ، ئەگەر پارێزراو بێت لە گوناهی گەورە، هەینیەکیش بۆ هەینیەکی تر و سێ ڕۆژ زیادەش.**

٧٧٨- الصلوات الخمس و الجمعة إلى الجمعة و رمضان إلى رمضان مكفرات لما بينهن إذا اجتنبت الكبائر .

( حم م ت ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٩٢٠)

**٧٧٨- پێنج نوێژە و هەینیەك بۆ هەینیەکی تر و ڕەمەزانێك بۆ ڕەمەزانێکی تر قەرەبوی نێوانیانن ئەگەر پارێزراو بێت لە گوناهی گەورە.**

٧٧٩- عليك بكثرة السجود فإنك لا تسجد لله سجدة إلا رفعك الله بها درجة و حط بها عنك خطيئة.

( حم م ت ن ه ) عن ثوبان وأبي الدرداء. (الإرواء ٤٥٦)

**٧٧٩- لە سەرتە سوژدەی زۆر بەری ، بە ڕاستی یەك سوژدە یەك سوژدە بۆ خوا نابەیت کە خوا بەو سوژدەیە پلەیەك بەرزت نەکاتەوەو گوناهێکت لێ نەسڕێتەوە .**

٧٨٠- عليك بكثرة السجود فإنك لا تسجد لله سجدة إلا رفعك الله بها درجة و حط بها عنك خطيئة[2] .

( حم م ت ن ه ) عن ثوبان وأبي الدرداء. (صحيح أبي داود ٤٥٥)

**٧٨٠- هەرگیز ناچێتە ئاگرەوە کەسێك پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆر ئاوابوون نوێژ بکات.**

٧٨١- ما عمل ابن آدم شيئا أفضل من الصلاة و صلاح ذات البين و خلق حسن.

( تخ هب ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٤٤٨)

**٧٨١- ئادەمیزاد هیچ کارێکی نەکردووە لە نوێژ و چاکسازی نێوان خەڵکی و ڕەوشت جوانی چاکتر بێت.**

---

[1] فيض القدير ج٤ ص ٣٢٤ رقم ٥١٨١ ط٤.

[2] واتە : نوێژی بەیانی و عەسر.

٧٨٢- ما من امرئ مسلم تحضره صلاة مكتوبة فيحسن وضوءها و خشوعها و ركوعها إلا كانت كفارة لما قبلها من الذنوب ما لم تؤت كبيرة و ذلك الدهر كله.

( م ) عن عثمان. (المشكاة ٢٨٦)

**٧٨٢- هيچ کەسێکی موسڵمان نیە کە کاتی نوێژ بێت و بەچاکی بە چاکی دەست نوێژ بشوات و مل کەچ بێت و بە چاکی کڕنوش بەرێت و نەبێتە قەرەبوو (کفارە) گوناهەکانی پێشووی ئەگەر گوناهی گەورەی نەکردبێت ، ئەمەش بە درێژایی ڕۆژگار.**

٧٨٣- ما من عبد يسجد لله سجدة إلا رفعه الله بها درجة و حط عنه بها خطيئة.

( حم ت ن حب ) عن ثوبان. (الإرواء ٤٥٦)

**٧٨٣- هيچ بەندەیەك [1] نیە کە سوژدەیەك بۆ خوا بەرێت ، خوا پلەیەك بەرزی نەکاتەوە و گوناهێکی لێ نەسڕێتەوە.**

٧٨٤- ما من عبد يسجد لله سجدة إلا كتب الله له بها حسنة و حط عنه بها سيئة و رفع له بها درجة فاستكثروا من السجود.

( ه طب الضياء ) عن عبادة بن الصامت. (الترغيب ٣٨٦)

**٧٨٤- هيچ بەندەیەك نیە سوژدەیەك بۆ خوا بەرێت حەتمەن خوا بەو سوژدەیە چاکەیەکی بۆ دەنوسرێ و ،ی گوناهێکی بۆ دەسڕێتەوە و پلەیەك بەرز دەبێتەوە ، دەی زۆر سوژدە بەرن.**

٧٨٥- ما من مسلم يتطهر فيتم الطهور الذي كتب الله عليه فيصلي هذه الصلوات الخمس إلا كانت كفارة لما بينهن.

( م ) عن عثمان. (الترغيب ٣٦٤)

**٧٨٥- هيچ موسڵمانێك نیە دەست نوێژ بە تەواوی بگرێت بەو شێوەی خوا لەسەری پێویست کردووە و ، ئەو پێنج نوێژە بکات کە خوا لەسەری پێویست کردووە ، حەتمەن دەبنە قەرەبوی ئەوی نێوانیان [2] .**

٧٨٦- مثل الصلوات الخمس كمثل نهر جار عذب على باب أحدكم يغتسل فيه كل يوم خمس مرات فما يبقي ذلك من الدنس.

( حم م ) عن جابر. (الإرواء ١٤)

---

[1] **واتە : بەندەیەکی موسڵمان.**

[2] **واتە قەرەبوی گوناهو تاوان.**

**٧٨٦- نمونەی پێنج نوێژەکە وەکو ڕوبارێکی ڕەوانی شیرین وایە کە بە بەردەرگای هەر یەکێکتاندا بڕوات و ڕۆژی پێنج جار خۆی لێ بشوات هیچ چڵك و پیسی پێوە نامێنێت.**

٧٨٧- من آمن بالله و رسوله و أقام الصلاة و آتى الزكاة و صام رمضان كان حقا على الله أن يدخله الجنة هاجر في سبيل الله أو جلس في أرضه التي ولد فيها.

( حم خ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٩٢١)

**٧٨٧- هەرکەس بڕوای بە خوا و پێغەمبەرەکەی هەبێت و بەچاکی نوێژ بکات و زەکات بدات و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت دەبێتە مافێك بەسەر خواوە کە بیخاتە بەهەشتەوە ، جا لە پێناوی خوادا کۆچی کردبێت یان لە خاکی خۆیدا دانیشتبێت کە تێدا لە دایك بووە.**

## بابەتی پارێزگاریکردن لە نوێژ

٧٨٨- حافظ على العصرين: صلاة قبل طلوع الشمس و صلاة قبل غروبها.

( د ك ق ) عن فضالة الليثي . (الصحيحة ١٨١٣)

**٧٨٨- پارێزگاری لە نوێژی (دوو عەسرەکە[1] ) بەیانی و عەسر بکە : نوێژ پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆرئاوابوون .**

٧٨٩- صلاة المغرب وتر النهار .

( ش ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٢٨١٤)

**٧٨٩- نوێژی ئێوارە نوێژی (ویتر) تاکی ڕۆژە.**

٧٩٠- لو يعلم الناس ما في النداء و الصف الأول ثم لم يجدوا إلا أن يستهموا عليه لاستهموا و لو يعلمون ما في التهجير لاستبقوا إليه و لو يعلمون ما في العتمة و الصبح لأتوهما و لو حبوا.

( مالك حم ق ن ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٦٢٨)

**٧٩٠- ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە چەند خێر و پاداشت لە بانگ و ڕیزی یەکەم دایە و چاریشیان نەبوایە بە تیروپشك (دەو) نەبوایە با تیر و پشکی بۆ بکەن و ، ئەگەر بیانزانیایە چەند خێر لە زوو ئامادەبوونی نوێژەکاندایە، پێشبڕکێیان بۆ دەکرد و ، ئەگەر بیانزانیایە چەند خێر لە نوێژی خەوتنان[2] و نوێژی بەیانی دا هەیە بە گاگۆڵکەش بوایە بۆیان دەهاتن.**

---

[1] دوو عەسرەکە واتە بەیانی و عەسر یان - شەوو ڕۆژ - قاموسی ڕستە ج٣ ص ١٧١٥.

[2] لە سەردەمی نەفامیدا بە خەوتنان واتە: دوای خۆرئاوابوون و کاتی نوێژی خەوتنانیان وتووە (عەتەمە) واتە: ووشتردۆش لەو کاتەدا ووشتریان دۆشیوە لە بەچاوەڕاز دواتر پێغەمبەر قەدەغەی کرد سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت.

٧٩١- لو يعلم الناس ما في صلاة العشاء و صلاة الفجر لأتوهما و لو حبوا.

( ه ) عن عائشة. (الإرواء ٤٨٦)

**٧٩١- ئەگەر خەڵكی بیانزانیایە چەند خێر لە نوێژی بەیانی و خەوتناندایە بە گاگۆڵکەش بوایە بۆیان دەهاتن.**

٧٩٢- الذي تفوته صلاة العصر كأنما وتر أهله و ماله.

( ق ٤ ) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ٤٤١)

**٧٩٢- ئەوەی نوێژی عەسری لە دەست بچێ هەروەكو هەموو خێزان و كەس و كار و ماڵی لە دەست دابێ وایە.**

٧٩٣- من الصلاة صلاة من فاتته فكأنما وتر[1] أهله و ماله - يعني العصر -.

( ن ) عن نوفل بن معاوية وابن عمر. (الترغيب ٤٨٠)

**٧٩٣- لە نوێژەكاندا نوێژێك هەیە هەركەس زایەی بكات و لەدەستی بدات وەكو خێزان و ماڵی لە دەست دابێ وایە. ( واتە نوێژی عەسر ).**

٧٩٤- من ترك صلاة العصر حبط عمله.

( حم خ ن ) عن بريدة. (الإرواء ٢٥٥)

**٧٩٤- هەركەس واز لە نوێژی عەسر بێنێت هەموو كردەوەكانی پووچەڵ دەبنەوە.**

٧٩٥- من صلى البردين دخل الجنة[2] .

( م ) عن أبي موسى. (المشكاة ٦٢٥)

**٧٩٥- هەركەس دوو نوێژە فێنكەكە بكات دەچێتە بەهەشتەوە.**

٧٩٦- إن هذه الصلاة - يعني العصر - عرضت على من كان قبلكم فضيعوها فمن حافظ منكم اليوم عليها كان له أجره مرتين و لا صلاة بعدها حتى يطلع الشاهد.

( م ن ) عن أبي بصرة الغفاري . (الإرواء ٢٥٨) (الصحيحة ٣٥٤٩)

**٧٩٦- بە ڕاستی ئەم نوێژە واتە: عەسر – درایە ئەوانەی پێش ئێوە زایەیان كرد ، جا هەركەس لە ئێوە ئەمڕۆ پارێزگاری لێ بكات دووجار پاداشتی هەیە ، لە دوای ئەو نوێژكردن نیە هەتا خۆر هەڵدێت.**

---

[1] **وتر: ای فقد واتە لەدەست دابێ و لە كیسی چوبێ. السراج المنير ج١ ص١٦٠.**

[2] **دوو نوێژە فێنكەكە بەیانی فێنكی بەیانی و عەسر فێنكی ئێوارە.**

**٧٩٧**-من صلى الصبح فهو في ذمة الله فلا يتبعنكم الله بشيء من ذمته.

( ت ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٣٦٧)

**٧٩٧- هەركەس نوێژی بەیانی بکات[1] ، ئەو لە پەنای[2] خوادایە هیچ داواکاریەکیشی لە نێوە نیە بۆ ئەو پەنادانە.**

**٧٩٨**- من صلى الصبح فهو في ذمة الله فلا يطلبنكم الله من ذمته بشيء فإن من يطلبه من ذمته بشيء يدركه ثم يكبه على وجهه في نار جهنم.

( حم م ت ) عن جندب البجلي. (الترغيب ٣٦٧)

**٧٩٨- هەركەس نوێژی بەیانی بکات بە جەماعەت (کۆمەڵ) ئەو لە ئەمانەت و پەنای خوادایە و بۆ ئەو پەنادانەشی هیچتان لێ داوا ناکات ، بێگومان ئەوەی خوا لە بەرامبەر ئەو پەنادانەدا داواکاری لێ بکات لەسەر ڕوو و بەدەما دەیخاتە ناو ئاگر.**

**٧٩٩**- من صلى الغداة كان في ذمة الله حتى يمسي.

( طب ) عن ابن عمر. (الترغيب ٤٦٢)

**٧٩٩- هەركەس نوێژی سبەینێ (بەیانی) بکات لە پەنای خوادایە هەتا ئێوارە دەکاتەوە .**

**٨٠٠**- من صلى الفجر فهو في ذمة الله فلا يطلبنكم الله بشيء من ذمته.

( هـ ) عن سمرة. (الترغيب ٣٦٧)

**٨٠٠- هەركەس نوێژی سپێدە (بەیانی) بکات ئەو لە پەنای خوادایە و هیچ داواکاریەکیشتان لێ ناکات بۆ ئەو پەنادانە.**

**٨٠١**- من صلى الفجر فهو في ذمة الله و حسابه على الله.

( طب ) عن والد أبي مالك الأشجعي. (الترغيب ٤٥٨)

**٨٠١- هەركەس نوێژی سپێدە (بەیانی) بکات ئەوە لە پەنای خوادایە و لێپرسینەوەشی هەر لەسەر خوادایە.**

**٨٠٢**- من صلى الفجر في جماعة ثم قعد يذكر الله حتى تطلع الشمس ثم صلى ركعتين كانت له كأجر حجة و عمرة تامة تامة تامة.

( ت ) عن أنس. (الترغيب ٤٦٤)

---

[1] **به کۆمەڵ (جماعه) السراج المنير ج١ ص١٦٠.**

[2] **( ذمة الله ) له ئەمانەت و بەنا و پەیمانی پاراستنی خوایە . السراج المنير ج١ ص١٦.**

**٨٠٢- هەرکەس نوێژی سپێدە (بەیانی)بە کۆمەڵ بکات و ئینجا دانیشێتیادی خوا بکات هەتا خۆر هەڵدێت ئینجا دوو ڕکات نوێژ بکات پاداشتی وەکو پاداشتی حەج و عومرەیەکی تەواو تەواو تەواو وایە.**

٨٠٣- من صلى صلاة لم يتمها زيد عليها من سبحاته حتى تتم.

( طب ) عن عائذ بن قرط. (الصحيحة ٣٤٥٠)

**٨٠٣- هەرکەس نوێژێکی ناتەواوی کرد کە کەموکوڕی هەبوو با بە سوننەت کردن لێ ی زیاد بکات هەتا تەواو دەبێت و کەم و کوڕیەکەی[1] پڕ دەبێتەوە.**

٨٠٤- يتعاقبون فيكم ملائكة بالليل و ملائكة بالنهار و يجتمعون في صلاة الفجر و صلاة العصر ثم يعرج الذين باتوا فيكم فيسألهم و هو أعلم بهم: كيف تركتم عبادي ؟ فيقولون: تركناهم و هم يصلون و أتيناهم و هم يصلون.

( ق ن ) عن أبي هريرة. (السنة ٤٩١)

**٨٠٤- بەر و دوا فریشتەی شەوو فریشتەی ڕۆژ دێنە ناوتان و ، لە نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر کۆدەبنەوە و یەکدەگرن،ئینجا ئەوانە شەو لە ناوتاندا بوون بەرزدەبنەوە ، خوا پرسیاریان لێ دەکات خۆشی لە ئەوان چاکتر دەزانێت : چۆن بەندەکانی منتان بەجێ هێشت ؟ دەڵێن: کە بە جێمان هێشتن ئەوان نوێژیان دەکرد و کە چووین بۆ لاشیان هەر نوێژیان دەکرد.**

## بابەتی مەرجەکانی نوێژ

٨٠٥- ما بين المشرق و المغرب قبلة.

( ت م ك ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٩٢)

**٨٠٥- نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا ڕووگەیە[2].**

٨٠٦- نهى أن يصلي خلف المتحدث و النائم[3].

---

[1] **واتە: ئەگەر سوننەتی گەورە و بچوکی نوێژە فەرزەکانی کەمیان هەبوو با بە کردنی نوێژی سوننەت پڕیان بکاتەوە ، یان ئەگەر لە پایە و مەرجەکانی نوێژە فەرزەکان کەم و کوڕی هەبوو و پێ ی نەزانیبوو با بە کردنی سوننەتی زۆر پڕیان بکاتەوە فیض القدير ج٦ ص٢٢١ رقم ٨٨١٤.**

[2] **ئەمەش زیاتر بۆ خەڵکی مەدینە و ئەوانەی لەسەر ئاستی ئەوانن السراج المنير ج١ ص ١٦١.**

[3] **قسەکەر لەوانەیە قسەی نابەجێ بکات و خەوخۆش لەوانەیە شتی نابەجێ و بێ هودەی لێ دەرچێت. ج١ ص ١٦٠ السراج المنير.**

( ه ) عن ابن عباس. (الإرواء ٣٧٤)

**٨٠٦- پێغەمبەر سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت قەدەغەی کردوە لە دوای قسەکەر و خەوتوەوە نوێژ بکرێت.**

٨٠٧- نهى عن الصلاة إلى القبور.

( حب ) عن أنس.

**٨٠٧- پێغەمبەر سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت قەدەغەی کردوە نوێژ ڕوەو گۆڕ بکرێت.**

٨٠٨- لا تصلوا خلف النائم و لا المتحدث.

( د هق ) عن ابن عباس. (الإرواء ٣٧٥)

**٨٠٨- نوێژ لە دوای خەوتو ( نوستو ) و قسەکەرەوە مەکەن.**

٨٠٩- إني أبرأ إلى الله أن يكون لي منكم خليل فإن الله قد اتخذني خليلا كما اتخذ إبراهيم خليلا و لو كنت متخذا من أمتي خليلا لاتخذت أبا بكر خليلا ألا و إن من كان قبلكم كانوا يتخذون قبور أنبيائهم و صالحيهم مساجد ألا فلا تتخذوا القبور مساجد إني أنهاكم عن ذلك.

( م ) عن جندب . (الإرواء ٢٨٦)

**٨٠٩- من پەنا بەخوا دەبەم ئەستۆپاکی خۆم بۆ خوا دەردەبڕم کە کەسێك لە ئێوە بکەمە هاودەمی خۆم ، بەڕاستی خوا منی کردۆتە خۆشەویستی خۆی هەروەکو ئیبراهیمی کردۆتە خۆشەویستی خۆی ، خۆ ئەگەر من کەسێکم لە ئوممەتم بکردایە هاودەم و خۆشەویستی خۆم بێگومان ئەبابەکرم دەکردە هاودەم و خۆشەویستی خۆم بێگومان پەروەردگارم منی کردۆتە هاودەم و خۆشەویستی خۆی هەروەکو ئیبراهیمیشی کردۆتە خۆشەویستی خۆی ، ئاگاداربن ئەوانەی پێش ئێوە گۆڕی پێغەمبەرەکان و پیاوچاکەکانیان دەکردە سوژدەگا و مزگەوت ، ئاگاداربن گۆڕەکان نەکەنە مزگەوت بەڕاستی من لێتان قەدەغە دەکەم.**

٨١٠- أيها الناس إنه قد كان لي فيكم إخوة و أصدقاء و إني أبرأ إلى الله أن يكون لي فيكم خليل و لو كنت متخذا من أمتي خليلا لاتخذت أبا بكر خليلا و إن ربي اتخذني خليلا كما اتخذ إبراهيم خليلا ألا إن من كان قبلكم كانوا يتخذون قبور أنبيائهم و صالحيهم مساجد ألا فلا تتخذوا القبور مساجد إني أنهاكم عن ذلك.

( م ن ) عن جندب . (الإرواء ٢٨٦)

**٨١٠- هۆ خەڵکینە من لەناو ئێوەدا براو هاوڕێم هەیە و بەڕاستی من ئەستۆپاکی خۆم بۆ خوا دەکەم کە هاودەم و خۆشەویستێك لە ئێوە بگرم ، خۆ ئەگەر هاودەم و خۆشەویستێکم بگرتایە ئەبابەکرم دەکردە خۆشەویست و هاودەم ، بەڕاستی پەروەردگارم منی کردۆتە خۆشەویستی خۆی هەروەکو ئیبراهیمیشی کردۆتە خۆشەویستی خۆی ، ئاگاداربن ئەوانەی پێش ئێوە گۆڕی پێغەمبەر و پیاو چاکەکانیان دەکردە سوژدەگا و مزگەوت ، ئاگاداربن گۆڕەکان مەکەن مزگەوت و سوژدەگا بەڕاستی من لێتان قەدەغە دەکەم.**

٨١١- لا تقبل صلاة الحائض إلا بخمار.

( حم ت ه ) عن عائشة. (الإرواء ١٩٩)

**٨١١- نوێژی ئافرەتی پێ گەیشتوو (کە بێنوێژی بەخۆیەوە دیبێت) دروست نیە بە سەرپۆشەوە[1] نەبێت.**

٨١٢- لا تقبل صلاة بغير طهور و لا صدقة من غلول.

( م ت ه ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٢٠)

**٨١٢- نوێژ بەبێ دەست نوێژ وەرناگیرێت و خێریش لە دزی و داگیرکردنی دەست کەوتی جەنگ وەرناگیرێت .**

٨١٣- اقتلوا الأسودين في الصلاة: الحية و العقرب.

( د ت حب ك ) عن أبي هريرة . (المشكاة ١٠٠٤)

**٨١٣- دوو ڕەشەکان لە نوێژدا بکوژن: مار و دووپشك.**

٨١٤-إذا صلى أحدكم فليأتزر و ليرتد.

( حب هق ) عن ابن عمر . (صحيح أبي داود ٦٤٥)

**٨١٤- ئەگەر هەر یەکێکتان نوێژی کرد با جلی سەرو خوار شەرواڵ و کراس لەبەر بکات.**

٨١٥- إذا صلى أحدكم فليلبس ثوبيه فإن الله تعالى أحق من تزين له.

( طس ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١٣٦٩)

**٨١٥- ئەگەر هەر یەکێکتان نوێژی کرد با هەردوو پارچە جلەکەی[2] لەبەر بکات.**

---

[1] پێگەیشتن و بێ نوێژی باسکردوە چونکە بە زۆری هەر ئەوە نیشانەی پێگەیشتنە ئەگەر نا کچێکی بچوکیش کە گەیشتوو نەبێت مەگەر چاك و خراپ لێك جیاکاتەوە و بفامێ بە بێ سەرپۆش دروست نیە. السراج المنير ج١ ص ١٦٢.

[2] واتە : جلی سەرەوە کراس ( الرداء ) و جلی خوارەوە ( الازار ) شرواڵ.

٨١٦- إذا صلى أحدكم فليلبس نعليه أو ليخلعهما بين رجليه و لا يؤذ بهما غيره.

( ك ) عن أبي هريرة . (صحيح أبي داود ٦٦٢)

**٨١٦- ئەگەر هەر یەکێکتان نوێژی کرد با هەردوو پێڵاوەکەی لە پێ بکات ، یان دایانبکەنێت و لە نێوان هەردوو قاچیدا دایان بنێت و کەسیان پێ ئازار نەدات.**

٨١٧- إذا صلى أحدكم في ثوب واحد فليخالف بطرفيه على عاتقيه .

(صحيح) ( حم د حب ) عن أبي هريرة ( حم ) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ٦٣٨)

**٨١٧- ئەگەر هەر کەس لەئێوە لەیەك قوماش و بەرگدا نوێژی کرد با ڕاست و چەپی بیهێنێتەوە بەسەر شان و ملیدا.**

٨١٨- إذا صلى أحدكم في ثوب واحد فليشده على حقويه ولا تشتملوا كاشتمال اليهود.

(صحيح) ( ك هق ) عن ابن عمر . (صحيح أبي داود ٦٤٥)

**٨١٨- ئەگەر هەرکەس لە ئێوە نوێژی کرد لەیەك قوماش و بەرگدا توند بیبەستێتەوە بەناو قەدیەوە ، وەك جولەکە مەکەن لای سەروی لاشەیان دادەپۆشن و شۆڕی ناکەنەوە بۆ خوارەوە تاهەموو لاشەیان دا پۆشێت.**

٨١٩- إذا صليتم فاتزروا وارتدوا ولا تشبهوا باليهود .

(صحيح) ( عد ) عن ابن عمر . (صحيح أبي داود ٦٤٥)

**٨١٩- کاتێ نوێژتان کرد جلەکانتان جوان ببستن لەخوارەوە و لەسەریشەوە شت لەبەر بکەن و خۆتان مەچوێنن بە جولەکە.**

٨٢٠- إذا صليت الصبح فأمسك عن الصلاة حتى تطلع الشمس فإنها تطلع بين قرني الشيطان فإذا طلعت فصل فإن الصلاة محضورة متقبلة حتى تعتدل على رأسك مثل الرمح فأمسك فإن تلك الساعة التي تسجر فيها جهنم وتفتح فيها أبوابها حتى ترتفع الشمس على حاجبك الأيمن فإذا زالت عن حاجبك الأيمن فصل فإن الصلاة محضورة متقبلة حتى تصلي العصر ثم دع الصلاة حتى تغيب الشمس .

(صحيح) ( حم ه ك ) عن صفوان بن المعطل . (الأحاديث الصحيحة ١٣٧١)

**٨٢٠- کاتێ نوێژی بەیانیت کرد ئیتر واز لەنوێژ کردن بهێنە تا خۆر هەڵدێ، چونکە لەنێوان هەردووشاخی شەیتانەوە هەڵدێت جا کەتەواو خۆر دەرکەوت ئەو کاتە نوێژ بکە چونکە کاتی گیرا بووە تا ئەو کاتەی خۆر بەڕاسەرتەوە وەك ڕم بیچەقێ و ڕێك دەوەستێ**

**لەو کاتەدا نوێژ مەکە، چونکە ئەوە کاتێکە دۆزەخ تێیدا سور دەبێتەوە و دەرگاکانی دەکرێتەوە نوێژ مەکە تا ئەوە کاتەی خۆر لەسەر بڕۆی ڕاستت لا دەچێ، ئەگەر لەسەر ئاستی بڕۆی ڕاستت ترازا ئەو کاتە نوێژ بکە و گیرایە، تا کاتی عەسر دێت پاشان نوێژ مەکە تا خۆر ئاوا دەبێت.**

٨٢١- إذا كان لأحدكم ثوبان فليصل فيهما فإن لم يكن إلا ثوب فليأتزر ولا يشتمل اشتمال اليهود .

(صحيح) ( د ) عن ابن عمر . (صحيح أبي داود ٦٤٥)

**٨٢١- هەریەك لەئێوە ئەگەر دوو پارچە جلتان هەبوو با نوێژیان پێوە بکات وە ئەگەر یەك پارچە بوو با لە پشتوێنی بەرەو خوارەوەی پێ دا پۆشێت و وەك جولەکە نەکات بیپێچێت بەخۆیەوە.**

٨٢٢- زره عليك ولو بشوكة .

(صحيح) ( حم ن حب ك ) عن سلمة بن الأكوع. (صحيح أبي داود ٦٤٣)

**٨٢٢- بیبەستەوە بەخۆتەوە بابەدڕکێکیش بێت** [1]

٨٢٣- من صلى في ثوب فليخالف بين طرفيه .

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٦٣٩)

**٨٢٣- هەرکەس بە پارچە جلێکەوە نوێژی کرد باهەردوو سەری پارچەکە ڕاست و چەپ بدات بەخۆیدا.**

٨٢٤-نهى أن يصلي الرجل في لحاف لا يتوشح به ونهى أن يصلي الرجل في سراويل وليس عليه رداء.

(صحيح) ( د ك ) عن بريدة. (صحيح أبي داود ٦٤٦)

**٨٢٤- پێغەمبەری خوا(ﷺ)قەدەغەی کردووە لە کەسێك نوێژ بکات بە پارچە قوماشێکەوەو لای چەپی قوماشەکە لە ژێر چەپیەوە نەدات بەسەر شانی ڕاستیداو لای ڕاستی قوماشەکەش لە ژێر ڕاستیەوە نەدات بەسەر شانی چەپیدا هەروەها قەدەغەی کردوە لەو کەسەی نوێژ بکات بەشەرواڵێکەوەو قوماشێك بەخۆیدا نەدات.**

٨٢٥- نهى أن يصلي الرجل ورأسه معقوص .

(صحيح) ( طب ) عن أم سلمة. (الصحيحة ٢٣٨٦)

---

[1] (( ئەمە وەلام بوو بۆ ئەو کەسەی پرسیاری لێکرد ئایا بەیەك پارچە قوماشەوە نوێژ بکەم؟ فەرمووی بەڵێ بیبەستەوە بەخۆتەوە بابە دڕکیش بێت مەبەست لەوەیە ( عەورەتی دەرنەکەوێت ) )

**٨٢٥- پێغەمبەری خوا( ﷺ ) قەدەغەی كردووە لەو كەسەی نوێژ بكات و سەری پێچابێت.**

٨٢٦- نهى أن يصلي الرجل وهو حاقن .

(صحيح) ( ه ) عن أبي أمامة. (ضعيف أبي داود ١١)

**٨٢٦- پێغەمبەری خوا( ﷺ ) قەدەغەی كردووە لەو كەسەی نوێژ بكات و میز تەنگاوی كرد بێت.**

٨٢٧- لا يصلي أحدكم في الثوب الواحد ليس على عاتقه منه شيء .

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٧٥)

**٨٢٧- باهیچ كەس لەئێوە لەتەنها پارچە قوماشێكدا نوێژ نەكات ئەوەندە قوماشەكە كەم بێت بەشی سەرشانی نەكات.**

٨٢٨- لا يقبل الله صلاة حائض إلا بخمار .

(صحيح) ( د ك ) عن عائشة. (الإرواء ١٩٩)

**٨٢٨- خوای گەورە نوێژی ئافرەتێكی پێگەشتوو وەرناگرێت[1] بەسەرپۆشەوە نەبێت.**

٨٢٩- إذا كان أحدكم يصلي فلا يرفع بصره إلى السماء لا يلتمع .

(صحيح) ( مالك ق ن ) عن ابن عمر . (الترغيب ٥٥٠)

**٨٢٩- ئەگەر هەر كەس لەئێوە نوێژی كرد باچاوی بەرز نەكاتەوە و سەیری ئاسمان نەكات نەك بریسكەی روناكی چاوی ببات.**

٨٣٠- إذا اتسع الثوب فتعطف به على منكبيك ثم صل و إن ضاق عن ذلك فشد به حقوك ثم صل بغير رداء.

( حم الطحاوي ) عن جابر . (صحيح أبي داود ٦٤٤)

**٨٣٠- ئەگەر قوماشەكە فراوان بوو ئەوە بیدە بەهەردوو سەرشانداو پاشان نوێژ بكەو ئەگەر كەم بوو ئەوە بیبەستە لەناو قەدت بۆ خوارەوەو بەبێ پارچەی سەرشان نوێژ بكە.**

---

[1] (ووشەی (حائض)لێرەدا واتە ئافرەتێك گەیشتبێتە تەمەنی كەوتنە بێ نوێژیەوەو پێگەشتبێت)

## بابەتی بەربەستی نوێژخوێن

٨٣١- إذا صلى أحدكم إلى سترة فليدن منها لا يمر الشيطان بينه وبينها .

(صحيح) ( طب الضياء ) عن جبير بن مطعم . (الصحيح ١٣٨٦)

**٨٣١- ئەگەر هەر كەس لەئێوە ڕوو لەبەربەستەكەی (ستره)كەی نوێژی كرد بانزيك بێتەوە لێی تا شەيتان لەنيوان ئەوو بەربەستەكەدا نەڕوات.**

٨٣٢- إذا صلى أحدكم إلى شيء يستره من الناس فأراد أحد أن يجتاز بين يديه فليدفعه فإن أبى فليقاتله فإنما هو شيطان .

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن أبي سعيد . (صحيح أبي داود ٦٩٧)

**٨٣٢- ئەگەر هەر كەس لەئێوە ڕوو بە(ستره) بەربەستێك نوێژی كرد و يەكێك ويستی بە بەردەميدال بڕوات بارێی لێ بگرێتو پاڵی پێوە بنێت بۆ دواوە گەر هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی بڕوات باجەنگی لەگەڵ بكاتو لێ ی بدات چونكە ئەو كەسە شەيتانە.**

٨٣٣- إذا صلى أحدكم فليصل إلى سترة وليدن منها ولا يدع أحدا يمر بين يديه فإن جاء أحد يمر فليقاتله فإنما هو شيطان .

(صحيح) ( حم ق د ە حب هق ) عن أبي سعيد . (صحيح أبي داود ٦٩٤)

**٨٣٣- ئەگەر هەر كەس لەئێوە نوێژی كرد با(ستره) بەربەست بۆخۆی دابنێتو نزيك بێتەوە لێ ی ، وە با مۆڵەت نەدا كەس لەبەردەميەوە بڕوات، وەگەر يەكێك هاتو ويستی بڕوات بارێی لێ بگرێت چونكە ئەوە شەيتانە.**

٨٣٤- إذا قام أحدكم يصلي فإنه يستره إذا كان بين يديه مثل آخرة الرحل فإذا لم يكن بين يديه مثل آخرة الرحل فإنه يقطع صلاته الحمار والمرأة والكلب الأسود قيل ما بال الكلب الأسود من الكلب الأحمر قال الكلب الأسود شيطان .

(صحيح) ( م ن ) عن أبي ذر . (صحيح أبي داود ٦٩٩)

**٨٣٤- ئەگەر هەر كەس لە ئێوە نوێژی كردو ئەوە دەبێتە (ستره) بۆی، وە ئەگەر هەر و شتێك لەبەردەميدا بو وەك دواوەی زينی وشتر ئەگەر كۆمايەك و شتێك لەبەردەميدا نەبوو ئەگەر كەر يان ئافرەت يان سەگی ڕەش لەبەردەميەوە تێپەڕن ئەوە نوێژكەی**

**بەتاڵ دەبێتەوە، وترا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ سەگی رەش ؟ جیاوازی چییە لەنێوان سەگی رەش و سەگی سوور؟ فەرمووی سەگی رەش شەیتانە.**

٨٣٥- إذا كان أحدكم يصلي فلا يدع أحدا يمر بين يديه وليدرأه ما استطاع فإن أبى فليقاتله فإنما هو شيطان .

(صحيح) ( م د ن ) عن أبي سعيد . (صحيح أبي داود ٦٩٤)

**٨٣٥- ئەگەر هەر كەس لەئێوە نوێژی كرد بامۆڵەت نەدا بەكەس لەبەردەمیەوە بڕوات و تادەتوانێت بارێگری لێ بكات و بیگێڕێتەوە، جاگەر سوور بوو لەسەر رۆشتن با بەگژیدا بچێت، چونكە ئەو كەسە شەیتانە.**

٨٣٦- إذا كان أحدكم يصلي فلا يدع أحدا يمر بين يديه وليدرأه ما استطاع فإن أبى فليقاتله فإن معه القرين .

(صحيح) ( حم م ه ) عن ابن عمر . (الترغيب ٥٦١)

**٨٣٦- ئەگەر هەر كەس لەئێوە نوێژی كرد بامۆڵەت نەدا بەكەس لەبەردەمیەوە بڕوات، وتا دەتوانێت با رێگری لێ بكات، گەر هەر سوور بوو لەسەر رۆشتن با بجەنگێ لە گەڵیدا چونكە ئەو كەسە ئەو شەیتانەی پێ ی دەوترێ (قرين) ئەوە فرمانی پێ دەكات كە لەبەر دەمیەوە بچێت.**

٨٣٧- إذا وضع أحدكم بين يديه مثل مؤخرة الرحل فليصل ولا يبال من مر وراء ذلك .

(صحيح) ( م ت ) عن طلحة . (المشكاة ٧٧٥)

**٨٣٧- ئەگەر هەر كەس لە ئێوە لەبەر دەستی خۆیدا وەك پشتی كۆپان(زين) شتێكی دا چەقاند با روو بەوە نوێژ بكات و گوێ نەدات بەوەی لە پشتی ئەو شتەوە كێ هاتوچۆ دەكات.**

٨٣٨- إذا جعلت بين يديك مثل مؤخرة الرحل فلا يضرك من مر بين يديك .

(صحيح) ( د ) عن طلحة بن عبيدالله . (صحيح أبي داود ٦٨٦)

**٨٣٨- ئەگەر لەبەردەمی خۆتدا دارێك یان شتێكێكت دانا وەك پشتی زینی وشتر ئیتر گوێ بەوە مەدە كێ لە پشتیەوەو بەبەردەمتدا دەڕوات.**

٨٣٩- إن الشيطان عرض لي فشد علي ليقطع الصلاة علي فأمكنني الله تعالى منه فذعته ولقد هممت أن أوثقه إلى سارية حتى تصبحوا فتنظروا إليه فذكرت قول سليمان { رب هب لي ملكا لا ينبغي لأحد من بعدي } فرده الله خاسئا .

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٩٨٧)

**٨٣٩- شه‌یتان هاته به‌رده‌مم‌و زۆر هه‌وڵی دا نوێژه‌كه‌م پێ ببڕێت به‌ڵام خوای گه‌وره هێزو ووزه‌ی پێدام‌و توانیم ملی بگرم‌و خه‌ریك بوو بیخنكێنم وبه‌ته‌ما بووم بیبه‌ستمه‌وه به پایه‌یه‌كه‌وه هه‌تا نوێژی به‌یانی دا دێ‌و ئێوه بێن و ببیینن، به‌ڵام ووته‌كه‌ی سوله‌یمانم بیركه‌وته‌وه–سه‌لامی خوای لێبێت- كردموه كه‌له‌خوای گه‌وره پاڕاوه‌ته‌وه (خوایه لێم خۆش به‌و موڵك‌و ده‌سه‌ڵاتێكم پێ ببه‌خشه له‌پاش من به‌كه‌سی نه‌به‌خشی) بۆیه به‌ره‌ڵام كردو خوای گه‌وره‌ش سه‌رشۆڕی كردموه .**

٨٤٠- لأن يقوم أحدكم أربعين خير له من أن يمر بين يدي المصلي .

(صحيح) ( حم ه الضياء ) عن زيد بن خالد. (الترغيب ٥٥٩)

**٨٤٠- ئه‌گه‌ر یه‌كێكتان چل به‌پێوه بوه‌ستێ باشتره بۆی له‌وه‌ی كه به‌به‌رده‌م نوێژ خوێنێكدا بڕوات.**

٨٤١- لو يعلم المار بين يدي المصلي ماذا عليه لكان أن يقف أربعين خيرا له من أن يمر بين يديه.

(صحيح) ( مالك ق ٤ ) عن أبي جهيم. (صحيح أبي داود ٦٩٨)

**٨٤١- ئه‌و كه‌سه‌ی به‌به‌رده‌م نوێژ خوێندا ده‌ڕوات گه‌ر بزانێت چه‌نده گوناهی ده‌گاتێ ، واباشتربوو بۆی چل بوه‌ستێ تا ئه‌وه‌ی به‌به‌رده‌میدا بڕوات.**

**٨٤٢-** ليضع أحدكم بين يديه مثل مؤخرة الرحل ولا يضره ما مر بين يديه.

(صحيح) ( الطيالسي حب ) عن طلحة. (صحيح أبي داود ٦٨٦)

**٨٤٢- باهه‌ر كه‌س له ئێوه له‌كاتی نوێژدا دارێك، عه‌مودێك له زه‌وی دابچه‌قێنێت‌و ویتر زه‌ره‌ری پێناگه‌یه‌نێت ئه‌وه‌ی له پاش داره‌كه‌و یان به‌رده‌میدا ده‌ڕوات .**

٨٤٣- مثل مؤخرة الرحل يكون بين يدي أحدكم ثم لا يضره من مر بين يديه .

(صحيح) ( حم ه ) عن طلحة. (المشكاة ٧٧٥)

**٨٤٣- با له‌به‌رده‌م هه‌ر یه‌كێكتاندا دارێك وه‌ك دواوه‌ی زینی وشتر یا كۆمایه‌ك دابنرێت و پاشان زیانی نییه كێ له‌به‌رده‌میدا هاتوچۆ ده‌كات.**

٨٤٤- من استطاع منكم أن لا يحول بينه وبين قبلته أحد فليفعل .

(صحيح) ( د ) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ٦٩٦)

**٨٤٤- هه‌ركه‌س له ئێوه ده‌توانێ مۆڵه‌ت نه‌دات به‌كه‌س له‌نێوان ئه‌وو روگه‌كه‌یدا ببێت باوا بكات.**

٨٤٥- يقطع الصلاة الحمار والمرأة والكلب .

(صحيح) ( حم ه ) عن أبي هريرة وعبدالله بن مغفل. (صحيح أبي داود ٧٠٠)

**٨٤٥- گوێدرێژوو ئافرەت و سەگ نوێژ دەبڕن.**

٨٤٦- يقطع الصلاة المرأة الحائض والكلب الأسود.

(صحيح) ( د ه ) عن ابن عباس. (صحيح أبي داود ٧٠٠)

**٨٤٦- ئافرەتی بێ نوێژو سەگی ڕەش نوێژ دەبڕن.**

٨٤٧- يقطع الصلاة المرأة والحمار والكلب ويقي من ذلك مثل مؤخرة الرحل .

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الضعيفة ٥٦٦١)

**٨٤٧- ئافرەت و گوێدرێژو سەگی ڕەش نوێژ دەبڕن ، بەلاَم شتێکی بەرزی وەکو پاشی زین لەو نوێژ برینە دەیپارێزێت.**

٨٤٨- يقطع صلاة الرجل إذا لم يكن بين يديه كمؤخرة الرحل المرأة والحمار والكلب الأسود الكلب الأسود شيطان .

(صحيح) ( حم ٤ حب ) عن أبي ذر. (صحيح أبي داود ٦٩٩)

**٨٤٨- ئافرەت و گوێدرێژو سەگی ڕەش نوێژی کەسێك دەبڕن ئەگەر هیچی لەبەردەمیدا دانەنابێت وەك بەرزی پاشی زین، وە سەگی ڕەشیش شەیتانە .**

٨٤٩- إذا صلى أحدكم فليصل إلى سترة وليدن من سترته لا يقطع الشيطان عليه صلاته .

(صحيح) ( حم د ن حب ك ) عن سهل بن أبي حثمة . (الصحيح ١٣٧٣)

**٨٤٩- ئەگەر هەر کەس لە ئێوە نوێژی کرد با ( سترە ) کێلێك دابنێ و نزیکیش بێتەوە لە ( سوترەکەی ) نەك شەیتان نوێژەکەی پێ ببڕێت.**

٨٥٠- إذا صلى أحدكم إلى شيء يستره من الناس فأراد أحد أن يجتاز بين يديه فليدفعه فإن أبى فليقاتله فإنما هو شيطان .

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن أبي سعيد . (صحيح أبي داود ٦٩٥)

**٨٥٠- گەر هەر کەس لە ئێوە نوێژی کرد با ڕوو بە ( سترە ) کێلێك نوێژ بکات و نزیك بێتەوە لێ ی ، مۆڵەتیش نەدات کەس لەبەردەمیەوە بڕوات، وە گەر کەسێ هەر ویستی لەنێوان خۆی و ( سوترە )کەیدا بڕوات با جەنگی لەگەڵ بکات چونکە ئەو کەسە شەیتانە.**

٨٥١- استتروا في صلاتكم ولو بسهم .

(صحيح) ( حم ك هق ) عن الربيع بن سبرة . (الصحيح ٢٧٨٣)

**٨٥١- لەکاتی نوێژەکانتاندا ( سوترە ) کێلێك دروست بکەن با بەسەرە ڕمێکیش بێت بیچەقێنن لە زەوی.**

# بابەتی مزگەوتەكان

٨٥٢- إذا زخرفتم مساجدكم وحليتم مصاحفكم فالدمار عليكم .

(صحيح) ( الحكيم ) عن أبي الدرداء . (الصحيح ١٣٥١)

**٨٥٢- هەر كات مزگەوتەكانتان بەنەخش و نیگار رازاندەوە ، وە قورئانەكانتان بەئاوی ئاڵتوون جوان كرد، ئەوە داروخان و تیاچوون چارەنوستانە** [1] .

٨٥٣- إن مما يلحق المؤمن من عمله وحسناته بعد موته علما نشره وولدا صالحا تركه ومصحفا ورثه أو مسجدا بناه أو بيتا لابن السبيل بناه أو نهرا أجراه أو صدقة أخرجها من ماله في صحته وحياته تلحقه من بعد موته .

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٠٧٩)

**٨٥٣- لەو شتانەی كە فریای ئیماندار دەكەوێت لە پاش مردنی لە كردەوەو كارە چاكەكانی، زانستێكە بڵاوی كردبێتەوە، و نەوەیەكی چاكە لە پاش خۆی بەجێی هێشت بێت، و قورئانێكە بە میراتی جێی هێشتبێت، یان مزگەوتێكە یان خانوویەكە بۆ حەوانەوەی رێبواران یان جۆگەو روبارێكە برد بێتی بە شوێنێكدا ، یان زەكاتو سەدەقەو خێرێكە لەماڵەكەی دەری كردووە لەكاتی لەش ساغیو ژیانی خۆیدا، ئەمانە هەمووی پێی دەگاتو فریای دەكەون لە پاش مردنی.**

٨٥٤- ما أمرت بتشييد المساجد .

(صحيح) ( د ) عن ابن عباس. (المشكاة ٧١٨)

**٨٥٤- فرمانم پێ نەدراوە بە نەخشاندن و رازاندنەوەی مزگەوتەكان.**

٨٥٥- من بنى لله مسجدا بنى الله له بيتا في الجنة .

(صحيح) ( ه ) عن علي. (الروض ٨٨٣)

**٨٥٥- هەركەس مزگەوتێك بۆ خودا دروست بكات، خوای گەورە ماڵێكی لەبەهەشتدا بۆ دروست دەكات.**

---

[1] ( ئیمامی مەناوی ئەفەرموێت (رازاندنەوەی مزگەوتەكانو بەئاوی ئاڵتوون و جوان كردنی قورئانەكان قەدەغەكراوە، چونكە ئەوە دڵ سەرقاڵ دەكات و لای دەدات لەگەردن كەچی و بیركردنەوە لەماناكانی قورئانو نوێژو لەگەڵ خوادا بوون ) .

٨٥٦- من بنى لله مسجدا ولو كمفحص قطاة أو أصغر بنى الله له بيتا في الجنة .

(صحيح) ( ه ) عن جابر. (الترغيب ٢٧١)

**٨٥٦- هەركەس مزگەوتێك بۆ خودا دروست بكات، باوەك هێلانەی كلاو كورەیەكیش یا بچوكتریش بێت خوای گەورەماڵێكی لەبەهەشتدا بۆ دروست دەكات.**

٨٥٧- من بنى لله مسجدا ولو كمفحص قطاة لبيضها بنى الله له بيتا في الجنة.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عباس. (الترغيب ٢٧٢)

**٨٥٧- هەركەس لەبەر خوا مزگەوتێك درووست بكات یاوەكو هێلانەی كلاو كورەیەكیش بێت خوا خانوویەكی لە بەهەشتدا بۆ درووست دەكات.**

٨٥٨- من بنى مسجدا لله يذكر الله فيه بنى الله له مثله في الجنة .

(صحيح) ( حم ن ) عن عمرو بن عبسة ( ه ) عن عمر. (المشكاة ٣٣٨٥)

**٨٥٨- هەركەس مزگەوتێك بۆ خودا دروست بكات، یادی خوای گەورەی تێدا بكرێت، خوا بەوێنەی ئەوە ماڵێكی لەبەهەشتدا بۆ دروست دەكات.**

٨٥٩- من بنى مسجدا يبتغي به وجه الله بنى الله له مثله في الجنة .

(صحيح) ( حم ق ت ه ) عن عثمان. (الترغيب ٢٦٨)

**٨٥٩- هەر كەس مزگەوتێك دروست بكاتو مەبەستی تەنها خوای گەورە بێت خوا وێنەی ئەوەی لە بەهەشتدا بۆ درووست دەكات [1] .**

٨٦٠- نهى أن يتباهى الناس في المساجد.

(صحيح) ( حب ) عن أنس. (صحيح أبي داود ٤٧٥)

**٨٦٠- پێغەمبەری خوا(ﷺ) قەدەغەی كردووە خەڵك لەناو مزگەوتەكاندا شانازی بكەن بەسەر یەكتردا بەوەی ئەو بڵێ مزگەوتەكەی من باشترەو جوانتر دروستم كردووە. صحيح ( حب ) لە ئەنەسەوە.**

---

[1] **( ئیمامی مەناوی ئەڵێت: زانایان زۆر توندن لەسەر حەرام كردنی ئەوەی مرۆڤ بۆ غەیری خوا مزگەوت دروست بكات، هەتا ئیمامی ئیبن جەوزی ئەفەرمویت: هەر مەكەس ناوی خۆی بخاتە سەر مزگەوتێك دروستی كردبێت ئەوە دوورە لەئیخلاسەوە} ئەوە خوای گەورە لەبەهەشتدا بەوێنەی ئەوە ماڵێكی بۆ دروست دەكات )**

# بابه‌تی ئه‌ده‌بی مزگه‌وته‌كان

٨٦١- ائذنوا للنساء بالليل إلى المساجد.

(صحيح) ( حم م د ت ) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ٥٧٧)

**٨٦١- رێگه بده‌ن به ئافره‌تان به‌شه‌و بچنه مزگه‌وت.** [1]

٨٦٢- ائذنوا للنساء أن يصلين بالليل في المسجد .

(صحيح) ( الطيالسى ) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ٥٧٧)

**٨٦٢- رێگا بده‌ن با ئافره‌تان به‌شه‌و نوێژ بكه‌ن له مزگه‌وتدا..**

٨٦٣- إذا أذن المؤذن فلا يخرج أحد حتى يصلي .

(صحيح) (هب) عن أبي هريرة. (المشكاة ١٠٧٤)

**٨٦٣- ئه‌گه‌ر بانگبێژ بانگی فه‌رموو با كه‌ستان له مزگه‌وت ده‌رنه‌چێت تا نوێژ ده‌كات.**

٨٦٤- إذا استأذنت أحدكم امرأته إلى المسجد فلا يمنعها .

(صحيح) (حم ق ن) عن ابن عمر. (غاية المرام ٢٠١)

**٨٦٤- ئه‌گه‌ر خێزانی هه‌ر یه‌كێكتان مۆڵه‌تی لێوه‌رگرتن بۆ چوونه مزگه‌وت با رێگای لێ نه‌گرێت.**

٨٦٥- إذا توضأ أحدكم فأحسن وضوءه ثم خرج عامدا إلى المسجد فلا يشبكن بين يديه فإنه في صلاة .

(صحيح) (حم د ت) عن كعب بن عجرة. (الإرواء ٣٧٨)

**٨٦٥- ئه‌گه‌ر هه‌ر كه‌س له‌ئێوه ده‌ستنوێژێكی جوانی گرت‌و پاشان به‌ره‌و مزگه‌وت به‌رێ كه‌وت، با په‌نجه‌كانی ده‌ستی نه‌كات به‌ناو یه‌كتردا چونكه له‌ناو نوێژدایه.**

٨٦٦- إذا توضأ أحدكم في بيته ثم أتى المسجد كان في صلاة حتى يرجع فلا يقل هكذا وشبك بين أصابعه.

(صحيح) (ك) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٢٩٤)

**٨٦٦- ئه‌گه‌ر هه‌ر كه‌س له ئێوه ده‌ستنوێژی له‌ماڵه‌وه گرت‌و پاشان رۆشت بۆ مزگه‌وت ئه‌وه وه‌ك ئه‌وه وایه له‌نوێژدا بێت تا ده‌گه‌رێته‌وه با ئاواش نه‌كات، و پێغه‌مبه‌ر( ﷺ ) په‌نجه‌كانی ده‌ستی كردن به‌ناویه‌كدا.**

٨٦٧- إذا توضأ أحدكم للصلاة فلا يشبك بين أصابعه .

(صحيح) (طس) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٢٩٤)

---

[1] ( مه‌به‌ست چوونه بۆ نوێژی خه‌وتنان و به‌یانی )

**٨٦٧- ئەگەر هەر یەكێكتان لە ئێوە دەست نوێژی گرت بۆ نوێژ با پەنجەكانی دەستی نەكات بەناو یەكدا.**

٨٦٨- إذا خرجت إحداكن إلى المسجد فلا تقربن طيبا .

(صحيح) (حم) عن زينب الثقفية. (الصحيحة ١٠٩٣)

**٨٦٨- ئەگەر هەر كەس لەئێوە-ئافرەتان- چوون بۆ مزگەوت با بۆنی خۆش لەخۆی نەدات.**

٨٦٩- إذا شهدت إحداكن العشاء فلا تمس طيبا .

(صحيح) (حم م ن) عن زينب الثقفية. (الصحيحة ١٠٩٣)

**٨٦٩- ئەگەر هەر كەس لە ئێوە-ئافرەتان- ئامادەی نوێژی عیشا بوو با بۆنی خۆش لەخۆی نەدات.**

٨٧٠- إذا دخل أحدكم المسجد فلا يجلس حتى يصلي ركعتين .

(صحيح) (حم ق ٤ ) عن أبي قتادة (هـ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٤٦٧)

**٨٧٠- ئەگەر هەر كەس لەئێوە چووە مزگەوتەوە بادانەنیشێت تا دوو ڕكات نوێژ دەكات.**

٨٧١- إذا دخل أحدكم المسجد فليسلم على النبي وليقل اللهم افتح لي أبواب رحمتك وإذا خرج فليسلم على النبي وليقل اللهم اعصمني من الشيطان .

(صحيح) (ن هـ حب ك) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ١٤٨\٣)

**٨٧١- ئەگەر هەر كەس لەئێوە چووە مزگەوتەوە با سەلام لە پێغەمبەر (ﷺ) بكاتو پاشان بڵێ ( اللهم افتح لی أبواب رحمتك ) واتە: خوایە دەرگاكانی ڕەحمەتی خۆتم بۆ والآ بكە، وەكاتێ دەرچوویە دەرەوە با دیسانەوە سەلام لە پێغەمبەر(ﷺ) بكاتەوەو بڵێ: اللهم أعصمنى من الشيطان ) واتە خوایە بمپارێزە لە شەیتان.**

٨٧٢- إذا دخل أحدكم المسجد فليسلم على النبي وليقل اللهم افتح لي أبواب رحمتك وإذا خرج فليسلم على النبي وليقل اللهم إني أسألك من فضلك .

(صحيح) (د) عن أبي حميد أو أبي أسيد (هـ) عن أبي حميد. (صحيح أبي داود ٤٨٤)

**٨٧٢- هەركاتێ یەكێك لەئێوە چووە مزگەوت، باسەلام لە پێغەمبەر(ﷺ) بكاتو بڵێ: ( اللهم افتح لي ابواب رحمتك ) واتە خوایە دەرگاكانی ڕەحمەتی خۆتم بۆ بكەرەوە، و كاتێ چوویە دەرەوە لە مزگەوت باسەلام لە پێغەمبەر(ﷺ) بكاتو بڵێ: اللهم إنی أسألك من فضلك ) واتە خوایە داوات لێ دەكەم لەفەر و پیرۆزی خۆت بەهرەمەندم بكە.**

٨٧٣- إذا دخل أحدكم المسجد فليصل على النبي صلى الله عليه وسلم وليقل اللهم افتح لي أبواب رحمتك وإذا خرج فليسلم على النبي وليقل اللهم إني أسألك من فضلك .

(صحيح) (حم م) عن أبي حميد أو أبي أسيد (حم ن حب هق) عن أبي حميد وأبي أسيد معا. (صحيح أبي داود ٤٨٤)

**٨٧٣- هەركات يەكێك لەئێوە چووە مزگەوت، با سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) بدات و بڵێ: اللهم افتح لی ابواب رحمتك) وەكاتێ لە مزگەوت دەرچوو باسەلام لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) بكات و بڵێ (اللهم أني أسألك من فضلك).**

٨٧٤- كان إذا دخل المسجد يقول: بسم الله و السلام على رسول الله اللهم اغفر لي ذنوبي و افتح لي أبواب رحمتك و إذا خرج قال: بسم الله و السلام على رسول الله اللهم اغفر لي ذنوبي و افتح لي أبواب فضلك .

( حم ه طب ) عن فاطمة الزهراء. (صحيح أبي ماجه ٧٧١)

**٨٧٤- كاتێك دەچووە مزگەوت دەيفەرموو**[1] (بسم الله و السلام على رسول الله اللهم اغفر لي ذنوبي و افتح لي أبواب رحمتك) **بەناوی خوا سەلام لە پێغەمبەری خوا، خوايە لە گوناهم خۆشبە و، دەرگاكانی بەزەيی خۆتم بۆ بكەرەوە ، كە دەچووە دەرەوە دەيفەرموو** (بسم الله و السلام على رسول الله اللهم اغفر لي ذنوبي و افتح لي أبواب فضلك) **بەناوی خوا سەلام لە پێغەمبەری خوا، خوايە لە گوناهەكانم خۆشبە و، دەرگاكانی بەزەيی خۆتم بۆ بكەرەوە.**

٨٧٥- إذا رأيتم من يبيع أو يبتاع في المسجد فقولوا لا أربح الله تجارتك وإذا رأيتم من ينشد فيه ضالة فقولوا لا رد الله عليك ضالتك .

(صحيح) (ت ك) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٢٨٢)

**٨٧٥- هەركات يەكێكتان بينی لەمزگەوت مامەڵەی كڕين و فرۆشتنی دەكرد پێی بڵێن: خوايە هەرگيز خێر لەبازرگانيەكەت نەبينيت، ئەگەر هەر كەستان بينی جاری بۆ شتی ونبووی دەدا پێی بڵێن: خوايە هەرگيز نەيدۆزيتەوە.**

٨٧٦- لا وجدته لا وجدته لا وجدته إنما بنيت هذه المساجد لما بنيت له .

(صحيح) (حم م ن هـ) عن بريدة. (الثمر المستطاب ١\٦٨٦)

---

[1] **واتە پێغەمبەری خوا سەڵات و سەلامی خوای لەسەربێت.**

**٨٧٦- خوا بکات نەیبینیتەوە، نەبینتیەوە، نەبیتنیەوە، چونکە ئەم مزگەوتانە بۆ ئەو مەبەستە دروست کران کە بۆی دروست کراون.** [1]

٨٧٧- إذا مر أحدكم في مسجدنا أو في سوقنا ومعه نبل فليمسك على نصالها بكفه لا يعقر مسلما .

(صحيح) (ق د هـ) عن أبي موسى. (المشكاة ٣٥١٧)

**٨٧٧- ئەگەر هەر کەس لەئێوە بەنێو مزگەوت یا بازاڕی ئێمەدا تێپەڕیو نێزەی پێبوو باجوان لەشوێنی چەسپاندنی خۆیدا بەدەست بیگرێ نەوەك موسڵمانێك بریندار بکات.**

٨٧٨- إذا نعس أحدكم وهو في المسجد فليتحول من مجلسه ذلك إلى غيره .

(صحيح) (د ت) عن ابن عمر . (الصحيحة ٤٦٨)

**٨٧٨- ئەگەر یەکێکتان لە مزگەوتدا بوو هەنۆزی دەکرد با لەو شوێنەی خۆی بگۆڕێت بە شوێنێکی تر.**

٨٧٩- إن هذا المسجد لا يبال فيه وإنما بني لذكر الله والصلاة .

(صحيح) (هـ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٤٠٤)

**٨٧٩- ئەم مزگەوتە نابێت میزی تێدا بکرێت، بێگومان دروستکراوە بۆ یادی خوداو نوێژ تێداکردن.**

٨٨٠- إن هذه المساجد لا تصلح لشيء من القذر والبول والخلاء إنما هي لقراءة القرآن وذكر الله والصلاة.

(صحيح) (حم م) عن أنس. (الإرواء ١٧١)

**٨٨٠- ئەم مزگەوتانە ناگونجێت هیچ شتێك لە پیسیو میزو سەرئاوی تێدا بکرێت بەڵکو بۆ قورئان خوێندنو یادی خوداو نوێژ دروست کراون.**

٨٨١- أيتكن أرادت المسجد فلا تقربن طيبا.

(صحيح) (ن) عن زينب الثقفية. (الصحيحة ١٠٩٣)

**٨٨١- ئەی ئافرەتان هەرکامتان ویستتان بێنە مزگەوت باتوخنی بۆنی خۆش نەکەوێت.**

٨٨٢- أيما امرأة أصابت بخورا فلا تشهد معنا العشاء الآخرة.

(صحيح) (حم م د ن) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٦٠٥)

---

[1] (ئەمە وەڵام بوو بۆ ئەو کەسەی بانگەوازی دەکرد بۆ شتێك لێ ی بزر بوو بوو، چونکە مزگەوت دروستکراوە بۆ مەبەستی خواپەرستی و پاك کردنەوەی دڵ و دروونەوە)

**٨٨٢- هەر ئافرەتێك بۆنی بخوری بەركەوتوو با ئامادەی نوێژی خەوتنان نەبێت لە گەڵماندا.**

٨٨٣- البزاق في المسجد سيئة ودفنه حسنة.

(صحيح) (حم طب) عن أبي أمامة. (الروض النضير ٤٨)

**٨٨٣- بەڵغەم فڕێدان لە مزگەوتدا خراپەو گوناهەو لابردنو شاردنەوەی چاكەیە.**

٨٨٤- أيما امرأة أصابت بخورا فلا تشهد معنا العشاء الآخرة.

(صحيح) (حم م د ن) عن أبي هريرة. (الروض النضير ٤٨)

**٨٨٤- هەر ئافرەتێكتان بۆنی بوخری پێوە بوو با لەگەڵ ئێمە ئامادەی نوێژی خەوتنان نەبێت.**

٨٨٥- تبعث النخامة في القبلة يوم القيامة وهي في وجه صاحبها.

(صحيح) (البزار) عن ابن عمر. (الترغيب ٢٨٥)

**٨٨٥- چڵم كە بەرەو رووگە فڕێ درابێت زیندوو دەكرێتەوە لە رۆژی قیامەتداو دەدرێت بە روخساری بەنێو چاوانی خاوەنەكەیدا.**

٨٨٦- التفل في المسجد خطيئة وكفارته أن يواريه.

(صحيح) (د) عن أنس. (صحيح أبي داود ٤٩٣)

**٨٨٦- تفو بەڵغەم فڕێدان لە مزگەوتدا تاوانەو (كەفارەتەكەی) بارتەقاكەی شاردنەوەیەتی.**

٨٨٧- خير صلاة النساء في قعر بيوتهن.

(صحيح) (طب) عن أم سلمة . (الصحيحة ١٣٩٦)

**٨٨٧- باشترین نوێژی ئافرەتان لە ناوەراستی ماڵەكانی خۆیاندایە.**

٨٨٨- خير مساجد النساء قعر بيوتهن.

(صحيح) (حم هق) عن أم سلمة. (الصحيحة ١٣٩٦)

**٨٨٨- باشترین مزگەوتی ئافرەتان نێو ماڵەكانی خۆیانە.**

٨٨٩- صلاة المرأة في بيتها أفضل من صلاتها في حجرتها وصلاتها في مخدعها أفضل من صلاتها في بيتها.

(صحيح) (د) عن ابن مسعود (ك) عن أم سلمة. (المشكاة ١٠٦٣)

**٨٨٩- نوێژی ئافرەت لەماڵی خۆیدا باشتر لەو نوێژەی لەژوری میوان دەیكات وەئەو نوێژی لە ژووری نوستنیدا دەكیات باشترە لەوەی كەلەماڵدا دەكات.**

٨٩٠- صلاتكن في بيوتكن أفضل من صلاتكن في حجركن و صلاتكن في حجركن أفضل من صلاتكن في دوركن و صلاتكن في دوركن أفضل من صلاتكن في مسجد الجماعة .

( حم طب هق ) عن أم حميد. (المرأة المسلمة ص٢٩)

**٨٩٠- واته ئەی ئافرەتـان نوێژەکانتـان لە ماڵەکانتـاندا بـاشترە لە ژوری دانیشتنتان و نوێژکردنتـان لە ژوری میوان دانیشتنتان باشترە لەم وشەو پاساتـاندا و نوێژکردنتان لە حەوشەو یارستـاندا بـاشترە لە نوێژکردنتان لە مزگەوت.**

٨٩١-. عرضت علي أمتي بأعمالها حسنها و سيئها فرأيت في محاسن أعمالها إماطة الأذى عن الطريق و رأيت في سيء أعمالها النخاعة في المسجد لم تدفن .[1]

( حم م ه ) عن أبي ذر. (المشكاة ٧٠٩)

**٨٩٢- ئوممەتەکەم بەکردەوەکانیەوە لەبەردەمدا پیشانم درا، لە چاکەکانی ئوممتەکەمدا بینیم پاکردنەوەو لادانی شەخەڵی ڕێگاو بان بوو، وە لە خراپەکانی ئوممەتی من، چڵمو بەڵغەم بوو لە مزگەوتدا فڕێ نەدرابوو.**

٨٩٢- كلوه و من أكل منكم فلا يقرب هذا المسجد حتى يذهب ريحه منه - يعني الثوم -.

( د حب ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٢٠٣٢)

**٨٩٣- بیخۆن، وەهەرکەس لە ئێوە خواردی بـانزیکی ئەم مزگەوتە نەبێتەوە تـا ئەو کاتەی بۆنی لەلاشەی نامێنێت واته( سیر ) .**

٨٩٣- كان إذا دخل المسجد صلى على محمد وسلم و قال: رب اغفر لي ذنوبي و افتح لي أبواب رحمتك و إذا خرج صلى على محمد وسلم و قال: رب اغفر لي ذنوبي و افتح لي أبواب فضلك.

(ت) عن فاطمة الزهراء. (صحيح الترمذي ٣١٤)

**٨٩٣- کاتێ چوبـایەتە مزگەوتەوە سەڵاواتی لەسەر پێغەمبەر دەداو سەلامی لێ دەکردو ئەیوت:** رب أغفر لي ذنوبي ، افتح لي ابواب رحمتك، **واته خوایە لە گوناهەکانم خۆش بەو دەرگاکانی ڕەحمەتی خۆتم بۆ واڵا بکە، وەکاتێ دەردەچوو سەلاوات و سەلامی لەسەر پێغەمبەر دەداو ئەیووت:** رب أغفر لي ذنوبي ، افتح لي ابواب فضلك **واته خوایە لە گوناهەکانم خۆش بەو دەرگاکانی بەرەکەت و فەڕی خۆتم بەڕوودا بکەرەوە.**

---

[1] (به ( النخامة )ش هاتووه له زمانی عەرەبیدا. السراج ج١ ص١٧٨ )

٨٩٤- كان إذا دخل المسجد قال: أعوذ بالله العظيم و بوجهه الكريم و سلطانه القديم من الشيطان الرجيم و قال: إذا قال ذلك حفظ منه سائر اليوم.

( د ) عن ابن عمرو. (المشكاة ٧٤٩)

**٨٩٤- پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ دەچوویە مزگەوت، ئەیفەرموو پەنا ئەگرم بە پەروەردگاری مەزن وە روخساری دەسەڵاتی دێرین و هەتاهەتایی لە شەیتانی نەفەرت لێ کراو.. ئەیفەرموو: جائەگەر مرۆڤ سەرەتای رۆژ بڵێ : باقی رۆژەکە هەموو پارێزراو دەبێت لە شەیتان.**

٨٩٥- كان إذا دخل المسجد قال: ( بسم الله اللهم صل على محمد و أزواج محمد ) .

( ابن السني ) عن أنس. (الكلم ٦٤)

**٨٩٥- پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ دەچوویە مزگەوت ئەیفەرموو... خوایە دروودو رەحمەت بنێرە بۆ سەر موحەممەدو هاوسەرەکانی موحەممەد.**

٨٩٦- لأن تصلي المرأة في بيتها خير لها من أن تصلي في حجرتها و لأن تصلي في حجرتها خير لها من أن تصلي في الدار و لأن تصلي في الدار خير لها من أن تصلي في المسجد.

( هق ) عن عائشة. (الصحيحة ٢١٤٢)

**٨٩٦-ئەگەر ئافرەتان لە ماڵەکەیدا نوێژ بکات باشترە لەوەی نوێژ لە ژوری میوان و دانیشتنەکەیدا بکات ئەگەر نوێژ لە ژووری دانیشتنەکەیدا بکات باشترە لە نوێژکردن لە خانووەکەیدا.وەئەگەر نوێژ لە خانوەکەیدا باشترە لە نوێژکردن لە مزگەوت.**

٨٩٧- لو تركنا هذا الباب للنساء.

( د ) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ٤٨٣)

**٨٩٧-ئای ئەگەر ئەو دەرگایەمان واز لێبێنایە بۆ ئافرەتان.**

٨٩٨- ليصل الرجل في المسجد الذي يليه و لا يتبع المساجد.

( طب ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٢٢٠٠)

**٨٩٨-با هەر پیاوێك نوێژ لە مزگەوتەکەی نزیك ماڵی خۆی بکات و بەدوای مزگەوتەکاندا نەگەرێت.**

٨٩٩- ما بال أحدكم يقوم مستقبل ربه فيتنخع أمامه ؟ ! أيحب أن يستقبل فيتنخع في وجهه ؟ فإن تنخع أحدكم فليتنخع عن يساره أو تحت قدمه فإن لم يجد فليقل هكذا - يعني في ثوبه -.

( حم م ه ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٨٤)

**٨٩٩- ئەوە چیەتی یەکێکتان هەڵدەستێت بەرەو رووگە چڵم فڕێ ئەداتە بەردەمی خۆی! ئایا پێی خۆشە رووەو روگە تف بکرێتە روخساری؟ئەگەر یەکێکتان تفی کرد با بەلای چەپیدا فڕێی دا، یان بۆ ژێر پێی، ئەگەر ئەوەی بۆ نەکرا با ئاوا بکات-واتە بە جل یان دەسرەکەی بیسڕێت.**

٩٠٠- من أدرك الأذان في المسجد ثم خرج لم يخرج لحاجته وهو لا يريد الرجعة فهو منافق .

(صحيح) (هـ) عن عثمان. (الترغيب ٢٦٣)

**٩٠٠- هەرکەس فریای بانگ کەوت لە مزگەوت ئینجا هاتە دەر لە مزگەوت و نیازیشی نەبوو بگەڕێتەوە، ئەوە دووڕووە.**

٩٠١- من أتى المسجد لشيء فهو حظه .

(صحيح) (د) عن أبي هريرة. (المشكاة ٧٣٠)

**٩٠١-هەر کەس بۆچی بچێت بۆ مزگەوت ئوە بەشیەتی.**

٩٠٢- من أكل ثوما أو بصلا فليعتزلنا وليعتزل مسجدنا وليقعد في بيته .

(صحيح) (ق) عن جابر. (الإرواء ٥٤٠)

**٩٠٢-هەرکەس سیر یان پیازی خوارد با لێمان دووربکەوێتەوە و لە مزگەوتەکەشماندا دوورەپەرێز بێت و با لە ماڵەکەیدا دانیشێت.**

٩٠٣- من أكل من هذه الشجرة الخبيثة شيئا فلا يقربنا في المسجد يا أيها الناس إنه ليس لي تحريم ما أحل الله ولكنها شجرة أكره ريحها .

(صحيح) (حم م) عن أبي سعيد.

**٩٠٣-هەرکەس لەم درەختە پیسەی خوارد با لە مزگەوتەکەمان نزیك نەبێتەوە، هۆ خەڵکینە بۆم نیە یاساغی شتێك بکەم کە خوا حەلاڵی کردبێت بەلام بۆنەکەیم پێ خۆش نیە.**

٩٠٤- من أكل من هذه الشجرة الخبيثة فلا يقربن مسجدنا فإن الملائكة تتأذى مما يتأذى منه الإنس .

(صحيح) (ق) عن جابر. (الإرواء ٥٤٧)

**٩٠٤-هەرکەس لەم درەختە پیسەی خوارد با نزیك مزگەوتەکەمان نەکەوێت چونکە هەر شتێك ئادەمیزاد پێی ناخۆش بێت فریشتەکانیش پێیان ناخۆشە.**

٩٠٥- من أكل من هذه الشجرة الخبيثة فلا يقربن مصلانا حتى يذهب ريحها .

(صحيح) (حم د حب) عن المغيرة بن شعبة. (إصلاح المساجد ٧١ )

**٩٠٥- هەركەس لەم درەختە پیسەی خوارد با نزیك مزگەوتەكەمان(سوژدەگاكەمان) نەكەوێت هەتا بۆنەكەی دەروات.**

٩٠٦- من أكل من هذه الشجرة فلا يقربن المساجد .

(صحيح) (د هـ حب) عن ابن عمر. (الترغيب ٣٣١)

**٩٠٦-هەر كەس لەم درەختەی خوارد با نزیكی مزگەوتەكەمان نەكەوێت.**

٩٠٧- من أكل من هذه الشجرة فلا يقربن مسجدنا ولا يؤذينا بريح الثوم .

(صحيح) (م هـ) عن أبي هريرة.

**٩٠٧- هەركەس لەم درەختەی خوارد با نزیكی مزگەوتەكەمان نەكەوێت ىو بە بۆنەكەی ئازارمان نەدات.**

٩٠٨- من أكل من هذه الشجرة فلا يقربنا ولا يصلين معنا .

(صحيح) (ق) عن أنس.

**٩٠٨- هەركەس لەم درەختەی خوارد با نزیكمان نەكەوێت و بە نوێژیشمان لەگەڵ نەكات.**

٩٠٩- من أكل من هذه الشجرة - يعني الثوم - فلا يقربن مسجدنا .

(صحيح) (ق) عن ابن عمر.

**٩٠٩-هەركەس لەم درەختە بخوات - واتە: سیر - با نزیكی مزگەوتەكەمان نەكەوێت.**

٩١٠- كلوه فإني لست كأحدكم إن أخاف أن أوذي صاحبي .

(صحيح) (حم ت حب) عن أم أيوب. (الصحيحة ٢٧٨٤)

**٩١٠-بیخۆن بەراستی من وەكو هەریەكێكتان نیم بەراستی ئەترسم هاوڕێكەم ئازار بدەم(واتە فریشتەكەم).**

٩١١- من تفل تجاه القبلة جاء يوم القيامة تفله بين عينيه ومن أكل من هذه البقلة الخبيثة فلا يقربن مسجدنا .

(صحيح) (د حب) عن حذيفة. (الصحيحة ٢١٢)

**٩١١-هەركەس تف بەرەو رووگە فڕێ بدات لەرۆژی قیامەتدا دێت و تفەكە لەنێو چاوانیدایە،هەركەسیش لەم رووەكە پیسەشی خوارد با نزیكی مزگەوتەكەمان نەكەوێت.**

٩١٢- من دخل في هذا المسجد فبزق فيه أو تنخم فليحفر فليدفنه فإن لم يفعل فليبزق في ثوبه ثم ليخرج به.

(صحيح) (د) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ١٤٩٦)

**٩١٢-هەرکەس بێتە ئەم مزگەوتەو بەڵغەمی لێ فرێیدات با لە چاڵێکدا بیشارێتەوە ئەگەر ئەوەشی نەکرد با بە پۆشاکەکەی پاکی بکاتەوە ئینجا لە مزگەوتەکە دەرچێت.**

٩١٣- من سمع رجلا ينشد ضالة في المسجد فليقل لا ردها الله عليك فإن المساجد لم تبن لهذا .

(صحيح) (حم م د هـ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٤٩٢)

**٩١٣-هەرکەس گوێی لە پیاوێك جاری بۆ شتێکی وونبوو ئەدا لە مزگەوت با پێی بڵێ خوا بۆت نەدۆزێتەوە بەراستی مزگەوتەکان بۆ ئەمە درووست نەکراون.**

٩١٤- النخاعة في المسجد خطيئة وكفارتها دفنها .

(صحيح) (حم ق) عن أنس. (صحيح أبي داود ٤٩٥)

**٩١٤-بەڵغەم فرێدان لە مزگەوتدا هەڵەو گوناهە و (کەفارەتەکەی)بارتەقەکەی شاردنەوەیەتی.**

٩١٥- نهى أن يبال بأبواب المساجد .

(صحيح) (د في مراسيله) عن مكحول مرسلا. (الترغيب ١٥٠)

**٩١٥-پێغەمبەر سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت قەدەغەی کرد بە دەرگای مزگەوتدا بەو دیودا میز بکرێت.**

٩١٦- نهى أن يبال في قبلة المسجد .

(صحيح) (د في مراسيله) عن أبي مجلز مرسلا.

**٩١٦-قەدەغە کراوە کە میز بەرەو رووی رووگەی مزگەوت بکرێت.**

٩١٧- نهى عن الشراء والبيع في المسجد وأن تنشد فيه ضالة وأن ينشد فيه شعر ونهى عن التحلق قبل الصلاة يوم الجمعة

(صحيح) (حم ٤ ) عن ابن عمرو. (صحيح أبي داود ٩٩١)

**٩١٧- پێغەمبەر سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت قەدەغەی کردوە کرین و فرۆشتن لە مزگەوتدا بکرێت یان جاری شتی ون بوو بدرێتیان شیعری تێدا بوترێت وە قەدەغەی کردووە سەر چاککردن لە پێش نوێژدا لە رۆژی هەینی.**

٩١٨- نهى عن جلد الحد في المساجد .

(صحيح) (هـ) عن ابن عمرو. (الإرواء ٢٢٧٦)

**٩١٨-قەدەغەی کردووە شەلاقی( حَدّ ) سزای خوایی لەناو مزگەوتدا جێبەجێ بکرێت.**

٩١٩- لا تتخذوا المساجد طرقا إلا لذكر أو صلاة .

(صحيح) (طب) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٠٠١)

**٩١٩-مزگەوت مەکەنە ڕێگە، چونکە تەنها بۆ یادی خواو نوێژە.**

٩٢٠- لا تقبل صلاة لامرأة تتطيب لهذا المسجد حتى ترجع فتغتسل غسلها من الجنابة .

(صحيح) (د) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٠٣١)

**٩٢٠-نوێژ لە هیچ ئافرەتێك وەرناگیرێت کە خۆی بۆن خۆش کردبێت بۆ مزگەوت هەتا نەگەڕێتەوەو خۆی نەشوات وەکو خۆشتنی لەشگرانی.**

٩٢١- لا تمنعوا النساء حظوظهن من المساجد إذا استأذنكم .

(صحيح) (م) عن ابن عمر. (الإرواء ٥٠٨)

**٩٢١-ڕێگە لە ئافرەتان مەگرن ئەگەر ویستیان بچنە مزگەوت و مۆڵەتیان لێ وەرگرتن.**

٩٢٢- لا تمنعوا إماء الله أن يصلين في المسجد .

(صحيح) (هـ) عن ابن عمر. (الإرواء ٥٠٨)

**٩٢٢-ڕێگە لە کەنیزەکەکانی خوا مەگرن کە نوێژ لە مزگەوتا بکەن.**

٩٢٣- لا تمنعوا إماء الله مساجد الله .

(صحيح) (حم م) عن ابن عمر. (الإرواء ٥٠٨)

**٩٢٣-ڕێگەی مزگەوتەکانی خوا لە کەنیزەکەکانی[1] خوا مەگرن.**

٩٢٤- لا تمنعوا إماء الله مساجد الله ولكن ليخرجن وهن تفلات .

(صحيح) (حم د) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٥٧٤)

**٩٢٤- ڕێگەی مزگەوتەکانی خوا لە کەنیزەکەکانی خوا مەگرن مەگەر خۆ بۆن خۆشکراوی بڕۆن.**

٩٢٥- لا تمنعوا نساءكم المساجد وبيوتهن خير لهن .

(صحيح) (حم د ك) عن ابن عمر. (الإرواء ٥٠٨)

**٩٢٥-ڕێگەی مزگەوتەکان لە ئافرەتەکانتان مەگرن و ماڵەوەشیان باشترە بۆیان.**

٩٢٦- إذا تطهر الرجل ثم مر إلى المسجد يرعى الصلاة كتب له كاتبه بكل خطوة يخطوها إلى المسجد عشر حسنات والقاعد يرعى الصلاة كالقانت ويكتب من المصلين من حين يخرج من بيته حتى يرجع إليه .

(صحيح) (حم حب ك هق) عن عقبة بن عامر. (الترغيب ٢٩٦)

---

[1] واتە :ئافرەتان.

**٩٢٦-ئەگەر پیاوێك دەستنوێژی گرت و ئینجا ڕۆیشت بۆ مزگەوت بۆ كردن و لەبەرچاو گرتنی نوێژ نوسوری كردەوەكانی بەهەموو هەنگاوێك كە دەینێت بەرەو مزگەوت دە چاكەی بۆ دەنوسێت،ئەو كەسەش دانیشتووەو چاوەڕێی نوێژ دەكات وەك لێبراوان وایە و لە نوێژ خوێنانیش دەنوسرێت هەر لەو كاتەی لە ماڵەوە دەرچووە ەتا دەگەڕێتەوە.**

## بابەتی جێگاكانی نوێژو فەزڵی مزگەوتەكان

٩٢٧- أحب البلاد إلى الله مساجدها وأبغض البلاد إلى الله أسواقها.

(صحيح) (م) عن أبي هريرة (حم ك) عن جبير بن مطعم. (المشكاة ٦٩٦)

**٩٢٧- خۆشەویسترین جێگای وڵاتو نیشتمان لای پەروەردگار مزگەوتەكانیەتی[1] و قێزەونترین شوێنی وڵاتانیش لەلای خوا بازارەكانێتی.[2]**

٩٢٨- أخرجوا يهود الحجاز وأهل نجران من جزيرة العرب واعلموا أن شر الناس الذين اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد.

(صحيح) (حم ع حل الضياء) عن أبي عبيدة بن الجراح. (الصحيحة ١١٣٢)

**٩٢٨- جولەكەی حیجازو ئەهلی نەجران لەدورگەی عەرەب دەر بكە، وە با بزانن كە خراپترین خەڵك ئەوانەن كە گۆڕی پێغەمبەرەكانیان دەكەنە مزگەوت.**

٩٢٩- أعطيت خمسا لم يعطهن أحد من الأنبياء قبلي نصرت بالرعب مسيرة شهر وجعلت لي الأرض مسجدا وطهورا فأيما رجل من أمتي أدركته الصلاة فليصل وأحلت لي الغنائم ولم تحل لأحد قبلي وأعطيت الشفاعة وكان النبي يبعث إلى قومه خاصة وبعثت إلى الناس عامة .

(صحيح) (ق ن) عن جابر. (الإرواء ٢٨٥)

**٩٢٩- پێنج بەخششم پێبخشراوە كە بەهیچ پێغەمبەرێكی پێش من نەبەخشراون كۆمەكی و سەركەوتنم پێدراوە بەترس لەدڵی دوژمناندا لە دووری یەك مانگە ڕێ وە، و زەویم بۆ دانراوە بەمزگەوت و خاكەكەشی بە پاكۆكەرەوە جا هەر كەس لە ئوممەتی من لەهەر**

---

[1] ( چونكە مزگەوت شوێنی خوا پەرستی و تەقواو دابارینی رەحمەتە )

[2] ( چونكە بازاڕ شوێنی سوێن خواردنی درۆو فێڵو كەمی لە كێشانو پێوانو بێ ئاگایی خەڵكە لە پەروەردگار)

**كۆیدا كاتی نوێژ هات با نوێژبكات، وه دەسكەوتم بۆ ڕەواكراوه كه پێش من بۆ هیچ پێغەمبەر ڕەوا نەبووه، وه (شەفاعەت)تكام پێ بەخشراوه[1] وه هەر پێغەمبەرێك له پێش منەوه تەنها بۆ گەل و نەتەوه كەی خۆی نێروانه كراوه بەلام من بۆ هەموو خەڵك بەگشتی رەوان كراوم.**

٩٣٠- امسحوا رغام الغنم وطيبوا مراحها وصلوا في جانب مراحها فإنها من دواب الجنة .

(صحيح) (هق في المعرفة) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١١٢٨)

**٩٣٠- چڵمی مەڕ بسڕن، پەچەی و مۆڵگای مەڕو ماڵات پاك بكەنەوه، و له تەنیشت مۆڵگاكەیانەوه نوێژ بكەن، چونكه مەڕوبزن یەكێكن له ئاژەڵانی بەهەشت.**

٩٣١- إن لم تجدوا إلا مرابض الغنم وأعطان الإبل فصلوا في مرابض الغنم ولا تصلوا في أعطان الإبل فإنها خلقت من الشياطين .

(صحيح) (هـ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٧٣٩)

**٩٣١- گەر شوێنتان دەست نەكەوت جگه له پەچەو مۆڵگای مەڕوبزن و مۆڵگای ووشتر، ئەوه نوێژ له مۆڵگای مەڕوبزن دا بكەن و له مۆڵگای وشتردا نوێژ مەكەن، چونكه مۆڵگای وشتر له شەیتانەكان دروست كراوه.**

٩٣٢- إياكم والتعريس على جواد الطريق والصلاة عليها فإنها مأوى الحيات والسباع وقضاء الحاجة عليها فإنها الملاعن .

(صحيح) (هـ) عن جابر. (الإرواء ٦١)

**٩٣٢- ئاگادارتان دەكەمەوه له كۆتایی شەودا هەرگیز لەسەر ڕێگاو بان بارگەوینه دامەنێن و نوێژیشی لێ مەكەن، چونكه ڕێگای هاتوچۆ بەشەودا لانكەی مارو دڕندەیه هەروەها بەهیچ جۆرێك دەست بەئاو مەگەیەنن لەسەر ڕێگای خەڵك، چونكه هۆكاره بۆ جوێندان و نەفرینی خەڵك.**

٩٣٣- لأرض كلها مسجد إلا المقبرة والحمام .

(صحيح) (حم د ت هـ حب ك) عن أبي سعيد. (الإرواء ٢٨٧)

---

[1] **(ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێنج شەفاعەتی بۆ هەیه ،یەكەم شەفاعەتی(عظمی) بۆ دەست پێكردنی چارەنووسی خەڵك، دووەم بۆ هەندێك كه دەچنه بەهەشت به بێ حیساب، سێیەم بۆ خەڵكی كه شایستەی دۆزەخن، بەلان ناچنه ناوی، چوارەم بۆ خەڵكانێ چونەته دۆزەخ بەلام بەو شەفاعەته دێنه دەرەوه، پێنجەم بۆ بەرز كردنەوەی پلەی كۆمەڵێك لەناو بەهەشتدا)**

**٩٣٣- زەوی هەمووی شوێنی نوێژو کڕنوش بردنە جگە لە قەبرستان و حەمام نەبێت.**

٩٣٤- جعلت لي الأرض مسجدا وطهورا .

(صحيح) (هـ) عن أبي هريرة (د) عن أبي ذر. (الإرواء ١٥٢)

**٩٣٤- زەویم بۆ دانراوە بە مزگەوت و پاکۆکەرەوە.**[1]

٩٣٥- جعلت لي كل أرض طيبة مسجدا وطهورا .

(صحيح) (حم الضياء) عن أنس. (الإرواء ١٥٢)

**٩٣٥- هەموو زەویم بۆ پاککراوەتەوە بۆم کراوەتە بە مزگەوت و شوێنی کڕنوش بردن بۆ خودا بۆ کراوەتە پاکۆکەرەوە.**

٩٣٦- خير البقاع المساجد وشر البقاع الأسواق .

(صحيح) (طب ك) عن ابن عمر. (الترغيب ٣٢٥)

**٩٣٦- باشترین پارچە شوێن و جێگا مزگەتەکانە ، وە خراپترین جێگاش بازاڕەکانە.**

٩٣٧- صلوا في مرابض الغنم ولا تصلوا في أعطان الإبل .

(صحيح) (ت) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٧٦)

**٩٣٧- نوێژ بکەن لە پەچەو مۆڵگای مەڕەوبزندا و نوێژ مەکەن لە پەچەو مۆڵگای ووشتردا.**

٩٣٨- صلوا في مرابض الغنم ولا تصلوا في أعطان الإبل فإنها خلقت من الشياطين .

(صحيح) (هـ) عن عبدالله بن مغفل. (الإرواء ١٧٦)

**٩٣٨- نوێژ بکەن لە پەچەکانی مەڕوبزندا، بەڵام نوێژ مەکەن لە پەچە و مۆڵگاکانی وشتردا چونکە پەچەکان لە شەیتان دروست بوون.**

٩٣٩- صلوا في مراح الغنم وامسحوا رغامها فإنها من دواب الجنة .

(صحيح) (عد هق) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١١٢٨)

**٩٣٩- لە پەچەی مەڕوماڵاتدا نوێژ بکەن، و تەپو تۆزیان لێ بتەکێنە ، چونکە مەڕو ماڵات لە گیانلەبەرانی بەهەشتن.**

---

[1] (ئیمامی ئیبن و لقەیم ئەفەرموێت: ئەم فەرمودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی نوێژ لەهەر کوێیەکدا بیکەیت دروستە جگەلەو شوێنانەی بەرگریان لێکراوە وەك( قەبرستان و حەمام و پەچەی وشترو ....هتد) ئەم وسوننەتە لە کوێ و کردەوەی ئەوانە لەکوێ کە نوێژ نەك هەر لەسەر زەوی ناکەن بەڵکو حەسیرێك رادەخەون پاشان بەرماڵێك لەسەری و هەندێ جار قوماشێك بەسەر بەرماڵەکەشدا دەدەن )

٩٤٠- فضلت بأربع جعلت أنا وأمتي في الصلاة كما تصف الملائكة وجعل الصعيد لي وضوءا وجعلت لي الأرض مسجدا وطهورا وأحلت لي الغنائم .

(صحيح) (طب) عن أبي الدرداء. (الإرواء ٢٨٥)

**٩٤٠- بەچوار شت پلەم بەرزكراوەتەوە بەسەر پێغەمبەرانی هاوەڵمدا، منو ئوممەتەكەم بۆمان دانراوە لەنوێژدا وەك فریشتەكان چۆن ریز دەبەستن ئاوەها بە ریز رێك بوەستین، وە خۆلیشم بۆ دانراوە لەجیاتی دەست نوێژ تەیەممومی پێ بكەم ، وە زەویشم بۆ كراوە بە مزگەوتو شوێنی پاك و دەستكەوتم بۆ رەوا كراوە .**

٩٤١- فضلت بأربع جعلت لي الأرض مسجدا وطهورا فأيما رجل من أمتي أتى الصلاة فلم يجد ما يصلي عليه وجد الأرض مسجدا وطهورا وأرسلت إلى الناس كافة ونصرت بالرعب من مسيرة شهرين يسير بين يدي وأحلت لي الغنائم .

(صحيح) (هق) عن أبي أمامة. (الإرواء ٢٥٥)

**٩٤١- بەچوار شت پلەم بەرزكراوەتەوە بەسەر پێغەمبەرانی هاوەڵمدا، زەویم بۆ دانراوە بە مزگەوتو شوێنی پاك، بۆیە هەر كەسێ لەئوممەتم كاتی نوێژ هاتو هیچی دەست نەكەوت نوێژ لەسەر بكات با زەوی بكاتە راخەر و شوێنی سوژدە هەروەها من بۆ هەموو خەڵك نێردراوم وەمن سەرخراوم بەسەر دوژمنداو لێم دەترسن بە ئەندازەی دوو مانگەرێ وە دەستكەوتیشم بۆ رەوا كراوە .**

٩٤٢- فضلت على الأنبياء بخمس بعثت إلى الناس كافة وادخرت شفاعتي لأمتي ونصرت بالرعب شهرا أمامي وشهرا خلفي وجعلت لي الأرض مسجدا وطهورا وأحلت لي الغنائم ولم تحل لأحد قبلي .

(صحيح) (طب) عن السائب بن يزيد. (الإرواء ٢٥٥)

**٩٤٢- پلەم بەرزكراوەتەوە بەسەر پێغەمبەراندا بە پێنج شت، من نێردراوم بۆ هەموو خەڵك ، تكاكردنمپاشەكەوت كردووە بۆ ئوممەتەكەم، و سەرخراوم بەسەر دوژمندا بەوەی بە ئەندازەی یەك مانگەرێ لە پێشمەوە وەیەك مانگە رێ لە دوامەوە لێم دەترسن، وە زەویم بۆ دانراوە بە شوێنی كڕنوش بردن و پاك كەرەوەی، هەروەها دەستكەوتم بۆ رەوا كراوە بەلام بۆ پێغەمبەرانی پێش من رەوا نەبووە.**

٩٤٣- فضلت على الأنبياء بست أعطيت جوامع الكلم ونصرت بالرعب وأحلت لي الغنائم وجعلت لي الأرض طهورا ومسجدا وأرسلت إلى الخلق كافة وختم بي النبيون .

(صحيح) (م ت) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٨٥)

**٩٤٣- پلەم بەرزكراوەتەوە بەسەر پێغەمبەرانی تردا بەشەش شت ( جوامع الكلم ) قسەی كورتو پڕمانا و گشتگیریم پێ بەخشراوە و وەسەرخراوم بە ترس لەدڵی دوژمنانمدا، وە دەستكەوتم بۆ ڕەوا كراوە، و زەویم بۆ دانراوە بە پاكۆكەرو مزگەوتو شوێنی كڕنوش بردن، و نێردراوم بۆ هەموو خەڵك و پێغەمبەران بەمن كۆتاییان هاتووە.**[1]

٩٤٤- قاتل الله اليهود اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد .

(صحيح) (ق د) عن أبي هريرة. (تحذير الساجد ١٢)

**٩٤٤- خوای گەورە جولەكە لەناو بەرێت و ریسوایان بكات كە گۆڕی پێغەمبەرەكانیان كرد بووە مزگەوتو شوێنی كڕنوش بردن.**

٩٤٥- لعن الله اليهود اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد .

(صحيح) (ن) عن أبي هريرة. (تحذير الساجد ١٠)

**٩٤٥- نەفرەتی خوا لە جولەكە بێت گۆڕی پێغەمبەرەكانیان كردبووە مزگەوت.**

٩٤٦- لعن الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد .

(صحيح) (حم) عن أسامة بن زيد (حم ق ن) عن عائشة وابن عباس معا(م) عن أبي هريرة. (تحذير الساجد ١٠)

**٩٤٦- نەفرەتی خوا لە جولەكەو گاوران بێت گۆڕی پێغەمبەرەكانیان كردبووە مزگەوت.**

٩٤٧- المسجد بيت كل مؤمن .

(صحيح) (حل) عن سلمان. (الصحيحة ٧١٦)

**٩٤٧- مزگەوت ماڵی هەموو ئیمانداریكە.**

---

[1] (ئیمامی الزين العراقی ئەڵێ( كە هەموو فەرمودەكان لەم بوارەدا كۆ دەكەینەوە دەگاتە(١١) یازدە فەزڵو خەسڵەت كە ئەمانەن( جوامع الكلم ) ی پێ بەخشراوە و بەرتس سەرخراوەو غەنیمەی بۆ حەڵاڵ كراوەوە زەوی بۆ دانراوە پاكۆكەرەوەو مزگەوت بێت، وە بۆ هەموو خەڵك نێردراوە، وە بە ئەم پێغەمبەران كۆتاییان هاتووە، و ریزی ئوممەتەكەی لە نوێژدا بۆ دانراوە وەك ریزی فریشتەكان بێت وە شەفاعەتی پێ بەخشراوە وەناونراوە ( احمد ) وە ئوممەتەكەی بە ( خير الامم ) باشترین ئوممەت دانراوە و كۆتایی سورەتی ( البقره ) ی پێ بەخشراوە كەلە خەزینەیەكدا بووە لە ژێر عەرشی پەروەردگاردا )

٩٤٨- لا تشد الرحال إلا إلى ثلاثة مساجد المسجد الحرام ومسجدي هذا والمسجد الأقصى .

(صحيح) (حم ق د ن هـ) عن أبي هريرة (حم ق ت هـ) عن أبي سعيد (هـ) عن ابن عمرو. (الإرواء ٧٥٢)

**٩٤٨- هەرگیز نابێت خۆ ئامادە باشی بکرێتو پشتێن ببەسترێ بۆ زیارەت تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت( مزگەوتی ( حەرام ) ماڵی خوا، ئەم مزگەوتەی من، مزگەوتی ئەقسا لە قودس.**

٩٤٩- لا تصلوا إلى قبر ولا تصلوا على قبر.

(صحيح) (طب) عن ابن عباس. (الصحيحة ١٠٦)

**٩٤٩- هەرگیز ڕوو بە هیچ گۆڕێك و لەسەر هیچ گۆڕێك نوێژ مەکن .**

٩٥٠- لا تصلوا في مبارك الإبل فإنها من الشياطين وصلوا في مرابض الغنم فإنها بركة .

(صحيح) (حم د) عن البراء. (صحيح أبي داود ١٧٧)

**٩٥٠- نوێژ مەکەن لە مۆڵگای وشتردا، چونکە مۆڵگای وشتر دروست بووە لەوەی کە شەیتانی لێ دروست بووە، نوێژ بکەن لە پەچەی مەڕوبزندا چونکە پەچەی مەڕوبزن بەرەکەتە.**

٩٥١- لا تعمل المطي إلا إلى ثلاثة مساجد إلى المسجد الحرام وإلى مسجدي هذا وإلى مسجد بيت المقدس .

(صحيح) (مالك ٣ حب) عن بصرة بن أبي بصرة (د ن) عن أبي بصرة. (الجنائز ٢٢٦)

**٩٥١- سەفەر مەکەو ڕێگا مەبڕە تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت، مزگەوتی حەرام کەعبەی پیرۆز، و ئەم مزگەوتەی منو مزگەوتی بیت المقدس.**

٩٥٢- لا يصلى في أعطان الإبل ويصلى في مراح الغنم .

(صحيح) (هـ) عن سبرة بن معبد. (الإرواء ١٧٦)

**٩٥٢- نوێژ ناکرێت لەو شوێنەی پێستی وشتری تێدا دەباخ دەکرێت، ونوێژ دەکرێت لە حەوشەو گەوڕی مەڕ و بزندا.**

٩٥٣- على كل باب من أبواب المسجد ملكان يكتبان الأول فالأول فكرجل قدم بدنة وكرجل قدم بقرة وكرجل قدم شاة وكرجل قدم طيرا وكرجل قدم بيضة فإذا قعد الإمام طويت الصحف .

(صحيح) (حب) عن أبي هريرة. (الترغيب ٧٠٨)

**٩٥٣- لەبەردەم هەموو دەرگایەك لە دەرگاكانی مزگەوت دوو فریشتە ئامادەن و ناوی یەكەیەكەی نوێژ خوێنان دەنوسن بەدوای یەكدا، جا ئەوەی كەلە پێش هەموویەوە هاتوە وەك ئەوە وایە وشترێكی بەخشیبێت، وە ئەوی دوای ئەو وەك ئەوە وایە مانگایەكی بەخشیبێت، وەئەوی دواتر وەك ئەوە وایە مەڕێكی بەخشبێت، وە ئەوی دواتر وەك ئەوە وایە باڵندەیەكی بەخشبێت، ئەوی كۆتایش وەك ئەوە وایە هێلكەیەكی بەخشیبێت، تا ئەو كاتەی وتاربێژ دەگاتە سەر مینبەر، ئەمانە دەنوسرێن، بەڵام كاتێ وتاربێژ لەسەر مینبەر دانیشت ، فریشتەكان نوسیەكانیان دەپێچنەوەو هیچی تر نانوسن.**

## بابەتی فەزڵی مزگەوتی حەرام (المسجد الحرام)

٩٥٤- أول مسجد وضع في الأرض المسجد الحرام ثم المسجد الأقصى وبينهما أربعون سنة ثم أينما أدركتك الصلاة بعد فصل فإن الفضل فيه .

(صحيح) (حم ق ن هـ) عن أبي ذر. (فقه السيرة ٨٢)

**٩٥٤- یەكەمین مزگەوتێ كە لەسەر زەویدا دانرا مزگەوتی (حەرام-كەعبە) بوو پاشان مزگەوتی (ئەقسا) لە نێوانیشیان چل ساڵ بوو، پاشان لەهەر شوێنێكدا كاتی نوێژ هات، نوێژكەت بكەو خێر و چاكە لەو شوێنەدایە.**

٩٥٥- فضل الصلاة في المسجد الحرام على غيره مائة ألف صلاة وفي مسجدي ألف صلاة ...

(صحيح) (هب) عن أبي الدرداء. (الإرواء ١١٣٠)

**٩٥٥- فەزڵی یەك نوێژ لە مزگەوتی(حەرام) دا بەسەر مزگەوتكانی تردا سەد هەزار نوێژە، وە لەیەك نوێژ لە مزگەوتی مندا هەزار نوێژە. صحيح( هب ) لە ئەبی دەردائەوە.**

## بابەتی فەزڵی مزگەوتی پێغەمبەر((ﷺ))

٩٥٦- خير ما ركبت إليه الرواحل مسجدي هذا والبيت العتيق .

(صحيح) (حم ع حب) عن جابر. (الصحيحة ١٦٤٨)

**٩٥٦- باشترین شوێن كەرێبواران كۆچی بۆ بكەن ئەم مزگەتەی منو ماڵی خودایە (البيت العتيق).**

٩٥٧- صلاة في مسجدي أفضل من ألف صلاة فيما سواه إلا المسجد الحرام وصلاة في المسجد الحرام أفضل من مائة ألف صلاة فيما سواه .

(صحيح) (حم هـ) عن جابر. (الإرواء ١١٢٩)

**٩٥٧- یەك نوێژ لە مزگەوتی مندا باشترە لەهەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی تردا جگە لە (مزگەوتی حەرام) وە نوێژێك لە مزگەوتی(حەرام)دا باشترە لەسەد هەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی تردا.**

٩٥٨- صلاة في مسجدي هذا أفضل من ألف صلاة فيما سواه من المساجد إلا المسجد الحرام .

(صحيح) (حم ق ت ن هـ) عن أبي هريرة (حم م ن هـ) عن ابن عمر (م) عن ميمونة (حم) عن جبير بن مطعم وسعد والأرقم. (الإرواء ٩٥٣)

**٩٥٨- نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا باشترە لەهەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی تردا جگە لە (مزگەوتی حەارم)**

٩٥٩- صلاة في مسجدي هذا أفضل من ألف صلاة فيما سواه من المساجد إلا المسجد الحرام فإني آخر الأنبياء وإن مسجدي آخر المساجد .

(صحيح) (م ن) عن أبي هريرة. (الثمر المستطاب ١\٥١٣)

**٩٥٩- نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا باشترە لەهەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی تردا جگە لە مزگەوتی حەرام، چونکە من کۆتا پێغەمبەرمونەم مزگەوتەی منیش کۆتا مزگەوتە.**[1]

٩٦٠- صلاة في مسجدي هذا أفضل من ألف صلاة فيما سواه من المساجد إلا المسجد الحرام وصلاة في المسجد الحرام أفضل من صلاة في مسجدي هذا بمائة صلاة .

(صحيح) (حم حب) عن ابن الزبير. (الإرواء ٩٥٣)

**٩٦٠- نوێژێك لەم مزگەوتەی مندا خێری زیاترە لەهەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی تردا جگە لە مزگەوتی(حەرام) ونوێژێك لە مزگەوتی (حەرام)دا فەزڵی زیاترە لەسەد نوێژ کەلەم مزگەوتەی مندا بکرێت.**

٩٦١- المسجد الذي أسس على التقوى مسجدي هذا .

(صحيح) (م ت) عن أبي سعيد (حم ك) عن أبي. (الترغيب ١١٧٦)

---

[1] (زانای پایە بەرز (سندی) ئەڵێ (ئەم مزگەوتەی منیش کۆتا مزگەوتە بەچەند مانایەك لێك دەدرێتەوە لەوانە ئەم مزگەوتەی من کۆتا مزگەوتە لەو سێ مزگەوتەی فەزڵ و ڕێزی بۆ دانراوە یان ئەم مزگەوتەی من کۆتا مزگەوتە پێغەمبەران دروستیان کرد بێت یان ئەم مزگەوتەی من کۆتا مزگەوتە لە ڕووخان و لەناو چووندا)

**٩٦١- ئه‌و مزگه‌وته‌ى كه‌له‌سه‌ر ( ته‌قوا ) پاريزكارى دروستكراوه ئه‌م مزگه‌وته‌ى منه.**

٩٦٢- ما بين بيتي ومنبري روضة من رياض الجنة .

(صحيح) (حم ق ن) عن عبدالله بن زيد المازني (ت) عن علي وأبي هريرة. (الروض ١١٢٥)

**٩٦٢- نيوان ماڵه‌كه‌مو مينبه‌ركه‌م باخچه‌يه‌كه له باخچه‌كانى به‌هه‌شت.**

٩٦٣- ما بين بيتي ومنبري روضة من رياض الجنة ومنبري على حوضي .

(صحيح) (حم ق ت) عن أبي هريرة. (السنة ٧٣١)

**٩٦٣- نيوان ماڵه‌كه‌مو مينبه‌ره‌كه‌م باخچه‌يه‌كه له باخچه‌كانى به‌هه‌شت‌ومينبه‌ره‌كه‌شم له‌سه‌ر حه‌وزه‌كه‌مه.**

٩٦٤- منبري هذا على ترعة من ترع الجنة .

(صحيح) (حم) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٣٦٣)

**٩٦٤- مينبه‌ره‌كه‌م له‌سه‌ر جيگايه‌كى تايبه‌ته له جيگاكانى به‌هه‌شت.**

٩٦٥- قوائم منبري رواتب في الجنة .

(صحيح) (حم ن حب) عن أم سلمة (طب ك) عن أبي واقد. (الصحيحة ٢٠٥٠)

**٩٦٥- پايه‌كانى مينبه‌ره‌كه‌ى من جيگاى ديارى كراون.**

## پله‌و پايه‌و ريزى به‌يتوله‌قديس

٩٦٦- إن سليمان بن داود لما بنى بيت المقدس سأل الله عز وجل خلالا ثلاثة سأل الله حكما يصادف حكمه فأوتيه وسأل الله ملكا لا ينبغي لأحد من بعده فأوتيه وسأل الله حين فرغ من بناء المسجد أن لا يأتيه أحد لا ينهزه إلا الصلاة فيه أن يخرجه من خطيئته كيوم ولدته أمه أما اثنتان فقد أعطيهما وأرجوا أن يكون قد أعطي الثالثة .

(صحيح) (حم ن هـ حب ك) عن ابن عمرو. (الترغيب ١١٧٨)

**٩٦٦- سوله‌يمانى كوڕى داود- سه‌لامى خوايان له‌سه‌ر بيت- كاتێ به‌يتوله‌قديسى دروست كرد سى داواى له خواى گه‌وره كرد، داواى كرد كه خواى گه‌وره حوكميكى پێ ببه‌خشيت گونجاوو ريك بيت له‌گه‌ڵ حوكمى په‌روه‌ردگاردا ، خواى گه‌وره پێى به‌خشى، وه داواى كرد خواى گه‌وره موڵكو ده‌سه‌ڵاتيكى پێ ببه‌خشيت كه‌له‌دواى سوله‌يمان به‌كه‌سى نه‌به‌خشيت، خواى گه‌وره ئه‌مه‌شى پێ**

بەخشی، وە کاتێ لەدروست کردنی مزگەوتی (بيت المقدس) لێ بوویەوە ، داوای لە پەروەردگار کرد کە هەر کسە بەنیەتو نیازی نوێژکردن ڕوو لەم مزگەوتە بکات نەچێتە دەرەوە تاخوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێتو دەیسڕێتەوە و وەکو ئەو ڕۆژەی لێ دێت کەلە دایك بوە، بۆیە خوای گەورە خاڵی یەکەمو دووەمی پێ بەخشیو ئومێد دەکەمو دەخوازم خاڵی سێیەمیشی پێ بەخشرا بێت.

## پلەو پایەی مزگەوتی قوبا

٩٦٧- الصلاة في مسجد قباء كعمرة .

(صحيح) (حم ت هـ ك) عن أسيد بن حضير. (الصحيحة ٣٤٤٦)

**٩٦٧- نوێژ لە مزگەوتی قوبادا وەکو عەمرەیە.**

٩٦٨- من تطهر في بيته ثم أتى مسجد قباء فصلى فيه كان له كأجر عمرة .

(صحيح) (هـ) عن أبي أمامة بن سهل بن حنيف. (الترغيب ١١٨١)

**٩٦٨- هەرکەس لە ماڵی خۆیەوە دەست نوێژ بگرێتو پاشان بێتە مزگەوتی قوباو نوێژی تێدا بکات ئەو بە ئەندازەی عەمەرەیەك پاداشت وەردەگرێت.**

٩٦٩- من خرج حتى يأتي هذا المسجد مسجد قباء فيصلي فيه كان له عدل عمرة .

(صحيح) (حم ن ك) عن سهل بن حنيف. (الترغيب ١١٨١)

**٩٦٩- هەرکەس لەشوێنی خۆی دەربچێتو بگاتە ئەم مزگەوتە، مزگەوتی قوبا، و نوێژی تێدا بکات ئەو بە ئەندازەی عەمەرەیەك پاداشت وەردەگرێت.**

## بابەتی گەردن کەچی لەنوێژدا

٩٧٠- اذهبوا بهذه الخميصة إلى أبي جهم بن حذيفة وأتوني بأنبجانيته فإنها ألهتني آنفا في صلاتي .

(صحيح) (ق د ن هـ) عن عائشة. (الإرواء ٣٧٥)

**٩٧٠- ئەم جلو بەرگە(خميصه).[1] بەرن بۆ ئەبی جەهمی کوڕی حەزیفەو کراسەکەی (أنبجانيته)[2] بۆ بێنن، چونکە جلو بەرگە (خميصه) کەم بی دوێنێ ئاگای کردم لە نوێژەکەم .**

[1] ((خميصه) بەو جلو بەرگە دەوترێت وێنەو نیشانەی لەناودا کێشرا بێت)

[2] ((إنبجانبته) بەرگێکە لەخوری دروست کراوەو نیشانەو وێنەی تێدا نەبوە)

٩٧١- لا صلاة بحضرة طعام ولا وهو يدافعه الأخبثان .

(صحيح) (م د) عن عائشة. (الإرواء ٥٤٣)

**٩٧١- لەكاتی ئامادە بوونو دانانی خواردندا نوێژ ناكرێت، وە نابێت نوێژ بكرێت لەو كاتەی دوو پیسیەكە تەنگاویان كردبێت.**

٩٧٢- إذا أقمت الصلاة وآتيت الزكاة وهجرت الفواحش ما ظهر منها وما بطن فأنت مهاجر وإن مت بالحضر.

(صحيح) (حم) عن ابن عمرو . (الصحيحة ٣٩٦٤)

**٩٧٢- كاتێ قامەتت كرد بۆ نوێژو زەكات ودوورەپەرێزیت كرد لە خراپەكاری ئاشكراو پەنهانی وئیتر تۆ كۆچكەری با بەنیشتەجێیش بمریت.**

٩٧٣- هو اختلاس يختلسه الشيطان من صلاة العبد - يعني الالتفات- .

(صحيح) (حم خ د ن ) عن عائشة (الإرواء ٣٦٩)

**٩٧٣- ئاوڕدانەوە لە نیوژدا: ئەوە دزیكردنێكە شەیتان لەنوێژی مرۆڤ دەیدزێتەوە.**

٩٧٤- أميطي عنا قرامك هذا فإنه لا تزال تصاويره تعرض لي في صلاتي .

(صحيح) (حم خ) عن أنس. (المشكاة ٧٥٨)

**٩٧٤- لە ئێمەی دوور بخەرەوە ئەم پۆشاكە نەخشەكێشراوە چونكە بەردەوام وێنەكانی دێنە پێش چاوم لە نوێژەكەمدا.**

٩٧٥- إذا كان أحدكم في الصلاة فلا يرفع بصره إلى السماء أن يلتمع بصره .

(صحيح) (حم ن) عن رجل من الصحابة. (الترغيب ٥٥٠)

**٩٧٥-ئەگەر یەكێكتان لەنوێژدا بوو با چاوی بەرز نەكاتەوە بۆ ئاسمان نەوەك رووناكی چاوی بڕوات.**

٩٧٦- إذا كان أحدكم في صلاة فإنه يناجي ربه فلينظر أحدكم ما يقول في صلاته ولا ترفعوا أصواتكم فتؤذوا المؤمنين .

(صحيح) (البغوي) عن رجل من بني بياضة . (الصحيحة ١٥٩٧)

**٩٧٦- ئەگەر هەركەس لەئێوە لە نوێژدا بوو لەگەڵ پەروەردگاردا ووتووێژ دەكات جا باهەر یەك لەئێوە سەیر بكاتو بزانێت چی دەڵێ لە نوێژكەیداو دەنگ بەرز مەكەنەوە، چونكە ئیمانداران ئەزیەت دەدەن.**

٩٧٧- إذا قمت في صلاتك فصل صلاة مودع ولا تكلم بكلام تعتذر منه واجمع الإياس مما في أيدي الناس.

(صحيح) (حم هـ) عن أبي أيوب. (الصحيحة ٤٠٠)

**٩٧٧- ئەگەر هەستای بۆ نوێژکردن ئەوا نوێژ خواحافیزی بکە، وە هەرگیز قسەیەك مەکە ناچار بیت بیانووی بۆ بهێنیتەوە، وەبریار بدەو عەزمت هەبێت بێ ئومێدو بێنیاز بە لەوەی لە دەست خەڵکدایە.**

٩٧٨- إني نسيت أن آمرك أن تخمر القرنين فإنه ليس ينبغي أن يكون في البيت شيء يشغل المصلي .

(صحيح) (د) عن عثمان الحجبي. (صحيح أبي داود ١٧٧٠)

**٩٧٨- من لەیادم چوو کە فرمانت پێ بکەم کە جوتە قۆچەکەت دا پۆشی چونکە نابێت لە ناوماڵی خوادا شتێ هەبێت نوێژ خوێن سەرقاڵ بکات.**

٩٧٩- إذا أقيمت الصلاة وأحدكم صائم فليبدأ بالعشاء قبل صلاة المغرب ولا تعجلوا عن عشائكم .

(صحيح) (حب) عن أنس. (الصحيحة ٣٩٦٤)

**٩٧٩- ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژو هەر یەك لەئێوە بەرۆژوو بوو با نانی ئێوارە بخوات پێش نوێژی ئێوارەو هیچ پەلە نەکات لەنان خوارنەکەیدا.**

٩٨٠- إذا أقيمت الصلاة وأراد الرجل الخلاء فليبدأ بالخلاء .

(صحيح) (مالك الشافعي حب ت ن هـ حب ك هق) عن عبدالله بن أرقم.(صحيح أبي داود ٨٠)

**٩٨٠- ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ وکەسێ ویستی دەست بە ئاو بگەیەنێت با بچێتە سەر ئاو.**

٩٨١- إذا أراد أحدكم أن يذهب إلى الخلاء وأقيمت الصلاة فليذهب إلى الخلاء .

(صحيح) (حم د ن هـ حب ك) عن عبدالله بن أرقم. (صحيح أبي داود ٨٠)

**٩٨١- ئەگەر یەکێکتان ویستی بچێتە سەر ئاوو قامەت کرا با بچێتە سەر ئاو.**

٩٨٢- اذكر الموت في صلاتك فإن الرجل إذا ذكر الموت في صلاته لحري أن يحسن صلاته وصل صلاة رجل لا يظن أنه يصلي صلاة غيرها وإياك وكل أمر يعتذر منه .

(صحيح) (فر) عن أنس وحسنه ابن حجر وهو نادر في مفاريد مسند الفردوس فإن أكثرها ضعاف. (الصحيحة ١٤٢١)

**٩٨٢- بیری مردن بکەرەوە لەنوێژەکەتدا، چونکە مرۆڤ کاتێ بیری مردن دەکاتەوە لەنوێژەکەیدا بێگومان لەو حاڵەتەدا نوێژکەی بە جوانی بکات، وە کە نوێژت کرد وەك**

**ئەو کەسە نوێژ بکە کە گومانی نییە لەوەی ئەمە دوا نوێژە دەیکاتو فریای نوێژی تر ناکەوێت، وە ئاگادارت دەکەم لە ئە نجامدانی هەر ئیشێك بیانووی بۆ بهێنرێتەوە.**

٩٨٣- نهى عن الاختصار في الصلاة .

(صحيح) (حم د ت) عن أبي هريرة. (الإرواء ٣٧٣)

**٩٨٣- پێغەمبەری خوا(ﷺ) قەدەغەی کردووە لەنوێژدا مرۆڤ دەست بخاتە سەر لاکەلەکەی .**

٩٨٤- أول ما يرفع من الناس الخشوع .

(صحيح) (طب) عن شداد بن أوس. (الترغيب ٥٤٢)

**٩٨٤- یەکەمین شتێك کەلەناو خەڵکدا هەڵدەگیرێت گەردن کەچیە.**

٩٨٥- صل صلاة مودع كأنك تراه فإن كنت لا تراه فإنه يراك وايأس مما في أيدي الناس تعش غنيا وإياك وما يعتذر منه

(صحيح) (أبو محمد الإبراهيمي في كتاب الصلاة ابن النجار) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٤)

**٩٨٥- نوێژی کۆتاییو خواحافیزی بکە، وەك ئەوەی پەروەردگار ببینیت، جا ئەگەر تۆ خوای گەورە نەبینیت ئەو تۆ دەبینێت، وە بێ ئومێد بە لەوەی لەدەست خەڵکدا یە بە دەوڵەمەندی دەژیت، و ئاگادارت دەکەم لە ئە نجامدانی کارێك بیانووی بۆ بهێنرێتەوە.**

٩٨٦- نهى عن السدل في الصلاة وأن يغطي الرجل فاه .

(صحيح) (حم ٤ ك) عن أبي هريرة. (المشكاة ٧٦٤)

**٩٨٦- پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی کردووە لە بەردانەوە.[1] درێژ کردنەوەی لە نوێژدانو لەدەم دا پۆشینو داخستن.**

٩٨٧- إن الرجل لينصرف وما كتب له إلا عشر صلاته تسعها ثمنها سبعها سدسها خمسها ربعها ثلثها نصفها .

(صحيح) (حم د حب) عن عمار بن ياسر. (صحيح أبي داود ٧٦١)

---

[1] (ئیمامی مەناوی دەڵێت: مەبەست لە (سدل- بەردانەوەو شۆرکردنەوە( شۆرکردنەوەی جلو بەرگە تادەخشێت لە زەوی ، یان جلو بەرگ لە خۆ پێچانەو هەردوو دەست شاردنەوەیە لە نێویداو بەو شێوەیە رکوعو سوژدە ببات، هەروەك رەفتاری جولەکە، یان مەبەست لە (سدل) بەردانەوەی قژی سەرە تا نێو چاوان و شوێنی سوجدە دادەپۆشی )

**٩٨٧- بەراستی پیاو هەیە نوێژ دەکات و روو وەردەگێرێت و دەڕوا بەڵام لەپاداشتی نوێژکەی دەیەك نۆیەك هەشت یەك حەوت یەك شەش یەك پێنج یەك چوار یەك سێ یەك نیوەی بۆ دەنوسرێت.**[1]

٩٨٨- إن الرجل إذا دخل في صلاته أقبل الله عليه بوجهه فلا ينصرف عنه حتى ينقلب أو يحدث حدث سوء .

(صحيح) (هـ) عن حذيفة. (الصحيحة ١٥٩٦)

**٩٨٨- پیاو کاتێ دەچێتە نێو نوێژەکەیەوەن خوای پەروەردگار بە روخساری خۆی رووی لێ دەکات و رووی وەناچەرخێنێت لێ ی هەتا نوێژ خوێن لێ نەبێتەوە و پشت هەڵ نەکات یان کارێکی خراپی پێچەوانەی دین ئەنجام نەدات.**

٩٨٩- كان يلحظ في الصلاة يمينا وشمالا ولا يلوي عنقه خلف ظهره .

(صحيح) (ت) عن ابن عباس. (المشكاة ٩٩٨)

**٩٨٩- پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە نوێژدا چاوی بەلای راست و چەپدا دەگێڕا، وە هەرگیز ملی وەرنەدەگێڕا بۆ پشتەوەی خۆی.**[2]

٩٩٠- إذا استؤذن على الرجل وهو يصلي فإذنه التسبيح وإذا استؤذن على المرأة وهي تصلي فإذنها التصفيق .

(صحيح) (هق) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٤٩٧)

**٩٩٠- ئەگەر داوای ئیزن و مۆڵەت کرا لە پیاو ئەویش لەنوێژدا بوو ئیزن دانی بە (تەسبیح)[3]، وە ئەگەر داوای ئیزن لە ئافرەت کراو ئەویش لە نوێژدا بوو ئەوە ئیزن پێدانەکەی بە چەپلە دەبێت.**

٩٩١- أسوأ الناس سرقة الذي يسرق من صلاته لا يتم ركوعها ولا سجودها ولا خشوعها .

(صحيح) (حم ك) عن أبي قتادة (الطيالسي حم ع) عن أبي سعيد. (المشكاة ٨٨٥)

**٩٩١- خراپترین کەسێ دزی بکات ئەو کەسەیە دزی لە نوێژەکەی دەکات، کە رکوع و سوجدەکانی رێك و لەسەر خۆ ناکات و بە تەواوی گەردن کەچی دەرناخات.**

---

[1] (واتە پاداشت جیاوازە بە پێی جیاوازی کەسکان لەگەردن کەچ و ئاستی بیرکردنەوە لەماناکانی نوێژ)

[2] (پێغەمبەری خوا ئەمەی کردووە لەبەر هۆکارێك ئەگینا ئەمە هەدی و سوننەی ئەو نییە)

[3] (مەبەستلە (تسبیح) (سبحان الله)کردنە بۆ پیاو وە بە (چەپلە) لێدان ئافرەت بە ناو لە پی دەستی راستی بەسەر پشتی دەستی چەپدا)

٩٩٢- أفضل الصلاة طول القنوت .

(صحيح) (حم م ت هـ) عن جابر (طب) عن أبي موسى وعمرو بن عبسة وعمير بن قتادة الليثي. (الإرواء ٤٥٧)

**٩٩٢- باشترین نوێژ درێژی ماوەی بە پێوە وەستانە.** [١]

٩٩٣- إن المصلي يناجي ربه فلينظر بم يناجيه ولا يجهر بعضكم على بعض بالقرآن .

(صحيح) (طب) عن أبي هريرة وعائشة. (صحيح أبي داود ١٢٠٣)

**٩٩٣- بەراستی نوێژ خوێن گفتوگۆ و چپە لەگەڵ پەروەردگار دەكات، بۆیە دەبێت بزانێت بەچی لێی دەپارێتەوە، وەبا هەندێكیان دەنگ بەسەر ئەوی تردا بەرز نەكاتەوە بە قورئان خوێندن.**

٩٩٤- لا يزال الله مقبلا على العبد وهو في صلاته ما لم يلتفت فإذا صرف وجهه انصرف عنه .

(صحيح) (حم د ن حب ك) عن أبي ذر. (صحيح أبي داود ٨٤٣)

**٩٩٤- بەردەوام خوای گەورە ڕوو لە بەندەی خۆی دەكات تالە ناو نوێژدا بێت مادەم ئاوڕنەداتەوە، جا هەر كاتێ بەندە ڕووی وەرگێڕا پەروەردگاریش ڕووی لێ وەردەگێڕێ.**

## بابەتی سیفەتی نوێژ

٩٩٥- إذا استقبلت القبلة فكبر ثم اقرأ بأم القرآن ثم اقرأ بما شئت فإذا ركعت فاجعل راحتيك على ركبتيك وامدد ظهرك ومكن لركوعك فإذا رفعت رأسك فأقم صلبك حتى ترجع العظام إلى مفاصلها فإذا سجدت فمكن سجودك فإذا جلست فاجلس على فخذك اليسرى ثم اصنع كذلك في كل ركعة وسجدة.

(صحيح) (حم حب) عن رفاعة بن رافع الزرقي. (صحيح أبي داود ٨٠٦)

**٩٩٥- كاتێ ڕووت لە ڕووگەكرد(الله اكبر) بكە، پاشان سورەتی (فاتحە – ام القران) بخوێنە ، پاشان لەو شوێنەی ئەتەوێ قورئان بخوێنە، ئینجا كە كرنوشت برد ناو لەپی هەردوو دەستت لەسەر ئەژنۆت دابنێ و پشتت ڕێك بوەستێنە و جوان كرنوشەكەت بەرە، ئینجا كەسەرت بەرزكردەوە پشتت ڕێك بكەرەوە تا ئێسكەكانی لەشت دەچنەوە**

[١] (السراج المنير ج١ ص ١٩٣)

**سەر جومگەكانى خۆيان، ئينجا كە كڕنوش(سوجدەت )برد جوان لە سوجەدەكەت بوەستە، پاشان كە هەستايتەوە و دانيشتيت ئەوە لەسەر قاچى چەپت دابنيشە بەم شێوەيە لەهەموو كرنوش و سوژدەيەكدا وا بكە.**

٩٩٦- إذا أقيمت الصلاة فكبر ثم اقرأ ما تيسر من القرآن ثم اركع حتى تطمئن راكعا ثم ارفع حتى تعتدل قائما ثم اسجد حتى تطمئن ساجدا ثم ارفع حتى تطمئن جالسا ثم اسجد حتى تطمئن ساجدا ثم افعل ذلك في صلاتك كلها .

(صحيح) (حم ق ٣ ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٨٠٢)

**٩٩٦- كاتێ كە قامەت كرا بۆ نوێژ(الله اكبر) بكەو پاشان چەندت پێكرا قورئان بخوێنە، پاشان كرنوش ببە تا لە كرنوشدا ئارام دەگرى، پاشان بەرز ببەوە تا بەجوانى لاشەت لە جوڵە دەكەوێت رێك دەوەستيت پاشان سەر بەرزبكەرەوە تا بەرێكى دەوەستيت، پاشان سوژدە ببەرەوە تا ديسانەوە لاشەت لە جوڵە دەكەوێت ئيتر بەم شێوەيە بكە لە هەموو نوێژەكەتدا.**

٩٩٧- إذا قمت إلى الصلاة فكبر ثم اقرأ ما تيسر معك من القرآن ثم اركع حتى تطمئن راكعا ثم ارفع حتى تعتدل قائما ثم اسجد حتى تطمئن ساجدا ثم ارفع حتى تطمئن جالسا ثم اسجد حتى تطمئن ساجدا ثم افعل ذلك في صلاتك كلها .

(صحيح) (حم ق ٣ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٨٩)

**٩٩٧- كاتێ هەستايت بۆ نوێژ ، وە نوێژت دابەست بڵێ(الله أكبر) ، پاشان چەند قورئانت لەبەر بوو بەپێی توانا بيخوێنە ، پاشان كرنوش ببە تا بە تەواوى ئارام دەگريت ، پاشان سەر بەرز بكەرەوە تا بەرێكى دەوەستيت، پاشان سوژدە ببە بەجوانى تا لاشەت لەجوڵە دەكەوێت و ئارام دەگريت ، پاشان سەر بەرز بكەرەوەو دابنيشە تا لەجوڵە دەكەويت وئارام دەگريت، پاشان بەم شێوەيە بكە لەهەموونوێژەكەتدا .**

٩٩٨- إذا قمت إلى الصلاة فتوضأ كما أمرك الله ثم قم فاستقبل القبلة ثم كبر فإن كان معك قرآن فاقرأه وإن لم يكن معك قرآن فاحمد الله وهلله وكبره فإذا ركعت فاركع حتى تطمئن ثم ارفع رأسك فاعتدل قائما ثم اسجد فاعتدل ساجدا ثم ارفع رأسك فاعتدل قاعدا حتى تقضي صلاتك فإذا فعلت ذلك فقد تمت صلاتك وإن انتقصت من ذلك شيئا فإنما انتقصت من صلاتك .

(صحيح) ( ٣ ) عن رفاعة البدري. (صحيح أبي داود ٨٠٧)

**٩٩٨- کاتێ هەستایت بۆ نوێژ دەست نوێژ بگرە بەو شێوەی پەروەردگار فەرمانت پێ کردویت ، پاشان هەستەو ڕوو لە رووگە ( الله اکبر ) بکە، هەر چەندت قورئان لەبەر بوو بیخوێنە ئەگەر هیچت لە قورئان لەبەر نەبوو ئەوا( الحمد لله ولا اله الا الله والله اکبر ) بکە، ئەوجاکە کرنوش بەرە، بە شێوەیەك بیبە تا لاشەت لە جوڵە دەکەوێت، پاشان سەرت بەرز بکەرەوەو بەرێکی بوەستە، پاشان سوژدە بە جوانی ببە تا لاشەت لەجوڵە دەکەوێت ، پاشان سەرت بەرز بکەرەومو بەرێکی دابنیشە ،تا نوێژەکەت تەواو دەکەیت ، جائەگەر وات کرد ئەوە نوێژەکەت بەجوانی وتەواوی کردوە ،وە ئەگەر لەوە کەمترت کرد و لێت کەم کردنەوە ئەوە بێ گومان لە نوێژەکەت کەم کردۆتەوە.**

٩٩٩- إذا قمت إلى الصلاة فكبر ثم اقرأ ما تيسر معك من القرآن ثم اركع حتى تطمئن راكعا ثم ارفع حتى تعتدل قائما ثم اسجد حتى تطمئن ساجدا ثم ارفع حتى تطمئن جالسا ثم اسجد حتى تطمئن ساجدا ثم افعل ذلك في صلاتك كلها .

(صحيح) (حم ق ٣ ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٨٠٢)

**٩٩٩- ئەگەر هەستایت بۆ نوێژ ( الله اکبر )بکە وپاشان چەندت قورئان لە بەر بوویە پێی توانا بیخوێنە ، پاشان کرنوش ببە تا لاشەت لە جوڵە دەکەوێت ، پاشان بەرز ببەرەوە تا بەرێکی دەوەستیت ، پاشان سوژدە ببە و ئارام دەبیتەوە لە سوژدەکەتا ، پاشان بەرزببەرەوە و ئارام بگرە لە دانیشتنەکەتدا ، پاشان سوژدە ببە و ئارام بگرە لە سوژدەکەتا ، پاشان لە هەموو نوێژەکەتدا بەم شێوەیە بکە.**

١٠٠٠- ثلاث من أخلاق النبوة تعجيل الإنطار وتأخير السحور ووضع اليمين على الشمال في الصلاة.

(صحيح) (طب) عن أبي الدرداء.

**١٠٠٠- سێ شت لە رەوشتی پێغەمبەرایەتیە، پەلەکردن[1] لە رۆژوو شکاندندا، وە دواخستنی پارشێو، وە دانانی دەستی راست لەسەر چەپ لە نوێژدا.**

١٠٠١- كان إذا استفتح الصلاة قال سبحانك اللهم وبحمدك وتبارك اسمك وتعالى جدك ولا إله غيرك.

(صحيح) (د ت هـ ك) عن عائشة (ق هـ ك) عن أبي سعيد (طب) عن ابن مسعود وعن واثلة. (المشكاة ٨١٥)

---

[1] ( دوای ئەوەی گومان نەما کە خۆر ئاوابووە )

**١٠٠١- پێغەمبەری خوا( ﷺ ) کاتێ نوێژی دادەبەست ئەیفەرموو: پەروەردگارا پاكو بێگەردی سوپاس وستایش بۆتۆ، ناوت بەرزو پیرۆز بێ ، جوانی دەسەڵاتت شكۆدار و پایەدار بێت، وهیچ پەرستراوێكی بە حەق نییە جگە لەتۆ.**

١٠٠٢- كان إذا قام إلى الصلاة رفع يديه مدا .

(صحيح) (ت) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٧٣٥)

**١٠٠٢- پێغەمبەری خوا( ﷺ ) کاتێ هەستایە بۆ نوێژ هەردو[1] دەستی بەرزدەكردەوە.**

١٠٠٣- كان إذا كان في وتر من صلاته لم ينهض حتى يستوي قاعدا .

(صحيح) (د ت) عن مالك بن الحويرث . (الإرواء ٣٦١)

**١٠٠٣- پێغەمبەری خوا( ﷺ ) ئەگەر لەنوێژدا بوایە بەرز نەدەبویەوە.[2] تا بەرێكی دادەنیشت[3].**

١٠٠٤- كان يضع اليمنى على اليسرى في الصلاة .

(صحيح) ( وربما مس لحيته وهو يصلي). (هق) عن عمرو بن حريث. (الضعيفة ٤٢٣٧)

**١٠٠٤- پێغەمبەری خوا( ﷺ ) دەستی راستی لەسەر دەستی چەپیدا دادەنا لە نوێژدا.**

١٠٠٥- إنه لا تتم صلاة أحدكم حتى يسبغ الوضوء كما أمره الله فيغسل وجهه ويديه إلى المرفقين ويمسح رأسه ورجليه إلى الكعبين ثم يكبر الله ويحمده ويمجده ويقرأ ما تيسر من القرآن مما علمه الله وأذن له فيه ثم يكبر فيركع فيضع يديه على ركبتيه ويرفع حتى تطمئن مفاصله وتسترخي ثم يقول سمع الله لمن حمده فيستوي قائما حتى يأخذ كل عظم مأخذه ويقيم صلبه ثم يكبر فيسجد فيمكن جبهته من الأرض حتى تطمئن مفاصله وتسترخي ثم يكبر فيرفع رأسه فيستوي قاعدا على مقعدته فيقيم صلبه ثم يكبر فيسجد حتى يمكن وجهه ويسترخي لا تتم صلاة أحدكم حتى يفعل ذلك .

(صحيح) (د ن هـ ك) عن رفاعة بن رافع. (الترغيب ٥٣٦)

**١٠٠٥- بێگومان نوێژی هیچ كام لە ئێوە دروست نییە تا دەستنوێژ نەگرێت بەو شێوەیەی خوای گەورە فەرمانی پێ كردووە، لەسەرەتاوە روخساری وهەردوو هەردوو دەستی لەگەڵ**

---

[1] ( تا ئاستی سەرشانیو نزیك گوێچكەی )

[2] ( بۆ هەستانەوە بۆ ركاتی دووەم )

[3] ( ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ( سوننەت بوونی ) دانیشتنی نیچوان دوو ركات پاش هەستانەوە لە سوجدەی دووەم لە هەر ركاتێكدا )

**ئانیشکەکانی بشۆرێت ودەستی تەر بهێنێت بە سەریدا و هەردوو قاچی لەگەڵ قوله پێکانی بشۆرێت، پاشان الله اكبر والحمد بكات، و ئەوەندەی ئەتوانێت لە قورئان لەوەی خوای گەورە فێری کردووەو مۆڵەتی پێداوەو بۆی دیاری کردووە بخوێنێت، پاشان الله أكبر بکاتو کرنوش بباتو هەردوو دەستی لەسەر ئەژنۆکانی دابنێت ، ودواتر بەرز بێتەوە تا ئەوەندەی جومگەکانی دەچنەوە شوێنی خۆیانو دەوەستن، پاشان بڵێ ( سمع الله لمن حمده ) واتە هەر کەس سوپاس و ستایشی خوا بکات خوا بکات، خوای گەورە لێی گیرا دەکات، دوای ئەوە بەرێکی بوەستێت تا جومگەکانی پشتی تەواو رێك دەبنەوە ، پاشان ( الله اكبر ) و سوژدە ونێو چاوانی بەجوانی بخاتە سەر زەوی تاهەموو جوگەکانی لەشی لە جوڵە دەکەون، پاشان ( الله اكبر ) بکاتو سەری بەرز بکاتەوەو بەرێکی لەسەر نەرمایی سمتەکانی دابنیشێت تا پشتی رێك دەبێتەوە، پاشان الله اكبر ) بکاتو بەرەو سوژدە برواتەوەو نێوچاوانی بەجوانی لە زەوی گیر بکات تا جومگەکانی لاشەی رادەوەستن، بەم شێوەیە بکات تا نوێژەکەی تەواو دەبێتو نوێژی هیچ کەس دروست و تەوا نییە تا بەم شێوەیە ئە نجامی نەدات.**

١٠٠٦- مفتاح الصلاة الطهور وتحريمها التكبير وتحليلها التسليم .

(صحيح) (حم د ت هـ) عن علي. (الإرواء ٣٠١)

**١٠٠٦- کلیلی نوێژ دەست نوێژە، دابەستنی ( الله اكبر )ە وکۆتایی هێنانی بە ( سەلام دانەوە )یە .**

١٠٠٧- في كل إشارة في الصلاة عشر حسنات .

(صحيح) (المؤمل بن إهاب في جزئه) عن عقبة بن عامر. (الصحيحة ٣٢٨٦)

**١٠٠٧- لەهەموو ئاماژەیەکدا[1] لە نوێژدا ( دە ) چاکە دەنوسرێت.**

١٠٠٨- ما بال أقوام يصلون معنا لا يحسنون الطهور فإنما يلبس علينا القرآن أولئك.

(صحيح) (ن) عن رجل . (هداية الرواة ٢٨٢)

**١٠٠٨- ئەوە خەڵکانێك چیانە، لەگەڵ ئێمەدا نوێژ دەکەن کەچی دەست نوێژ باش ناشۆرن؟! بەراستی ئەوا قورئان خوێندن لە ئێمە تێك دەدەن.**

---

**[1] ( ئیمامی مەناوی ئەڵێت: مەبەست بە ( ئاماژە-اشارە ) پەنجەی شایەتمانە لە تەحیاتدا بەڵام شێخی ئەلبانی ئەڵێت: مەبەست لە ئاماژە -بەرزرکردنەوەی دەستەکانە لە کاتی ( الله اكبر ) کردنو چوون بۆ رکوع )**

## بابەتی ڕێککردنی ریزەکانی نوێژ

١٠٠٩- أتموا الصف المقدم ثم الذي يليه فما كان من نقص فليكن من الصف المؤخر .

(صحيح) (حم د ن حب ابن خزيمة الضياء) عن أنس. (المشكاة ١٠٩٤)

**١٠٠٩- ڕیزی پێشەوەی نوێژو ئەوی دواتر تەاوو بکەن، جاهەر نوقسانیەك هەبوو بالە ریزی دواوە بێت.**

١٠١٠- أتموا الصفوف فإني أراكم خلف ظهري .

(صحيح) (م) عن أنس. (الصحيحة ٣٩٥٥)

**١٠١٠- ریزەکانتان تەواو بکەن چونکە من لە پشتمەوە دەتانبینم.**

١٠١١- أحسنوا إقامة الصفوف في الصلاة .

(صحيح) (حم حب) عن أبي هريرة. (الترغيب ٤٩٩)

**١٠١١- ریزەکان ڕێكو پێك بکەن لە نوێژدا.**

١٠١٢- استقبل صلاتك فلا صلاة لمن صلى خلف الصف وحده .

(صحيح) (ش هـ حب) عن علي بن شيبان. (الإرواء ٥٤١)

**١٠١٢- نوێژکەت ببە ریزەکانی پێشەوە ، چونکە خێری تەواوی نوێژ بۆ کەسێك نیە بەتەنها لە پشتی ریزەوە نوێژ بکات.**

١٠١٣- استووا ولا تختلفوا فتختلف قلوبكم وليليني منكم أولو الأحلام والنهي ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم .

(صحيح) (حم م ن) عن أبي مسعود. (صحيح أبي داود ٦٧٨)

**١٠١٣- ڕێك بوەستن، خورو جیاواز مەوەستن، چونکە دڵەکانیشتان خوارو جیاوازی تێدەکەوێت وە با دامەزراو و ژیرەکان لێم نزیك بوەستن، ئەوجا ئەوانی پاشترو ئەوجا ئەوانەی لەدوای ئەوانەوە دێن.**

١٠١٤- أقيموا الصفوف فإنما تصفون بصفوف الملائكة وحاذوا بين المناكب وسدوا الخلل ولينوا بأيدي إخوانكم ولا تذروا فرجات للشيطان ومن وصل صفا وصله الله ومن قطع صفا قطعه الله عز وجل .

(صحيح) (حم د طب) عن ابن عمر. (الصحيحة ٧٤٣)

**١٠١٤- ریزەكانتان ڕێك بخەن، چونكە ئێوە ریزەكراون بە ریزی فریشتەكانو شانتان با لە ئاستی یەكبن و بۆشاییەكان پڕ بكەنەوە، و دەستی براكانتان بگرن بەهێواشی و نەرمو نیانی، و بۆشایی بەجێمەهێڵن بۆ شەیتان وە هەر كەس ریزێك بەیەكەوە ببەستێت بە ریزێكی ترەوە خوای گەورە ئەو پەیوەست دەكات بە خۆیەوەو هەر كەس ریزێك داببڕێتو تەواوی نەكات خوای گەورەش ئەو دادەبڕێت.**

١٠١٥- أقيموا الصفوف في الصلاة فإن إقامة الصف من حسن الصلاة .

(صحيح) (م) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٩٩٤)

**١٠١٥- ریزەكان ڕێكخەن لە نوێژدا، بێگومان ریز ڕێككردن لەجوانیو تەواوی نوێژە.**

١٠١٦- أقيموا صفوفكم فوالله لتقيمن صفوفكم أو ليخالفن الله بين قلوبكم.

(صحيح) (د) عن النعمان بن بشير. (الصحيحة ٣٢)

**١٠١٦- ریزەكانتان ڕێك و پێك بكەن، سوێند بەخوا یا ریزەكانتان ڕێك دەكەن یان خوای گەورە جیاوازی دەخاتە نێوان دڵەكانتانەوە.**

١٠١٧- أقيموا صفوفكم لا تخللكم الشياطين كأنها أولاد الحذف قيل يا رسول الله وما أولاد الحذف قيل سود جرد بأرض اليمن.

(صحيح) (حم ش ك) عن البراء. (صحيح أبي داود ٦٧٣)

**١٠١٧- ریزەكانتان ڕێك و پێك بكەن و بۆشاییی مەهێڵنەوە نەك شەیتانەكان وەك بەرخی ڕەش لەنێوانتاندا هاتوچۆ بكە، وترا ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) (اولاد الحذف) چییە؟ فەرمووی حەیوانێكی [1] ڕەشە لە وڵاتی یەمەن هەیە.**

١٠١٨- أقيموا صفوفكم وتراصوا فإني أراكم من خلف ظهري .

(صحيح) (خ ن) عن أنس. (الصحيحة ٣١)

**١٠١٨- ریزەكانتان ڕێك و پێك بكەن و ڕێك بوەستن بێگومان من لە پشتمەوە دەتانبینم.**

١٠١٩- أقيموا صفوفكم وتراصوا فوالذي نفسي بيده إني لأرى الشياطين بين صفوفكم كأنها غنم عفر .

(صحيح) (الطيالسي) عن أنس. (صحيح أبي داود ٦٧٣)

---

[1] (ئەو گیانداراە ڕەشە نە گوێی هەیە و نەكلك)

**١٠١٩- ريزەكانتان ريك و پێك بكەن و ريك بوەستن، سوێند بەو كەسەی گيانی منی بەدەستە من شەيتانەكان دەبينم لەنێو ريزەكانتاندا ئەڵێی مەڕی سپين.**

١٠٢٠- إن الله وملائكته يصلون على الصف الأول سووا صفوفكم وحاذوا بين مناكبكم ولينوا في أيدي إخوانكم وسدوا الخلل فإن الشيطان يدخل فيما بينكم مثل الحذف .

(صحيح) (حم طب) عن أبي أمامة. (المشكاة ١١٠١)

**١٠٢٠- بێگومان خوای گەورەو فريشتەكانی سەڵاوات ئەدەن و داوای لێخۆشبوون بۆ ريزی يەكەم دەكەن ، ريزەكانتان ريك ە پێك بكەنو شانتان ريك بكەن، و بە نەرمو نيانی دەستی براكانتان بگرنو بۆشاييەكان پڕ بكەنەوە، چونكە شەيتان دەچێتە نێو ريزەكانتانەوە ئەڵێی گياندارى رەشە.**

١٠٢١- إن الله وملائكته يصلون على الصفوف المقدمة .

(صحيح) (ن) عن البراء. (الترغيب ٤٩٥)

**١٠٢١- بەراستی خوای گەورەو فريشتەكانی سەڵاوات ئەدەن لە ريزی يەكەم و داوای لێخۆش بوونو بەزەيی بۆ دەكەن.**

١٠٢٢- إن الله تعالى وملائكته يصلون على الذين يصلون الصفوف ومن سد فرجة رفعه الله بها درجة .

(صحيح) (حم هـ حب ك) عن عائشة. (الترغيب ٥٠٢)

**١٠٢٢- بێگومان خوای گەورە سەڵاوات ئەدات و فريشتەكانی داوای لێخۆشبوون دەكەن بۆ ئەوانەی كەريزەكان پڕ دەكەنەوەو لێكيان ئەدەن، وە هەر كەس بۆشاييەك پڕ بكاتەوە خوای گەورە پلەيەك بەرزی دەكاتەوە.**

١٠٢٣- إن الله وملائكته يصلون على الصفوف المقدمة .

(صحيح) (ن) عن البراء. (الترغيب ٥٠١)

**١٠٢٣- بێگومان خوای گەورە سەڵاوات ئەدات و فريشتەكانی داوای لێخۆشبوون بۆ ريزەكانی پێشەوە دەكەن.**

١٠٢٤- إن من تمام الصلاة إقامة الصف .

(صحيح) (حم) عن جابر. (الترغيب ٤٩٤)

**١٠٢٤- بێگومان لە دروستیو تەواوی نوێژ ريك راوەستانە.**

١٠٢٥- ألا تصفون كما تصف الملائكة عند ربها يتمون الصلاة بالصفوف الأول ويتراصون في الصف .

(صحيح) (حم م د ن هـ) عن جابر بن سمرة. (صحيح أبي داود ٦٦٧)

**١٠٢٥- ئەریّ ریّك راناوەستن هەر وەك چۆن فریشتەكان ریز دەبەستن لای پەروەردگاریاندا، نوێژەكان تەاو دەكەن بە پرِكردنەوەی ریزەكانی یەكەمو ریّك وەستان لە ریزەكاندا.**

١٠٢٦- إياي والفرج - يعني في الصلاة .

(صحيح) (طب) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٧٥٧)

**١٠٢٦- ئاگادارتان دەكەم لە بۆشایی رِیزەكان واتە لە نوێژدا.** [1]

١٠٢٧- تقدموا فأتموا بي وليأتم بكم من بعدكم ولا يزال قوم يتأخرون حتى يؤخرهم الله .

(صحيح) (حم م د ن هـ) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ٦٨٣)

**١٠٢٧- وەرنە پێشەوەو لە پشت منەوە ریزەكان تەواو بكەن، و با ئەوانەی دوای ئێوەش لە پشت ئێوەوە بوەستن، بەردەوام هەندیّ كەس خۆی دوا دەخات تا خوای گەورەش دوایان دەخات.**

١٠٢٨- خياركم ألينكم مناكب في الصلاة .

(صحيح) (د هق) عن ابن عباس. (صحيح أبي داود ٦٧٦)

**١٠٢٨- باشترینتان ئەوانەتانن كەسەر شانەكانتان نەرمە لە نوێژدا.** [2]

١٠٢٩- خير صفوف الرجال أولها وشرها آخرها وخير صفوف النساء آخرها وشرها أولها .

(صحيح) (م ٤ ) عن أبي هريرة (طب) عن أبي أمامة وابن عباس. (صحيح أبي داود ٦٨١)

**١٠٢٩- باشترین ریزەكانی پیاوان ریزی یەكەمەو خراپترینی ریزی كۆتاییە وە باشترین ریزی ئافرەتان ریزی كۆتاییە وە خراپترینیان ریزی یەكەمیانە.**

١٠٣٠- راصوا الصفوف فإن الشيطان يقوم في الخلل .

(صحيح) (حم) عن أنس. (صحيح أبي داود ٦٧٣)

**١٠٣٠- ریزەكان ریّك بخەن، چونكە شەیتان لە بۆشاییەكاندا دەوەستیّ.**

١٠٣١- راصوا صفوفكم وقاربوا بينها وحاذوا بالأعناق .

(صحيح) (ن) عن أنس. (صحيح أبي داود ٦٧٣)

---

[1] (واتە بیّ خەم مەبن لە پرِكردنەوەی ریزەكاندا)

[2] (واتە :بە ئاسانی پالْ ئەدەن بە نوێژ خوێنەكانی تەنیشتیانەوە)

**١٠٣١- ريزه‌كانتان رێك بخه‌ن و نزيكيان بكه‌نه‌وه له‌يه‌كتر، وه گه‌ردنتان با له رێكى يه‌كبن.**

١٠٣٢- رصوا صفوفكم وقاربوا بينها وحاذوا بالأعناق فوالذي نفسي بيده إني لأرى الشياطين تدخل من خلل الصفوف كأنها الحذف.[1]

(صحيح) (حم د ن حب) عن أنس. (صحيح أبي داود ٦٧٣)

**١٠٣٢- ريزه‌كانتان رێك بخه‌ن و نزيكيان بكه‌نه‌وه له يه‌كتر ، وه گه‌ردنتان با له رێكى يه‌كتر بن سوێند به‌وه‌ى گيانى منى به‌ده‌سته من شه‌يتانه‌كان ده‌بينم ده‌يته كه‌لێنى ريزه‌كانه‌وه ده‌ڵێى به‌ردى په‌له پيتكه‌ن.**

١٠٣٣- سووا صفوفكم أو ليخالفن الله بين وجوهكم .

(صحيح) (هـ) عن النعمان بن بشير. (صحيح أبي داود ٦٦٩)

**١٠٣٣- ريزه‌كانتان رێك بخه‌ن ده‌نا خواى گه‌وره جياوازى ده‌خاته نێو رووخسارتان.**

١٠٣٤- سووا صفوفكم فإن تسوية الصفوف من إقامة الصلاة .

(صحيح) (حم ق د هـ) عن أنس.

**١٠٣٤- ريزه‌كانتان رێك بخه‌ن، چونكه رێك و پێكى ريزه‌كان به‌شێكه له‌چاكى جێبه‌جێ كردنى نوێژ.**

١٠٣٥- سووا صفوفكم لا تختلف قلوبكم .

(صحيح) (الدارمي) عن البراء. (صحيح أبي داود ٦٧٤)

**١٠٣٥- ريزه‌كانتان رێك كه‌ن با دڵه‌كانتان جياوازى تێنه‌كه‌وێت.**

١٠٣٦- عباد الله لتسون صفوفكم أو ليخالفن الله بين وجوهكم .

(صحيح) (ق د ت) عن النعمان بن بشير. (صحيح أبي داود ٦٧٠)

**١٠٣٦- ئه‌ى به‌نده‌كانى خوا يان ريزه‌كانتان رێك بكه‌ن يان خواى گه‌وره جياوازى ده‌خاته نێوان روخسارتان.**

١٠٣٧- كونوا في الصف الذي يليني .

(صحيح) (حم ن حب ك) عن أبي. (المشكاة ١١١٦)

**١٠٣٧- له‌و ريزه‌دا به‌وه‌ستن كه‌له پشتى منه‌وه‌يه.**

١٠٣٨- كان يحب أن يليه المهاجرون والأنصار في الصلاة ليحفظوا عنه .

(صحيح) (حم ن هـ ك) عن أنس. (الصحيحة ١٤٠٩)

---

[1] (واته :به‌رخى ره‌شى سيخن كه گوێ و كلكى نه‌بێت يان كوڵبن، معجم الوسيط ص ١٦٢ ط٢)

**١٠٣٨- پێغه‌مبه‌رى خوا (ﷺ) پێى خۆش بوو كه كۆچكه‌ران‌و پشتيوانان (المهاجرون والانصار) راسته‌وخۆ له پشتيه‌وه نوێژ بكه‌ن بۆ ئه‌وه‌ى له‌ومه‌وه شت فێر بن.**

١٠٣٩- كان يستغفر للصف المقدم ثلاثا وللثاني مرة .

(صحيح) (حم هـ ك) عن عرباض. (الترغيب ٤٩٠)

**١٠٣٩- پێغه‌مبه‌رى خوا (ﷺ) سێ جار داواى لێخۆشبوونى بۆ ريزى يه‌كه‌م ده‌كردو يه‌ك جاريش بۆ ريزى دووه‌م.**

١٠٤٠- لتسون لصفوفكم في صلاتكم أو ليخالفن الله بين قلوبكم .

(صحيح) (حم طب) عن النعمان بن بشير. (صحيح أبي داود ٦٦٩)

**١٠٤٠- به‌راستى ريزه‌كانتان رێك ده‌خه‌ن له نوێژه‌كانتاندا يان خواى گه‌وره جياوازى ده‌خاته نێوان دڵه‌كانتانه‌وه.**

١٠٤١- لتقيمن صفوفكم أو ليخالفن الله بين وجوهكم .

(صحيح) (ن) عن النعمان بن بشير. (صحيح أبي داود ٦٦٩)

**١٠٤١- ريزه‌كانتان رێك ده‌خه‌ن يان خواى گه‌وره جياوازى ده‌خاته نێوان روخسارتان.**

١٠٤٢- لو تعلمون ما في الصف الأول ما كانت إلا قرعة .

(صحيح) (م هـ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٤٨٨)

**١٠٤٢- ئه‌گه‌ر بزانن چى له‌ريزى يه‌كه‌مدا[1] هه‌يه به (قورعه) تيروپشك نه‌بوايه به‌رنه‌ده‌كه‌وى.[2]**

١٠٤٣- ليليني منكم أولوا الأحلام والنهى ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم ولا تختلفوا فتختلف قلوبكم وإياكم وهيشات الأسواق .

(صحيح) (م ٤ ) عن أبي مسعود. (صحيح أبي داود ٦٧٨)

**١٠٤٣- بانزيك بنه‌وه لێم ئه‌وانه‌ى خاوه‌ن ژيرى‌و تێگه‌يشتن، ئينجا ئه‌وانه‌ى كه پله‌يان له‌مان كه‌متره‌و پاشان ئه‌وانه‌ى له ئه‌وان كه‌مترن، وه جياوازى مه‌كه‌ن دڵه‌كانتان جياوازى تێده‌كه‌وێت، وه ئاگادارتان ده‌كه‌م‌و ده‌تانترسێنم له فيتنه.[3]**

---

[1] (له پاداشت‌و خێر)

[2] (واته له‌سه‌ر ريزى يه‌كه‌م پێشبركێ‌و شه‌رتان ده‌كرد مه‌گه‌ر به (قورعه) بۆتان ده‌ربچوايه كه كێ شايسته‌ى ريزى يه‌كه‌مه)

[3] (مه‌به‌ست و ئاسوده‌يى بازاره‌كانه)

١٠٤٤- من وصل صفا وصله الله ومن قطع صفا قطعه الله .

(صحيح) (ن ك) عن ابن عمر. (المشكاة ١١٠٢)

**١٠٤٤- هەر كەس ريزێك تەاو بكاتو بگەيەنێت بە يەك خواى گەورەش ئەو دەگەيەنێت بەخۆى، وە هەر كەس ريزێك تەواو نەكاتو ببڕێت خواى گەورەش ئەو دادەبڕێت.**

١٠٤٥- لا يزال قوم يتأخرون عن الصف الأول حتى يؤخرهم الله في النار .

(صحيح) (د) عن عائشة. (صحيح أبي داود ٦٨٢)

**١٠٤٥- كۆمەڵێك هەن بەردەوام خۆيان دوادەخەن لە ريزى يەكەم تاخواى گەورە ئەوانيش دوا دەخات بۆ ناو ئاگر.**

## بابەتى نوێژى جەماعەتو پێش نوێژى

١٠٤٦- أتريد أن تكون فتانا يا معاذ إذا صليت بالناس فاقرأ بـ { الشمس وضحاها } و{سبح اسم ربك الأعلى } و{ الليل إذا يغشى } و{ اقرأ باسم ربك} .

(صحيح) (هـ) عن جابر. (الصحيحة ٣١٧١)

**١٠٤٦- ئەى موعاز ئەتەوێت نوێژ خوێنان گرفتار بكەين و تووشى فيتنەيان بكەيت؟! ئەگەر نوێژت كرد بۆ خەڵكى سورەتەكانى** (والشمسء ضحاها ) و ( سبح إسم ربك الأعلى ) و (والليل إذا يغشى ) و( أقرأ بإسم ربك ) **بخوێنە بۆيان.**[1]

١٠٤٧- إذا أتى أحدكم الصلاة والإمام على حال فليصنع كما يصنع الإمام .

(صحيح) (ت) عن علي ومعاذ. (الصحيحة ١١٨٨)

**١٠٤٧- ئەگەر يەكێكتان هات بۆ نوێژو پێش نوێژ لەهەر حاڵەتێكى نوێژدا بوو بائيمام چى دەكات ئەميش وا بكات.**

١٠٤٨- إذا أتيت الصلاة فأتها بوقار وسكينة فصل ما أدركت واقض ما فاتك .

(صحيح) (طس) عن سعد. (الصحيحة ١١٩٨)

**١٠٤٨- ئەگەر هاتيت بۆ نوێژ مەردى و لەسەر خۆيى برۆ ، جاهەر چى فرياكەوتيت بە ( جەماعەت ) بە كۆمەڵ بيكەو ئەوەش فريا نەكەوتيت تەواوى بكە.**

---

[1] **(واتە: قورئان زۆر مەخوێنە كە پێش نوێژيت كرد بۆ خەڵكى)**

١٠٤٩- إذا أتيتم الصلاة فعليكم بالسكينة ولا تأتوها وأنتم تسعون فما أدركتم فصلوا وما فاتكم فأتموا.

(صحيح) (حم ق) عن أبي قتادة.

**١٠٤٩- ئەگەر هاتن بۆ نوێژ پێویستە بە لەسەر خۆبن و هەرگیز بە پەلە پەل نەکەن، جا ئەوەی فریا کەوتن بە کۆمەڵ بیکەن و ئەوەشتان لەکیس چوو تەواوی بکەن.**

١٠٥٠- إذا أقيمت الصلاة فلا تأتوها وأنتم تسعون وأتوها وأنتم تمشون وعليكم السكينة فما أدركتم فصلوا وما فاتكم فأتموا .

(صحيح) (حم ق ٤ ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٥٨٠)

**١٠٥٠- ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ ئێوە بە ڕاکردن مەیەن بۆ نوێژ،بەڵکو هێواش و لەسەرخۆ وەرن بۆی با ئارامیتان پێوە دیار بێت، جا فریای هەر چەندکەوتن بیکەن و ئەوە شتان لە کیس چووە تەواوی بکەن.**

١٠٥١- إذا أقيمت الصلاة فلا تقوموا حتى تروني .

(صحيح) (حم ق د ن) عن أبي قتادة زاد ( ٣ ): قد خرجت إليكم. (صحيح أبي داود ٥٥)

**١٠٥١- ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ هەڵمەستن تا من دەبینن.**

١٠٥٢- إذا أقيمت الصلاة فلا صلاة إلا المكتوبة .

(صحيح) (م ٤ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٤٩٠)

**١٠٥٢- ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ هیچ نوێژێك ناکرێت جگە لە فەرز .**

١٠٥٣- يوشك أحدكم أن يصلي الفجر أربعا .

(صحيح) (هـ) عن عبدالله بن بحينة.

**١٠٥٣- یەکێکتان نوێژی بەیانی چوار ڕکات بکات.** [1]

١٠٥٤- إذا أم أحدكم الناس فليخفف فإن فيهم الصغير والكبير والضعيف والمريض وذا الحاجة وإذا صلى لنفسه فليطول ما شاء .

(صحيح) (حم ق ت) عن أبي هريرة. (الإرواء ٥١٢)

**١٠٥٤- ئەگەر یەکێکتان پێش نوێژی بۆ خەڵك کرد، بە ئاسانی بیکات چونکە ئەوان منداڵ و گەورەو لاوازو نەخۆش و خاوەن ئیشیان لەناودایە، بەڵام گەر بۆ خۆی بەتەنیا نوێژی کرد با چەند بیەوێت درێژی بکاتەوە.**

---

[1] (وەڵامە بۆ ئەو کەسەی بەردەوام بوو لە سەر نوێژی سوننەت کردن و لەهەمان کاتدا قامەتیش کرا بوو بۆ نوێژی بەیانی)

١٠٥٥- إذا أم الرجل القوم فلا يقم في مكان أرفع من مقامهم .

(صحيح) (د هق) عن حذيفة (صحيح أبي داود ٦١١)

**١٠٥٥- ئەگەر هەر پیاوێك نوێژی بۆ كۆمەڵێك كرد، با لە شوێنێكدا نەوەستێ بەرزتر بێت لەشوێنی ئەوان.**

١٠٥٦- إذا أممت الناس فاقرأ بـ { الشمس وضحاها } و{ سبح اسم ربك الأعلى } { والليل إذا يغشى} .

(صحيح) (م) عن جابر. (الإرواء ٢٩٥)

**١٠٥٦- ئەگەر پێشنوێژیت كرد بۆ خەڵك ئەم سورەتانە بخوێنە (والشمس وضحاها) و (سبح اسم ربك الأعلى) و (الليل إذا يغشى).**

١٠٥٧- إذا أممت قوما فأخف بهم الصلاة .

(صحيح) (م هـ) عن عثمان بن أبي العاص. (الصحيحة ٣٩٦٥)

**١٠٥٧- ئەگەر پێش نوێژیت كرد بۆ كۆمەڵێك، لەبەر ئەوان نوێژی كورتو ئاسانیان پێ بكە.**

١٠٥٨- إذا ثوب للصلاة فلا تأتوها وأنتم تسعون وأتوها وعليكم السكينة فما أدركتم فصلوا وما فاتكم فأتموا فإن أحدكم إذا كان يعمد إلى الصلاة فهو في صلاة .

(صحيح) (م) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٥٨٠)

**١٠٥٨- ئەگەر قامەت كرا بۆ نوێژ ، ئەوە پەلە پەل مەكەن لەكاتی هاتندا، بەڵكو لەسەر خۆو هێمنی وەرن جا ئەوەی فریاكەوتن بیكەن، و ئەوەشی لە كیستان چوو تەواوی بكەن، چونكە هەر یەك لە ئێوە كاتێ نیازی نوێژكردنی هێنا هەر بەو نیەتو نیازە لە نوێژدایە.**

١٠٥٩- إذا جاء أحدكم إلى الصلاة فليمش على هينة فليصل ما أدرك وليقض ما سبقه .

(صحيح) (حم د هق الضياء) عن أنس. (صحيح أبي داود ٧٤١)

**١٠٥٩- ئەگەر هەریەك لە ئێوە هات بۆ نوێژ باله سەر خۆو هێواش بێت، ئەوەی فریاكەوت بیكاتو ئەوەشی لەكیسی چوو با بیگێڕێتەوە.**

١٠٦٠- إذا جئت فصل مع الناس وإن كنت قد صليت .

(صحيح) (مالك الشافعي ن حب) عن محجن. (صحيح أبي داود ٥٩٠)

**١٠٦٠- ئەگەر هاتیت لەگەڵ خەڵك نوێژ بكە با پێشتر نوێژیشت كرد بێت .**

١٠٦١- إذا جئتم الصلاة ونحن سجودا فاسجدوا ولا تعدوها شيئا ومن أدرك الركعة فقد أدرك الصلاة .

(صحيح) (د ك هق) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١١٨٨)

**١٠٦١- ئەگەر هاتن بۆ نوێژو ئێمە لە سوژدەدا بووین، ئێوەش سوژدە ببەن، بری هیچ مەخەن، وە هەر کەس فریای (رکوع)کرنوش کەوت لە رکاتی یەکەمدا ئەوە فریای نوێژکەی کەوتووە.**

١٠٦٢- إذا دخلت مسجدا فصل مع الناس وإن كنت قد صليت .

(صحيح) (ص) عن محجن الديلي. (الصحيحة ١٣٣٧)

**١٠٦٢- ئەگەر چوویتە مزگەوتێك لەگەڵ خەڵك نوێژ بکە[1] ، باتۆ نوێژیشت کرد بێت .**

١٠٦٣- إذا زار أحدكم قوما فلا يصل بهم وليصل بهم رجل منهم .

(صحيح) (حم ٣ ) عن مالك بن الحويرث. (صحيح أبي داود ٦٠٩)

**١٠٦٣- ئەگەر یەکێکتان سەردانی ماڵو کۆمەڵێکی کرد با پێشنوێژیان بۆنەکات، بەڵکو پیاوێك لەخۆیان پێش نوێژیان بۆ بکات.**

١٠٦٤- إذا صلى أحدكم في بيته ثم دخل المسجد والقوم يصلون فليصل معهم تكون له نافلة .

(صحيح) (طب) عن عبدالله بن سرجس. (الإرواء ٥٢٧)

**١٠٦٤- ئەگەر یەکێکتان لەماڵی خۆیدا نوێژی کردو پاشان چووە مزگەوتو خەڵك نوێژی جەماعەتیان دەکرد با نوێژیان لەگەڵ بکات و ئەم نوێژەی بە سوننەت بۆ حیساب دەکرێت.**

١٠٦٥- إذا صلى أحدكم في رحله ثم أدرك الإمام ولم يصل فليصل معه فإنها له نافلة .

(صحيح) (د ك هق) عن يزيد بن الأسود. (الإرواء ٥٢٧)

**١٠٦٥- ئەگەر یەکێکتان لە ڕێو شوێنی خۆیدا نوێژی کردو پاشان فریای پێش نوێژ کەوت کە نوێژی دا نەبەست بوو، ئەوە لەگەڵ پێش نوێژدا نوێژ بکاتو ئەمەی دەیکات بە سوننەت بۆی تۆمار دەکرێت.**

١٠٦٦- ا أم أحدكم الناس فليخفف فإن فيهم الصغير والكبير والضعيف والمريض وذا الحاجة وإذا صلى لنفسه فليطول ما شاء .

(صحيح) (حم ق ت) عن أبي هريرة. (الإرواء ٥٠٥)

**١٠٦٦- ئەگەر یەکێکتان پێشنوێژی بۆ خەڵك کرد با کوردتو ئاسان بیکات چونکە ئەوان خەڵکی بچوك و گەورەو لاوازو نەخۆشو خاوەن پێویستیان تێدایە، هەر کاتێ بۆخۆی بەتەنها نوێژی کرد چەند دەتوانێت با درێژی بکاتەوە.**

---

[1] (چونکە خاوەن ماڵ شایستە ترە بە ئیمامەت کردن بەڵام ئەگەر خۆیان پێشیان خست ئاساییە)

١٠٦٧- إذا صلى الأمير جالسا فصلوا جلوسا .

(صحيح) (ش) عن معاوية. (صحيح أبي داود ١٣٦٣)

**١٠٦٧- ئەگەر فەرماندە و برا گەورە بەدانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەش هەروەها بە دانیشتنەوە بیکەن.**

١٠٦٨- إذا صليتما في رحالكما ثم أتيتما الإمام فصليا معه فتكون لكما نافلة والتي في رحالكما فريضة .

(صحيح) (فر) عن ابن عمرو. (صحيح أبي داود ٥٩٠)

**١٠٦٨- ئەگەر هەردوکتان له ڕێو شوێنی خۆتاندا نوێژتان کردو پاشان هاتنه لای پێشنوێژ،نوێژ لەگەڵ ئەویشدا بکەن و ئەمەتان بە سوننەت بۆ تۆمار دەکرێتو ئەوەش کە پێشتر لە ڕێو شوێنی خۆتاندا کرد بۆتان بەفەرز دەنوسرێت.**

١٠٦٩- إذا صليتما في رحالكما ثم أتيتما مسجد جماعة فصليا معهم فإنها لكما نافلة .

(صحيح) (حم ت ن هق) عن يزيد بن الأسود. (صحيح أبي داود ٥٩٠)

**١٠٦٩- ئەگەر هەردووکتان نوێژتان لە ڕێو شوێنی خۆتاندا کردو پاشان هاتنە مزگەوتو جەماعەت بوو ئێوەش لەگەڵیاندا نوێژ بکەن و ئەم نوێژەتان بەسوننەت بۆ تۆمار دەکرێت.**

١٠٧٠- إذا صليتم فأقيموا صفوفكم ثم ليؤمكم أحدكم فإذا كبر فكبروا وإذا قرأ فأنصتوا وإذا قال { غير المغضوب عليهم ولا الضالين } فقولوا آمين يجبكم الله وإذا كبر وركع فكبروا واركعوا فإن الإمام يركع قبلكم ويرفع قبلكم فتلك بتلك وإذا قال سمع الله لمن حمده فقولوا اللهم ربنا لك الحمد يسمع الله لكم وإذا كبر وسجد فكبروا واسجدوا فإن الإمام يسجد قبلكم ويرفع قبلكم فتلك بتلك وإذا كان عند القعدة فليكن من أول قول أحدكم التحيات الطيبات الصلوات لله السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمد عبده ورسوله .

(صحيح) (حم م د ن هـ) عن أبي موسى. (الإرواء ٣٣١)

**١٠٧٠- ئەگەر نوێژتان کرد ڕیزەکانتان ڕێك بخەن، پاشان با یەکێکتان پێشنوێژیتان بۆ بکات، جاهەر کاتێ پێشنوێژ( الله اكبر ) ی کرد ئێوەش الله اكبر بکەن و کاتێ قورئانی خوێند ئێوە گوێ بگرن و بێ دەنگ بن، وەکاتێ ووتی (غير المغضوب عليهم ولا الضالين)**

**ئێوەش بڵێن(ئامین) واتە : خوایە نزاو پاڕانەوەکانمان وەربگرە) ئیتر خوا خۆشی دەوێن، وە ئەگەر (الله أكبر)ی کردو چوو بۆ (رکوع) کرنوش ئێوەش (الله اكبر) بکەنو بچن بۆ کرنوش، بێگومان پێشنوێژ پێش ئێوە کرنوش دەبات و پێش ئێوەش سەر بەرز دەکاتەوە، هەق بەهەق، وەکاتێ ووتی(سمع الله لمن حمده) واتە خوای گەورگیرا دەکات سوپاسی هەرکەس سوپاسی بکات ئێوەش بڵێن(اللهم ربنا لك الحمد) بێگومان پەروەردگار لێتان وەردەگرێت، وەکاتێ ئیمام (الله اكبر)ی کردو رۆشت بۆ سوژدە، ئێوەش (الله اكبر) بکەنو بچن بۆ سوژدە، چونکە پێشنوێژ پێش ئێوە سوژدە دەبات و لە پێش ئێوەشەوە سەر لە سوژدە بەرز دەکاتەوە ئەمەش هەق بەهەق، و ئەگەر کاتی دانیشتن بوو با یەکەم ووتەی ئێوە**

( التحيات و الطيبات الصلوات لله السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين اشهد ان لا اله الا الله وأشهد ان محمداً عبده ورسوله.. )

١٠٧١- إذا قال الإمام سمع الله لمن حمده فقولوا اللهم ربنا لك الحمد فإنه من وافق قوله قول الملائكة غفر له ما تقدم من ذنبه

(صحيح) (مالك ق ٣ ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٧٩٤)

**١٠٧١- ئەگەر پێشنوێژ ووتی( سمع الله لمن حمده ) ئێوەش بڵێن( اللهم ربنا لك الحمد ) چونکە هەر کەس قسەکانی هاوکات بوو یەکی گرت لەگەڵ قسەی فریشتەدا ئەوە خوای گەورە لە گوناهی پێشتری خۆش دەبێت.**

١٠٧٢- إذا قال الإمام سمع الله لمن حمده فقولوا اللهم ربنا ولك الحمد .

(صحيح) (هـ ك) عن أبي سعيد (هـ حب) عن أنس (حب) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٧٩٤)

**١٠٧٢- هەر پێشنوێژ ووتی( سمع الله لمن حمده ) ئێوەش بڵێن( اللهم ربنا لك الحمد ) .**

١٠٧٣- إذا قال الإمام { غير المغضوب عليهم ولا الضالين } فقولوا آمين فإنه من وافق قوله قول الملائكة غفر له ما تقدم من ذنبه .

(صحيح) (مالك خ د ن) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٨٦٥)

**١٠٧٣- ئەگەر پێشنوێژ ووتی( غير المغضوب عليهم ولا الضالين ) ئێوەش بڵێن( ئامین ) بێگومان قسەی هەرکەس هاوکات بوویەکی گرت لەگەڵ قسەی فریشتەدا خوای گەورە لە گوناهی پێشی خۆش دەبێت.**

١٠٧٤- إذا قرأ الإمام فأنصتوا .

(صحيح) (م) عن أبي موسى. (الإرواء ٣٣١)

**١٠٧٤- ئەگەر پێشنوێژ قورئانی خوێند ئێوەش بێ دەنگ بن و گوێی بۆ بگرن.**

١٠٧٥- إذا قمتم في الصلاة فلا تسبقوا قارئكم بالركوع والسجود ولكن هو يسبقكم .

(صحيح) (البزار) عن سمرة. (الصحيحة ١٣٩٣)

**١٠٧٥- ئەگەر نوێژتان دابەست هەرگیز پێشی پێشنوێژەکەتان مەکەون لە کڕنوش و سوژدە بردندا بەڵکو دەبێ ئەو پێشتان بکەوێت.**

١٠٧٦- إذا كانوا ثلاثة فليؤمهم أحدهم وأحقهم بالإمامة أقرؤهم .

(صحيح) (حم م ن) عن أبي سعيد.

**١٠٧٦- ئەگەر سێ کەس بوون با یەکێکیان پێش نوێژیان بۆ بکات، وە شایستە ترینیان بۆ پێشنوێژی ئەوەیانە کە قورئانی زۆرتری لەبەر بێت.**

١٠٧٧- إذا كبر الإمام فكبروا وإذا ركع فاركعوا وإذا سجد فاسجدوا وإذا رفع رأسه من الركوع فارفعوا وإذا صلى جالسا فصلوا جلوسا أجمعين .

(صحيح) (طب) عن أبي أمامة. (صحيح أبي داود ٦١٤)

**١٠٧٧- ئەگەر ئپێشنوێژ (الله اكبر)ی کرد ئێوەش(الله اكبر) بکەن و کاتێ چوو بۆ (رکوع)کرنوش ئێوەش کرنوش بەرن، وە کاتێ سوژدەی برد ئێوەش بیبەن، وەکاتێ سەری بەرز کردەوە لە کڕنوش ئێوەش سەر بەرز بکەنەوە، وەکاتێ نوێژی بە دانیشتنەوە کرد ئێوەش بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن.**

١٠٧٨- ارجعوا إلى أهليكم فكونوا فيهم وعلموهم ومروهم وصلوا كما رأيتموني أصلي فإذا حضرت الصلاة فليؤذن لكم أحدكم وليؤمكم أكبركم .

(صحيح) (حم ق ن) عن مالك بن الحويرث. (الإرواء ٢١٣)

**١٠٧٨- بگەڕێنەوە بۆ لای کەسوکارتان و لەناو ئەواندا بن، فێریان بکەن و فرمانیان پێ بکەن، و نوێژ بکەن هەر وەك منتان بینی چۆن و بە چ شێوەیەك نوێژ دەکەم، جا کە کاتێر نوێژ هات با یەکێکتان بانگتان بۆ بداتو گەورەترین بەتەمەنترینتان پێش نوێژیتان بۆ بکات .**

١٠٧٩- ما يخشى أحدكم إذا رفع رأسه قبل الإمام أن يجعل الله رأسه رأس حمار أو يجعل الله صورته صورة حمار

(صحيح) (ق ٤ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٥٠٣)

**١٠٧٩- ئایا هەر یەكێك لە ئێوە ناترسێت كاتێ سەری بەرز كردەوە لە پێش ئیمامەوە خوای گەورە سەری بكاتە سەری گوێدرێژ ، یاخوای گەورە شێوەو شكڵی بكاتە شێوەی كەر؟.**

١٠٨٠- أم قومك ومن أم قوما فليخفف فإن فيهم الكبير وإن فيهم المريض وإن فيهم الضعيف وإن فيهم ذا الحاجة فإذا صلى أحدكم وحده فليصل كيف شاء .

(صحيح) (م) عن عثمان بن أبي العاص. (الإرواء ٥١٢)

**١٠٨٠- پێشنوێژی بكە بۆ كەسوكارت و هەركەس پێشنوێژی بۆ قەومێك كرد با كورتو سادە بیكات چونكە ئەوان كەسی پیرو كەسی نەخۆشو كەسی لاوازو كەسی خاوەن ئیشو كاریان تێدایە، جا هەر كەس بەتەنها بۆخۆی بە تەنیا نوێژی كرد با چۆن دەیەوێت بەو شێوەیە نوێژ كات.**

١٠٨١- إن كنتم آنفا تفعلون فعل فارس والروم يقومون على ملوكهم وهم قعود فلا تفعلوا ائتموا بأئمتكم إن صلى قائما فصلوا قياما وإن صلى قاعدا فصلوا قعودا .

(صحيح) (ن هـ) عن جابر. (صحيح أبي داود ٦١٩)

**١٠٨١- ئەگەر ئێوە پێشتر بەكردەوەی فارسو رۆمتان كردوە كەلەبەردەم پاشكانیان دەوەستانو ئەوانیش دانشتبوون، ئەوە ئێستا نابێت وا بكەن، شوێن پێشەواو ئیمامەكانتان بكەون، گەر پێشنوێژ بە پێوە نوێژی دەكرد، ئێوەش بە پێوە نوێژ بكەن، وە ئەگەر پێشنوێژ دانشتبوو ئێوەش بە دانیشتنەوە نوێژ بكەن.**

١٠٨٢- إنما جعل الإمام جنة فإذا صلى قاعدا فصلوا قعودا وإذا قال سمع الله لمن حمده فقولوا اللهم ربنا لك الحمد فإذا وافق قول أهل الأرض قول أهل السماء غفر له ما تقدم من ذنبه .

(صحيح) (م) عن أبي هريرة. (الإرواء ٣٩٣)

**١٠٨٢- پێشنوێژ كراوەتە قەڵغان، جا هەر كات پێشنوێژ بەدانیشتنەوە نوێژی كرد، ئێوەش بە دانیشتنەوە نوێژ بكەن، وەئەگەر ووتی( سمع الله لمن حمده ) ئێوەش بڵێن : اللهم ربنا لك الحمد ) جاهەر كاتێ قسەو ووتەی خەڵكی سەرزەوی لەگەڵ قسەی خەڵكی ئاسمان هاوكات بوو یەكی گرت ئەوە خوای گەورە لە گوناهی پێشویان خۆش دەبێت.**

١٠٨٣- إنما جعل الإمام ليؤتم به فإذا صلى قائما فصلوا قياما وإن صلى جالسا فصلوا جلوسا ولا تقوموا وهو جالس كما يفعل أهل فارس بعظمائها .

(صحيح) (حم م ن) عن جابر. (صحيح أبي داود ٦١٥)

**١٠٨٣- بێگومان پێشنوێژ بۆیە دانراوە خەڵك نوێژی لە دواوە بكەن، جاكاتێ بە راوەستانەوە نوێژی كرد ئێوەش وەها نوێژ بكەن، وە ئەگەر بەدانیشتنەوە نوێژی كرد ئێوەش بەدانیشتنەوە نوێژ بكەن و هەرگیز ئێوە بە پێوە مەوەستن كە پێشنوێژ و برا گەورە دانیشتبێت هەروەك چۆن خەڵكی فارس لەگەڵ گەورەكانیاندا وا دەكەن.**

١٠٨٤- إنما جعل الإمام ليؤتم به فإذا كبر فكبروا وإذا رفع فارفعوا وإذا قال سمع الله لمن حمده فقولوا اللهم ربنا ولك الحمد وإذا سجد فاسجدوا وإذا صلى جالسا فصلوا جلوسا أجمعين .

(صحيح) (مالك حم خ د) عن أنس (حم ق د هـ) عن عائشة (صحيح أبي داود ٦١٤)

**١٠٨٤- بێگومان پێشنوێژ بۆیە دانراوە خەڵك نوێژی لە دواوە بكەن جاهەر كاتێ (الله أكبر)ی كرد ئێوەش (الله أكبر) بكەن، وەئەگەر سەری بەرز كردەوە ئێوەش سەر بەرز بكەنەوە، وەئەگەر ووتی( سمع الله لمن حمده) ئێوەش بڵێن(اللهم ربنا ولك الحمد) وەئەگەر سوژدەی برد ئێوەش سوژدە ببەن، وەكاتێ نوێژی بە دانیشتنەوە كرد، ئێوەش هەمووتان بە دانیشتنەوە نوێژ بكەن.**

١٠٨٥- إنما جعل الإمام ليؤتم به فإذا كبر فكبروا وإذا قرأ فأنصتوا وإذا قال سمع الله لمن حمده فقولوا ربنا لك الحمد.

(صحيح) (ن) عن أبي هريرة . (الإرواء ٣٨٧)

**١٠٨٥- بێگومان پێشنوێژ بۆیە دانراوە خەڵك بەدووی بكەوێت، جا هەر كاتێ (الله اكبر) ی كرد ئێوەش( الله اكبر) بكەن، وەكاتێ قورئانی خوێند ئێوەش گوێی بۆ بگرن، وەكاتێ ووتی(**سمع الله لمن حمده) **بڵێن** (ربنا ولك الحمد)

١٠٨٦- إنما جعل الإمام ليؤتم به فإذا كبر فكبروا وإذا قرأ فأنصتوا وإذا قال { غير المغضوب عليهم ولا الضالين } فقولوا آمين وإذا ركع فاركعوا وإذا قال سمع الله لمن حمده فقولوا اللهم ربنا ولك الحمد وإذا سجد فاسجدوا وإذا صلى جالسا فصلوا جلوسا .

(صحيح) (ش هـ هق) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٦١٧)

**١٠٨٦- بێگومان پێشنوێژ بۆیە دانراوە نوێژی لە دواوە بكرێت، جاهەر كاتێ (الله أكبر)ی ئێوەش (الله أكبر) بكەن، وكە قورئانی خوێند ئێوەش گوێی بۆ بگرن وكاتێ ووتی(**غير المغضوب عليهم ولا الضالين) **ئێوەش بڵێن(امين) وەكاتێ كرنوشی برد ئێوەش بیبەن وەكاتێ ووتی: ( سمع الله لمن حمده) ئێوەش بڵێن( اللهم ربنا ولك الحمد) وەكاتێ**

**كسوژده‌ی برد ئێوشه سوژده ببه‌ن، وكاتێ نوێژی به دانیشتنه‌وه كرد ئێوه‌ش به دانیشتنه‌وه نوێژ بكه‌ن.**

**١٠٨٧**- إنما جعل الإمام ليؤتم به فلا تختلفوا عليه وإذا كبر فكبروا وإذا ركع فاركعوا وإذا قال سمع الله لمن حمده فقولوا ربنا لك الحمد وإذا سجد فاسجدوا وإذا صلى جالسا فصلوا جلوسا أجمعين .

(صحيح) (حم ق د) عن أبي هريرة . (الإرواء ٣٩٣)

**١٠٨٧- بێگومان پێشنوێژ بۆیه دانراوه نوێژی له دواوه بكرێت لێی جیا مه‌بنه‌وه و جیاوازی درووست مه‌كه‌ن، جا له‌گڵ (الله اكبر)ی كرد ئێوه‌ش (الله اكبر)بكه‌ن و ئه‌گه‌ر كرنوشی برد كرنوش به‌رن و ئه‌گه‌ر وتی** (سمع الله لمن حمده) **بڵێن (ربنا ولك الحمد)،ئه‌گه‌ر سوژده‌ی برد سوژده به‌رن و ئه‌گه‌ر به دانیشتانه‌وه نوێژی كرد ئێوه‌ش به دانیشتانه‌وه نوێژ بكه‌ن.**

١٠٨٨- إني قد بدنت فإن ركعت فاركعوا وإذا رفعت فارفعوا وإذا سجدت فاسجدوا ولا ألفين رجلا سبقني إلى الركوع ولا إلى السجود .

(صحيح) (هـ) عن أبي موسى. (الصحيحة ١٧٢٥)

**١٠٨٨- من به‌راستی پیر بووم ، جا كه كرنوشم برد ئێوه‌ش كرنوش ببه‌ن، وكاتێ سه‌رم به‌رزكردەوه ئێوه‌ش سه‌ر به‌رزبكه‌نه‌وه، وه‌كاتێ سوژده‌م برد ئێوه‌ش سوژده ببه‌ن، با نه‌بینم هه‌رگیز كه‌سێ پێشم كه‌وتبێت نه له‌كرنوشدا نه له سوژده‌دا.**

١٠٨٩- إني لأدخل في الصلاة وأنا أريد أن أطيلها فأسمع بكاء الصبي فأتجوز في صلاتي مما أعلم من شدة وجد أمه ببكائه

(صحيح) (حم ق هـ) عن أنس . (صحيح أبي داود ٥٧٧)

**١٠٨٩- من ده‌چمه ناو نوێژه‌وه‌و ئه‌مه‌وێت درێژی بكه‌مه‌وه به‌ڵام كه گریانی منداڵ ده‌بیستم نوێژه‌كه‌م سووك‌و كورت ده‌خوێنم، چونكه ده‌زانم دایكی چه‌ندی دڵی گه‌رم بووه بۆ گریانی منداڵه‌كه‌ی.**

١٠٩٠- إني لأراكم من ورائي كما أراكم .

(صحيح) (خ) عن أنس. (الترغيب ٥٤١)

**١٠٩٠- بێگومان من ئێوه له پشتمه‌وه ده‌بینم هه‌روه‌ك چۆن له پێشه‌وه ده‌تانبینم.**

١٠٩١- إني لأسمع بكاء الصبي فأتجوز في الصلاة .

(صحيح) (هـ) عن عثمان ابن أبي العاص. (صحيح أبي داود ٥٧٧)

**١٠٩١- به‌راستى من كه گوێ بيستى گريانى منداڵ ده‌بم نوێژه‌كه خێرا ئه نجام ئه‌ده‌م.**

١٠٩٢- إني لأقوم للصلاة وأنا أريد أن أطول فيها فأسمع بكاء الصبي فأتجوز في صلاتي كراهية أن أشق على أمه .

(صحيح) (حم خ د ن هـ) عن أبي قتادة. (صحيح أبي داود ٥٧٧)

**١٠٩٢- به‌راستى من هه‌ڵده‌ستم بۆ نوێژو ده‌مه‌وێت نوێژه‌كه درێژ بكه‌مه‌وه له‌ناكاو گريانى منداڵ ده‌بيستم ، خێرا نوێژه‌كه ده‌كه‌م نه‌وه‌ك له‌سه‌ر دايكه‌كه‌ى قورس بكه‌م.**

١٠٩٣- أيما رجل أم قوما وهم له كارهون لم تجز صلاته أذنيه .

(صحيح) (طب) عن طلحة. (الترغيب ٤٨٤)

**١٠٩٣- هه‌ر پياوێك پێشنوێژى بۆ كۆمه‌ڵێك بكات‌و ئه‌و كۆمه‌ڵه ڕقيان[1] بێت لێ ى ئه‌وه نوێژه‌كه‌ى له بناگوێى تێنا په‌ڕێ.[2]**

١٠٩٤- الإمام ضامن فإن أحسن فله ولهم وإن أساء فعليه ولا عليهم .

(صحيح) (هـ ك) عن سهل بن سعد. (الصحيحة ١٧٦٧)

**١٠٩٤- پێشنوێژ كه‌فيلى نوێژخوێنانه و كه‌م و كورييان له‌خۆ ده‌گرێت ئه‌گه‌ر به‌چاكى كردى ئه‌وه پاداشت بۆ خۆى‌و نوێژخوێنان مسۆگه‌ر ده‌كات، وه ئه‌گه‌ر به خراپى كردى ئه‌وه گوناهه‌كه‌ى له‌سه‌ر خۆيه‌تى‌وهيچ له‌سه‌ر ئه‌وان نييه.**

١٠٩٥- تجوزوا في الصلاة فإن خلفكم الضعيف والكبير وذا الحاجة .

(صحيح) (طب) عن ابن عباس. (صحيح أبي داود ٧٥٩)

**١٠٩٥- له پێش نوێژدا خێراو ئاسان نوێژ بكه‌ن، چونكه له‌پشتتانه‌وه خه‌ڵكى لاوازو به‌ته‌مه‌ن‌و خاوه‌ن ئيش هه‌يه.**

١٠٩٦- ثلاثة لا تجاوز صلاتهم آذانهم العبد الآبق حتى يرجع وامرأة باتت وزوجها عليها ساخط وإمام قوم وهم له كارهون .

(صحيح) (ت) عن أبي أمامة. (المشكاة ١١٢٢)

**١٠٩٦- سێ كه‌س هه‌ن نوێژه‌كانيان له گوێيان تێپه‌ڕناكات، كۆيله‌يه‌ك له‌ده‌ست گه‌وره‌كه‌ى هه‌ڵبێت تا ئه‌و كاته‌ى ده‌گه‌ڕێته‌وه لاى و ئافره‌تێك شه‌و به‌سه‌ر به‌رێت‌و مێرده‌كه‌ى لێى توڕه‌و دڵگران بێت[1] وه پێشه‌واى خه‌ڵكانێك كه قه‌ومه‌كه‌ى ڕقيان لێى بێت.**

---

[1] (له‌سه‌ر تيشێك به پێى شه‌رع خراپ بێت‌و ئيمام كرد بێت)

[2] (واته به‌رز نابێته‌وه بۆ لاى په‌روه‌ردگارو قه‌بوڵ نابێت لێى)

١٠٩٧- زادك الله حرصا و لا تعد.

( حم خ د ن ) عن أبي بكرة. (صحيح أبي داود ٦٨٤)

**١٠٩٧- خوای گەورە زیاتر دڵ گەرمو سوورترت بكات بەڵام جارێكی تر وامەكە.** [2]

١٠٩٨- صل بـ { الشمس وضحاها } ونحوها من السور .

(صحيح) (حم) عن بريدة. (الإرواء ٢٩٥)

**١٠٩٨- كە پێش نوێژیت كرد لە نوێژدا( والشمس وضحاها ) وهاوشێوەكانی بخوێنە.** [3]

**١٠٩٩-** صل بصلاة أضعف القوم ولا تتخذ مؤذنا يأخذ على أذانه أجرا .

(صحيح) (طب) عن المغير . (صحيح أبي داود ٥٤١)

**١٠٩٩-كە پێش نوێژیت كرد وەكو لاواز ترین كەس لەو كۆمەڵەدا نوێژ بكە وەهەرگیز بانگ بێژێك دیاری مەكەو بانگی پێ مەدە كە پارە لەسەر بانگدانەكانی وەرگرێت.**

١١٠٠- كان أخف الناس صلاة على الناس وأطول الناس صلاة لنفسه .

(صحيح) (حم ع) عن أبي واقد. (الصحيحة ٢٠٥٦)

**١١٠٠- پێغەمبەری خوا( ﷺ ) لە نوێژەكردندا بۆ خەڵك ئاسانكارترین كەس بووە، بەڵام لە نوێژی خۆیدا لەهەموو كەس زیاتر نوێژی درێژ كردۆتەوە.**

١١٠١- كان أخف الناس صلاة في تمام .

(صحيح) (م ت ن) عن أنس. (الصحيحة ٢٠٥٦)

**١١٠١- پێغەمبەری خوا( ﷺ ) ئاسانكارترین پێش نوێژ بووە لەنوێژداو بەتەواویش كردویەتی.**

١١٠٢- ليؤمكم أكثركم قراءة للقرآن.

(صحيح) (ن) عن عمرو بن سلمة. (الإرواء ٣٨٣)

**١١٠٢- با پێش نوێژیتان بۆ بكات ئەوەتان كە لەهەمووتان زیاتر قورئان دەخوێنێتەوە.**

١١٠٣- ما يأمن الذي يرفع رأسه في صلاته قبل الإمام أن يحول الله صورته في صورة حمار .

(صحيح) (م) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٦٣٥)

---

[1] ( لەبەر فرمانێكی شەرعی وەك رەوشت خرا پیو بێ رێزیو جێگا جیاكردنەوە )

[2] ( وەڵامە بۆ كەسێك بەخێرایی و پەلە پەل دەچوو بۆ مزگەوتیو جەماعەت )

[3] ( واتە لە سورەتە كورتەكان .. گەر نوێژخوێنان رازی نەبوون بە سورەتی درێژ )

**١١٠٣- كێ گره‌نتیو ئه‌مان ئه‌دات به‌و كه‌سه‌ی پێ پێش نوێژ له‌نوێژدا سه‌ر به‌رز ده‌كاته‌وه له‌وه‌ی كه‌خوای گه‌وره شكڵ و روخساری بگۆڕێ بۆ شكڵ و شێوه‌ی گوێ درێژ؟! .**

١١٠٤- من أم الناس فأصاب الوقت وأتم الصلاة فله ولهم ومن انتقص من ذلك شيئا فعليه ولا عليهم.

(صحيح) (حم د هـ ك) عن عقبة بن عامر. (صحيح أبي داود ٥٩٣)

**١١٠٤- هه‌ركه‌س پێش نوێژی بۆ خه‌ڵك كردو له‌كاتی خۆیداو به‌جوانی نوێژی بۆ كردن ئه‌وه پاداشته‌كه‌ی بۆ خۆیو نوێژ خوێنانه و هه‌ر كه‌س پێش نوێژ كردو كه‌مو كورتی لێ په‌یدا كرد ئه‌وه له‌سه‌ر پێش نوێژه‌و هیچ له‌سه‌ر ئه‌وان نیه.**

١١٠٥- من أم قوما وهم له كارهون فإن صلاته لا تجاوز ترقوته .

(صحيح) (طب) عن جنادة . (الصحيحة ٢٣٢٥)

**١١٠٥- هه‌ر كه‌س ئپێش نوێژ بۆ كۆمه‌ڵێك بكاتو ئه‌وانیش بیبوغزێنن ، بێگومان نوێژی ئپێش نوێژه‌كه له ده‌فه‌ی شانی تێنا په‌ڕێ .**

١١٠٦- من زار قوما فلا يؤمهم وليؤمهم رجل منهم .

(صحيح) (حم د ت) عن مالك بن الحويرث. (صحيح أبي داود ٦٠٩)

**١١٠٦- هه‌ر كه‌س سه‌ردانی خه‌ڵكانێكی كرد با پێش نوێژییان بۆ نه‌كات به‌ڵكو پیاوێك له‌خۆیان پێش نوێژییان بۆ بكات.**

١١٠٧- من كان له إمام فقراءة الإمام له قراءة .

(صحيح) (حم هـ) عن جابر. (الإرواء ٥٠٠)

**١١٠٧- هه‌ر كه‌س پێش نوێژێكی هه‌بوو قورئان خوێندنی پێش نوێژه‌كه قورئان خوێندنه بۆ ئه‌و.**

١١٠٨- نهى أن يقوم الإمام فوق شيء والناس خلفه .

(صحيح) (د ك) عن حذيفة. (المشكاة ١٦٩٢)

**١١٠٨- پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) قه‌ده‌غه‌ی كردووه له‌وه‌ی پێش نوێژ له شوێنێكی به‌رزدا بوه‌ستێو خه‌ڵكیش له شوێنێكی نزمدا له‌دواوه‌ی نوێژ بكه‌ن.**

١١٠٩- هل ترون قبلتي هاهنا فوالله ما يخفي على خشوعكم ولا ركوعكم إني لأراكم من وراء ظهري .

(صحيح) (مالك ق) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣١)

**١١٠٩- ئایا رووگەی من دەبینن ئالێرەوەیە؟ سوێند بەخوا بێئاگانیم لە گەردن کەچیتان و کرنوشتان، بێگومان من ئێوە دەبینم لە پشتمەوە.**

١١١٠- هل قرأ معي أحد منكم آنفا إني أقول مالي أنازع القرآن .

(صحيح) (حم ت ن هـ حب) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٧٨١)

**١١١٠- ئایا لەگەڵ مندا لەم نوێژەی پێشوودا کەس قورئانی خوێند؟ چونکە من ئەڵێم ئەوە چییە خەڵك رکابەری و قورئان خوێندنم لەگەڵ دەکەن و لێم تێك ئەدەن.**

١١١١- و الله إني لأسمع بكاء الصبي وأنا في الصلاة فأخفف مخافة أن تفتن أمه .

(صحيح) (ت) عن أنس. (صحيح أبي داود ٥٧٧)

**١١١١- سوێند بەخوا من لەناو نوێژدا گوێم لەگریانی منداڵە بۆیە نوێژەکە سووك و سادە دەەم، نەوەك دایکی تووشی گرفتاری و نارەحەتی بێت.**

١١١٢- لا تبادروا الإمام إذا كبر فكبروا وإذا قال { ولا الضالين } فقولوا آمين وإذا ركع فاركعوا وإذا قال سمع الله لمن حمده فقولوا اللهم ربنا ولك الحمد ولا ترفعوا قبله .

(صحيح) (م) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٤٧٦)

**١١١٢- دەست پێشخەری لە پێش نوێژ مەکەن، کاتێ (الله اكبر)ی کرد ئێوەش (الله اكبر) بکەن و کاتێ ووتی (ولا الضالين) ئێوەش بڵێن (امين) وەکاتێ کرنوشی برد ئێوەش بیبەن، وەکاتێ ووتی(سمع الله لمن حمده) بڵێن: اللهم ربنا ولك الحمد وەهەرگیز لە پێشنوێژەوە بەرز مەبنەوە.**

١١١٣- لا تبادروني بركوع ولا بسجود فإنه مهما أسبقكم به إذا ركعت تدركوني إذا رفعت ومهما أسبقكم به إذا سجدت تدركوني به إذا رفعت إني قد بَدَّنْتُ .

(صحيح) (حم د هـ) عن معاوية. (الإرواء ٥٠٢)

**١١١٣- دەستپێشخەریم لێ مەکەن نە لە کرنوش و نە لە سوژدە بردندا، چونکە هەر چەند پێشتان بکەوم لەهەر کامیاندا، گەر کرنوشم برد فریام دەکەون کاتێ بەرز بوومەوە، وە هەر چەند پێشتان بکەوم گەر سوژدەم برد فریای کڕنوش دەکەون کاتێ سەرم بەرز کردەوە، چونکە بەراستی من کامڵ بووم.**

١١١٤- لا يؤم الرجل في سلطانه ولا يجلس على تكرمته في بيته إلا بإذنه .

(صحيح) (ت) عن ابن مسعود. (الإرواء ٤٨٧)

**١١١٤- نابێت پێش نوێژی بۆ پیاوێ بكرێت لە شوێنی دەسەڵاتیدا، وەنابێت لەماڵەكەی خۆیدا كەس لە شوێنە تایبەتیەكەیدا دابنیشێت مەگەر لەسەر رەزامەندی خۆی.**

١١١٥- يا أيها الناس إن منكم منفرين فمن أم الناس فليتجوز فإن خلفه الضعيف والكبير وذا الحاجة .

(صحيح) (حم ق هـ) عن أبي مسعود. (المشكاة ١١٣٢)

**١١١٥- ئەی خەڵكینە! لەناو ئێوەدا كەسانێك هەیە خەڵك تۆرێنە وخەڵك تەرە دەكات بۆیە هەر كەس پێش نوێژی بۆ خەڵك كرد باسووكو ئاسان بیكات، چونكە لە پشتیەوە كەسانی لاوازو بەتەمەنو خاوەن ئیش نوێژ دەكەن.**

١١١٦- يا أيها الناس إني إمامكم فلا تسبقوني بالركوع ولا بالسجود ولا بالقيام ولا بالقعود ولا بالانصراف فإني أراكم من أمامي ومن خلفي وايم الذي نفسي بيده لو رأيتم ما رأيت لضحكتم قليلا ولبكيتم كثيرا .

(صحيح) (حم م ن) عن أنس. (الإرواء ٥٠٢)

**١١١٦- ئەی خەڵكینە من پێش نوێژی ئێوەم باكەس پێشم نەكەوێت نەلە كرنوش و نە لە سوژدەدا نەلەهەستانەوە لە كرنوش و وەستانداو نەلەدانیشتندا، وە نە لە سەلامدانەوەدا، چونكە من لە پێشمەوە دەتابینم، وە سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە گەر ئێوە ئەوە ببینن كەمن بینومە كەم پێدەكەنینو زۆر دەگریان.**

١١١٧- يا فلان أفلا تحسن صلاتك ألا ينظر المصلي إذا صلى كيف يصلي فإنما يصلي لنفسه إني والله لأبصر من ورائي كما أبصر من بين يدي .

(صحيح) (م ن) عن أبي هريرة. (الترغيب ٥٤١)

**١١١٧- ئەی فلانە كەس ! ئەوە بۆ نوێژەكەت جوان ناكەیت! ئایا بۆ نوێژ خوێن ورد نابێتەوە. كاتێ نوێژ دەكات چۆن دەیكات؟ بێگومان ئەو نوێژ بۆ خۆی دەكات، سوێند بەخوا من لە دواوە دەبینم هەروەك چۆن لە بەردەممدا دەبینم.**

١١١٨- يا معاذ أفتان أنت فلولا صليت بـ { سبح اسم ربك الأعلى } { والشمس وضحاها } { والليل إذا يغشى } فإنه يصلي وراءك الكبير والضعيف وذو الحاجة .

(صحيح) (ق د) عن جابر . (صحيح أبي داود ٧٥٦)

**١١١٨- ئەما موعاز! ئەری تۆ خەڵكی دەفەوتێنی؟ باشە بۆ لە نوێژدا** (سبح اسم ربك الاعلى) **وە** (والشمس وضحاها) **و**(والليل إذا يغشى) **ناخوێنی بێگومان لە پشتتەوە خەڵكانی بەتەمەن و لاواز خاوەن ئیش نوێژ دەكەن.**

١١١٩- يؤم القوم أقرؤهم لكتاب الله فإن كانوا في القراءة سواء فأعلمهم بالسنة فإن كانوا في السنة سواء فأقدمهم هجرة فإن كانوا في الهجرة سواء فأقدمهم سنا ولا يؤمن الرجل في أهله ولا في سلطانه ولا يقعد في بيته على تكرمته إلا بإذنه.

(صحيح) (حم م ٤ ) عن أبي مسعود . (صحيح أبي داود ٥٩٤)

**١١١٩- پێش نوێژی بۆ خەڵك دەكەن ئەو كەسانەی كە لەهەموویان شارەزاترن لە قورئان خوێندن، جا ئەگەر لە قورئان خوێندندا یەكسان بوون كامیان لە فەرمودەكانی پێغەمبەردا شارەزا ترن، وە ئەگەر لە فەرمووده ناسیدا وەك یەك بوون كامیان لە كۆچ كردندا(هجرە) دا لە پێشترن، وە ئەگەر لە كۆچ كردنیشدا وەك یەك بوون، ئینجا كامیان بەتەمەنترن، و با هەرگیز پێش نوێژ بۆ كەسێ نەكرێت لەنێو ماڵ و منداڵی خۆیدا یان لە شوێنی دەسەڵاتیدا و با لەماڵەكەی خۆیدا كەس لەجێگای خاوەن ماڵ دانەنیشێت مەگەر بەر رەزامەندی خۆی.**

١١٢٠- يؤم القوم أقرؤهم للقرآن ؟.

(صحيح) (حم) عن أنس. (صحيح أبي داود ٥٩٤)

**١١٢٠- پێش نوێژی دەكات بۆ خەڵك ئەو كەسەی لەهەموویان شارەزاترە لە قورئان خوێندندا.**

١١٢١- يصلون لكم فإن أصابوا فلكم وإن أخطئوا فلكم وعليهم .

(صحيح) (خ) عن أبي هريرة. (الطحاوية ٦٩)

**١١٢١- پێش نوێژیتان بۆ دەكەن جا ئەگەر چاكیان كرد ئەوە پاداشتەكەی بۆ ئێوەیە وە ئەگەر خراپ و هەڵەیان كرد ئێوە پاداشتی خۆتان وەردەگرن و گوناهیش لەسەر ئەوانە.**

١١٢٢- أعظم الناس أجرا في الصلاة أبعدهم إليها ممشى فأبعدهم والذي ينتظر الصلاة حتى يصليها مع الإمام أعظم أجرا من الذي يصليها ثم ينام .

(صحيح) (ق) عن أبي موسى (هـ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٣٠٧)

**١١٢٢- زۆرترین پاداشت لەنوێژدا بۆ ئەو کەسانەیە لە جێگای دوروو دوورترەوە بە پێ دێن، وە ئەو کەسەی چاوەرشوانی نوێژ کردن دەکات بۆ ئەوەی لەگەڵ پێش نوێژدا بیکات پاداشتی زیاترە لەو کەسەی نوێژەکەی دەکات‌و پاشان دەخەوێت.**

١١٢٣- إن آثاركم تكتب .

(صحيح) (ت) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٣٥٠٠)

**١١٢٣- بەراستی جێ پێ‌و هەنگاوەکانتان بە پاداشت بۆ دەنوسرێت[1] .**

١١٢٤- إن الناس قد صلوا ورقدوا وإنكم لن تزالوا في صلاة ما انتظرتم الصلاة

(صحيح) (ق هـ) عن أنس. (صحيح أبي داود ٤٩٩)

**١١٢٤- خەڵك نوێژیان کردو خەوتن، بە راستی ئێوەش بەردەوام لە نوێژ کردندان مادام چاوەڕوانی نوێژی ئاینده بکەن.**

١١٢٥- إن الناس قد صلوا وناموا وأنتم لم تزالوا في صلاة ما انتظرتم الصلاة ولولا ضعف الضعيف وسقم السقيم لأمرت بهذه الصلاة أن تؤخر إلى شطر الليل .

(صحيح) (ن هـ) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ٤٩٩)

**١١٢٥- بێگومان خەڵك نوێژیان کردو خەوتن وە ئێوە بەردەوام لەنوێژدا بوون مادەم چاوەڕوانی نوێژتان کردبێت، وە ئەگەر لاوازی لاوازەکان‌و نەخۆشی نەخۆشەکان نەبایە فرمانم دەدا ئەم نوێژ-خەوتنان- [2] دوا بخرێت بۆ ناوەراستی شەو .**

١١٢٦- إنكم لن تزالوا في صلاة ما انتظرتم الصلاة .

(صحيح) (ن) عن أنس. (صحيح أبي داود ٤٩٩)

**١١٢٦- بەراستی ئێوە بەردەوام لەنوێژدان مادام چاوەڕوانی نوێژ بکەن.**

١١٢٧- ألا أدلكم على ما يكفر الله به من الخطايا ويزيد في الحسنات إسباغ الوضوء على المكروهات وكثرة الخطا إلى المساجد وانتظار الصلاة بعد الصلاة .

(صحيح) (هـ) عن أبي سعيد. (الترغيب ١٩٢)

---

[1] ((وەلامە بۆ تیرەی بەنی سەلەمە کاتێ ویستیان لەگەڕەکی خۆیان بگوازنەوە بۆ نزیك مزگەوتی پێغەمبەر(صلى الله على وسلم ))

[2] (نوێژی (المغرب) واتە :نوێژی ئێوارە،نوێژی (العشاء) واتە :نوێژی خەوتنان )

**١١٢٧- ئایا پێتان بڵێم ئەوەی خوا گوناهەکانیی دەسڕێتەوە و لە چاکەکانیشی پێ زیاد دەکات، دەست نوێژ جوان گرتن لەکاتی نارەحەتیدا، وە زۆر ڕۆیشتن بۆ مزگەوتەکان و چاوەڕوانی نوێژ لە دوای نوێژ .**

١١٢٨- الأبعد فالأبعد[1] ، من المسجد أعظم أجرا[2] .

(صحيح) (حم د هـ ك هق) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٥٦٥)

**١١٢٨- دورتر بە دورتر لە مزگەوتەوە پاداشتی گەورەترە.**

١١٢٩- بشر المشائين في الظلم إلى المساجد بالنور التام يوم القيامة.

(صحيح) (د ت) عن بريدة (هـ ك) عن أنس وسهل بن سعد. (المشكاة ٧٢١)

**١١٢٩- موژدە بدە بەو کەسانەی لە تاریکایی شەودا دەچن بۆ مزگەوتەکان، بەوەی نوورو روناکی تەواویان پێ دەبەخشرێت لە ڕۆژی دواییدا.[3]**

١١٣٠- من حين يخرج أحدكم من منزله إلى مسجده فرجل تكتب حسنة والأخرى تمحو سيئة .

(صحيح) (ك هب) عن أبي هريرة . (الترغيب ٢٩٩)

**١١٣٠- لەو کاتەوە کە یەکێکتان لە ماڵەکەیەوە دەردەچێت بۆ مزگەوتەکەی هەنگاوێکی قاچی چاکەی بۆ دەنوسرێتو هەنگاوێکی تری قاچەکەی تری گوناهێکی لێ دەسڕێتەوە.**

١١٣١- إن لك ما احتسبت .

(صحيح) (هـ) عن أبي. (صحيح أبي داود ٥٦٦)

**١١٣١- بە ئەندازەی نیزی خۆت چاکەو پاداشتت بۆ دەنوسرێت.[4]**

١١٣٢- إن لكم بكل خطوة درجة .

(صحيح) (م) عن جابر. (الترغيب ٣٠٤)

**١١٣٢- بەراستی بەهەموو هەنگاوێك پلەیەك وەردەگرن.**

١١٣٣- القاعد على الصلاة كالقانت[5] ويكتب من المصلين من حين يخرج من بيته حتى يرجع إلى بيته.

(صحيح) (حب) عن عقبة بن عامر. (الترغيب ٤٥٤)

---

١ دوری لە ماڵەوە .

٢ چونکە هەنگاوی زیاتر دەنێت.

[3] ( لەسەر پردی سیرات )

[4] ( وەڵامە بۆ ئەو کەسەی یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) پێی وتبوو: گوێ درێژێك بکڕە بۆ هاتوچۆی مزگەوت بۆ نوێژ، ئەمیش وتبووی بەڵکو بە هەنگاوەکانم پاداشتی زیاتر وەربگرم )

[5] (( المنذري ) مونزیری لە تەرغیبدا فەرموویەتی واتە: پاداشتی وەکو پاداشتی کەسێکە بە پێوە نوێژ دەکات مادام چاوەڕوانی نوێژ دەکات چونکە مەبەست بە( القنوت ) لێرەدا نوێژکردنە بە پێوە )

**١١٣٣- ئەوەی دانیشتووەو چاوەڕوانی نوێژ دەكات وەك ئەو كەسە وایە بە پێوە نوێژ دەكات، و لە ریزی نوێژخوێنان دەنوسرێت لەو كاتەوەی كە لەماڵ دەردەچێت تا ئەو كاتەی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی.**

١١٣٤- كل خطوة يخطوها أحدكم إلى الصلاة يكتب له بها حسنة ويمحى عنه بها سيئة.

(صحيح) (حم) عن أبي هرير. (الترغيب ٢٩٧)

**١١٣٤- هەموو هەنگاوێك كەیەكێكتان دەینێت بۆ نوێژ، بەو هەنگاوە چاكەیەكی بۆ دەنوسرێت، و گوناهێكی لێ دەسڕێتەوە.**

١١٣٥- من تطهر في بيته ثم مشى إلى بيت من بيوت الله ليقضي فريضة من فرائض الله كانت خطواته إحداهما تحط خطيئة والأخرى ترفع درجة .

(صحيح) (م) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٥٧٢)

**١١٣٥- هەر كەس لەماڵی خۆیدا دەست نوێژ بگرێتو پاشان بەرەو ماڵێك لە ماڵەكانی خوا بەڕێ بكەوێت بۆ ئەوەی فەرزێك لە فەرزەكانی خوا-جل جلاله- جێبەجێ بكات ئەوە بێگومان هەنگاوەكانی یەكێكیان گوناهێكی پێ دەسڕێتەوەو هەنگاوەكەی تریش پلەیەك بەرزی دەكاتەوە.**

١١٣٦- من صلى وجلس ينتظر الصلاة لم يزل في صلاة حتى تأتيه الصلاة التي يلاقيها.

(صحيح) (ن) عن عبدالله بن سلام وأبي هريرة. (المشكاة ١٣٥٩)

**١١٣٦- هەر كەس نوێژ بكاتو دابنیشێت چاوەڕوانی نوێژێكی تر بكاتەوە، ئەوە بەردەوام لە نوێژدایە هەتای نوێژەكەی دوای ئەو دێتە پێشەوە و دەیكات.**

١١٣٧- من غدا إلى المسجد وراح أعد الله له نزلا من الجنة كلما غدا وراح .

(صحيح) (حم ق) عن أبي هريرة. (المشكاة ٦٩٨)

**١١٣٧- هەر كەس هاموشۆی مزگەوت بكات( بڕوات وبێتەوە ) خوای گەورە چەند جێگایەكی لە بەهەشتدا بۆ ئامادەكردووە بۆ گشت رۆشتنو گەڕانەوەكان.**

١١٣٨- من كان في المسجد ينتظر الصلاة فهو في الصلاة ما لم يحدث .

(صحيح) (حم ن حب) عن سهل بن سعد. (صحيح النسائي ٧٣٤)

**١١٣٨- هەركەس لە مزگەوتدا بمێنێتەوەو چاوەڕانی نوێژێكی تر بكات ئەوە وەك ئەوە وایە لەنوێژدا بێت مادام دەست نوێژی نەشكێت.**

١١٣٩- من مشى إلى صلاة مكتوبة في الجماعة فهي كحجة ومن مشى إلى صلاة تطوع فهي كعمرة نافلة .

(صحيح) (طب) عن أبي أمامة. (صحيح أبي داود ٥٦٧)

**١١٣٩- هەر كەسێ بڕوات بۆ نوێژێكی فەرز بەكۆمەڵ ئەوە پاداشتی ئەو نوێژ بە كۆمەڵە وەك پاداشتی حەج كردنێكە، وە هەر كەس بڕوا بۆ نوێژێكی سوننەت ئەوە پاداشتەكەی وەك پاداشتی عەمرەیەكە.**

١١٤٠- الملائكة تصلي على أحدكم ما دام في مصلاه الذي صلى فيه ما لم يحدث أو يقم اللهم اغفر له اللهم ارحمه.

(صحيح) (حم د ن) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٤٨٨)

**١١٤٠- فریشتە داوای درودو لێ خۆشبوون دەكەن بۆ هەر یەكێكتان مادەم لەو شوێنەی كەنوێژی تێداكردووە مابێتەوە بەمەرجێ دەست نوێژی نەشكابێت یاهەڵنەستابێت فریشتەكە دەڵێت: خوایە لێی خۆش بە ، خوایە میهرەبان بە بەرامبەری.**

١١٤١- لا يزال أحدكم في صلاة ما دامت الصلاة تحبسه لا يمنعه أن ينقلب إلى أهله إلا الصلاة.

(صحيح) (حم م هـ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٤٨٩)

**١١٤١- بەردەوام هەر یەكێكتان لەنوێژدایە، مادام نوێژ گرێی دابێت و هیچ شتێكی تر ڕێگای لێ نەگرتبێت بچێتەوە ناو كەسوكاری جگە لە نوێژ.**

١١٤٢- لا يزال العبد في صلاة ما دام في المسجد ينتظر الصلاة ما لم يحدث .

(صحيح) (ق د ت) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٤٩٠)

**١١٤٢- بەردەوام مرۆڤ لەنوێژدایە مادام لە مزگەوت چاوەڕوانی نوێژی ئایندە بكات بەمەرجێ دەست نوێژی نەشكێت.**

١١٤٣- المرء في صلاة ما انتظرها .

(صحيح) (عبد بن حميد) عن جابر. (الصحيحة ٢٣٦٨)

**١١٤٣- مرۆڤ لەنوێژدایە هەتا چاوەڕوانی بكات.**

١١٤٤- ما توطن رجل مسلم المساجد للصلاة والذكر إلا تبشبش الله له من حين يخرج من بيته كما يتبشبش أهل الغائب بغائبهم إذا قدم عليهم .

(صحيح) (هـ ك) عن أبي هريرة. (الترغيب ٣٢٧)

**١١٤٤- هيچ پياوێكى موسڵمان نييە مزگەوتەكان بكاتە ماڵ و نيشتەجێ بێت تياياندا بۆ نوێژو يادى خودا- جل جلاله- مەگەر خواى گەورە خۆشنود دەبێت بەرامبەرى لەو كاتەوەى كە لەماڵ دەردەچێت، هەروەك چۆن كەسێك لەغەريبى بێت و كاتێ دێتەوە كەس و كارى دەم و چاويان پێى خۆشنود و خۆشحاڵ دەبن بە گەڕانەوەى ...**

١١٤٥- يا بني سلمة ألا تحتسبون آثاركم إلى المسجد .

(صحيح) (حم خ هـ) عن أنس. (المشكاة ٧٠٠)

**١١٤٥- ئەى (بەنى سەلەمە) ! ئايا شوێنەواروو جێ پێ و هەنگاوەكانتان بە پاداشت ناژمێرن كەدێن بۆ مزگەوت؟**

١١٤٦- يا بني سلمة دياركم تكتب آثاركم .

(صحيح) (حم م) عن جابر. (المشكاة ٧٠٠)

**١١٤٦- ئەى بەنى سەلەمە! لەگەڕەك و شوێنى خۆتان بمێنن، شوێنەوار و جێ پێ و هەنگاوەكانتان بۆ دەنوسرێت.**

١١٤٧- أثقل الصلاة على المنافقين صلاة العشاء وصلاة الفجر ولو يعلمون ما فيهما لأتوهما ولو حبوا ولقد هممت أن آمر بالصلاة فتقام ثم آمر رجلا فيصلي بالناس ثم أنطلق معي برجال معهم حزم من حطب إلى قوم لا يشهدون الصلاة فأحرق عليهم بيوتهم بالنار.

(صحيح) (حم ق د ه) عن أبي هريرة. (الإرواء ٤٨٩)

**١١٤٧- گرنگترين نوێژ لەسەر دووڕووەكان نوێژى خەوتنان و بەيانيانە جا ئەگەر بيانزانيايە چەندە پلەو پاداشتى هەيە لە كردنياندا، بە گاگۆڵكێش بوايە بۆيان دەهاتن، بێگومان بەنياز بووم فرمان بدە كە قامەت بكرێت كۆمەڵێك لەگەڵ خۆمدا ببەم و يەكى كۆڵە پشتێك داريان پێ بێت و بەرەو ماڵى ئەو كەسانە بڕۆين كە نايەن بۆ نوێژى جەماعەت تا ماڵەكانيان بسوتێنم بەسەرياندا.**

١١٤٨- لينتهين رجال عن ترك الجماعة أو لأحرقن بيوتهم .

(صحيح) (هـ) عن أسامة. (الترغيب ٤٣٣)

**١١٤٨- بائەو پياوانە وازبێنن لە وازهێنان لە نوێژى جەماعەت ئەگينا ماڵەكانيان دەسوتێنم.**

١١٤٩- اعبد الله كأنك تراه وعد نفسك في الموتى وإياك ودعوات المظلوم فإنهن مجابات وعليك بصلاة الغداة وصلاة العشاء فاشهدهما فلو تعلمون ما فيهما لأتيتموهما ولو حبوا .

(صحيح) (طب) عن أبي الدرداء. (الصحيحة ١٤٧٤)

**١١٤٩- خواى گەورە وا بپەرستە كە دەيبينيت، وە خۆت لە ريزى مردووەكان[1] دابنێ ، ئاگات لە نزاو دۆعاى مەزلوم بێت، چونكە دۆعاكانيان گيرادەبێت وە پێويستە لەسەرت ئامادەى هەردوو نوێژى بەيانيان‌و (عيشا)خەوتنان بيت، چونكە ئەگەر بزانن چەند خێريان تێدايە بێگومان بەگاگۆلكێش بوايە بۆيان دەهاتن.**

١١٥٠- إن الرجل إذا صلى مع الإمام حتى ينصرف كتب له قيام ليلة .

(صحيح) (حم ٤ حب) عن أبي ذر. (الإرواء ٤٧٧)

**١١٥٠- پياو ئەگەر لەگەڵ پێشنوێژ نوێژى كرد[2] تا تەواو دەبێت ئەوە پاداشتى شەونوێژێكى بۆ دەنوسرێت.**

١١٥١- إن الله ليعجب من الصلاة في الجمع .

(صحيح) (حم) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٦٥٢)

**١١٥١- بەراستى پەروەردگار نوێژى بە كۆمەڵى زۆر پێ خۆشە.**

١١٥٢- إن صلاة الرجل في الجماعة تزيد على صلاته وحده بخمس وعشرين جزءا .

(صحيح) (ت) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٤٧٥)

**١١٥٢- بەراستى نوێژى مرۆڤ بە كۆمەڵ پاداشتى بەسەر نوێژى بەتەنهادا بيست‌و پێنج پلەيە.**

١١٥٣- إن هاتين الصلاتين - يعني العشاء والصبح - من أثقل الصلاة على المنافقين ولو يعلمون فضل ما فيهما لأتوهما ولو حبوا عليكم بالصف المقدم فإنه مثل صف الملائكة ولو تعلمون فضيلته لابتدرتموه وصلاة الرجل مع الرجل أزكى من صلاته وحده وصلاته مع الرجلين أزكى من صلاته مع الرجل وما كان أكثر فهو أحب إلى الله تعالى .

(صحيح) (حم د ن هـ حب ك) عن أبي. (صحيح أبي داود ٥٦٣)

**١١٥٣- بەراستى ئەم دوو نوێژە واتە((عيشا)خەوتنان‌و بەيانيان) لە قورسترينى نوێژەكانن لەسەر دووڕووەكان، و ئەگەر پلەو پايەو پاداشتى ئەم دوانەيان بزانيبايە بێگومان بۆى دەهاتن بابە گاگۆلكێش بوايە، پێويستە خۆ بگەيەننە ريزى يەكەم بەراستى وەكو فريشتە وايە ئەگەر پلەوپايەى بزانن پەلەتانم بۆ دەكرد ،نوێژى مرۆڤ**

---

[1] (واتە خۆت دابڕە لەدونياو ئەهلى دونياو چاويان لێ مەكە ئيش بۆ ناوو شۆرەت نەكە وەك چۆن مردوو لە ناوشۆرەت‌و تەماع دادەبڕێت)

[2] (مەبەست لە نوێژى تەراويحە)

**لەگەڵ یەکتر پاکترە لەنوێژێك بۆخۆی و بەتها بیکات، ومنوێژێك لەگەڵ دوو کەس بیکات باشترە لەو نوێژەی لەگەڵ یەك کەس دەیکات، بۆیە تا نوێژ خوێنان زیاتر بن خۆشەویسترە لای پەروەردگار.**

١١٥٤- إنه من قام مع الإمام حتى ينصرف كتب له قيام ليلة .

(صحيح) (ت هـ حب) عن أبي ذر. (الإرواء ٤٤٦)

**١١٥٤- بێگومان هەر کەس لەگەڵ پێش نوێژ نوێژ بکات تا تەواو دەبێت ئەوە پاداشتی شەو نوێژێکی بۆ دەنوسرێت.**

١١٥٥- تفضل صلاة الجمع صلاة أحدكم وحده بخمس وعشرين جزءا وتجتمع ملائكة الليل وملائكة النهار في صلاة الفجر

(صحيح) (خ ن) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٦١٨)

**١١٥٥- نوێژی بە کۆمەڵ پلەو پلایەی لە نوێژی هەر یەك لە ئێوە بەتەنها بە بیستو پێنج پلە، و فریشتەکانی شەو لەگەڵ فریشتەکانی لە نوێژی بەیانیاندا کۆ دەبێتەوە.**

١١٥٦- ثلاثة في ضمان الله عز وجل رجل خرج إلى مسجد من مساجد الله عز وجل ورجل خرج غازيا في سبيل الله تعالى ورجل خرج حاجا.

(صحيح) (د حب ك) عن أبي أمامة. (الصحيحة ٦٠٠)

**١١٥٦- سێ کەس لە زەمانەت و پەرێزی پەروەردگاردان، پیاوێك لەماڵ بچێت بۆ مزگەوتێك لە مزگەوتەکانی خوا-جل جلالە- وە پیاوێك بەمەبەستی جیهادو غەزاکردن لە پێناوی خوادا لە ماڵ دەرچێت، وە پیاوێك بچێت بۆ حەجی ماڵی خوا.**

١١٥٧- ثلاثة كلهم ضامن على الله رجل خرج غازيا في سبيل الله فهو ضامن على الله حتى يتوفاه فيدخله الجنة أو يرده بما نال من أجر أو غنيمة ورجل راح إلى المسجد فهو ضامن على الله حتى يتوفاه فيدخله الجنة أو يرده بما نال من أجر ورجل دخل بيته بسلام فهو ضامن على الله .

(صحيح) (د حب ك) عن أبي أمامة. (المشكاة ٧٢٧)

**١١٥٧- سێ کەس هەن لە زەمانەتو پەرێزی خوای گەورەدان، کەسێك دەربچێت بە مەبەستی جیهادو غەزا کردن ئەوە لە پەرێزی پەروەردگاردایە تا ئەو کاتەی دەیمرێنیو دەیخاتە بەهەشتەوە، یان بە دەسکەوت وپاداشتەوە دەیگێرێتەوە، وە کەسێك بڕوات بۆ مزگەوت ئەویش لە پەرێزوو زەمانەتی خودا دایە جا یان دەیمرێنێ و**

**دەیخاتە بەهەشتەوە یاخود دەیگێڕێتەوە بە پاداشتەوە ، وەکەسێك چووەتە ماڵی خۆی بەهێمنی و ئاشتی ئەویش لە زەمانەت و پەرێزی پەروەردگار دایە.**

١١٥٨- سبعة يظلهم الله في ظله يوم لا ظل إلا ظله إمام عادل وشاب نشأ في عبادة الله ورجل قلبه معلق بالمسجد إذا خرج منه حتى يعود إليه ورجلان تحابا في الله فاجتمعا على ذلك وافترقا عليه ورجل ذكر الله خاليا ففاضت عيناه ورجل دعته امرأة ذات منصب وجمال فقال إني أخاف الله رب العالمين ورجل تصدق بصدقة فأخفاها حتى لا تعلم شماله ما تنفق يمينه .

(صحيح) (مالك ت) عن أبي هريرة وأبي سعيد (حم ق ن) عن أبي هريرة (م) عن أبي هريرة وأبي سعيد معا. (الإرواء ٨٧٩)

**١١٥٨- حەوتن ئەوانەی خوای گەورە دەیا نخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، لە ڕۆژێکدا کەهیچ سێبەرێك ڕێك نییە جگە لە سێبەری خوایی، پێشەوایەکی دادپەروەر، و گەنجێك لەبەنەدایەتی خوادا پێگەیشتبێت و گەشەی کردبێت، و کەسێك دڵی وا بەستەی مزگەوت بێت بەرادەیەك کە دەردەچێ لە مزگەوت دڵی لای بێت تا دەگەڕێتەوە بۆی، و دوو کەس خۆشەویستی خوای گەورە کۆی کردبنەوەو بەردەوام بن تا مردن لێکیان جیا دەکاتەوە، و کەسێك یادی خوا دەکات و فرمێسك بەچاوەکانیدا دێتە خوارەوە، و پیاوێك ئافرەتێکی خاوەن پلەو دیمەنو جوان بانگی بکات[1] ئەویش بڵێ: بەراستی من لەخوای پەروەردگار دەترسم، وە پیاوێك بەخشیشێك ببەخشێتو بیشارێتەوە بەرادەیەك دەستی چەپی نەزانێت دەستی ڕاستی چی بەخشیوە .**

١١٥٩- صلاة الجماعة أفضل من صلاة أحدكم وحده خمسة وعشرين جزءا .

(صحيح) (ن هـ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٦١٨)

**١١٥٩- نوێژی بەکۆمەڵ باشترە لە نوێژی هەر یەك لە ئێوە کە بەتەنها بیکات بەبیستو پێنج بەش.**

١١٦٠- صلاة الجماعة تعدل خمسا وعشرين من صلاة الفذ .

(صحيح) (م) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٥٦٩)

**١١٦٠- نوێژی بە کۆمەڵ هاوتای بیستو پێنج نوێژی تاك دەوەستێت.**

١١٦١- صلاة الجماعة تفضل صلاة الفذ بخمس وعشرين درجة .

(صحيح) (حم خ هـ) عن أبي سعيد. (الترغيب ٤١٣)

---

[1] (بۆ زینا کردن)

**١١٦١- نوێژی به کۆمەڵ پلەو پایە زیاترە بە سەر نوێژی تاکەکەسدا بە بیستو پێنج پلە.**

١١٦٢- صلاة الجماعة تفضل صلاة الفذ بسبع وعشرين درجة .

(صحيح) (مالك حم ق ت ن هـ) عن ابن عمر. (المشكاة ١٠٥٢)

**١١٦٢- نوێژی به کۆمەڵ پلەو پایەی دەدرێت بەسەر نوێژی تاکەکەسدا بە بیستو حەوت پلە.**

١١٦٣- صلاة الرجل تطوعا حيث لا يراه الناس تعدل صلاته على أعين الناس خمسا وعشرين .

(صحيح) (ع) عن صهيب. (الصحيحة ٣١٤٩)

**١١٦٣- نوێژی مرۆڤ کە سوننەت بێت بیکاتو خەڵك نەیبینێت هاوتای نوێژەکەی دەبێت کە لەبەرچاوی خەڵك ئەنجامی ئەدات بە بیستو پێنج نوێژ.**

١١٦٤- صلاة الرجل في جماعة تزيد على صلاة الرجل وحده ( أربعا وعشرين أو ) خمسا وعشرين درجة .

(صحيح) (هـ) عن أبي. (صحيح أبي داود ٥٦٣)

**١١٦٤- نوێژی مرۆڤ کەلەجەماعەتدا بیکات خێری زیاترە بەسەر نوێژەکەیدا کەبە تەنها بیکات بە بیست و چوار یان بیستو پێنج پلە.**

١١٦٥- صلاة الرجل في جماعة تزيد على صلاته في بيته وصلاته في سوقه خمسا وعشرين درجة وذلك أن أحدكم إذا توضأ فأحسن الوضوء ثم أتى المسجد لا يريد إلا الصلاة لم يخط خطوة إلا رفعه الله بها درجة وحط عنه بها خطيئة حتى يدخل المسجد فإذا دخل المسجد كان في صلاة ما كانت الصلاة تحبسه وتصلي الملائكة عليه ما دام في مجلسه الذي يصلي فيه يقولون اللهم اغفر له اللهم ارحمه اللهم تب عليه ما لم يؤذ فيه أو يحدث فيه .

(صحيح) (حم ق د هـ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٥٦٨)

**١١٦٥- نوێژی کەسێك بە کۆمەڵ خێری زیاترە بەسەر نوێژەکەیدا کەلەماڵەوە یا لەبازارەکەیدا بیکات بە بیستو پێنج پلە، چونکە هەر یەکێکتان کاتێ دەست نوێژێکی تەواوی گرتو پاشان چوو بۆ مزگەوتو هیچ مەبەستێکی تری نەبێت جگە لە نوێژ ئەوە هیچ هەنگاوێك نانێت مەگەر خوای گەورە بەو هەنگاوە پلەیەك بەرزی دەکاتەوەو گوناهێکی لێ دەسڕێتەوە تا دەچێتە ناو مزگەوت ، جا کاتێ چووە ناو مزگەوت بە نوێژ بۆی تۆمار دەکرێت مادەم نوێژ گیری دابێت ، وە بەردەوام فریشتە داوای بەزەیی خوایی بۆ دەکەن مادەم لەو شوێنەی نوێژی تێدا کردووە هەڵنەستا بێت، فریشتەکان دەڵێن لە**

**نزاکانیاندا بۆی خوایە لێی خۆش بە ، خوایە بەزەیت پێیدا بێتەوە، خوایە تۆبەی لێ قبوڵ بکە، ئەم پاداشتو نزایانەی بەمەرجێ دەست دەکەوێت کە ئەزیەتی خەڵکی نەدابێتو دەست نوێژی نەشکا بێت .**

١١٦٦- صلاة الرجل في جماعة تزيد على صلاته وحده خمسا وعشرين درجة فإذا صلاها بأرض فلاة فأتم وضوءها وركوعها وسجودها بلغت صلاته خمسين درجة.

(صحيح) (عبد بن حميد ع حب ك) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ٥٦٩)

**١١٦٦- نوێژی کەسێك بە کۆمەڵ بیکات خێری زیاترە بەسەر نوێژی تاکە کەسدا بە بیستو پێنج پلە، وە ئەگەر لەدەشتو چۆڵەوانیدا بەدەست نوێژی تەواوو کڕنوش و سوژدەی تەواوە وە بیکات ئەوە ئەو نوێژی بۆ دەگاتە پە نجا پلە.**

١١٦٧- صلاة رجلين يؤم أحدهما صاحبه أزكى عند الله من صلاة أربعة تترى وصلاة أربعة يؤمهم أحدهم أزكى عند الله من صلاة ثمانية تترى وصلاة ثمانية يؤمهم أحدهم أزكى عند الله من صلاة مائة تترى.

(صحيح) (طب هق) عن قبات بن أشيم. (الصحيحة ١٩١٢)

**١١٦٧- نوێژی دوو پیاو کە یەکێکیان پێش نوێژی بۆ ئەوی تر بکات پاکترو باشترە لای پەروەردگار لە نوێژی چوار کەسو بەجیاوازیو بۆ خۆیان بیکەن وە نوێژی چوار کەس کە یەکێکیان پێش نوێژییان بۆ بکات پاکتروو خێرترە لە نوێژی هەشت کەس هەر یەکەو بۆ خۆی بیکات بەتەنها، وە نوێژی هەشت کەس کەیەکێکیان پێشنوێژیان بۆ بکات پاکترە لای پەروەردگار لەنوێژی سەد (١٠٠) کەس کە هەر یەکەو بۆ خۆی بەتەنها بیکات.**

١١٦٨- صلاة مع الإمام أفضل من خمس وعشرين صلاة يصليها وحده .

(صحيح) (م) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٥٦٨)

**١١٦٨- نوێژێك لەگەڵ پێش نوێژدا باشترە لە بیستو پێنج نوێژەکە مرۆڤ بەتەنها بیکات.**

١١٦٩- الصلاة في جماعة تعدل خمسا وعشرين صلاة فإذا صلاها في فلاة فأتم ركوعها وسجودها بلغت خمسين صلاة .

(صحيح) (د ك) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ٥٦٩)

**١١٦٩- نوێژێك لەجەماعەتدا هاوتای بیستو پێنج نوێژە، جا ئەگەر لەدەشتو چۆڵەوانیدا بەرێكو پێکی کرنوش و سوژدەکانی ئەنجام دابێت ئەوە پاداشتی پە نجا نوێژی هەیە.**

١١٧٠- فضل صلاة الجماعة على صلاة الرجل وحده خمس وعشرون درجة ( وفضل صلاة التطوع في البيت على فعلها في المسجد كفضل صلاة الجماعة على المنفرد) .

(صحيح) (ابن السكن) عن ضمرة بن حبيب عن أبيه. (صحيح أبي داود ٥٧٠)

**١١٧٠- پلە و پایەی نوێژی بە کۆمەڵ بەسەر نوێژی تاکە کەسدا بیستو پێنج پلەیە.وە پلە و پایەی نوێژی سوننەت لو ماڵەوە بەسەر نوێژی سوننەتی مزگەوتدا وەکو پلەوپایەی نوێژی فەرزە بە کۆمەڵ بەسەر نوێژی تاکدا.**

١١٧١- فضل صلاة الجميع على صلاة الواحد خمس وعشرون درجة وتجتمع ملائكة الليل وملائكة النهار في صلاة الفجر.

(صحيح) (ق) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٦١٨)

**١١٧١- پلەوپایەی نوێژی بەکۆمەڵ بەسەر نوێژی تاکە کەسدا بیستو پێنج پلەیەو فریشتەکانی شەو و فریشتەکانی ڕۆژ لەنوێژی بەیانیاندا کۆ بدەنەوە.**

١١٧٢- لقد أعجبني أن تكون صلاة المسلمين واحدة حتى لقد هممت أن أبث رجالا في الدور ينادون الناس لحين الصلاة وحتى هممت أن آمر رجالا يقومون على الآطام ينادون المسلمين بحين الصلاة.

(صحيح) (د ك) عن رجل. (صحيح أبي داود ٥٢٣)

**١١٧٢- شادمانو دەبم و پێمخۆشە کە نوێژی موسلمانان بەیەکەوە بێت، هەتا ولم بە خەیەڵدا هات چەند پیاوێك بنێرمە گەرەکەکانو خەڵك بانگ بکەن بۆ نوێژ لە کاتی نوێژەکاندا، و هەتا گەشتومەتە ئەوەی بەتەمام فرمان بدەم بەچەند پیاوێك لە شوێنە بەرزەکانەوە خەڵك بانگ بکەن بۆ لەکاتی نوێژدا .**

١١٧٣- لقد هممت أن آمر رجلا يصلي بالناس ثم أحرق على رجال يتخلفون عن الجمعة بيوتهم.

(صحيح) (حم م) عن ابن مسعود. (المشكاة ١٣٧٨)

**١١٧٣- وام بە خەیاڵدا هات فەرمان بکەم بە پیاوێك نوێژ بۆ خەڵك بکاتو پاشان بڕۆم بۆ ئەو کەسانەی نایەن بۆ نوێژی هەینی و ماڵەکانیان بەسەریاندا بسوتێنم.**

١١٧٤- ما من ثلاثة في قرية ولا بدو لا تقام فيهم الصلاة إلا استحوذ عليهم الشيطان فعليكم بالجماعة فإنما يأكل الذئب القاصية .

(صحيح) (حم د ن حب ك) عن أبي الدرداء. (المشكاة ١٠٦٧)

**١١٧٤- هیچ سێ کەسێك نییە لەلادێ یان دەشت نشین بن و نوێژ لەناویاندا نەکرێت حەتمەن شەیتان زەفەری پێ بردوون و سوار شانیان بووە، بۆیە دەست بە کۆمەڵی مسوڵمانان بگرن، چونکە بەراستی گورگ لە مەڕی تاكوتەرا دەخوات.**

١١٧٥- من سمع النداء فلم يأته فلا صلاة له إلا من عذر.

(صحيح) (هـ حب ك) عن ابن عباس. (الإرواء ٥٤٤)

**١١٧٥- هەر کەس گوێی لە بانگ بێتو نەچێت بەدەمەیوە نوێژی بۆ نییە مەگەر بیانووی هەبێت.**

١١٧٦- من صلى العشاء في جماعة فكأنما قام نصف ليلة ومن صلى الصبح في جماعة فكأنما صلى الليل كله .

(صحيح) (حم م) عن عثمان. (المشكاة ٦٣٠)

**١١٧٦- هەرکەس نوێژی عیشا بەکۆمەڵ بکات وەك ئەوەیە نیوەی شەوەکەی شەو نوێژی کردبێت، وە هەرکەس نوێژی بەیانیان بەکۆمەڵ بکات وەك ئەوە وایە هەموو شەوەکەی شەونوێژی کردبێت.**

١١٧٧- من صلى العشاء في جماعة كان كقيام نصف ليلة ومن صلى العشاء والفجر في جماعة كان كقيام ليلة.

(صحيح) (د ت) عن عثمان. (صحيح أبي داود ٥٦٤)

**١١٧٧- هەرکەس نوێژی خەوتنانی بە کۆمەڵ کردبێت، ئەوە وەك ئەوەیە نیوەی شەونوێژی کردبێت و وەهەرکەس نوێژی خەوتنانو بەیانی بەکۆمەڵ کردبێت ئەوە وەك ئەوەیە شەوێکی تەواو شەو نوێژی کردبێت.**

١١٧٨- من صلى لله أربعين يوما في جماعة يدرك التكبيرة الأولى كتب له براءتان براءة من النار وبراءة من النفاق .

(صحيح) (ت) عن أنس. (الضعيفة ٣٦٤)

**١١٧٨- هەر کەس چل ڕۆژ نوێژەکانی بەکۆمەڵ بکاتو فریای ( الله اكبر ) ی ركاتی یەکەم نوێژ دابەستن بکەوێت، ئەوە دوو بەری بوونی بۆ دەنوسرێت بەری بوون لەدۆزەخ وەبەری بوون لەدوو ڕوویی( نفاق ) .**

١١٧٩- و الذي نفسي بيده لقد هممت أن آمر بحطب فيحطب ثم آمر بالصلاة ليؤذن لها ثم آمر رجلا فيؤم الناس ثم أخالف إلى رجال فأحرق عليهم بيوتهم والذي نفسي بيده لو يعلم أحدهم أنه يجد عرقا سمينا أو مرماتين حسنتين لشهد العشاء .

(صحيح) (مالك خ ن) عن أبي هريره. (صحيح أبي داود ٥٧٧)

**١١٧٩- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە بەخەیاڵمدا هات فەرمان بکەم دار کۆبکرێتەوەو پاشان فەرمان بکەم بانگ بدرێت بۆ نوێژو پاشتر فرمان بکەم پیاوێك پێش نوێژی بکات بۆ خەڵكو پاشان بچم بۆ پیاوانێك وماڵەکانیان بەسەریاندا بسوتێنم سوێند بەموەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر یەکێکیان بیزانیایە ئێساقێکی گۆشتاوی یان پارچە گۆشتێکی چاکی دەست دەکەوێت ئامادەی نوێژی عیشا دەبوو.**

١١٨٠- انتعلوا وتخففوا وخالفوا أهل الكتاب.

(صحيح) (هب) عن أبي أمامة. (حجاب المرأة ص٩٣)

**١١٨٠- پێڵاووو (خوف) گۆرەوی ئەستوور لە پێ بکەن‌و ئێوە پێچەوانەی خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان بکەن. (ئەهلی کیتاب)** [1].

١١٨١- إنما مثل الذي يصلي ورأسه معقوص مثل الذي يصلي وهو مكتوف .

(صحيح) (حم م طب) عن ابن عباس. (صحيح أبي داود ٦٥٤)

**١١٨١- وێنەی ئەو کەسەی کەنوێژ دەکاتو قژی سەری بژو گیڤەڵ دەبێتو بە پەلکەکانی بەرز دەبێتەومن وەك ئەو کەسە وایە نوێژ بکاتو هەردوو دەستی کەلە پچە کرا بێت بە شانیەوە.**

١١٨٢- كان يصلي على الخمرة .

(صحيح) (خ د ن هـ) عن ميمونة. (صحيح أبي داود ٦٦٣)

**١١٨٢- پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر بەرماڵێکی بچوك نوێژی دەکرد.**

١١٨٣- كان يصلي على بساط .

(صحيح) (هـ) عن ابن عباس. (صحيح أبي داود ٦٦٥)

**١١٨٣- پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر حەسیرێك** [2] **نوێژی کردووە.**

١١٨٤- كان يصلي على راحلته حيثما توجهت به فإذا أراد أن يصلي المكتوبة نزل فاستقبل القبلة .

(صحيح) (حم ق) عن جابر. (المشكاة ١٣٤٠)

**١١٨٤- پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر وڵاخەکەی نوێژی دەکرد ڕووی لەهەر کوێ بوایە، وە کاتێ بیویستایە نوێژی فەرز بکات دادەبەزیو ڕووی لە رووگە دەکرد.**

---

[1] (مەبەست لە گاور و جولەکەیە)

[2] (البساط:الحصير ج١ ص٢٢ السراج المنير)

١١٨٥- كان يصلي في نعليه .

(صحيح) (حم ق ت) عن أنس. (الصحيحة ٢٩٤١)

**١١٨٥- پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە پێڵاوەكانیەوە نوێژی دەكرد.**

١١٨٦- لا غرار في صلاة ولا تسليم .

(صحيح) (حم د ك) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣١٨)

**١١٨٦- لەهیچ نوێژێكدا ساردو سڕی وكەم و كوری و نابێت هەبێت و هەروەها لەوەڵام دانەوەی سەلامیشدا.**[1]

١١٨٧-لا يصلين أحدكم وهو عاقص شعره.

(صحيح) (هـ) عن أبي رافع. (الصحيحة ٢٣٨٦)

**١١٨٧- باهیچ كەس لەئێوە نوێژ نەكاتو قژی سەری لە تەوقی سەری كۆمەڵ نەكات و پەلكەكانی بەدەوری سەریدا لول نەكات.**

١١٨٨- إذا أمن الإمام فأمنوا فإنه من وافق تأمينه تأمين الملائكة غفر له ما تقدم من ذنبه .

(صحيح) (مالك حم ق ٤ ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٨٦٦)

**١١٨٨- كاتێ پێش نوێژ (ئامین)ی كرد ئێوەش راستەوخۆ بەدوایدا ئامین بكەن، چونكە بەراستی (ئامین) كردنی هەر كەسێ لەگەڵ (ئامین)كردنی فریشتە یەكبگرێتەوە لەگوناهی پێشتری چاو پۆشی دەكرێت.**

١١٨٩- إذا أمن القارئ فأمنوا فإن الملائكة تؤمن فمن وافق تأمينه تأمين الملائكة غفر له ما تقدم من ذنبه .

(صحيح) (ن هـ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٢٦٣)

**١١٨٩- كاتێ پێش نوێژ ئامینی كرد ئێوەش بەدوایدا ئامین بكە، چونكە فریشتەكانیش ئامین دەكەن، بۆیە ئەگەر (ئامین)ی هەر كەس هاوكاتو یەكیگرت لەگەڵ (ئامین)ی فریشتە ئەوە لە گوناهی پێشتری چاو پۆشی دەكرێت.**

١١٩٠- إذا قال أحدكم في الصلاة آمين وقالت الملائكة في السماء آمين فوافقت إحداهما الأخرى غفر له ما تقدم من ذنبه .

(صحيح) (مالك ق ن) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٨٦٥)

---

[1] (ساردی لەنوێژدا جێبەجێ نەكردنی روكنەكانیەتی، وە لەسەلامیشدا وەڵام نەدانەوەیە وەك خۆی)

**١١٩٠- ئەگەر هەر یەك لەئێوە لەنوێژدا ووتی( ئامین ) وە فریشتەش لە ئاسماندا ووتیان،ئامین )و هەر یەك لەو دوو ( ئامینە ) یەکیان گرت لەگەڵ یەکتر ئەوە لە گوناهی پێشتری چاو پۆشی دەکرێت.**

١١٩١- أمنوا إذا قرئ { غير المغضوب عليهم ولا الضالين} .

(صحيح) (ابن شاهين في السنة) عن علي.

**١١٩١- ئامین بکەن کاتێ ( غير المغضوب عليهم ولا الضالين ) خوێنرا.**

١١٩٢ إن اليهود ليحسدونكم على السلام والتأمين .

(صحيح) (خط الضياء) عن أنس. (الصحيحة ٦٩١)

**١١٩٢- بەراستی جولەکە ( حەسودی ) ئێرەییتان پێ دەبەن لەسەر سەلام کردن و ئامین کردنتان.**

١١٩٣- كل صلاة لا يقرأ فيها بأم الكتاب فهي خداج .

(صحيح) (حم هـ) عن عائشة (حم هـ) عن ابن عمرو (هق) عن علي (خط) عن أبي أمامة.

**١١٩٣- هەموو نوێژێك كە ( فاتحە )ی تێدا نەخوێنرێت ئەوە نوێژێکی نوقسانە.**

١١٩٤- لم تحسدنا اليهود بشيء ما حسدونا بـ ( ثلاث ) التسليم والتأمين ( واللهم ربنا لك الحمد) .

(صحيح) (هق) عن عائشة. (الصحيحة ٦٩١)

**١١٩٤- جولەکە لەهیچ شتێکدا وێرەیی پێ نەبردووین بە قەدەر ئەوەی کە لەسەلام کردن بۆ یەکترو ( ئامین ) کردندا ئێرەییان پێ دەبەن.**

١١٩٥- من صلى صلاة لم يقرأ فيها بأم القرآن فهي خداج فهي خداج فهي خداج غير تمام .

(صحيح) (حم م ٤ ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٧٧٩)

**١١٩٥- هەر کەس نوێژێك بکات و سورەتی ( فاتحە )ی تێدا نەخوێنێت ئەو نوێژە ناتەواوە ئەو نوێژە ناتەواوە .. ئەو نوێژە ناتەواوەو تەواو نییە.**

١١٩٦- لا صلاة لمن لم يقرأ بأم القرآن فصاعدا .

(صحيح) (م د ن) عن عبادة بن الصامت. (الإرواء ٣٠٢)

**١١٩٦- لە ئێستا بەدواوە هەرکەس فاتحەی نەخوێند نوێژەکەی درووست نیە .**

١١٩٧- لا صلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب .

(صحيح) (حم ق ٤ ) عن عبادة. (الإرواء ٣٠٢)

**١١٩٧- نوێژی درووست نیە کەسێك فاتحەی قورئانی نەخوێند بێ .**

١١٩٨- أتموا الركوع والسجود فوالذي نفسي بيده إني لأراكم من وراء ظهري إذا ركعتم وإذا سجدتم .

(صحيح) (حم ق ن) عن أنس. (الصحيحة ٣١)

**١١٩٨- كرنوش و سوژدەكانتان بەجوانى ئەنجام بدەن، سويْند بەو كەسەى گيانى منى بەدەستە من لە پشتمەوە دەتانبينم كاتىٚ كرِنوش و سوژدە دەبەن.**

١١٩٩- إذا ركعت فضع كفيك على ركبتيك حتى تطمئن وإذا سجدت فأمكن جبهتك من الأرض حتى تجد حجم الأرض

(صحيح) (حم) عن ابن عباس. (الصحيحة ١٣٤٩)

**١١٩٩- كاتىٚ كرنوشت برد هەردوو ناولەپى دەستت لەسەر ئەژنۆكانت دابنىٚ تالاشەت لەجولْە دەكەويْت، وەكاتىٚ كرِنوشت برد نيْو چاوانت لەزەوى توند بكە بەرادەيەك هەست بە بەركەوتنى زەوى بكەيت.**

١٢٠٠- إذا سجد أحدكم فلا يبرك كما يبرك البعير وليضع يديه قبل ركبتيه .

(صحيح) (د ن) عن أبي هريرة. (الإرواء ٣٥٦)

**١٢٠٠- ئەگەر هەر يەك لەئيْوە سوژدەى برد باوەكو وشتر نەمۆلىٚ و چۆك دابدا، بەلْكو دەستى پيْش ئەژنۆكانى بخاتە سەر زەوى .**

١٢٠١- إذا سجد أحدكم فليعتدل ولا يفترش ذراعيه افتراش الكلب .

(صحيح) (حم ت هـ ابن خزيمة الضياء) عن جابر. (صحيح أبي داود ٨٣٤)

**١٢٠١- ئەگەر هەر يەكيْكتان سوژدەى برد بالاشەى ريْك رابگريْتو هەردوو باسكى رانەخاتە سەر زەوى هەروەك چۆن سەگ دەستى رادەخات لەسەر زەوى .**

١٢٠٢- إذا سجد العبد سجد معه سبعة آراب وجهه وكفاه وركبتاه وقدماه .

(صحيح) (حم م ٤ ) عن العباس (عبد بن حميد) عن سعد. (صحيح أبي داود ٨٣٠)

**١٢٠٢- مرۆڤ كاتىٚ سوژدە دەبات حەوت لە ئەندامەكانى لەشى لەگەلْيدا كرنوش دەبەن، روخسارى، هەردوو دەستى هەردوو ئەژنۆى ، هەردوو قاچى.**

١٢٠٣- إذا سجدت فضع كفيك وارفع مرفقيك .

(صحيح) (حم م) عن البراء . (صفة الصلاة ١٤٤)

**١٢٠٣- كاتىٚ سوژدەت برد هەردوو ناولەپى دەستت لەسەر زەوى دابنىٚو ئانيشكەكانت بەرزبكەرەوە.**

١٢٠٤- إذا صلى أحدكم فليتم ركوعه ولا ينقر في سجوده فإنما مثل ذلك كمثل الجائع يأكل التمرة والتمرتين فماذا يغنيان عنه .

(صحيح) (تمام ابن عساكر) عن أبي عبدالله الأشعري . (الترغيب ٥٢٨)

**١٢٠٤- ئەگەر هەر یەك لەئێوە نوێژی كرد با كرنوشی تەواو بباتو لە سوژدەا بردنیشدا دەنوك نەدات لە زەوی و خێرا هەستێتەوە، چونكە ئەوە وەك كەسێكی برسی وایە دەنكێك یان دوو دەنك خورما بخوات چ سودێكی پێ دەگەیەنێت؟.**

١٢٠٥- أسرق الناس الذي يسرق صلاته لا يتم ركوعها ولا سجودها وأبخل الناس من بخل بالسلام.

(صحيح) (طس) عن عبدالله بن مغفل. (الترغيب ٢٧١٥)

**١٢٠٥- دزترین كەس ئەو كەسەیە نوێژەكەی دەدزێ، بەوەی كە كرنوش و سوژدەكانی بە جوانیو تەواوی ناكات، وە پیسكەو رەزیلترین كەس ئەوەیە كە كە رەزیلی ورووژدی لە سەلام كردندا بكات.**

١٢٠٦- اعتدلوا في السجود ولا يبسط أحدكم ذراعيه انبساط الكلب .

(صحيح) (حم ق ٤ ) عن أنس. (الإرواء ٣٧١)

**١٢٠٦- لە كڕنوش بردندا پشتتان ڕێك بكەنەوە ، باهیچ كەس لەئێوە باڵەكانی لەكڕنوش بردندا ڕانەخات وەك ئەوەی سەگ دەستەكانی ڕادەخاتە بەسەر زەویدا .**

١٢٠٧- أعط كل سورة حظها من الركوع والسجود .

(صحيح) (ش) عن بعض الصحابة. (صفة الصلاة ١٠٣)

**١٢٠٧- هەموو سورەتێك دەیخوێنی مافی خۆی پێ بدە لە كرنوش و سوژدە بردندا.** [1]

١٢٠٨- أقرب ما يكون العبد إلى الله وهو ساجد .

(صحيح) (البزار) عن ابن مسعود. (صحيح أبي داود ٨١٩)

**١٢٠٨- نزیكترین حاڵەت كە مرۆڤ لەخوای گەورە نزیك بێت ئەو كاتەیە لە سوژدەدایە.**

١٢٠٩- أقرب ما يكون العبد من ربه وهو ساجد فأكثروا الدعاء.

(صحيح) (م د ن) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٨١٩)

**١٢٠٩- نزیكترین حاڵەت كە مرۆڤ لەخوای گەورە نزیك بێت ئەو كاتەیە لە سوژدەدایە كەواتە لەكاتی كڕنوشدا زۆر نزا بكەن.**

---

[1] (واتە چۆن لە ركوع و كڕنوش و سوژدەدا مل كەچی پیشان دەدەی دەبێ لە قورئان خوێندنیشدا بەهەمان شێوە بێت )

١٢١٠- أقيموا الركوع والسجود فوالله إني لأراكم من بعد ظهري إذا ركعتم وإذا سجدتم .

(صحيح) (ق) عن أنس. (المشكاة ٨٦٨)

**١٢١٠- كرنوش و سوژدەكانتان بە رێك وپێكی تەواو بكەن، سوێند بەخوا من لە پشتمەوە دەتانبینم كاتێ كرنوش و سوژدە دەبەن.**

١٢١١- أمر ابن آدم أن يسجد على سبعة أعظم .

(صحيح) (طب) عن ابن عباس. (االروض النضير ٣٩٨)

**١٢١١- فرمان كراوە بەمرۆڤ كەلەسەر حەوت پارچە ئێسقانی لاشەی كرنوش بەرێت.**

١٢١٢- أمرت أن أسجد على سبعة أعظم على الجبهة واليدين والركبتين وأطراف القدمين ولا نكفت الثياب ولا الشعر .

(صحيح) (ق د ن هـ) عن ابن عباس . (الإرواء ٣٠٩)

**١٢١٢- فرمانم پێ كراوە كە كرنوش بەرم لەسەر حەوت ئێسقان لەسەر روخسار، هەردوو دەست، هەردوو ئەژنۆ، قەراغی پەنجەكانی قاچ، وجلەكانی بەرمان كۆ نەكەینەوە و نەیانپێچین بەلاشەمانەوە قژی سەریشمان كۆ نەكەینەوە لەسەر سەرمان.**

١٢١٣- إن اليدين يسجدان كما يسجد الوجه فإذا وضع أحدكم وجهه فليضع يديه وإذا رفعه فليرفعهما .

(صحيح) (د ن ك) عن ابن عمر. (الإرواء ٣٠٢)

**١٢١٣- بەراستی هەردوو دەست كرنوش دەبەن وەك چۆن روخسار كرنوش دەبات، بۆیە هەریەك لە ئێوە كاتێ روخساری لەسەر زەوی دانا با دەستەكانیشی دابنێ ، وەكاتێ دەم و چاوی بەرز كردەوە با دەستەكانیشی بەرز بكاتەوە.**

١٢١٤- ضع أنفك ليسجد معك .

(صحيح) (هق) عن ابن عباس. (الصحيحة ١٦٤٤)

**١٢١٤- لوتت بخە سەر زەوی با لە گەڵ تۆ كرشنوش بەرێ.**

١٢١٥- كان إذا أراد أن يدعو على أحد أو يدعو لأحد قنت بعد الركوع .

(صحيح) (خ) عن أبي هريرة. (المشكاة ١٢٨٨)

**١٢١٥- پێغەمبەری خوا(ﷺ) كاتێ بیویستایە دۆعا لە كەسێك بكات یان بۆ كەسێك بپارێتەوە لە پاش كرنوش و دوعای قنوتی دەخوێند.**

١٢١٦- كان إذا رفع رأسه من الركوع في صلاة الصبح في آخر ركعة قنت .

(صحيح) (محمد بن نصر) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٠٧١)

**١٢١٦- پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ سەر بەرزبکردایەتەوە لە کرنوش لەنوێژی بەیانیاندا لە رکاتی دووهەمدا قنوتی دەخوێند.**[1]

١٢١٧- كان إذا ركع سوى ظهره حتى لو صب عليه الماء لاستقر .

(صحيح) (هـ) عن وابصة (طب) عن ابن عباس وأبي برزة وأبي مسعود. (الروض ٧٨)

**١٢١٧- پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ کرنوشی ببردایە پشتی رێك دەکردەوە هەتا ئەگەر ئاو برژێنرایە بەسەر پشتی ئاوەکە لەسەر پشتی دەوەستا.**

١٢١٨- كان إذا ركع فرج أصابعه وإذا سجد ضم أصابعه .

(صحيح) (ك هق) عن وائل بن حجر. (صحيح أبي داود ٨٠٩)

**١٢١٨- پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ کرنوشی ببردایە پەنجەکانی دەستی بڵاو دەکردەوە، وەکاتێ سوژدەی ببردایە پەنجەکانی دەلکاند بەیەکەوە.**

١٢١٩- كان إذا ركع قال سبحان ربي العظيم وبحمده - ثلاثا - وإذا سجد قال سبحان ربي الأعلى وبحمده — ثلاثا .

(صحيح) (د) عن عقبة بن عامر. (صحيح أبي داود ٨١٥)

**١٢١٩- پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ کرنوشی ببردایە سێ جار ئەیفەرموو** (سبحان ربى العظيم وبحمده) **وە کاتێ سوژدەی ببردایە سێ جار ئەیفەرموو** (سبحان ربى الأعلى وبحمده).

١٢٢٠- كان إذا سجد جافى حتى يرى بياض إبطيه .

(صحيح) (د) عن جابر. (صحيح أبي داود ٨٣٥)

**١٢٢٠- پێغەمبەری خوا((ﷺ)) کاتێ سوژدەی دەبرد هەردوو ئانیشکی بڵاودەکردەوە بەرادەیەك سپیایی بنباڵی دەبینرا.**

١٢٢١- كان إذا كان راكعا أو ساجدا قال سبحانك وبحمدك أستغفرك وأتوب إليك .

(صحيح) (طب) عن ابن مسعود. (الصحيحة ٢٠٨٤)

**١٢٢١- پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ کرنوش یا سوژدەی دەبرد بردبایە ئەیفەرموو (سبحانك وبحمدك استغفرك واتوب اليك) واتە پاكو بێگەردی سوپاس بۆ تۆ ئەی پەروەردگار، داوای لێخۆش بوونت لێ دەەمو دەگەرێمەوە لای تۆ.**

---

[1] **(کۆتا جار لەنێوان قنوت خوێندنو نەخوێندندا ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) وازی لەخوێندنی هێناوە لە نوێژی بەیانیاندا)**

١٢٢٢- لكل سورة حظها من الركوع والسجود .

(صحيح) (حم) عن رجل. (صفة الصلاة ١٠٣)

**١٢٢٢- هەموو پارچەیەكی لاشەر لە كرنوش و سوژدەدا پشكی هەیە.**

١٢٢٣- الذي لا يتم ركوعه وينقر في سجوده مثل الجائع يأكل التمرة والتمرتين لا يغنيان عنه شيئا.

(صحيح) (تخ) عن أبي عبدالله الأشعري. (الترغيب ٥٢٨)

**١٢٢٣- ئەو كەسەی پەلە دەكات كرنوشی تەاوو نابات و لە سوژدە بردنیشدات دەنوك لە زەوی دەدات، وەك كەسی برسی وایە دەنكێك یا دوو دەنك خورما بخوات، بێگومان هیچ سودێكیان بۆ برسی نییەو كەڵكی پێ ناگەیەنن.**

١٢٢٤- نهى عن الإقعاء في الصلاة .

(صحيح) (ك هق) عن سمرة. (الصحيحة ١٦٧٠)

**١٢٢٤- پێغەمبەری خوا(ﷺ) قەدەغەی كردووە لە هەڵتروشكان[1] و دەستوقاچ پێكەوە نوستاندن لە نوێژدا.[2]**

١٢٢٥- نهى عن الإقعاء والتورك في الصلاة .

(صحيح) (حم هق) عن أنس. (الصحيحة ١٦٧٠)

**١٢٢٥- پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەهی كردووە لە هەڵتروشكانو خۆ پێكەوە نوستاندنوەلەسەر رانو سمت دانیشتن لە نوێژدا.[3]**

١٢٢٦- نهى عن نقرة الغراب وافتراش السبع وأن يوطن الرجل المكان في المسجد كما يوطن البعير .

(صحيح) (حم د ن هـ ك) عن عبدالرحمن بن شبل. (الصحيحة ١١٦٨)

**١٢٢٦- پێغەمبەری خوا(ﷺ) قەدەغەی كردووە لەدەنوك لێدانی قەلەرەش و[4] دەست راخستنی حەیوانی دڕندەوە[1] مرۆڤ شێونێكی تایبەت لە مزگەوت بگرێت و هەمیشە لەوێدا نوێژ بكات[2] وەك چۆن حوشتر دەیگرێت بە شوێنێكەوە.**

---

[1] (چیچكە كردن: فەرهەنگی خاڵ لاپەرە ٥١٣)

[2] (شێخی ئەلبانی دەڵێت: مەبەست لە (اقعاء) دەستو قاچ پێكەوە نوستاندنە لە نوێژدا وەك چۆن سەگ دەستی لە زەویدا رادەخات)

[3] ((تورك) لەسەر رانو سمت دانیشتن لە تەحیاتی دووەمدا سوننەتە بەلام لەكاتەكانی تردا نابێت)

[4] (مەبەست لە دەنوك لێدانی قەلەرەش پەلەپەل كردنە لە سوژدە بردندا وەك چۆن قەلەرەشە بە پەلە دەنوك دەدات لە خواردن)

١٢٢٧- لا تجزئ صلاة الرجل حتى يقيم ظهره في الركوع والسجود .

(صحيح) (د ت) عن أبي مسعود. (المشكاة ٨٧٨)

**١٢٢٧- نوێژى مرۆڤ دروست نييه هەتا پشتى رێك نەكات لەكاتى كرنوش و سوژده بردندا.**

١٢٢٨- لا تجزئ صلاة لا يقيم الرجل فيها صلبه في الركوع والسجود .

(صحيح) (حم ن هـ) عن أبي مسعود. (المشكاة ٨٧٨)

**١٢٢٨- نوێژێك دروست نييه هەتا مرۆڤ تێيدا پشتى رێك نەكاتەوه لە كرنوش و سوژده بردندا.**

١٢٢٩- يا علي لا تقع إقعاء الكلب .

(صحيح) (هـ) عن علي. (صحيح أبي داود ٨٣٨)

**١٢٢٩- ئەى عەلى! خۆت رامەخە لە نوێژدا وەك چۆن سەك خۆى رادەخات.** [٣]

١٢٣٠- يا معشر المسلمين لا صلاة لمن لا يقيم صلبه في الركوع والسجود.

(صحيح) (هـ) عن علي بن شيبان. (صحيح أبي داود ٨٠١)

**١٢٣٠- ئەى كۆمەڵى موسڵمانان نوێژى كەسێك درووست نيه كە پشتى رێك نەكات لە كرنوش و سوژده بردندا.**

١٢٣١- يعمد أحدكم فيبرك في صلاته كما يبرك الجمل .

(صحيح) ( ٣ ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٧٨)

**١٢٣١- بۆ كەسى واتان هەيه دەچێ بۆ سوژده و دەمۆڵێ وەكو چۆن وشتر دەمۆڵێ.**

١٢٣٢- إذا صليت فلا تبسط ذراعيك بسط السبع وادعم على راحتيك وجاف مرفقيك عن ضبعيك .

(صحيح) (طب) عن ابن عمر. (الإرواء ٣٧٢)

**١٢٣٢- كاتێ نوێژت كرد باسكەكانت رامەخە لەسەر زەوى وەك ئاژەڵى دڕنده بەڵكو خۆت بده بەسەر هەردوو ناو دەستتدا و ئانيشكەكانت بەرزو دوور بخەرەوه لەهەردوو تەنيشتت.**

---

[١] (مەبەست لێ ى نوێژ خويچن و هەردوو ئانيشكى بنوسێنى بەسنگيەوه لەكاتى كرنوش بردندا )

[٢] (مەبەست لێ ى نوێژ خوێن شوێنێك ديارى بكات بۆ خۆى لە مزگەوتداو تەنها لەوێدا نوێژ بكاتو نەگوێزێتەوه شوێنێكى تر! )

[٣] ( پێغەمبەرى خوا(ﷺ) ئامۆژگارى سەعدى كرد كاتێ بينى بە دوو پەنجە لە تەحياتدا شەهادەت دەخوێنێ و دۆعا دەكات )

١٢٣٣- أحد أحد .

(صحيح) (د ن ك) عن سعد (ت ن ك) عن أبي هريرة. (المشكاة ٩١٣)

**١٢٣٣- بەیەك پەنجە ..... بەیەك پەنجە.** [١]

١٢٣٤- أحد يا سعد .

(صحيح) (حم) عن أنس. (المشكاة ٩١٣)

**١٢٣٤- ئەی سەعد بەیەك پەنجە.**

١٢٣٥- إذا صلى أحدكم فليبدأ بتحميد الله تعالى والثناء عليه ثم ليصل على النبي ثم ليدع بعد بما شاء .

(صحيح) (د ت حب ك هق) عن فضالة بن عبيد. (صحيح أبي داود ١٣٣١)

**١٢٣٥- ئەگەر یەكێكتان نوێژی كرد باسوپاس و ستایش و سەنای پەروەردگار دەست پێ بكاتو پاشان سەلاوات لە سەر پێغەمبەر بداتو پاشان هەر دۆعایەكی دەوێت بیكات.**

١٢٣٦- بين كل ركعتين تحية .

(صحيح) (هق) عن عائشة. (صحيح أبي داود ٧٥٢)

**١٢٣٦- لەنێوان هەردوو دوو ركاتێكدا تەحیاتێك هەیە.**

١٢٣٧- حولها ندندن .

(صحيح) (د) عن بعض الصحابة (هـ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٧٥٧)

**١٢٣٧- ئێمەش بەدەورو بەری ئەوەدا دەسوڕێینەوە.** [٢]

١٢٣٨- صلوا علي واجتهدوا في الدعاء وقولوا اللهم صل على محمد وعلى آل محمد وبارك على محمد وآل محمد كما باركت على إبراهيم وآل إبراهيم إنك حميد مجيد .

(صحيح) (حم ن ابن سعد سمويه البغوي الباوردي ابن قانع طب) عن زيد بن خارجة. (أصل صفة الصلاة ٩٢١\٣)

**١٢٣٨- سەلاواتم لەسەر بدەنو خۆتان ماندوو بكەن لەنزا كردنداو بڵێن: خوایە سەلاوات لەسەر موحەممەداو (ئالوبەیتی)خانەوادەی بدە، وە خوایە فەڕو پیرۆزی**

---

[١] (پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامۆژگاری سەعدی كرد كاتێ بینی بەدوو پەنجە لە تەحیاتدا شەهادەت دەخوێنێتو دۆعا دەكات)

[٢] (كابرایەك لەبەرخۆیەوە قسەی دەكردو دەپارایەوەو داوای بەهەشتی دەكردو پەنای لە دۆزەخ دەگرت پێغەمبەریش فەرمووی ئێمەش هەر بەدەوری ئەوەدا دەسوڕێینەوە) .

**بەسەر موحەممەدو خانەوادەی موحەممەددا برژێنە هەروەك چۆن فەڕو بەرەکەتت بەسەر ئیبراهیم‌و (ئالوبەیتی) خانەوادەی ئیبراهیمدا رژاند، بەراستی پەروەردگارا تۆ شایستەی سوپاس‌و شکۆداری‌و پلە پایەیت.**

١٢٣٩- علام تُومِئُون بأيديكم كأنها أذناب خَيْلٍ شُمْسٍ وإنما يكفي أحدكم أن يضع يده على فخذه ثم يسلم على أخيه من على يمينه وشماله .

(صحيح) (م) عن جابر بن سمرة . (صحيح أبي داود ٩١٦)

**١٢٣٩- ئەوە لەبەر چی بە دەستان هێما دەکەن هەر دەڵێی کلکی ئاژەڵی مۆزی کردووە[١] بەڵکو ئەوەندە بەسەر کە هەر یەك لەئێوە دەستی لەسەر ئەژنۆی دابنێ‌و پاشان سەلام بکات لە براکەی بەلای راستییەوە و پاشان لای چەپی .**

١٢٤٠- عجلت أيها المصلي إذا صليت فقعدت فاحمد الله بما هو أهله ثم صل علي ثم ادعه .

(صحيح) (ت ن) عن فضالة بن عبيد. (المشكاة ٩٣٠)

**١٢٤٠-ئەی نوێژ خوێن پەلەت کرد! کاتێ نوێژت کردو پاشان دانیشتیت سوپاسی پەرەردگار بکە بە جوانترین شێوە کە شایستەیە و پاشان سەلاوات لەسەر من بدەو ئینجا دەست بە نزا کردن بکە.**

١٢٤١- في كل ركعتين التحية .

(صحيح) (م) عن عائشة . (صحيح أبي داود ٧٥٢)

**١٢٤١- لەهەموو دوو رکاتێکدا تەحیات هەیە.**

١٢٤٢- قولوا اللهم صل على محمد وعلى آل محمد كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم وآل إبراهيم إنك حميد مجيد .

(صحيح) (حم ق د ن هـ) عن كعب بن عجرة. (الإرواء ٣١٩)

**١٢٤٢- بڵێن: خوایە سەلاوات‌و رێز و بەزەیی بنێرە بۆ سەر موحەممەدو خانەوادەی موحەممەد هەر وەك چۆن سەلاوات و رەحمەت نارد بۆ سەر ئیبراهیم‌و خانەوادەی ئیبراهیم خوایە فەڕ و پیرۆزی برژێنە بەسەر موحەممەد و خانەوادەی ئیبراهیمدا بەراستی تۆ ئەی پەروەردگار شایستەی سوپاس‌و ستایش و شکرداری‌و پلەو پایەیت.**

---

[١] (واتە ئاژەڵێك کە لە رەو جیا بووبێتەوە و چەموش بێت و مۆزی کردبێت و رابکات و کلکی راوەشێنێ ) .

١٢٤٣- قولوا اللهم صل على محمد وعلى أزواجه وذريته كما صليت على إبراهيم وبارك على محمد وعلى أزواجه وذريته كما باركت على إبراهيم إنك حميد مجيد .

(صحيح) (حم ق د ن هـ) عن أبي حميد. (صحيح أبي داود ٩٠٠)

**١٢٤٣- بڵێن: خوایە سەڵاوات و بەزەیت بڕژێنە بەسەر موحەممەدو بەسەر خێزانەکان و نەوەکانیدا هەر وەك چۆن سەڵاوات و بەزەیت ڕژاند بەسەر ئیبراهیمدا وە فەڕو بەرەکەت بڕژێنە بەسەر موحەممەدو بەسەر خێزانەکانی و نەوەکانیدا هەر وەك چۆن فەڕو بەرکەتت ڕژاند بەسەر ئیبراهیمدا، بەراستی تۆ ئەی پەروەردگار شایستەی ستایش و شکۆداریت.**

١٢٤٤- قولوا اللهم صل على محمد النبي الأمي وعلى آل محمد كما صليت على آل إبراهيم وبارك على محمد النبي الأمي كما باركت على آل إبراهيم في العالمين إنك حميد مجيد والسلام كما قد علمتم .

(صحيح) (م ٣ ) عن أبي مسعود الأنصاري. (صحيح أبي داود ٩٠١)

**١٢٤٤- بڵێن: پەروەردگارا سەڵاوات و بەزەیت بڕژێنە بەسەر موحەممەدی پێغەمبەری نەخوێندەواردا ، هەروەها بەسەر خانەوادەی موحەممەدا، هەروەك چۆن سەڵاوات و بەزەیت ڕژاند بەسەر ئیبراهیمدا، وە خوایە فەڕو پیرۆزیت بڕژێنە بەسەر موحەممەدی پێغەمبەری نەخوێندەواردا، هەروەك چۆن فەڕو پیرۆزیت ڕژاند بەسەر خانەوادەی ئیبراهیمدا لەگشت و جیهانەکاندا بەراستی ئەی پەروەردگار تۆ سوپاسکراو و خاوەن شکۆداری بەزەیت، وە سەلام کردنیش بەو شێوەیە کەفێر بوون.**

١٢٤٥- قولوا اللهم صل على محمد عبدك ورسولك كما صليت على إبراهيم وبارك على محمد وآل محمد كما باركت على إبراهيم وآل إبراهيم .

(صحيح) (حم خ ن هـ) عن أبي سعيد. (فضل الصلاة ٦٦)

**١٢٤٥- بڵێن: پەروەردگارا سەڵاوات و بەزەیت بڕژێنە بەسەر موحەممەدی بەندەو پەیامبەری خۆتدا، هەروەك چۆن سەڵاوات و بەزەیت ڕژاند بەسەر ئیبرهیمدا، وە فەڕ پیرۆزیت بڕژێنە بەسەر موحەممەدو خانەوادەی موحەممدا، هەروەك چۆن فەڕو پیرۆزیت ڕژاند بەسەر ئیبراهیم و خانەوادەی ئیبراهیمدا.**

١٢٤٦- ما بال الذين يرمون بأيديهم في الصلاة كأنها أذناب الخيل الشمس ألا يكفي أحدكم أن يضع يده على فخذه ويسلم عن يمينه وشماله .

(صحيح) (حم د ن) عن جابر بن سمرة. (صحيح أبي داود ٩١٦)

**١٢٤٦- ئەوە ئەو كەسانە چيانە و بۆ وادەكەن لە نوێژدا دەستيان بەرز دەكەنەوەو فڕێ دەدەن دەڵێی كلكی ئاژەڵی چەمووشە كە مۆز دەكات ئايا بەس نييە بۆ هەريەكێكتان دەستی لەسەر ئەژنۆی دابنێ و سەلام بەلای راستو چەپيدا بداتەوە؟**

١٢٤٧- ما شأنكم تشيرون بأيديكم كأنها أذناب خيل شمس إذا سلم أحدكم فليلتفت إلى أصحابه ولا يومئ بيده .

(صحيح) (م ن) عن جابر بن سمرة. (صحيح أبي داود ٩١٨)

**١٢٤٧- ئەوە چيتانە بەدەستتان ئاماژە دەكەن ئەڵێی كلكی ئاژەڵی چەمووشە كە مۆزی كردووە ئەگەر هەركەس لەئێوە سەلامی دايەوە با بەلای هاوەڵەكەيدا لابكاتەوە نەك بەدەستی ئاماژە بكات.**

١٢٤٨- ما لي أراكم رافعي أيديكم كأنها أذناب خيل شمس اسكنوا في الصلاة .

(صحيح) (حم م د ن) عن جابر بن سمرة. (صحيح أبي داود ٩١٨)

**١٢٤٨- ئەوە چييە ئەتانبينم دەستتان بەرزكردۆتەوە ئەڵێی كلكی ئاژەڵی چەمووشە لەنوێژدا مەجوڵێن.**

١٢٤٩- نهى أن يجلس الرجل في الصلاة وهو معتمد على يده اليسرى وقال إنها صلاة اليهود.

(صحيح) (ك هق) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ٩١١)

**١٢٤٩- پێغەمبەری خوا(ﷺ) قەدەغەی كردووە لە مرۆڤ كەلەنيوژدا دابنيشێتو خۆی بخات بەسەر دەستی چەپيدا وەفەرمويەتی :ئەو شێوازە نوێژی جولەكەيە.**

١٢٥٠- لا تقولوا السلام على الله فإن الله هو السلام ولكن قولوا التحيات لله والصلوات والطيبات السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين فإنكم إذا قلتم ذلك أصاب كل عبد في السماء والأرض أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله ثم يتخير من الدعاء أعجبه إليه فيدعو به .

(صحيح) (حم ق د ن هـ) عن ابن مسعود. (الإرواء ٣١٨)

**١٢٥٠- مەڵێن: (سەلام ) لەسەر خوای گەورە، چونكە خوای گەورە خۆی سەلامە بەڵكو بڵێن: هەموو رێز لێنان و سكالاكان بۆ پەروەردگارە هەروەها نوێژو درودو پاكو بێگەردی هەر بۆ ئەوە، سڵاوو رێز لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر لەگەڵ بەزەيیو فەڕ و پيرۆزی پەروەردگار، سەلام لەسەر ئێمەشو سەرجەم بەندە چاكەكانی خودا، جا ئەگەر ئێوە ئەمەتان ووت ئەوە وەبەرهەموو بەندەيەك دەكەوێت لە ئاسمانو زەويدا ، پاشان**

**بلێن بريار ئەدەم و دەرى ئەبرم كە هيچ پەرستراوێك بە حەق نييە جگە لە( الله ) ومشايەتيش بريار ئەدەم و دەرى دەبرم كە موحەممەد بەندەو پەيامبەرى پەروەردگارە، ئينجا كام دۆعاو نزاى پێخۆشە هەڵيبژێرێتو بيكات.**

١٢٥١- إذا أدرك أحدكم سجدة من صلاة العصر قبل أن تغرب الشمس فليتم صلاته وإذا أدرك سجدة من صلاة الصبح قبل أن تطلع الشمس فليتم صلاته .

(صحيح) (خ ن) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٦٦)

**١٢٥١- ئەگەر هەر يەك لەئێوە فرياى سوژدەيەك كەوت لەنوێژى عەسر پێش ئاوابوونى خۆر با نوێژكەى تەواو بكات، وە ئەگەر فرياى سوژدەيەك كەوت لەنوێژى بەيانيياندا پێش ئەوەى خۆر هەڵبێت باى نوێژەكەى تەواو بكات.**

١٢٥٢- إذا أدرك أحدكم سجدة من صلاة العصر قبل أن تغرب الشمس فليتم صلاته وإذا أدرك سجدة من صلاة الصبح قبل أن تطلع الشمس فليتم صلاته .

(صحيح) (خ ن) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٥٢)

**١٢٥٢- هەر كەس فرياى ركاتێك لەنوێژى عەسر كەوت پێش ئەوەى خۆر ئاوا بێت ئەوە فرياى نوێژى عەسر كەوتوە.وە هەركەس فرياى ركاتێك لەنوێژى بەيانى كەوت پێش ئەوەى خۆر هەڵبێت ئەوە فرياى نوێژى بەيانى كەوتوە،**

١٢٥٣- من أدرك ركعة من الصلاة مع الإمام فقد أدرك الصلاة .

(صحيح) (حم م) عن أبي هريرة . (صحيح أبي داود ١٠٢٦)

**١٢٥٣- هەركەس فرياى ركاتێك لەنوێژ لەگەڵ پێش نوێژ بكەوێت ئەوە فرياى هەموو نوێژەكەى كەوتووە.**

١٢٥٤- من أدرك من الصلاة ركعة فقد أدرك الصلاة .

(صحيح) (ق ٤ ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ١٠٢٦)

**١٢٥٤- هەركەس لەنوێژدا فرياى ركاتێك بكەوێت، ئەوە فرياى هەموو نوێژكەى كەوتووە.**[1]

١٢٥٥- من أدرك من صلاة ركعة فقد أدركها .

(صحيح) (ن) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ١٠٢٦)

**١٢٥٥- هەركەس فرياى ركاتێكى نوێژى بەيانى بكەوێت بێگومان فرياى نوێژ كەوتووە.**

[1] **( واتە فرياى ( ركوع )كرنوش بكەوێت لە ركاتێكدا )**

١٢٥٦- من صلى ركعة من الصبح ثم طلعت الشمس فليصل الصبح .

(صحيح) (ك) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٥٠)

**١٢٥٦- هەركەس فریای ركاتێك لەنوێژی بەیانی بكەوێت و پاشان خۆر هەڵبێت با نوێژەكەی تەواو بكات.**[1]

## بابەتی جم و جوڵ لەنوێژدا

١٢٥٧- إذا صلى أحدكم فخلع نعليه فلا يؤذ بهما أحدا ليجعلهما بين رجليه أو ليصل فيهما .

(صحيح) (د حب ك هق) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٦٦٢)

**١٢٥٧- ئەگەر یەكێكتان دەستی بەنوێژ كردو دوایی نەعلەكانی داكەند با بە نەعلەكانی ئەزیەتی كەس نەدات، با لەنێوان هەردوو قاچی دایان بنێت یان نوێژیان پێوە بكات.**

١٢٥٨- إذا صلى أحدكم فلا يبصق بين يديه ولا عن يمينه وليبصق عن يساره أو تحت قدمه .

(صحيح) (حم حب) عن جابر (ن) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٤٩٧)

**١٢٥٨- ئەگەر هەر یەك لەئێوە نوێژی كرد باتف و بەڵغەم فڕێ نەداتە بەردەمی و لای راستی بەڵكو فڕێی بداتە لای چە پی یان ژێر قاچییەوە.**

١٢٥٩- إذا صلى أحدكم فلا يضع نعليه عن يمينه ولا عن يساره فتكون عن يمين غيره إلا أن لا يكون عن يساره أحد وليضعهما بين رجليه .

(صحيح) (د ك هق) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٦٦٢)

**١٢٥٩-ئەگەر یەكێكتان نوێژی كرد با پێڵاوەكانی( نەعلەكانی )دانەنێت لەلای راست و لای چە پیەوە كەلای راستی خەڵكی دەكات،مەگەر لای چە پی كەسی لێ نەبێت یان بیا نخاتە نێوان قاچییەوە.**

١٢٦٠- إذا جاء أحدكم إلى المسجد فلينظر فإن رأى في نعليه قذرا أو أذى فليمسحه وليصل فيهما .

(صحيح) (د) عن أبي سعيد. (الإرواء ٢٨٤)

**١٢٦٠- ئەگەر یەكێكتان هات بۆ مزگەوت باسەیری (نەعەلەكانی) پێڵاوەكانی بكات، گەر بینی پیسیەك یان شتێكی ئەزیەت دەری پێوە بوو با بیسڕێتو نوێژیان پێوە بكات.**

---

[1] (واتە ركاتی دوەمیش بكاتو بەحازر بۆی دەنوسرێت)

١٢٦١- إذا صليت فلا تبزقن بين يديك ولا عن يمينك ولكن ابزق تلقاء شمالك إن كان فارغا وإلا فتحت قدمك اليسرى وادلكه .

(صحيح) (حم ٤ حب ك) عن طارق بن عبدالله المحاربي. (الصحيحة ١٢٢٣)

**١٢٦١- گەر نوێژت كرد تفـو بەڵغەم فڕێ مەدە بەردەمی خۆت یان لای راستت، بەڵكو فڕێی بدە لای چەپت گەر كەسی لێ نەبوو، ئەگینا بیكە ژێر قاچی چەپت‌و بیشارەوە.** [1]

١٢٦٢- إذا قام أحدكم إلى الصلاة فلا يبزق أمامه فإنما يناجي الله تبارك وتعالى ما دام في مصلاه ولا عن يمينه فإن عن يمينه ملكا وليبصق عن يساره أو تحت قدمه فيدفنها .

(صحيح) (حم خ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٩٧٤)

**١٢٦٢- ئەگەر یەكێكتان هەستا بۆ نوێژ كردن باتف و بەڵغەم فڕێ نەداتە بەردەمی چونكە ئەو گفتوگۆو نزا لەگەڵ پەروەردگار دەكات، مادەم لەشوێن نوێژكەیدا بێت، وەبا فڕێی نەداتە لای راستیشی چونكە بەڵكو با فڕێی بداتە لای چەپی یان ژێر قاچی و بیشارێتەوە لە زەویدا.**

١٢٦٣- إذا كان أحدكم يصلي فلا يبصق قبل وجهه فإن الله قبل وجهه إذا صلى .

(صحيح) (مالك ق ن) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٢٧٤)

**١٢٦٣- ئەگەر یەكێكتان نوێژی كرد باتف‌و بەڵغەم فڕێ نەداتە بەردەمی، چونكە خوای گەورە روو بەروویەتی كاتێ نوێژ دەكات.**

١٢٦٤- أما يخشى أحدكم إذا رفع رأسه في الصلاة أن لا يرجع إليه بصره .

(صحيح) (حم م هـ) عن جابر بن سمرة.

**١٢٦٤- ئایا یەكێكتان ناترسێت كاتێ لەنوێژدا سەری بەرز دەكاتەوە خوای گەورە چاوەكانی بۆ نەگێرێتەوە ؟** [2]

١٢٦٥- إن أحدكم إذا قام في صلاته فإنه يناجي ربه وإن ربه بينه وبين القبلة فلا يبزقن أحدكم قبل قبلته ولكن عن يساره أو تحت قدمه .

(صحيح) (ق) عن أنس. (الصحيحة ١٢٢٣)

---

[1] (شێخ مەناوی ئەڵێت: تفـو بەڵغەم فڕێ دانە ژێر قاچ‌و شاردنەوەی لەخۆڵدا بۆ سەردەمی پێغەمبەر بووە كە ناو مزگەوتەكان خۆڵ‌و لم بوون، بەڵام كاتێ بە قوڕ سواخ درابن یان كۆنكرێت و كاشی بن، ئەوە نابێت بخرێتە ژێر قاچەوە چونكە زیاتر مزگەوت پیس دەكات‌و پیس كردنی مزگەوتیش حەرامە )

[2] (واتە چاوەكانی بەرزكاتەوە بۆ ئاسمان یان وتراوە پێ ئیمام لە ركوعدا سەر بەرزبكاتەوە )

**١٢٦٥- ئەگەر یەکێکتان هەستاو نوێژی دابەست، ئەوە بێگومان لەگەڵ پەروەردگار گفتوگۆ دەکاتو پەروەدگار لەنێوان ئەوو رووگەدایە بۆیە دروست نییە هیچ کام لەئێوە تفو بەڵغەم روو بە رووگە فڕێ بدات بەڵکو فڕێی بداتە لای چەپی یان ژێر قاچییەوە.**

١٢٦٦- إن أحدكم إذا قام يصلي إنما يناجي ربه فلينظر كيف يناجيه .

(صحيح) (ك) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٦٠٣)

**١٢٦٦- بێگومان یەکێکتان کاتێ هەڵدەستێت نوێژ دەکات ئەوە لەگەڵ پەروەردگاریدا بە پەنهانی رازوو نیاز دەکات، جابابزانێ چۆن لەگەڵ خودا رازوو نیاز دەکات؟**

١٢٦٧- إن أحدكم إذا كان في الصلاة فإن الله قبل وجهه فلا يتنخمن أحد منكم قبل وجهه في الصلاة .

(صحيح) (حم خ د هـ) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ٤٩٨)

**١٢٦٧- بەراستی هەر یەکێکتان کاتێ نوێژی دابەست بێگومان خوای گەورە بەرەورویەتی، بۆیە نابێت هیچ کام لەئێوەلە نوێژدا تفو بەڵغەم فڕێ بداتە بەردەمی.**

١٢٦٨- إن أحدكم إذا كان في صلاته فإنه يناجي ربه فلا يبزقن بين يديه ولا عن يمينه ولكن عن يساره وتحت قدمه .

(صحيح) (ق) عن أنس. (الصحيحة ٣٩٧٤)

**١٢٦٨- بەراستی هەر یەکێکتان لەنوێژدا بوو بێگومان لەگەڵ خوای گەورەدا بە پەنهانی رازو نیاز دەکات، بۆیە نابێت تف و بەڵغەم فڕێ بداتە بەردەمی یان لای راستی خۆی، بەڵکو بیکاتە لای چەپی یان بیکاتە ژێر قاچییەوە.**

١٢٦٩- إن في الصلاة شغلا .

(صحيح) (ش حم ق د هـ) ابن مسعود. (صحيح أبي داود ٨٥٦)

**١٢٦٩- بێگومان لەنوێژدا سەرقاڵی هەیە.** [1]

١٢٧٠- إن الله أحدث في الصلاة أن لا تكلموا إلا بذكر الله وما ينبغي لكم وأن تقوموا لله قانتين .

(صحيح) (ن) عن ابن مسعود. (صحيح أبي داود ٨٥٧)

**١٢٧٠- بێگومان خوای گەورە لەنوێژدا ئەوەندە شتی دیاری کردووەو داهێناوە کە ئێوە جگە لە یادی خوداو ئەوەی بۆتان دیاری کراوە هیچی تر نەڵێن و درووست نیە ئەو شتانە لە کاتێکدا بۆ خوا بە مل کەچی وەستاوی.**

---

[1] ((مەبەست سەرقاڵی بەقورئان خوێندنو تەسبیحات کردنو دۆعاوەیە نەک قسەکردن))

١٢٧١- إن الله يحدث من أمره ما يشاء وإن الله قد أحدث أن لا تكلموا في الصلاة .

(صحيح) (حم د ن هق) عن ابن مسعود. (صحيح أبي داود ٨٥٧)

**١٢٧١- خوای گەورە ئەوەی کە بیەوێت لەفرمانو بڕیاری خۆی دایدەهێنێت بێگومان خوای گەروە وای دا ناوە کە ئێوە لەنوێژدا قسە نەکەن.**

١٢٧٢- إن هذه الصلاة لا يصلح فيها شيء من كلام الناس إنما هو التسبيح والتكبير وقراءة القرآن.

(صحيح) (حم م د ن) عن معاوية بن الحكم. (الإرواء ٣٨٩)

**١٢٧٢- بەراستی ئەم نوێژە ناگونجێت هیچ شتێك لە قسەی خەڵکی تێکەڵ بکرێت بەڵکو هەموی سبحان الله والله اکبرو قورئان خوێندنە.**

١٢٧٣- إنه لم يمنعني أن أرد عليك إلا أني كنت أصلي .

(صحيح) (م) عن جابر. (صحيح أبي داود ٨٥٩)

**١٢٧٣- هیچ ڕێگای لێ نەگرتم لەوەی وەڵامت بدەمەوە[1] ئەوەندە نەبێت من لەنوێژدا بووم.**

١٢٧٤- أيسر أحدكم أن يبصق في وجهه إن أحدكم إذا استقبل القبلة فإنما يستقبل ربه عز وجل والملك عن يمينه فلا يتفل عن يمينه ولا في قبلته وليبصق عن يساره أو تحت قدمه فإن عجل به أمر فليتفل هكذا - يعني في ثوبه.

(صحيح) (د) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ٤٩٩)

**١٢٧٤- ئایا هەرکەس لەئێوە پێی خۆشە تفو بەڵغەم بکرێتە نێو چاوانی؟ هەریەك لەئێوە کاتێ ڕوو لەڕووگە دەکات ئەوە ڕووی لە پەروەردگاری کردووە وفریشتەش لای ڕاستیەوەیەتی، بۆیە نابێت تف لەلای ڕاستیو لە ڕووی ڕووگە بکات، بەڵکو تفو بەڵغەم لای چەپیو ژێر قاچی بکات، وە ئەگەر زۆری بۆهات بابەم شێوە بکات واتە بیکاتە نێو جلەکانی.[2]**

١٢٧٥- التثاؤب في الصلاة من الشيطان فإذا تثاءب أحدكم فليكظم ما استطاع .

(صحيح) (ت حب) عن أبي هريرة. (المشكاة ٩٨٥)

**١٢٧٥-باوێشك لە نوێژدا لە شەیتانەوەیە جا ئەگەر یەکێکتان باوێشکی دا با بەگوێرەی توانا کپی بکاتەوە.**

---

[1] ( لە کاتێکدا فەرمووی کە کەسێك سەلامی لێ کرد ئەویش سەلامی خوای لەسەر بێت لە نوێژدا بوو )

[2] ( واتە :بیکاتە دەستەسر یان خاولی یان پارچە جلێکی )

١٢٧٦- التثاؤب من الشيطان فإذا تثاءب أحدكم فليرده ما استطاع فإن أحدكم إذا قال ها ضحك منه الشيطان .

(صحيح) (ق) عن أبي هريرة. (المشكاة ٤٧٣٢)

**١٢٧٦-باويَشك له شه‌يتانه‌وه‌يه جا ئه‌گه‌ر يه‌كيَكتان باويَشكى دا با بيگيَريَته‌وه، به‌راستى ئه‌گه‌ر يه‌كيَكتان له كاتى باويَشكدا بلىَ ها، شه‌يتان پيَى پىَ ده‌كه‌نيَت.**

١٢٧٧- خالفوا اليهود فإنهم لا يصلون في نعالهم ولا خفافهم .

(صحيح) (د ك هق) عن شداد بن أوس. (المشكاة ٧٦٥)

**١٢٧٧-به پيَچه‌وانه‌ى جوله‌كه‌وه بكه‌ن بيَگومان ئه‌وان به پيَلاَو (خوف)گۆره‌ويه‌وه نويَژ ناكه‌ن.**

١٢٧٨- صلوا في نعالكم ولا تشبهوا باليهود .

(صحيح) (طب) عن شداد بن أوس.

**١٢٧٨- به (نه‌عله‌وه) پيَلاَوه‌وه نويَژ بكه‌ن و خۆتان مه‌چويَنن به جوله‌كه‌وه.**

١٢٧٩- كان يشير في الصلاة .

(صحيح) (حم) عن أنس. (الصحيحة ٣١٨١)

**١٢٧٩- پيَغه‌مبه‌ر سه‌لات و سه‌لامى خواى له‌سه‌ر بيَت له نويَژدا هيَماى ده‌كرد.** [1]

١٢٨٠- لتسون الصفوف أو لتطمسن الوجوه ولتغضن أبصاركم أو لتخطفن أبصاركم .

(صحيح) (حم طب) عن أبي أمامة. (الترغيب ٥٤٩)

**١٢٨٠-يان ده‌بىَ ريزه‌كانتان ريَك بكه‌ن يان روخسارتان كويَر ده‌كه‌ينه‌وه،يان ده‌بىَ چاوتان له حه‌رام بگرن يان رووناكى چاوتان ده‌بريَت.**

١٢٨١- لينتهين أقوام يرفعون أبصارهم إلى السماء في الصلاة أو لا ترجع إليهم أبصارهم .

(صحيح) (حم م د هـ) عن جابر بن سمرة. (صحيح أبي داود ٨٤٦)

**١٢٨١-خه‌لَكانيَك ده‌بىَ واز بيَنن له چاو به‌رزكردنه‌وه له نويَژدا بۆ ئاسمان يان رووناكى چاويان بۆ ناگه‌ريَته‌وه.**

١٢٨٢- ما أحب أن أسلم على الرجل وهو يصلي ولو سلم علي لرددت عليه.

(صحيح) (الطحاوي) عن جابر. (الصحيحة ٢٢١٢)

---

[1] (واته به ده‌ست يان به‌سه‌ر هيَماو ئاماژه‌ى ده‌كرد واته بۆ فه‌رمان كردن به چاكه‌و قه‌ده‌غه‌كردنى خراپه و وه‌لاَم دانه‌وه‌ى سه‌لام)

**١٢٨٢- پێم خۆش نیە سەلام لە هیچ کامێکتان بکەم کە لە نوێژدا بێت بەڵام ئەگەر ئەو سەلامی لێ بکات وەڵامی دەدەمەوە.**

١٢٨٣- ما بال أقوام يرفعون أبصارهم إلى السماء في صلاتهم لينتهن عن ذلك أو لتخطفن أبصارهم.

(صحيح) (حم خ د ن هـ) عن أنس. (صحيح أبي داود ٨٤٧)

**١٢٨٣-ئەو خەڵكانێك چیانە لە نوێژدا چاویان بەرەو ئاسمان بەرز دەكەنەوە یان دەبێ واز لەو كارە بێنن یان چاویان دەفرێنین( كوێری دەكەین )**

١٢٨٤- نهينا عن الكلام في الصلاة إلا بالقرآن والذكر .

(صحيح) (طب) عن ابن مسعود . (الصحيحة ٢٣٨٠)

**١٢٨٤-لە نوێژدا لێمانی قەدەغە كراوە قسە بكەین تەنها قورئان و یادی خوا نەبێت.**

١٢٨٥- لا ترفعوا أبصاركم إلى السماء في الصلاة أن تلتمع .

(صحيح) (هـ طب) عن ابن عمر. (الترغيب ٥٤٨)

**١٢٨٥-لە نوێژدا چاوتان بەرز مەكەنەوە بەرەو ئاسمان با كوێر نەبن.**

١٢٨٦- لا تمسح وأنت تصلي فإن كنت لا بد فاعلا فواحدة تسوية الحصى .

(صحيح) (د) عن معيقيب. (صحيح أبي داود ٨٧٢)

**١٢٨٦-لە نوێژدا دەست بە لەشتا مەهێنە و میخورێنە ئەگەر هەر ناچار بوی یەكجار وەكو رێكخستنی بەرد.**

## بابەتی كەسێ نوێژی بچێت

١٢٨٧- إن الله تعالى قبض أرواحكم حين شاء وردها عليكم حين شاء يا بلال قم فأذن في الناس بالصلاة.

(صحيح) (حم خ د ن) عن أبي قتادة. (صحيح أبي داود ٤٦٥)

**١٢٨٧- خوای گەورە ( ڕووحەكانتان )ڕووحەكانتان دەكێشێ هەركات بیەوێت، وە بۆشتان دەگێڕێتەوە هەركات بیەوێت، ئەی بیلال هەستە بانگ بدە بۆ نوێژ**[1]

[1] ئەوانەی لە دۆڵەكەدا خەویان لێ كەوت و نوێژی بەیانیان چوو كە بەخەبەر هاتن پێغەمبەر سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت فەرمووی ئەی بیلال بانگ بدە كەواتە بانگ بۆ نوێژە فەوتاو دەدرێت.السراج المنير ج١ ص٢٣٤ )

١٢٨٨- ألا رجل يتصدق على هذا فيصلي معه .

(صحيح) (حم د حب ك) عن أبي سعيد. (الإرواء ٥٢٨)

**١٢٨٨- ئایا پیاوێك نی یە خێر بەم كەسە بكات و نوێژی لەگەڵدا بكات.**

١٢٨٩- تحولوا عن مكانكم الذي أصابتكم فيه الغفلة .

(صحيح) (د هق) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٤٦٣)

**١٢٨٩- بگوازنەوە لەو جێگایەی كەتێیدا بێ ئاگا بوون.**[1]

١٢٩٠- ليأخذ كل رجل برأس راحلته فإن هذا منزل حضرنا فيه الشيطان .

(صحيح) (حم م ن) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٦٤)

**١٢٩٠- با هەموو كەسێك (ڕەشوە) هەوساری وولاخەكەی خۆی بگرێت، چونكە لەم جێگایەدا شەیتان لەگەڵماندا ئامادەبوو.**

١٢٩١- ليس في النوم تفريط إنما التفريط في اليقظة أن تؤخر صلاة حتى يدخل وقت صلاة أخرى .

(صحيح) (حم حب) عن أبي قتادة. (صحيح أبي داود ٤٦٨)

**١٢٩١- لەكاتی خەودا مرۆڤ بەكەمتەرخەم ناژمێژمێردرێ، بەڵكو كەمتەر خەمی و خەم ساردی لەكاتی بەئاگا بووندایە كە نوێژ داو بخرێ تا كاتی نوێژێكی تر دێتە پێشەوە.**

١٢٩٢- من نسي صلاة أو نام عنها فكفارتها أن يصليها إذا ذكرها .

(صحيح) (حم ق ت ن) عن أنس. (صحيح أبي داود ٤٦٨)

**١٢٩٢- هەر كەس نوێژێكی لەیاد چوو یان خەوی لێكەوت و نەیكرد هیچ (كەفارەتێكی) قەرەبوو نی یە ئەنجام دانی نەبێت.**

١٢٩٣- من نسي صلاة فليصلها إذا ذكرها لا كفارة لها إلا ذلك .

(صحيح) (د ت هـ) عن أنس. (صحيح أبي داود ٤٦٨)

**١٢٩٣-هەر كەس نوێژێكی لەیاد چوو با كە بیریكەوتەوە بیكات و هیچ (كەفارەت) قەرەبوویەكی نیە ئەوە نەبێت.**

[1] (مەبەست خەبەر نەبونەوە بوو بۆ نوێژی بەیانی)

# بـابـەتـی نوێژ خوێن چی دەڵێت لە پاش نوێژ

١٢٩٤- اقرأ المعوذات في دبر كل صلاة .

(صحيح) (د حب) عن عقبة بن عامر. (الصحيحة ١٥١٤)

**١٢٩٤- هەر دوو ( معوذتين ) بخوێنە لە پاش هەموو نوێژێكەوە.** [1]

١٢٩٥- أمرنا بالتسبيح في أدبار الصلوات ثلاثا وثلاثين تسبيحة وثلاثا وثلاثين تحميدة وأربعا وثلاثين تكبيرة .

(صحيح) (طب) عن أبي الدرداء.

**١٢٩٥- فرمانمان پێ كراوە بە( تەسبيحات ) كردن لە پاش هەموو نوێژێكەوە بەسی وسێ ( سبحان الله ) وە سی وسێ ( الحمد لله ) وە سی و سێ ( الله أكبر ) كردن.**

١٢٩٦- ألا أحدثكم بأمر إن أخذتم به أدركتم من قبلكم ولم يدرككم من بعدكم وكنتم خير من أنتم بين ظهرانيه إلا من عمل مثله تسبحون وتحمدون وتكبرون خلف كل صلاة ثلاثا وثلاثين .

(صحيح) (ق) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٣٠٨)

**١٢٩٦- ئايا شتێكتان پێ بڵێم گەر جێ بەجێ بكەن پاداشتی ئەوانەی لە پێش خۆتان دەست بكەوێت و ئەوانەش لەدوای ئێوەوە دێن پێتان نەگەنەوە، وە ئێوە باشترين تاقم و كۆمەڵ دەبن لەنێوانياندا مەگەر يەكێك وەك ئەوەی ئێمەوە بكات؟ سبحان الله و الحمدلله و الله اكبر لە پاش هەموو نوێژێكەوە سی وسێ جار بڵێن.**

١٢٩٧- ألا أخبركم بأمر إذا فعلتموه أدركتم من قبلكم وفتم من بعدكم تحمدون الله في دبر كل صلاة وتسبحونه وتكبرونه ثلاث وثلاثين وثلاث وثلاثين وأربعا وثلاثين .

(صحيح) (هـ) عن أبي ذر (الصحيحة ١١٢٥)

**١٢٩٧- ئايا ئاگادارتان بكەمەوە لەئيشێك كاتێ جێبەجێتان كرد، دەبنە خاوەنی پاداشتی ئەوانەی پێش خۆتان و ئەوانەی دوای خۆشتان پێتان ناگەنەوە؟ ( الحمدلله ) بكەن لەدوای هەموو نوێژێكەوە پاشان ( سبحان الله ) وە ( الله اكبر ) سی وسێ جار و بەسی و سێ جار بەسی و چوار جار.**

---

[1] ( واتە :هەردوو سورەتی ( الفلق-الناس ) بخوێنە لە دوای سەلام دانەوەت لە هەموو نوێژێك )

١٢٩٨- ألا أعلمكم شيئا تدركون به من سبقكم وتسبقون به من بعدكم ولا يكون أحد أفضل منكم إلا من صنع مثل ما صنعتم تسبحون وتكبرون وتحمدون في دبر كل صلاة ثلاثا وثلاثين مرة.

(صحيح) (حم م) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٣٠٨)

**١٢٩٨- ئایا شتێکتان فێربکەم، پێ ی بگەنە خەڵکانی پێش خۆتـان، وە بەمەش پێشی خەڵکانی دوای خۆتـان بدەنەوە ،و هیچ کەسێك لـە ئێوە باشتر نـەبێت مەگـەر بەهـەمان ئیشی ئێـوەی کردبێـت؟ ( سـبحان الله و الله اکـبر و الحمـدلله ) بکـەن لـەدوای هـەموو نوێژێکەوە سی وسێ جار.**

١٢٩٩- خصلتان لا يحافظ عليهما عبد مسلم إلا دخل الجنة ألا وهما يسير ومن يعمل بهما قليل يسبح الله في دبر كل صلاة عشرا ويحمده عشرا ويكبره عشرا فذلك خمسون ومائة باللسان وألف وخمسمائة في الميزان ويكبر أربعا وثلاثين إذا أخذ مضجعه ويحمده ثلاثا وثلاثين ويسبح ثلاثا وثلاثين فتلك مائة باللسان وألف في الميزان فأيكم يعمل في اليوم والليلة ألفين وخمسمائة سيئة .

(صحيح) (حم خد ٤ ) عن ابن عمرو. (المشكاة ٢٤٠٦)

**١٢٩٩- دوو ئیش و کردار هەن هیچ موسوڵمانێك نی یە پابەنـد بێت پێیانـەومو نەچێتە بەهەشتەوە، بێگومان ئەو دوو ئیشە ئاسـانن و ئـەوەی هەڵدەستێ پێیـان کـەم دەکـەوێ لەسەری، لەدوای هەموو نوێژێکەوە دە جار سبحان الله وە دە جار الحمدلله و ە دە جـار الله اکبر بکات ئەوە دەکاتە ١٥٠ جار بەزمان و ١٥٠٠ هەزار و پێنج سەد جـار لەتـەرازوودا بـۆی دەنوسرێ ، وە سی و چوار جار ( الله اکبر ) بکات کاتێ چویە جێگای خەو، لەگەڵ سی وسێ جار ( الحمدلله ) وە سی و سێ جار ( سبحان الله ) ئەوەیە زمـان دەکاتـە سـەد ( ١٠٠ ) جـار وە لـە تـەرازووی کردەوەکانیـدا دەکـات هـەزار ( ١٠٠٠ ) جـار، کەواتـە کـێ لـەئێوە لـە شـەوو ڕۆژێکدا دوو هەزار و پێنج سەد ( ٢٥٠٠ ) تـاوان دەکـات...**

١٣٠٠- سبقكن يتامى بدر ولكن سأدلكن على ما هو خير لكن من ذلك تكبرن الله على إثر كل صلاة ثلاثا وثلاثين تكبيرة وثلاثا وثلاثين تسبيحة وثلاثا وثلاثين تحميدة ولا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير.

(صحيح) (د) عن أم الحكم بنت الزبير. (الصحيحة ١٨٨٢)

**١٣٠٠- هەتیوەكانی جەنگی بەدر پێش ئێوە كەوتن[1] ، بەڵام شتێكی باشترتان نیشانتان ئەدەم كە لەو خزمەتكارانە باشتربێت، لەدوای هەموو نوێژێكەوە سی و سێ ( ٣٣ ) جار الله أكبر بكەن، وەسی و سێ ٣٣ جار سبحان الله بكەن، وە سی و سێ جار الحمدلله بكەن لە پاشدا كۆتایی پێ بهێنن بە شایەتی دان بەوەی كە ( هیچ پەرستراوێك بەحەق نی یە جگە لە ( الله ) بێ هاوبەش و موڵك و دەسەڵاتە و سوپاس تەنها بۆ ئەوەو بێ گومان ئەو بەسەر هەموو شتێكدا بالأدەستە.**

١٣٠١- كان إذا انصرف انحرف .

(صحيح) (د) عن يزيد بن الأسود. (صحيح أبي داود ٦٢٧)

**١٣٠١- پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ لەنوێژ لێ دەبوونەوە ڕووی وەردەچەرخان[2] .و( ڕووی لە نوێژ خوێنەكان دەكرد )**

١٣٠٢- كان إذا انصرف من صلاته استغفر ثلاثا ثم قال اللهم أنت السلام ومنك السلام تباركت يا ذا الجلال والإكرام .

(صحيح) (حم م ٤ ) عن ثوبان. (الصحيحة ٢٠٧٤)

**١٣٠٢- پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ لەنوێژ لێ دەبوویەوە سێ جار ( أستغفر الله )ی دەكرد و پاشان ئەیفەرموو ( خوایە تۆ هێمن و ئاشتیت، وەئاسایش و هێمنی لەتۆوە سەرچاوە دەگرێ و دەردەچێ، بەرزی و بڵندی بۆ تۆ ئەی خاوەنی شكۆمەندی و ڕێزگرتن ).**

١٣٠٣- كان إذا سلم لم يقعد إلا بمقدار ما يقول اللهم أنت السلام ومنك السلام تباركت يا ذا الجلال والإكرام.

(صحيح) (م ٤ ) عن عائشة. (الصحيحة ٢٠٧٤)

**١٣٠٣- پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ سەلامی نوێژی دابایەوە دانەدەنیشت مەگەر بەئەندازەی ئەوەی كە ئەیفەرموو ( خوایە تۆ هێمن و ئاشتین، وە ئاسایش و هێمنی لەتۆوە سەرچاوە دەگرێ و دەردەچێ، بەرزی و بڵندی بۆتۆ ئەی خاوەنی شكۆمەندی و دەسەڵات و ڕێزگرتن.**

---

[1] ( ئەوە وەڵام بوو بۆ فاطمەی كچی ام الحكم كاتی هاتنە خزمەتی پێغەمبەر و داوای كەنیزەكیان لێ كرد بۆ خزمەت كردنی ماڵ و كارەكەی پێغەمبەریش (ﷺ) پێشتر ئەو كەنیزەكانەی دابەش كردبوو بەسەر ئەو هەتیوانەی كە باوكیان لە جەنگی بەدردا شەهید بووبوون. )

[2] ( مەبەست لەوەیە بە لای ڕاستیدا یان چەپیدا وەردەگەڕاو ئاوری لە نوێژ خوێنەكان ئەدایەوە ، ئەمەش بۆ پێش نوێژ سوننەتە )

١٣٠٤- كان إذا صلى الغداة جلس في مصلاه حتى تطلع الشمس .

(صحيح) (حم م ٣ ) عن جابر بن سمرة. (صحيح أبي داود ١١٧١)

**١٣٠٤- پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ نوێژی بەیانیانی دەکرد لەشوێنی نوێژەکەی دادەنیشت هەتا خۆر هەڵدەهات.**

١٣٠٥- كان ينصرف من الصلاة عن يمينه .

(صحيح) (ع) عن أنس.

**١٣٠٥- پێغەمبەری خوا ﷺ كە لەنوێژ لێ بووموە بە لای ڕاستیدا دەرۆیشت.**

١٣٠٦- معقبات لا يخيب قائلهن ثلاث وثلاثون تسبيحة وثلاث وثلاثون تحميدة وأربع وثلاثون تكبيرة في دبر كل صلاة مكتوبة .

(صحيح) (حم م ت ن) عن كعب بن عجرة. (الصحيحة ١٠٢)

**١٣٠٦- چەند ووشیەك هەیە بەدوای یەكدا دێن و هەر كەس بیانڵێت بێ ئومێد و شكست خواردوو نابێت، سی وسێ (٣٣) جار (سبحان الله) وە سی و سێ جار (الحمدلله) و سی وچوار جار (الله اكبر)، لە پاش هەموو نوێژێكی (فەرزموە) پێویستەوە.**

١٣٠٧- من سبح الله في دبر كل صلاة ثلاثا وثلاثين وحمد الله ثلاثا وثلاثين وكبر الله ثلاثا وثلاثين فتلك تسع وتسعون وقال تمام المائة لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير غفرت خطاياه وإن كانت مثل زبد البحر.

(صحيح) (حم م) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٠١)

**١٣٠٧- هەر كەس لە دوای هەموو نوێژێكەوە سی و سێ جار(سبحان الله) بكات وە سی وسێ جار(الحمدلله) بكات وە سی وسێ جار (الله اكبر) بكات، ئەوە دەكاتە (نەوەدو نۆ جار) و بۆ جاری سەدهەم بڵێ (هیچ پەرستراوێك نی یە بە حەق جگە لە (الله)ی تاك و تەنها و بێ هاوبەش، هەموو موڵك و دەسەڵات و سوپاس و ستایشێك شایستەی ئەومو تەنها بەسەر هەموو شتێكدا بالا دەستە، ئەوە چاوپۆشی لەگوناهەكانی كراوە با بە ئەندازەی كەفی سەردەریاش گوناهی كرد بێت.**

١٣٠٨- من قال في دبر صلاة الفجر وهو ثاني رجليه قبل أن يتكلم لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد يحيي ويميت وهو على كل شيء قدير عشر مرات كتب له عشر حسنات ومحي عنه عشر سيئات ورفع له عشر درجات وكان يومه ذلك كله في حرز من كل مكروه وحرس من الشيطان ولم ينبغ لذنب أن يدركه في ذلك اليوم إلا الشرك بالله عز وجل.

(صحيح) (ت هـ) عن أبي ذر. (الترغيب ٤٧٢)

**١٣٠٨- هەر کەس لە پاش نوێـژی بـەیانیان کـاتێ لەسـەر ئـەژنۆی دانیـشێت و پـێش ئـەوەی قـسە لەگەڵ کەسدا بکات دە جار بڵێ: هیچ پەرسـتراوێك نـی یـە جگـە لـە ( الله ) ی تـاك و تـەنها و بـێ هاوبـەش، هـەموو موڵـك و دەسـەڵات و سوپاسـێك شایـستەی ئـەومو تـەنها خـوای گەورەیـە، گیانلەبەران دەژێنێ و دەمرێنێ، بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێکدا بالآدەستە، خوای میهرەبان دە چاکەی بۆ دەنوسێت و دە گوناهی لەسەر دەسڕێتەوەو، دە پلەشی بـۆ بـەرز دەکاتـەوە، ئـەو ڕۆژەش تاکۆتـایی دێت پارێزراو دەبێت لەهەموو نارەحەتیەك و پـارێزراو دەبێـت لەشـەیتانیش، وە هـیچ گوناهێکیش ناتوانێ زیانی پێ بگەیەنێت لەو ڕۆژەدا مەگەر شەریك بۆ خودا ( جل جلاله ) دانان.**

١٣٠٩- يا معاذ والله إني لأحبك أوصيك يا معاذ لا تدعن في دبر كل صلاة أن تقول اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك .

(صحيح) (حم د ن حب ك) عن معاذ بن جبل . (صحيح أبي داود ١٣٦٢)

**١٣٠٩- ئەی مەعـاژ! سوێند بەخوای گەورە خۆشم دەوێـت، ئامۆژگـاریـت دەکـەم ئـەی معـاژ لە پاش هەموو نتوێژێکـەوە ومز لـەم دوعـایـە مەهێنـەو بیڵـێ، خوایـە گیـان پـشتم بگـرە لەسەر یادی خۆت و سوپـاس و ستایشی خۆت و جوان بەندایەتی کردن بۆ تۆ.**

## بابەتی سوجدەی سەهو چەند شتێکی تر

١٣١٠- إذا سها أحدكم في صلاته فلم يدر واحدة صلى أو اثنتين فليبن على واحدة فإن لم يدر ثلاثا صلى أو أربعا فليبن على ثلاث وليسجد سجدتين قبل أن يسلم.

(صحيح) (ت) عن عبدالرحمن بن عوف. (الصحيحة ١٣٥٦)

**١٣١٠- ئەگەر یەکێکتـان سەهوی کرد لەنوێژەکەیداو نەیزانی یەك ڕکاتی کـردووە یـا دوو یەکەکە حیساب بکات، وە ئەگەر نەیزانی دوو ڕکاتی کردوە یا سێ یـا ڕکاتەکـە حیـساب بکات وە ئەگەر نەیزانی سێ ڕکاتی کردووە یـا چـوار یـا سـێ ڕکاتـە کـە حیـساب بکـات و پێش ئەوەی سەلام بداتەوە دوو سوژدە بەرێت.**

١٣١١- إذا شك أحدكم في الاثنتين والواحدة فليجعلها واحدة وإذا شك في الاثنتين والثلاث فليجعلها اثنتين وإذا شك في الثلاث والأربع فليجعلها ثلاثا حتى يكون الوهم في الزيادة ثم ليتم ما بقي من صلاته ثم يسجد سجدتين وهو جالس قبل أن يسلم .

(صحيح) (حم هـ ك هق) عن عبدالرحمن بن عوف. (الصحيحة ١٣٥٦)

**١٣١١- ئەگەر هەر یەکێکتان گومانی هەبوو دوو ڕکاتی کردووە یا یەك یا یەکەکە دابنێت وە ئەگەر گەومانی هەبوو دوو ڕکاتی کردووە یا سێ با دووانە دابنێت، وە ئەگەر گومانی هەبوو چوار ڕکاتی کردووە یا سێ بە سێ یەکە دابنێت، بۆ ئەوەی گومان زیادەکە بێت، پاشان ئەوەندەی کەماوەیەتی لەنوێژەکەی باتەواوی بکات و پاشان دوو سوژدە ببات پێش ئەوەی سەلام بداتەوە.**

١٣١٢- إذا شك أحدكم في صلاته فلم يدر اثنتين صلى أو ثلاثا فليلق الشك وليبن على اليقين .

(صحيح) (هق) عن أنس. (الصحيحة ١٣٥٦)

**١٣١٢- ئەگەر یەکێکتان گومانی پەیدا کردن ئایا دوو ڕکات نوێژی کردووە یا سێ، با گومانەکەی فڕێ بدات و لەسەر دڵنیایی ئیش بکات.**

١٣١٣- إذا شك أحدكم في صلاته فلم يدر كم صلى ثلاثا أم أربعا فليطرح الشك وليبن على ما استيقن ثم ليسجد سجدتين قبل أن يسلم فإن كان صلى خمسا شفعن له صلاته وإن كان صلى إتماما لأربع كانتا ترغيما للشيطان .

(صحيح) (حم م د ن هـ) عن أبي سعيد. (الإرواء ٤١٠)

**١٣١٣- ئەگەر یەکێکتان گومانی پەیدا کردو نەیزانی سێ ڕکاتی کردووە یا چوار؟ با واز لەگومانەکەی بهێنێت و ئیش لەسەر (یەقین) دڵنیایی بکات، پاشان دوو سوژدە ببات پێش ئەوەی سەڵامك بداتەوە جا ئەگەر پێنج ڕکاتی کرد بوو نوێژەکەی بۆ دەبێت بەجووت، وە ئەگەر بۆ تەواکاری چوار ڕکاتەکە کردی ئەوە ئەو دوو ڕکاتە زیادەیە دەبنە لوت شکاندنی شەیتان.**

١٣١٤- إذا شك أحدكم في صلاته فليلق الشك وليبن على اليقين فإن استيقن التمام سجد سجدتين فإن كانت صلاته تامة كانت الركعة نافلة والسجدتان نافلة وإن كانت ناقصة كانت الركعة تمام الصلاة والسجدتان ترغمان أنف الشيطان .

(صحيح) (حب ك) عن أبي سعيد. (الصحيحة ١٣٥٦)

**١٣١٤- ئەگەر یەکێکتان گومانی هەبوو لەنوێژکەی، با گومانەکەی فڕێ بدات و لەسەر دڵنیایی کار بکات، جا ئەگەر دڵنیا بوو کەنوێژەکەی تەواو کرد رکاتەکەی بە سونەت و دوو سوژدەکەی بە سوننەت بۆ دادەنرێت بە دوو سوننەت بۆی حساب دەکرێ لەگەڵ سوژدەکان، وە ئەگەر نوێژەکەی ناتەواوە بوو ئەوە بەو ڕکاتە تەاوی کردووە و سوژدەکان دەبنە لوت شکانی شەیتان.**

١٣١٥- إذا صلى أحدكم فلم يدري كيف صلى فليسجد سجدتين وهو جالس .

(صحيح) (ت هـ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ١٣٦٢)

**١٣١٥- ئەگەر یەکێکتان نوێژی کردو نەیزانی چەندی کردووە با لە شوێنی خۆیدا دوو سوژدە ببات.**

١٣١٦- إن الشيطان يأتي أحدكم في صلاته فيلبس عليه حتى لا يدري كم صلى فإذا وجد ذلك أحدكم فليسجد سجدتين وهو جالس قبل أن يسلم ثم يسلم .

(صحيح) (ت هـ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٩٤٥)

**١٣١٦-بێگومان شەیتان دێتە لای هەریەك لەئێوە لەنوێژکەیدا دەیەوێ لێ ی تێك بدات ومنەزانێ چەند ڕکاتی کردووە؟ جا گەر هەر کەس لەئێوە حاڵەتی وای بینی باکاتێ لەسەر ئەژنۆ دانیشتوە دوای تەحیات خوێندن دوو سوژدە ببات، پێش ئەوەی سەلام بداتەوە.**

١٣١٧- إن أحدكم إذا قام يصلي جاء الشيطان فلبس عليه حتى لا يدري كم صلى فإذا وجد ذلك أحدكم فليسجد سجدتين وهو جالس .

(صحيح) (مالك ق د ن) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٩٤٣)

**١٣١٧- هەر یەکێکتان کاتێ هەستا نوێژ بکات و شەیتان هات و ویستی لێ ی تێك بدات نەزانێ چەند ڕکاتی کردووە؟ جا هەر لەئێوە شتی وای بینی با لەدوای تەحیات دوو سوژدە ببات.**

١٣١٨- إذا سها الإمام فاستتم قائما فعليه سجدتا السهو وإذا لم يستتم قائما فلا سهو عليه .

(صحيح) (طب) عن المغيرة. (الإرواء ٤٠٨)

**١٣١٨- ئەگەر پێش نوێژ سەهوی کرد و لەکاتی هەستانەوەدا ڕێك وەستا ئەوە دەبێ دوو سوجدەی سەهو ببات، بەڵام گەر نەگەشتە ئاستی وەستانی ڕێك ئەو سوژدەی سەهوی لەسەر نی یە.**

١٣١٩- إذا قام الإمام في الركعتين فإن ذكر قبل أن يستوي قائما فليجلس فإن استوى قائما فلا يجلس ويسجد سجدتي السهو

(صحيح) (حم د هـ هق) عن المغيرة. (صحيح أبي داود ٩٤٩)

**١٣١٩- ئەگەر پێش نوێژ لە ڕکاتی دووەم دا هەستایەوە جا ئەگەر پێش ئەوەی ڕێك بوەستێ بیری کەوتەوە با دانیشێتەوە ، بەلام ئەگەر ڕێك وەستا با نەگەڕێتەوە بۆ تەحیات خوێندن و پاشان دوو سوژدە ببات[1] .**

---

[1] مەبەست لەوەیە گەر لە ڕکاتی دووەم تەحییات خوێندنی بیر چوو و هەستایەوە جا گەر لە دانیشتنەوە نزیك بوو ئەوە بگەڕێتەوە بۆ تەحیات خوێندن وە گەر لە وەستانەوە نزیك بوو با نەگەڕێتەوە بۆ خوێندنی تەحیات و پاشتر دوو سوژدە ببات لە بری خوێندنی تەحیاتەکەی)

١٣٢٠- إنما أنا بشر أنسى كما تنسون فإذا نسي أحدكم فليسجد سجدتين وهو جالس .

(صحيح) (حم هـ) عن ابن مسعود. (الإرواء ٣٣٨)

**١٣٢٠- بێگومان من مرۆڤم و شتم لە یاد دەچێت هەروەك چۆن ئێوە شتتان لە یاد دەچێت ، جا گەر هەر كەس لە ئێوە شتێكی لە نوێژ لە یاد چوو با دوو سوژدەی سەهوو ببات كاتێك لە تەحیاتا دانیشتووە.**

١٣٢١- إنه لو حدث في الصلاة شيء لنبأتكم به ولكن إنما أنا بشر مثلكم أنسى كما تنسون فإذا نسيت فذكروني وإذا شك أحدكم في صلاته فليتحر الصواب فليتم عليه ثم ليسجد سجدتين.

(صحيح) (ق د ن هـ) عن ابن مسعود. (الإرواء ٤٠١)

**١٣٢١- بێگومان گەر گۆڕانكاریە لە نوێژدا ڕوویدات پێتان دەڵێم ، بەڵام منیش مرۆڤێكم وەك ئێوە شتم لە بیر دەچێت ، چۆن ئێوە شتان لە بیر دەچێت ، بۆیە گەر هەرچیم لەبیر چوو یادم بخەنەوە ، وە گەر هەركەس لە ئێوە گومانی هەبوو چەند ڕكاتی كردووە با لانی كەمی حساب بكات و نوێژی ڕێك و تەواو بكات و پاشان دوو سوژدە ببات.**

١٣٢٢- التسبيح للرجال والتصفيق للنساء .

(صحيح) (حم) عن جابر. (صحيح أبي داود ٨٦٧)

**١٣٢٢- سبحن الله بۆ پیاوان [1] دەوترێ و چەپڵەش بۆ ژنان [2] .**

١٣٢٣- يا أيها الناس ما لكم حين نابكم شيء في الصلاة أخذتم في التصفيق إنما التصفيق للنساء من نابه شيء في صلاته فليقل سبحان الله فإنه لا يسمعه أحد حين يقول سبحان الله إلا التفت .

(صحيح) (خ) عن سهل بن سعد. (صحيح النسائي ٧٨٤)

**١٣٢٣- ئەی خەڵكینە !! ئەوە چیتانە كاتێ شتێكتان توشهات لە نوێژدا دەست دەكەن بە چەپڵەلێدان؟ با بزانن چەپڵە ( ناو لەپ دان لە پشتی دەست ) بۆ ژنانە گەر هەریەك لە ئێوە حاڵەتێكی وای بینی لە نوێژدا با بڵێ ( سبحان الله ) بێگومان هەركەس گوێی لێ بێتسەر را و بە ئاگا دێتەوە.**

[1] واتە ئەگەر پێش نوێژ یان هەر پیاوێك لە نوێژدا توشی شتێك بوو پیاو بە ووتنی ( سبحن الله )ئاگاداری دەكاتەوە و ئافرەتیش بە چەپڵە( كێشانی بەری دەستی بە پشتی دەستی چەپدا ) )

[2] واتە هەر كاتێ نیشانەیەكی بەڵا و موسیبەتتان بینی پەنا بۆ عیبادەت و پاڕانەوەو سوجدە ببەن چونكە ( سوجدە بردن ) نزیك ترین حاڵەتی بەندەیە لە پەروەردگارەوە )

١٣٢٤- سجدتا السهو في الصلاة تجزئان من كل زيادة ونقصان .

(صحيح) (ع عد هق) عن عائشة. (الصحيحة ١٨٨٤)

**١٣٢٤- هەردوو سوژدەی سەهو لە نوێژدا شوێنی هەموو زیادە و کورتیەك پڕدەکەنەوە.**

١٣٢٥- لكل سهو سجدتان بعد ما يسلم .

(صحيح) (حم د هـ) عن ثوبان. (الإرواء ٣٣٨)

**١٣٢٥- بۆ هەموو سەهویەك دوو سوژدە هەیە لە پاش سەلام دانەوە .**

١٣٢٦- من نسي شيئا من صلاته فليسجد سجدتين وهو جالس.

(صحيح) (حم ن) عن معاوية. (الصحيحة ١٣٦٢)

**١٣٢٦- هەرکەس لە نوێـژدا شـتێکی لەیادچـوو بـا دوو سـوژدەی سـەهوو ببـات کـاتێ لـە تەحیاتا دانیشتووە.**

١٣٢٧- إذا رأيتم آية فاسجدوا .

(صحيح) (د ت) عن ابن عباس. (المشكاة ١٤٩١)

**١٣٢٧- گەر نیشانەیەکتان بینی سوژدە ببەن.**

١٣٢٨- إذا قرأ ابن آدم السجدة فسجد اعتزل الشيطان يبكي يقول يا ويله أمر ابن آدم بالسجود فسجد فله الجنة وأمرت بالسجود فعصيت فلي النار .

(صحيح) (حم م هـ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٤٣٨)

**١٣٢٨- کاتێ مرۆڤ ئایەتی ( سەجدە ) دەخوێنێ و سوژدە دەبات ، شەیتان کەنارگی دەبێت و دەست دەکات بە گریان و دەڵێ : ئەی هاوار بۆ مـن ئـەوەی ئـادەم فـەرمانی پـێ کـرا بـە سوژدە و سوژدەشی برد و دەچێتە بەهەشتەوە ، بەڵام من فەرمانم پێکرا بە سوژدە بـردن و سوژدەم نەبرد بۆیە دۆزەخ بۆ منە.**

١٣٢٩- السجدة التي في { ص } سجدها داود توبة ونحن نسجدها شكرا .

(صحيح) (طب خط) عن ابن عباس. (المشكاة ١٠٣٨)

**١٣٢٩- ئەو سوژدەیەی کە لە سورەتی ( ص ) دا هاتووە ، داود پێغەمبەر ( سەلامی خـوای لێ بێت ) وەك تۆبە کردن ئەو سوجدەیەی برد بەڵام ئێمە وەك سوپاس گوزار سوژدە دەبەین.**

١٣٣٠- إنما هي توبة نبي - يعني سجدة { ص} .

(صحيح) (د ك) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ١٢٧١)

**١٣٣٠- ئەو سوجدەیە تەوبەی پێغەمبەرێك بوو ، مەبەست پێی سوجدەی سورەتی ( ص )ە.**

١٣٣١- كان إذا جاءه أمر يسر به خر ساجدا شكرا لله تعالى .

(صحيح) (د هـ) عن أبي بكرة. (المشكاة ١٤٩٤)

**١٣٣١- پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر شتێكی دڵخۆشكەری بۆ بهاتیایە سوژدەی شوكری دەبرد بۆ خوای گەورە.**

١٣٣٢- ما لي رأيتكم أكثرتم التصفيق من نابه شيء في صلاته فليسبح فإنه إذا سبح التفت إليه وإنما التصفيق للنساء

(صحيح) (حم ق د ن) عن سهل بن سعد. (الإرواء ٤٨٨)

**١٣٣٢-ئەوە چییە دەتانبینم زۆر چە پڵە لێدەن. [1]ی( خۆبەخش )سوننەت هەركەس شتێكی توشهات لە نوێژدا با ( سبحان الله ) بكات، چونكە گەر ( سبحان الله ) ی كرد نوێژ خوێن بە ئاگا دێت. ، بێگومان چە پڵە لێدان بۆ ئافرەتانە.**

١٣٣٣- أحب الأعمال إلى الله أدومها وإن قل .

(صحيح) (ق) عن عائشة. (صحيح أبي داود ١٢٣٨)

**١٣٣٣- خۆشەویست ترین كردەوە لای پەروەرگار ئەو كردەوانەن كە مرۆڤ لەسەریان بەردەوامە ، با كەمیش بن.**

١٣٣٤- اكلفوا من العمل ما تطيقون فإن الله لا يمل حتى تملوا وإن أحب العمل إلى الله تعالى أدومه وإن قل .

(صحيح) (حم د ن) عن عائشة. (صحيح أبي داود ١٢٣٨)

**١٣٣٤- ئەوەندە كارو كردەوە ئەنجام بدەن كە لە تواناتانداییە ، بێگومان خوای گەورە بێزار و ماندوو نابێت ، مەگەر ئێوە بێزار و ماندوو بن ، بۆیە بەڕاستی خۆشەویسترین كردەوە لای پەروەردگار ئەوەیە كە بەردەوام بێت با كەمیش بێت.**

١٣٣٥- اكلفوا من العمل ما تطيقون فإن خير العمل أدومه وإن قل .

(صحيح) (هـ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ١٢٣٨)

**١٣٣٥- ئەوەندە كردەوە لە خۆتان بگرن كە لە تواناتاندایە بێت ، چونكە باشترین كردار ئەوەیە كە بەردەوام بێت با كەمیش بێت.**

١٣٣٦- ليتكلف أحدكم من العمل ما يطيق فإن الله تعالى لا يمل حتى تملوا وقاربوا وسددوا .

(صحيح) (حل) عن عائشة . (صحيح أبي داود ١٣٣٨)

---

[1] **(ناو لەپ لە پشتی دەستدەدەن)**

**١٣٣٦- با هەركەس لە ئێوە ئەوەندە شان بداتە ژێر كردەوەیەك كە پێی دەكرێ ، چونكە خوای گەورە بێ تاقەت نابێ مەگەر ئێوە بێزار و بێتاقەت بن، بۆیە هەمیشە هەوڵی ( نزیك بوونەوە لەخوا و راست و دروست بوون ) لە ئیشەكانتاندا بدەن.**

١٣٣٧-إذا خرجت من منزلك فصل ركعتين تمنعانك مخرج السوء وإذا دخلت إلى منزلك فصل ركعتين تمنعانك مدخل السوء.

(صحيح) (البزار هب) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٣٢٣)

**١٣٣٧- گەر لە ماڵ دەرچویت دوو ڕكات نوێژ بكە ، بەرگریت لێ دەكەن لە شتی خراپ كە تووشت بێت لە دەرەوە ، وە كاتێ چوویتەوە ناو ماڵ دوو ڕكات نوێژ بكە بەرگریت لێ دەكەن لە هەر شتێكی خراپ كە لە ژوورەوە تووشت ببێت.**

١٣٣٨- إن الله لا يمل حتى تملوا .

(صحيح) (البزار) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٧٦٠)

**١٣٣٨- بەڕاستی خوای گەورە بێزار و ماندوو نابێ مەگەر ئێوە ماندوو نەبن.**

١٣٣٩- عليكم من الأعمال بما تطيقون فإن الله لا يمل حتى تملوا .

(صحيح) (طب) عن عمران بن حصين. (صحيح أبي داود ١٢٣٨)

**١٣٣٩- پێویستە لەسەرتان ئەوەندە كردەوە بكەن كە لە تواناتاندایە چونكە بە ڕاستی پەروەردگار ماندوو نابێت مەگەر هەر خۆتان ماندوو بێزار بن.**

١٣٤٠- مه عليكم بما تطيقون من الأعمال فوالله لا يمل الله حتى تملوا .

(صحيح) (خ ن هـ) عن عائشة. (صحيح أبي داود ١٢٣٨)

**١٣٤٠- نەكەی پێویستە لەسەرتان ئەوەندە كردەوە بكەن كە لە تواناتاندا هەیە ، سوێند بەخوا ، پەروەردگار بێزار و ماندوو نابێ مەگەر هەر خۆتان ماندوو بن.**

١٣٤١- يا أيها الناس عليكم بالقصد عليكم بالقصد عليكم بالقصد فإن الله تعالى لن يمل حتى تملوا.

(صحيح) (هـ) عن جابر. (الصحيحة ١٧٦٠)

**١٣٤١- هۆ خەڵكینە! پێویستە مام ناوەند بن ، پێویستە مام ناوەند بن پێویستە مام ناوەند بن ، بەڕاستی خوای میهرەبان بێزار و ماندوو نابێ مەگەر هەر خۆتان ماندوو بێزار بن.**

١٣٤٢- يا أيها الناس عليكم من الأعمال ما تطيقون فإن الله لا يمل حتى تملوا وإن أحب الأعمال إلى الله ما دووم عليه وإن قل .

(صحيح) (ق) عن عائشة. (الصحيحة ١٢٣٨)

**١٣٤٢- ئه‌ی خه‌ڵكینه ! پێویسته له‌سه‌رتان ئه‌وه‌نده كارو كردەوه ئه نجام بده‌ن كه ده‌توانن ، به‌ڕاستی په‌روه‌ردگار بێزار و ماندوو نابێ‌ ته‌نها خۆتان ماندوو ئه‌بن ، بۆیه خۆشه‌ویسترین كردەوه لای په‌روه‌ردگار ئه‌وه‌یه له‌سه‌ری به‌رده‌وام بیت با كه‌میش بێت.**

١٣٤٣- إذا صلى أحدكم ركعتي الفجر فليضطجع على جنبه الأيمن .

(صحيح) (د ت حب) عن أبي هريرة. (المشكاة ١٢٠٦)

**١٣٤٣- ئه‌گه‌ر هه‌ركه‌س له ئێوه دوو ڕكات نوێژی سوننه‌تی به‌یانی كرد با له‌سه‌ر لای ڕاستی ڕاكشێ‌ .**

١٣٤٤- إذا طلع الفجر فلا صلاة إلا ركعتي الفجر .

(صحيح) (طس) عن أبي هريرة. (الإرواء ٤٧١)

**١٣٤٤- ئه‌گه‌ر ڕووناكی سپێده‌ی به‌یانی ده‌ركه‌وت نوێژكردن نی یه ته‌نها دوو ڕكات سوننه‌تی به‌یانی نه‌بێت .**

١٣٤٥- أربع ركعات قبل الظهر يعدلن بصلاة السحر .

(صحيح) (ش) عن أبي صالح مرسلا. (الصحيحة ١٤٣١)

**١٣٤٥- چوار ڕكاتی پێش نوێژی نیوه‌ڕۆ پاداشتی به ئه‌ندازه‌ی نوێژی به‌یانیه.**

١٣٤٦- أربع قبل الظهر ليس فيهن تسليم تفتح لهن أبواب السماء .

(صحيح) (د الترمذي في الشمائل ابن خزيمة) عن أبي أيوب. (المشكاة ١١٦٨)

**١٣٤٦- چوار ڕكاتی پێش نوێژی نیوه‌ڕۆ كه له نێوانیاندا سه‌لام دانه‌وه نه‌بێت ده‌رگاكانی ئاسمانیان بۆ ده‌كرێته‌وه.**

١٣٤٧- إن أبواب السماء تفتح إلى زوال الشمس فلا ترتج حتى يصلى الظهر فأحب أن يصعد لي فيها خير .

(صحيح) (حم) عن أبي أيوب. (الترغيب ٥٨٧)

**١٣٤٧- بێگومان ده‌رگاكانی ئاسمان تا لادانی خۆر له ناوه‌ڕاستی ئاسمان ده‌كرێنه‌وه ، داناخرێن هه‌تا نوێژی نیوه‌ڕۆ نه‌كرێت ، بۆیه پێم خۆشه له كاتی نیوه‌ڕۆدا چاكه‌یه‌كم به‌رز بێته‌وه .**

١٣٤٨- أيعجز أحدكم أن يتقدم أو يتأخر أو عن يمينه أو عن شماله في الصلاة - يعني في السبحة .

(صحيح) (د هـ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٩٢٢)

**١٣٤٨- ئایا هەریەك لە ئێوە دەستەو سانن و ناتوانن تۆزێ بچنە پێش یان بێنە دواوە یان بە لای ڕاست و چەپدا بیجوڵێن لە پاش نوێژ ؟ واتە بۆ سوننەتەكان.**

١٣٤٩- لا يصلي الإمام في الموضع الذي صلى فيه المكتوبة حتى يتحول .

(صحيح) (د هـ) عن المغيرة بن شعبة. (صحيح أبي داود ٦٢٩)

**١٣٤٩- با پێش نوێژ هەرگیز نوێژی سوننەت لەو جێگایەدا نەكات كە نوێژی فەرزی تێدا كردووە هەتا نەگوێزرێتەوە بگوازێتەوە جێگایەكی تر.**

١٣٥٠- رحم الله امرءا صلى قبل العصر أربعا .

(صحيح) (د ت حب) عن ابن عمر. (المشكاة ١١٧٠)

**١٣٥٠- ڕەحمەتی خوا لەو كەسە بێت پێش نوێژی عەسر چوار ڕكات سوننەت دەكات.**

١٣٥١- صلوا قبل المغرب ركعتين صلوا قبل المغرب ركعتين لمن شاء .

(صحيح) (حم د) عن عبدالله المزني. (الصحيحة ٢٣٣)

**١٣٥١- پێش نوێژی ئێوارە دوو ڕكات نوێژی سوننەت بكەن، پێش نوێژی ئێوارە دوو ڕكات بكەن ،بۆ هەركەس حەز بكات .**

١٣٥٢- كان إذا صلى صلاة أثبتها .

(صحيح) (م) عن عائشة. (صحيح أبي داود ١١٥٥)

**١٣٥٢- پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) كاتێ هەر نوێژێكی بكردایە ،لەسەری بەردەوام دەبوو.**

١٣٥٣- كان إذا صلى ركعتي الفجر اضطجع على شقه الأيمن.

(صحيح) (خ) عن عائشة. (صحيح أبي داود ١١٤٨)

**١٣٥٣- پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) كاتێ دوو ڕكاتە سوننەتەكەی بەیانیانی دەكرد ، بە لای ڕاستیدا ڕادەكشا.**

١٣٥٤- كان إذا فاته الأربع قبل الظهر صلاها .

(صحيح) ( بعد الركعتين ) بعد الظهر (هـ) عن عائشة. (الضعيفة ٤٢٠٨)

**١٣٥٤- پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) كاتێ چوار ڕكاتە سوننەتەكەی پێش نیوەڕۆی بچوایە، پاش نوێژی نیوەڕۆ دەیكردەوە.**

١٣٥٥- كان لا يدع أربعا قبل الظهر وركعتين قبل الغداة .

(صحيح) (خ د ن) عن عائشة. (صحيح أبي داود ١١٧٩)

**١٣٥٥- پێغەمبەری خوا (ﷺ) وازی لە چوار ڕكاتە سوننەتەكەی پێش نیوەڕۆ و دوو ڕكاتی پێش بەیانی نەهێنا.**

١٣٥٦- كان يصلي بين المغرب والعشاء .

(صحيح) (طب) عن عبيد مولاه. (الصحيحة ٢١٣٢)

**١٣٥٦- پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نێوان ئێوارەو خەوتناندا نوێژی دەكرد.**

١٣٥٧- كان يصلي قبل الظهر أربعا إذا زالت الشمس ( لا يفصل بينهن بتسليم ) ويقول أبواب السماء تفتح إذا زالت الشمس .

(صحيح) (هـ) عن أبي أيوب. (صحيح أبي داود ١١٥٣)

**١٣٥٧- پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پێش نوێژی نیوەڕۆوە چوار ڕكات نوێژی دەكرد ، كاتێ خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لای ئەداو بە لای خۆرئاوادا دەكشا ، وە ئەیفەرموو دەرگاكانی ئاسمان دەكرێنەوە ، كاتێ خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان بەرەو خۆرئاوا دەكشێ.**

١٣٥٨- كان يصلي قبل الظهر ركعتين وبعدها ركعتين وبعد المغرب ركعتين في بيته وبعد العشاء ركعتين وكان لا يصلي بعد الجمعة حتى ينصرف فيصلي ركعتين في بيته .

(صحيح) (مالك ق د ن) عن ابن عمر. (الإرواء ٦١٧)

**١٣٥٨- پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش نوێژی نیوەڕۆ دوو ڕكات سوننەتی دەكرد و لە دوای نوێژی نیوەڕۆش دوو ڕكاتی تری دەكرد ، وە لە پاش نوێژی ئێوارەش دوو ڕكات نوێژی لەماڵەوە دەكرد ، وە دوو ڕكات نوێژی تریشی لە پاش نوێژی خەوتنان دەكرد هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاش نوێژی جومعە نوێژی نەدەكرد تا دەگەڕایەوە لە ماڵەوە دوو ڕكاتی دەكرد.**

١٣٥٩- لو أصبحت أكثر مما أصبحت لركعتهما وأحسنتهما وأجملتهما - يعني ركعتي الفجر.

(صحيح) (د) عن بلال. (صحيح أبي داود ١١٤٣)

**١٣٥٩- ئەگەر تەمەنم بە بەرێوە ما زیاتر هەستام ئەوە ئەو دوو ڕكاتە ، زۆر بە جوانی و باشتر دەكەم ، واتە دوو ڕكاتەكەی پێش نوێژی بەیانی.**

١٣٦٠- ما من صلاة مفروضة إلا وبين يديها ركعتان .

(صحيح) (حب طب) عن عبدالله بن الزبير. (الصحيحة ٢٣٢)

**١٣٦٠- هیچ نوێژێکی فەرز نی یە لە دوو ڕکات نوێژی سوننەت لە پێشەوە نەنێت.**

١٣٦١- ما من عبد مسلم توضأ فأسبغ الوضوء ثم صلى لله في كل يوم ثنتي عشرة ركعة تطوعا غير فريضة إلا بنى الله له بيتا في الجنة .

(صحيح) (م) عن أم حبيبة. (صحيح أبي داود ١١٣٦)

**١٣٦١- هیچ کەسێکی موسوڵمان نی یە دەست نوێژ بگرێ بەجوانی و پاشان پاشان دوانزە ڕکات نوێژی سوننەت بۆ پەروەردگار بکات جگە لە فەرزەکان کە خوای گەورە ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست نەکات..**

١٣٦٢- من ثابر على اثنتي عشرة ركعة من السنة بنى الله له بيتا في الجنة أربع ركعات قبل الظهر وركعتين بعده وركعتين بعد المغرب وركعتين بعد العشاء وركعتين قبل الفجر .

(صحيح) (ت ن هـ) عن عائشة. (الترغيب ٥٨٠)

**١٣٦٢- هەرکەس بەردەوام بێت لەسەر دوانزە ڕکات نوێژی سوننەت خوای گەورە ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکات ، چوار ڕکاتیان لە پێش نوێژی نیوەڕۆدا ، دوو ڕکات لە پاش نوێژی نیوەڕۆ، دوو ڕکات لە پاش نوێژی ئێوارە و ، وە دوو ڕکات لە پاش نوێژی خەوتنان و ، وە دوو ڕکات لە پێش نوێژی بەیانیانەوە.**

١٣٦٣- من حافظ على أربع ركعات قبل الظهر وأربع بعدها حرم على النار .

(صحيح) ( ٤ ك) عن أم حبيبة. (المشكاة ١١٦٧)

**١٣٦٣- هەرکەس پارێزگاری لەسەر ئەنجام دانی چوار ڕکات سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆ و چوار ڕکاتیش لە پاش نوێژی نیوەڕۆ بکات لە دۆزەخ ڕزگاری دەبێ.**

١٣٦٤- من ركع اثنتي عشرة ركعة بني له بيت في الجنة.

( طس ) عن أبي ذر. (الصحيحة ٢٣٤٧)

**١٣٦٤- هەرکەس لە هەر شەوو ڕۆژێکدا دوانزە ڕکات نوێژ بکات ماڵێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکرێت .**

١٣٦٥- من صلى في اليوم و الليلة اثنتي عشرة ركعة تطوعا بنى الله له بيتا في الجنة.

( حم م د ن ه ) عن أم حبيبة. (المشكاة ١١٥٩)

**١٣٦٥- هەرکەس لە شەوو ڕۆژێکدا دوانزە ڕکات نوێژی( خۆبەخش )سوننەت بکات، خوای گەوری ماڵێکی لەبەهەشتدا بۆ دروست دەکات .**

١٣٦٦- من صلى في يوم و ليلة ثنتي عشرة ركعة بني لـه بيـت في الجنـة: أربعـا قبـل الظهـر و ركعتين بعدها و ركعتين بعد المغرب و ركعتين بعد العشاء و ركعتين قبل صلاة الغداة.

( ت ) عن أم حبيبة. (الترغيب ٥٨٠)

**١٣٦٦- هەركەس لە شەوو ڕۆژێكدا دوانزە ڕكات نوێژی سوننەت بكـات ئـەوە مـاڵێكی لـە بەهەشتدا بۆ دروست كراوە ، چوار ڕكات لـە پـێش نوێـژی نیـوەڕۆ داو دوو ڕكـات لـە دوای نوێژی نیوەڕۆ ، و دوو ڕكات لە پاش نوێژی ئێوارە و دوو ڕكات لە پاش نوێـژی خـەوتنان و دوو ڕكات لە پێش نوێژی بەيانيانەوە.**

١٣٦٧- من صلى قبل الظهر أربعا وبعدها أربعا حرمه الله على النار.

(صحيح) (حم ت ن هـ) عن أم حبيبة. (الترغيب ٥٨٤)

**١٣٦٧- هەركەس پێش نوێژی نیوەڕۆ چـوار ڕكـاتی كردبـێ وە لـە دوای نوێـژی نیـوەڕۆ وە چوار ڕكاتی تری كردبێ، ئەوە خوای گەورە ڕزگاری دەكات لە ئاگری دۆزەخ.**

١٣٦٨- من لم يصل ركعتي الفجر فليصلها بعد ما تطلع الشمس .

(صحيح) (حم ت ك) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٣٦١)

**١٣٦٨- هەركەس دوو ڕكاتەكەی نوێژی سوننەتی بەيانيی[1] نەكردبێ با پاش خۆرهەڵاتن بيكات.**

١٣٦٩- يا بنت أبي أمية سألت عن الركعتين بعـد العـصر وإنـه أتـاني نـاس مـن عبـد القـيس فشغلوني عن الركعتين اللتين بعد الظهر فهما هاتان .

(صحيح) (خ د) عن أم سلمة. (صحيح أبي داود ١١٥٥)

**١٣٦٩- ئەی كچی ئەبی ( ئومەييە ) ! پرسيارت لە بارەی دوو ڕكاتی پاش نوێژی عەسرەوە كرد ، بەراستی هـەنێ خـەڵكی تـيرەی ( عبـدالقيس ) هـاتبوون بـۆ لام و سـەرقاڵيان كـردم لـە دوو ڕكاتەكەی پاش نوێژی نیوەڕۆ بيكەم ، ئەو دوو ڕكاتەی كردم ئەوە بوو.**

١٣٧٠- اجعلوا من صلاتكم في بيوتكم ولا تتخذوها قبورا .

(صحيح) (حم ق د) عن ابن عمر (ع الروياني الضياء) عـن زيـد بـن خالـد (محمـد بـن نـصر في الصلاة) عن عائشة. (الصحيحة ١٩١٠)

**١٣٧٠- هەندێ لە نوێژەكانتان لە ماڵەوە بكەن و ، ماڵەكانتان مەكەنە گۆڕستـان .**

---

[1] ( مەبەست دوو ڕكاتە سوننەتەكەيە )

١٣٧١- إذا حضر أحدكم الصلاة في مسجده فليجعل لبيته نصيبا من صلاته فإن الله جاعل في بيته من صلاته خيرا . (الصحيحة ١٣٩٢)

(صحيح) (حم م) عن جابر.

**١٣٧١- ئەگەر هەركەس لە ئێوە ئامادەی نوێژكردن بوو لە مزگەوتدا با لە نوێژەكانی بەشی ماڵەوەشی لە دابنێ ، چونكە خوای گەورە خێری داناوە بۆ نوێژكردن لە ماڵەوە.**

١٣٧٢- إذا قضى أحدكم الصلاة في مسجده فليجعل لبيته نصيبا من صلاته فإن الله تعالى جاعل في بيته من صلاته خيرا .

(صحيح) (حم م هـ) عن جابر (الدارقطني في الأفراد) عن أنس. (الصحيحة ١٣٩٢)

**١٣٧٢- ئەگەر هەركەس لە ئێوە لە مزگەوت نوێژی تەواو كرد ، با بەشی ماڵەوەش دابنێ، چونكە خوای گەورە لە نوێژی ماڵەوەشدا خێری داناوە.**

١٣٧٣- إذا قضى أحدكم صلاته في المسجد ثم رجع إلى بيته فليصل في بيته ركعتين وليجعل لبيته نصيبا من صلاته فإن الله جاعل في بيته من صلاته خيرا .

(صحيح) (حم ع) عن أبي سعيد. (الصحيحة ١٣٩٢)

**١٣٧٣- ئەگەر هەركەس لە ئێوە لە مزگەوت نوێژی تەواو كرد و پاشان گەڕایەوە ماڵەوە، با لە ماڵەوە دوو ڕكات نوێژ بكات وە با هەمیشە بەشی ماڵەوەی دابێ لە نوێژەكانیدا ، چونكە خوای گەورە لە نوێژی ماڵەوەشیدا خێری بۆ داناوە.**

١٣٧٤- اركعوا هاتين الركعتين في بيوتكم السبحة بعد المغرب .

(صحيح) (هـ) عن رافع بن خديج. (صحيح أبي داود ١١٧٦)

**١٣٧٤- ئەم دوو ڕكاتە نوێژە لە ماڵەكانتاندا بكەن ، دوو ڕكاتی پاش نوێژی ( مەغریب ) ئێوارە.**

١٣٧٥- أفضل الصلاة صلاة المرء في بيته إلا المكتوبة .

(صحيح) (ن طب) عن زيد بن ثابت. (صحيح أبي داود ١٣٠١)

**١٣٧٥- باشترین نوێژ ئەو نوێژەیە كەسێك لە ماڵەوە دەیكات جگە لە نوێژە فەرزەكان.**

١٣٧٦- أفضل صلاتكم في بيوتكم إلا المكتوبة .

(صحيح) (ت) عن زيد بن ثابت. (صحيح أبي داود ٩٥٩)

**١٣٧٦- باشترین نوێژتان ئەوانەیە كە لە ماڵەوە دەیكەن جگە لە فەرزەكان.**

١٣٧٧- ما زال بكم الذي رأيت من صنيعكم حتى خشيت أن يكتب عليكم ولـو كتـب علـيكم ما قمتم به فصلوا أيها الناس في بيوتكم فإن أفضل صلاة المرء في بيته إلا الصلاة المكتوبة .

(صحيح) (حم ق ن) عن زيد بن ثابت. (الإرواء ٤٤٢)

**١٣٧٧ -ئەوەی من بينيم لـه ئێـوه هـەر بـەردەوامن لەسـەری [1] ، تەنانـەت ترسـام لـەوەی لەسەرتـان فەرز بێت ، جا ئەگەر فەرزيش بێت لەسەرتـان بێگومان ناتوانن پێ ی هەستن، كەواته ئەی خەڵكينـه نوێـژەكانتان لەماڵـەوه بكـەن ، چـونكه باشـترين نوێـژی مـرۆڤ ، ئەوەيه كه له ماڵەوه دەيكات ، جگه له نوێژه فەرزەكان.**

١٣٧٨- تطوع الرجل في بيته يزيد على تطوعه عند الناس كفضل صلاة الرجل في جماعة على صلاته وحده

(صحيح) (ش) عن رجل. (الصحيحة ٣١٤٩)

**١٣٧٨- نوێژی سوننەتـی هەركەسێك له ماڵەوه خێـری و بەرەكـەتـی زيـاتره لـەو نوێـژەی لای خەڵك دەيكات ، به ئەندازەی پلەوپايەی نوێژی كەسێك به كۆمەڵ بەسەر نوێژەكـەی كەبه تەنيا دەيكات .**

١٣٧٩- صلوا أيها الناس في بيوتكم فإن أفضل الصلاة صلاة المرء في بيته إلا المكتوبة .

(صحيح) (خ) عن زيد بن ثابت. (صحيح أبي داود ١٣٠١)

**١٣٧٩- ئەی خەڵكينه له ماڵەكانتاندا نوێژ بكەن ، بەراستی باشترين نوێژ ئەو نوێژەيـه كه مرۆڤ له ماڵەوه دەيكات جگه له فەرزەكان.**

١٣٨٠- صلوا في بيوتكم ولا تتخذوها قبورا .

(صحيح) (ت ن) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٩١٠)

**١٣٨٠- نوێژ له ماڵەوه بكەن و ماڵەمانتان مەكەنه گۆڕستان .**

١٣٨١- صلوا في بيوتكم ولا تتخذوها قبورا ولا تتخذوا بيتي عيـدا وصـلوا علـي وسـلموا فـإن صلاتكم تبلغني حيثما كنتم .

(صحيح) (ع الضياء) عن الحسن بن علي. (صحيح أبي داود ١٧٨٠)

**١٣٨١- له ماڵـەوه نوێـژەكانتان بكـەن و مەيكەنـه گۆڕسـتان ، و ماڵەكـەی [2] مـن مەكەنـه نەزرگەسەردانی، و دووبارەی بكەنەوه وەك جـەژن ، هەميـشه سـەڵاوات و سـەلامم لەسـەر بدەن ، چونكه سەڵاواتی ئێوەم پێ دەگات له هەر كوێ بن.**

---

[1] ( مەبەست شەو نوێژكردنه )

١٣٨٢- صلوا في بيوتكم ولا تتركوا النوافل فيها .

(صحيح) (الدارقطني في الأفراد) عن أنس وجابر. (الصحيحة ١٩١٠)

**١٣٨٢- له ماڵه‌كانتاندا نوێژ بكه‌ن و سوننه‌ت كردن پشت گوێ مه‌خه‌ن له ماڵه‌وه.**

١٣٨٣- صلاة أحدكم في بيته أفضل من صلاته في مسجدي هذا إلا المكتوبة .

(صحيح) (د) عن زيد بن ثابت (ابن عساكر) عن ابن عمر . (صحيح أبي داود ٩٥٩)

**١٣٨٣- نوێژی هه‌ریه‌ك له ئێوه له ماڵی خۆیدا باشتره له نوێژكردن له‌م مزگه‌وته‌ی من جگه له فه‌رزه‌كان .**

١٣٨٤- أيها الناس ما زال بكم صنيعكم حتى ظننت أن سيكتب عليكم فعليكم بالصلاة في بيوتكم فإن خير صلاة المرء في بيته إلا الصلاة المكتوبة .

(صحيح) (د) عن زيد بن ثابت. (صحيح أبي داود ١٣٠١)

**١٣٨٤- ئه‌ی خه‌ڵكینه ، ئه‌تانبینم به‌ردەوامن له‌سه‌ر ئه‌و ئیشه‌تان ته‌نانه‌ت گومانم برد له‌سه‌رتان پێویست بكرێ[1] پێویسته له‌سه‌رتان نوێژه‌كانتان له ماڵه‌وه بكه‌ن ، چونكه باشترین نوێژی مرۆڤ ئه‌وه‌یه كه له ماڵه‌وه بیكات جگه له نوێژه فه‌رزه‌كان.**

١٣٨٥- عليكم بهذه الصلاة في بيوتكم - يعني سنة المغرب .

(صحيح) (ت ن) عن كعب بن عجرة. (صحيح أبي داود ١١٧٦)

**١٣٨٥- پێویسته ئه‌م نوێژه له ماڵه‌وه بكه‌ن ، واته نوێژی سوننه‌تی ئێواره.**

١٣٨٦- فضل صلاة الرجل في بيته على صلاته حيث يراه الناس كفضل المكتوبة على النافلة .

(صحيح) (طب) عن صهيب بن النعمان. (الترغيب ٤٤١)

**١٣٨٦- پله‌وپایه و پاداشتی نوێژی هه‌ركه‌سێك له ماڵه‌وه بیكات به‌سه‌ر ئه‌و نوێژه‌ی كه له به‌رچاوی خه‌ڵك ده‌یكات، وه‌ك پله‌وپایه‌ی نوێژه به‌سه‌ر نوێژی سوننه‌تدا.**

١٣٨٧- هذه صلاة البيوت - يعني السبحة بعد المغرب- .

(صحيح) (د) عن كعب بن عجرة. (صحيح أبي داود ١١٧٦)

**١٣٨٧- ئه‌مه نوێژی ماڵوه‌یه ، مه‌به‌ست سوننه‌تی پاش ئێواره.**

١٣٨٨- لا تتخذوا بيوتكم قبورا .

(صحيح) (هـ) عن ابن عمر. (الجنائز ٢١٢)

---

[1] (واته شه‌و نوێژ)

**١٣٨٨- ماڵه‌كانتان مه‌كه‌ن به گۆڕستان.**

١٣٨٩- لا تتخذوا بيوتكم قبورا صلوا فيها .

(صحيح) (حم) عن زيد بن خالد. (الصحيحة ٢٤١٨)

**١٣٨٩- ماڵه‌كانتان مه‌كه‌ن به گۆڕستان و نوێژيان تێدا بكه‌ن.**

١٣٩٠- صل قائما إلا أن تخاف الغرق .

(صحيح) (ك) عن ابن عمر. (صفة الصلاة ٧٩)

**١٣٩٠- به پێوه نوێژ بكه مه‌گه‌ر ترسى نقوم بوونت هه‌بێ.** [١]

١٣٩١- صل قائما فإن لم تستطع فقاعدا فإن لم تستطع فعلى جنب .

(صحيح) (حم خ ٤ ) عن عمران بن حصين. (صحيح أبي داود ٨٧٨)

**١٣٩١- به ڕاوه‌ستانه‌وه نوێژ بكه ، گه‌ر توانات نه‌بوو به دانيشتنه‌وه ، گه‌ر توانات نه‌بوو به ڕاكشانه‌وه له‌سه‌ر ته‌نيشت.**

١٣٩٢- صلاة الجالس على النصف من صلاة القائم .

(صحيح) (حم) عن عائشة. (صحيح ابن ماجه ١٢٢٩)

**١٣٩٢- نوێژى كه‌سێكى دانيشتوو ، نيوه‌ى خێرى نوێژى كه‌سێكى هه‌يه به ڕاوه‌ستانه‌وه نوێژ بكات .**

١٣٩٣- صلاة الرجل قائما أفضل من صلاته قاعدا وصلاته قاعدا على النصف من صلاته قائما وصلاته نائما على النصف من صلاته قاعدا .

(صحيح) (حم د) عن عمران بن حصين. (صحيح أبي داود ٨٧٧)

**١٣٩٣- نوێژى مرۆڤ به پێوه باشتره له نوێژكردنى به دانيشتنه‌وه ، وه نوێژ كردنى به دانيشتنه‌وه نيوه‌ى پاداشتى ئه‌و نوێژه‌ى هه‌يه كه به پێوه ده‌يكات ، وه نوێژكردنى به ڕاكشانه‌وه ، نيوه‌ى پاداشتى نوێژى هه‌يه كه به دانيشتنه‌وه بيكات.**

١٣٩٤- صلاة الرجل قاعدا نصف الصلاة ولكني لست كأحد منكم.

(صحيح) (م د ن) عن ابن عمرو. (صحيح أبي داود ٨٧٦)

**١٣٩٤- نوێژى مرۆڤ به‌دانيشتنه‌وه نيوه‌نوێژه ، به‌ڵام من وه‌ك هه‌ر كه‌سێك له ئێوه نيم** [٢]

---

[١] ( وه‌ڵامه بۆ ئه‌و كه‌سه‌ى پرسيارى نوێژ كردنى كرد له كه‌شتيدا )

[٢] ( واته من عوزرم هه‌يه و ئێوه نيتانه )

١٣٩٥- صلاة القاعد نصف صلاة القائم .

(صحيح) (حم ن هـ) عن أنس (هـ) عن ابن عمرو (طب) عن ابن عمر وعبدالله بن السائب وعبدالمطلب بن أبي وداعة. (الروض ٥٨٥)

**١٣٩٥- نوێژی کەسێك بە دانیشتنەوە ، نیوەی نوێژی ئەو کەسەیە کە بە پێوە دەیکات.**

١٣٩٦- صلاتان لا يصلى بعدهما الصبح حتى تطلع الشمس والعصر حتى تغرب الشمس .

(صحيح) (حم حب) عن سعد. (صحيح أبي داود ١١٥٧)

**١٣٩٦- دوو نوێژ هەیە نوێژیان لە پاشەوە ناکرێ ، نوێژی بەیانی تا ئەو کاتەی خۆر هەڵدێ ، نوێژی عەسر تا ئەو کاتەی خۆر ئاوا دەبێ .**

١٣٩٧- نهى عن الصلاة بعد الصبح حتى تطلع الشمس وبعد العصر حتى تغرب .

(صحيح) (ق ن) عن عمر. (الصحيحة ٣٤١٢)

**١٣٩٧- پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، قەدەغەی کردووە لە دوای نوێژی بەیانییەوە نوێژبکرێت هەتا خۆر هەڵدێ، وەلە دوای عەسرەوە تا خۆر ئاوا دەبێ.**

١٣٩٨- كان أحب الدين إليه ما داوم عليه صاحبه .

(صحيح) (خ هـ) عن عائشة. (صحيح ابن ماجه ٤٢٣٨)

**١٣٩٨- خۆشەویسترین حاڵەتی خواپەرستی و دینداری لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئەو کردارەیە کە مرۆڤ بەردەوام دەبێت لە سەری.**

١٣٩٩- كان أحب العمل إليه ما دووم عليه وأن قل .

(صحيح) (ت ن) عن عائشة وأم سلمة. (الترغيب ٣١٧٥)

**١٣٩٩- خۆشەویسترین کردەوەی چاك لای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ، ئەو کردەوەیە کە خاوەنەکەی بەردەوام بێت لەسەری با کەمیش بێت.**

١٤٠٠- كان إذا حزبه أمر صلى .

(صحيح) (حم د) عن حذيفة. (صحيح أبي داود ١١٩٢)

**١٤٠٠- پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) کاتێك ناخۆشی و ناڕەحەتییەك دڵتەنگی بکردایە پەنای بۆ نوێژکردن دەبرد.**

١٤٠١- إذا جاء أحدكم المسجد فليصل سجدتين من قبل أن يجلس ثم ليقعد بعد إن شاء أو ليذهب لحاجته.

(صحيح) (د) عن أبي قتادة. (صحيح أبي داود ٤٨٦)

**١٤٠١- هەرکەس لـە ئێـوە کـاتێ چـووە مزگـەوت بـا دوو ڕکـات نوێـژ بکـات پـێش ئـەوەی دابنیشێ ،ئینجا کە لێ بوومەوە کەیفی خۆیەتی ، یان لـە مزگـەوت دابنیـشێت یـان بـەدەم ئیش و کاریەوە بڕوات .**

١٤٠٢- لا تعاد الصلاة في يوم مرتين .

(صحيح) (ن) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ٥٩٢)

**١٤٠٢- هیچ نوێژێك لە ڕۆژێکدا دوو جار دووبارە ناکرێتەوە.**

١٤٠٣- لا صلاة بعد الصبح حتى ترتفع الشمس ولا صلاة بعد العصر حتى تغرب الشمس.

(صحيح) (ق ن هـ) عن أبي سعيد (حم د هـ) عن عمر. (الإرواء ٣٧٢)

**١٤٠٣- لە پاش نوێژی بەیانیانەوە نوێژکردن نـی یـە هـەتا خـۆر بـەرز نەبێتـەوە و لـە پاش نوێژی عەسریشەوە نوێژکردن نیە هەتا خۆر ئاوا نەبێت**[١]

١٤٠٤- لا صلاة بعد الفجر إلا سجدتين .

(صحيح) (ت) عن ابن عمر. (الإرواء ٤٧١)

**١٤٠٤- نوێژکردن نیە لە دوای هەڵهاتنی سپێدە جگە لە دوو ڕکات.**

١٤٠٥- ليبلغ شاهدكم غائبكم لا تصلوا بعد الفجر إلا سجدتين .

(صحيح) (د هـ) عن ابن عمر. (الإرواء ٤٧١)

**١٤٠٥- با ئەوانەتـان ئامادەن بە ئامادەنەبووەکان ڕابگەیەنن جگە لە دوو ڕکات لـە پـاش سپێدەی بەیانیەوە نوێژ مەکەن.**

١٤٠٦- صل صلاة الصبح ثم أقصر عن الصلاة حتى تطلع الشمس حتى ترتفع فإنها تطلع حين تطلع بين قرني شيطان وحينئذ يسجد لها الكفار ثم صل فإن الصلاة مشهودة محضورة حتى يستقل الظل بالرمح ثم أقصر عن الصلاة فإن حينئذ تسجر جهنم فإذا أقبل الفيء فصل فإن الصلاة مشهودة محضورة حتى تصلي العصر ثم أقصر عن الصلاة حتى تغرب الشمس فإنها تغرب بين قرني شيطان وحينئذ يسجد لها الكفار.

(صحيح) (م) عن عمرو بن عنبسة. (الإرواء ١٧٧٩)

**١٤٠٦- نوێژی بەیانی بکە و ئینجا واز لە نوێژکردن بهێنـە ، هـەتا خـۆر هەڵـدێ و بـەرز دەبێتەوە ، چونکە ئەو کاتەی هەڵدێت لـە نێـوان دوو شـاخی شـەیتانێکدا هەڵـدێت ، وە**

---

[١] ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێ: ئومەتی ئیسلامی کۆدەنگی هەیە لەسەر ئەوەی لەو کاتانەی (قەدەغە کراوە نوێژ کردن تیایانداو) حەرامە نوێژیان تێدا بکرێ ، جگە لە نوێژە فەرزەکان کە جێگای یەکدەنگی هەموویانە )

**لەو کاتەدا بێ باوەڕان سوژدەی بۆ دەبەن ، دواتر دەست بـە نوێـژ بکـە ، تـا ئـەو کاتـەی سێبەری ڕم وەك خـۆی دەوەسـتێ لـەو کاتـەدا واز لـە نوێـژ بهێنـە چـونکە دۆزەخ سـوور دەبێتەوە دواتر سێبەر لە ئاستی خۆی زیاد دەکات ئەو کاتە نوێژ بکـە چـونکە نوێـژ لـەو کاتـەدا شـایەتی بـۆ دراوە و ئامـادەگی هەیـە (کـاتی خۆیـەتی) ، هـەتا نوێـژی عەسـر دەکەیت، لە دوای عەسریش واز لە نوێژ بهێنە تـا خۆرئاوا دەبێت ، چـونکە لـە نێـوان دوو شاخی شەیتانێکدا ئاوا دەبێ و لەو کاتەشدا بێ باوەڕان سوژدەی بۆ دەبەن.**

١٤٠٧- لا تصلوا صلاة في يوم مرتين .

(صحيح) (حم د) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ٥٩٢)

**١٤٠٧- لەیەك ڕۆژدا دوو جار نوێژێك دووبـارە مەكەنەوە .**

١٤٠٨- إن لكل شيء شرة ولكل شرة فترة فـإن صـاحبها سـدد وقـارب فـارجوه وإن أشـير إليـه بالأصابع فلا تعدوه .

(صحيح) (ت) عن أبي هريرة. (المشكاة ٥٣٢٥)

**١٤٠٨- هەموو ئیش و کارێك سەرەتـاکەی بـە چـالاکی و سـووربوون و گـەرم و گـوڕی دەست پێدەکات ، و بۆ هەموو گەرم و گوڕی وچالاکیەکیش خاو بوونەوە و لاوازیـەك هەیـە ، جـا ئەگەر خاوەن ئیش ژیرانـە و مـام ناوەندیانـە کـاری کـرد ئـەوە ئومێـدی سـەرکەوتنی بـۆ دەخوازم ، بەڵام ئەگەر ئاماژەی بۆ کرا بە پەنجە، ئەوە بەباشی مەزانن.**[1]

١٤٠٩- خذوا من العبادة ما تطيقون فإن الله لا يسأم حتى تسأموا .

(صحيح) (طب) عن أبي أمامة. (صحيح أبي داود ١٢٣٨)

**١٤٠٩- ئەوەندە خوا پەرستی بکەن کە لە تواناتانـدا هەیـە ، چـونکە خـوای گـەورە بێـزار نابێ تەنها هەر ئێوە بێزار و وەڕس دەبن.**

١٤١٠- خذوا من العمل ما تطيقون فإن الله لا يمل حتى تملوا .

(صحيح) (ق) عن عائشة. (المشكاة ١٢٤٣)

**١٤١٠- ئەوەندە خوا پەرستی بکەن کە لە تواناتانـدا هەیە ، چونکە خـوای گـەورە بێـزارو وەڕز نابێ تەنها هەر ئێوە بێزار دەبن.**

---

[1] مەبەست لەوەیە ئەوەندە توند بێت لە عیبادەتدا ، تا خەڵك دەیناسن و ئاماژەی پێدەکەن کردەوەکانی دەبێتە( ریا )روپامایی پەنا بەخوا )

١٥٨٠- في الإنسان ستون وثلاثمائة مفصل فعليه أن يتصدق عن كل مفصل منها صدقة النخاعة في المسجد تدفنها والشيء تنحيه عن الطريق فإن لم تقدر فركعتا الضحى تجزي عنك.

(صحيح) (حم د حب) عن بريدة. (الإرواء ٤٥٩)

**١٥٨٠- لە لاشەى مرۆڤ دا سێ سەد و شەست جومگە هەيە ، بۆيە پێويستە لەسەرى بۆ هەريەكەيان خێرێك بكات ، جا چڵم و پيساييەك مزگەوتى لێ پاك بكاتەوە ، يا خود شتێك لەسەر رێگا لا ببات، گەر نەيتوانى با دوو ڕكات نوێژى چێشتەنگاو بكات ، بۆت برى دەكەوێت.**

١٥٨١- كان يصلي الضحى أربعا ويزيد ما شاء الله.

(صحيح) (حم م) عن عائشة. (الإرواء ٤٦٠)

**١٥٨١- پێغەمبەر خوا ( ﷺ ) چوار ڕكات نوێژى چێشتەنگاوى دەكرد و زياد لەوەش ئەوەندەى خواى گەورە بە نسيبى بكردايە بەردەوام دەبوو.**

١٥٨٢- كان يصلي الضحى ست ركعات.

(صحيح) (ت في الشمائل) عن أنس. (الإرواء ٤٦١)

**١٥٨٢- پێغەمبەرى خوا ( ﷺ ) شەش ڕكات نوێى چێشتەنگاوى دەكرد .**

١٥٨٣- من خرج من بيته متطهرا إلى صلاة مكتوبة فأجره كأجر الحاج المحرم ومن خرج إلى تسبيح الضحى لا ينصبه إلا إياه فأجره كأجر المعتمر وصلاة على أثر صلاة لا لغو بينهما كتاب في عليين .

(صحيح) (د) عن أبي أمامة. (صحيح أبي داود ٥٩٧)

**١٥٨٣- هەركەس لە ماڵەوە دەست نوێژ بگرێ و بچێ بۆ نوێژێكى فەرز ، ئەو پاداشتى وەك پاداشتى حاجيەكى ئيحرام بەستوو وايە ، وە هەر كەس لە ماڵەوە دەربچێ بۆ سوننەتى چێشتەنگاو تەنها بە مەبەستى نوێژ كردن رۆيشتبێت پاداشتى وەك كەسێك وايە عومرەى كردبێت و نوێژ لە دواى نوێژ و دوور كەوتنەوە لە خۆ خلافاندن و شتى پروو پوچ لە نێوانياندا ئەوە لە پلەى بەرزى ( عليين ) دەنوسرێ .**

# بابەتی خۆرگیران

١٥٨٤- إن الشمس والقمر آيتان من آيات الله لا يخسفان لموت أحد ولا لحياته فإذا رأيتم ذلك فادعوا الله وكبروا وصلوا وتصدقوا يا أمة محمد والله ما من أحد أغير من الله أن يزني عبده أو تزني أمته يا أمة محمد والله لو تعلمون ما أعلم لضحكتم قليلا ولبكيتم كثيرا اللهم هل بلغت .

(صحيح) (مالك حم ق د ن) عن عائشة. (صحيح أبي داود ١٠٧٧)

**١٥٨٤- بە ڕاستی خۆر و مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی پەروەردگار بۆ مردن و ژیانی هیچ کەسێك ناگیرێن ، جا هەر کات بینیتان گیراون لە پەروەردگار بپاڕێنەوە و ( الله اكبر ) و نوێژ و خێر بکەن. ئەی ئوممەتی محمد ! سوێند بە خوای گەورە هیچ کەس نی یە بە ئەندازەی ئەو بە غیرەت و تووڕە بێت لەو بەندەی یان لەو ئافرەتەی زینا دەکات، ئەی ئوممەتی محمد ! سوێند بە پەروەردگار ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانییایە زۆر کەم پێدەکەنین و زۆریش دەگریان ، خوایە ئەوەی من زانیم گەیاندم.**

١٥٨٥- إن الشمس والقمر لا ينكسفان لموت أحد ولا لحياته ولكنهما آيتان من آيات الله يخوف الله بهما عباده فإذا رأيتم ذلك فصلوا وادعوا حتى ينكشف ما بكم.

(صحيح) (خ ن) عن أبي بكرة (ق ن هـ) عن أبي مسعود (ق ن) عن ابن عمر (ق) عن المغيرة. (صحيح النسائي ١٥٠٢)

**١٥٨٥- بەڕاستی خۆر و مانگ بۆ ژیان و مردنی هیچ کەس ناگیرێن ، بەڵام ئەوان دوو نیشانە و ئایەتی پەروەردگارن ، خوای مەزن بە گیرانیان بەندەکانی پێ دەترسێنێ ، جا هەر کاتێ بینیتان گیراون نوێژ بکەن و بپاڕێنەوە هەتا ڕزگارتان دەبێ و بەردەبن.**

١٥٨٦- إن أهل الجاهلية كانوا يقولون إن الشمس والقمر لا ينخسفان إلا لموت عظيم من عظماء أهل الأرض وإن الشمس والقمر لا ينخسفان لموت أحد ولا لحياته ولكنهما خليقتان من خلقه يحدث الله في خلقه ما شاء فأيهما انخسف فصلوا حتى ينجلي أو يحدث الله أمرا .

(صحيح) (ن) عن النعمان بن بشير. (المشكاة ١٤٩٣)

**١٥٨٦- بێگومان خەڵكی سەردەمی نەفانی دەیانگوت : خۆر و مانگ ناگیرێن مەگەر بۆ مردنی کەسێکی گەورەی سەر زەوی ، بەڵام لە ڕاستی دا خۆر و مانگ بۆ ژیان و مردنی هیچ کەسێك ناگیرێن ، بەڵکو ئەوان دوو دروستکراوی خوای گەورەن و ، خوای گەورە چی بوێت لەگەڵ دروستکراوەکانیدا ئەیکات ، جا هەرکات هەر کامیان گیران ئێوە نوێژ بکەت تا بەر دەبێ یا خوای گەورە شتێکی تر دەکات .**

١٥٨٧- إن هذه الآيات التي يرسل الله لا تكون لموت أحد ولا لحياته ولكن الله يرسلها يخوف بها عباده فإذا رأيتم منها شيئا فافزعوا إلى ذكر الله ودعائه واستغفاره .

(صحيح) (ق ن) عن أبي موسى. (صحيح أبي داود ١٠٦٨)

**١٥٨٧- ئەم ئایەت و نیشانانەی کە خوای گەورە دەینێرێت بۆ مردن و ژیانی هیچ کەسێك نایانێرێت بەڵکو بۆ ترساندنی بەندەکانی دەیانێرێت ، جا هەرکات بینیتان گیران پەنا بەرن بۆ یادی خوا و دوعاکردن و داوای لێ بوردنی گوناهەکان.**

١٥٨٨- إنه عرضت علي الجنة والنار فقربت مني الجنة حتى لقد تناولت منها قطفا قصرت يدي عنه وعرضت علي النار فجعلت أتأخر رهبة أن تغشاني ورأيت امرأة حميرية سوداء طويلة تعذب في هرة لها ربطتها فلم تطعمها ولم تسقها ولم تدعها تأكل من خشاش الأرض ورأيت فيها أبا ثمامة عمرو بن مالك يجر قصبه في النار وإنهم كانوا يقولون إن الشمس والقمر لا ينكسفان إلا لموت عظيم وإنهما آيتان من آيات الله يريكموها فإذا انكسفا فصلوا حتى تنجلي .

(صحيح) (م) عن جابر. (الإرواء ٦٥٠)

**١٥٨٨- بەهەشت و دۆزەخ خرانە بەردەمم ، ئەوجا بەهەشت لێم نزیك کەوتەوە بە شێوەیەك دەستم برد میوەیەك لێ بکەمەوە دەستم نەیگەیشتێ ، پاشان دۆزەخ خرایە بەردەستم ، منیش خێرا هاتمە دواوە لە ترسی ئەوەی ئەوەك داپیۆشێ ، هەر لەوێدا ئافرەتێکی ڕەشی بالاّ بەرزم بینی سزا دەدرێت بە هۆی ئەزێت دانی بۆ پشیلەیەکەوە کە بەندی کرد بو خواردن و خواردنەوەی لێ گرتبوەوە و نەیهێشتبو بۆ خۆی بگەڕێ و خشت و خۆڵی زەوی بخوات، هەروەها لە دۆزەخدا ئەبو ثومامە ( عەمری کوڕی مالیك ) م بینی ڕیخۆڵەکانی ڕادەکێشا لەناو ئاگردا ، ئەوجا نەزان و نەفامەکان دەیانگوت خۆر و مانگ ناگیرێت مەگەر بۆ مردنی کەسێکی گەورە ، بەڵام ئەو دوانە دوو ئایەت و نیشانەی**

**پەروەردگارن خوای گەورە پیشانی ئێوەی دەدات ، جا هەر کاتێ گیران ئێوە نوێژ بکەن تا بەردەبن .**

١٥٨٩- عرضت علي الجنة حتى لو مددت يدي تناولت من قطوفها وعرضت علي النار فجعلت أنفخ خشية أن يغشاكم حرها ورأيت فيها سارق بدنة رسول الله ورأيت فيها أخا بني دعدع سارق الحجيج فإذا فطن له قال هذا عمل المحجن ورأيت فيها امرأة طويلة سوداء تعذب في هرة ربطتها فلم تطعمها ولم تسقها ولم تدعها تأكل من خشاش الأرض حتى ماتت وإن الشمس والقمر لا ينكسفان لموت أحد ولا لحياته ولكنهما آيتان من آيات الله فإذا انكسف أحدهما فاسعوا إلى ذكر الله عز وجل .

(صحيح) (ن) عن ابن عمر. (صحيح النسائي ١٤٩٦)

**١٥٨٩- بەهەشتم نیشاندراو خرایە بەردەستم و تەنانەت دەستم درێژ کرد میوەیەکی لێ بکەمەوە ، و دۆزەخیش خرایە بەردەستم و منیش فووم لێکرد و ترسام کە تینی بۆتان بێت ، هەروەها ئەو کەسەم بینی کە حەیوانە دابەستەکەی منی دزیبوو ، هەروەها پیاوەکەی تایەفەی بەنی ( جەعجەع )م بینی کە لە دزی حاجیەکان کردبوو کاتێ کە پێی زانرا وتبووی : ئەوە ئیشی گۆچانەکەم بوو ، هەروەها لە دۆزەخدا ئافرەتێکی درێژی ڕەش پێستم بینی سزا دەدرا لەسەر پشیلەیەك ، کە بەستبوویەوە و خواردن و خواردنەوەی لێ گرتبوەوە و نەیهێشتبوو بڕوات بۆ خۆی خشت و خۆڵی زەوی بخوات هەتا مردار بو بوەوە ، ئەوجا بزانن کە خۆر و مانگ ناگیرێن بۆ ژیان و مردنی هیچ کەسێك بەڵکو دوو ئایەت و نیشانەی پەروەردگارن ، هەرکامیان گیران پەنابەرن بۆ یادی خوا جل جلالە.**

١٥٩٠- كان يأمر بالعتاقة في صلاة الكسوف.

(صحيح) (د ك) عن أسماء. (صحيح أبي داود ١٠٧٨)

**١٥٩٠- پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمانی دەکرد بە کۆیلە ئازادکردن لە کاتی نوێژی خۆر و مانگ گیران دا .**

# بابەتی نوێژە بارانە

١٥٩١- إنكم شكوتم جدب دياركم واستئخار المطر عن إبان زمانه عنكم وقد أمركم الله عز وجل ووعدكم أن يستجيب لكم { الحمد لله رب العالمين الرحمن الرحيم مالك يوم الدين } لا إله إلا الله يفعل ما يريد اللهم أنت الله لا إله إلا أنت الغني ونحن الفقراء أنزل علينا الغيث واجعل ما أنزلت لنا قوة وبلاغا إلى حين .

(صحيح) (د ك) عن عائشة. (صحيح أبي داود ١٠٦٤)

**١٥٩١- ئێوه دەردەدڵ و بێزاری خۆتـان لـه وشکه سـاڵی و قـات و قـری دەکـەن بـاران بارینیش درەنگ کەوت لە سەردەمی ئێوەدا خوا فەرمانی پێکـردوون و بەڵێنیـشی پـێ داوون کە لێتان گیرا بکات( هەرچی سوپاس و ستایش هەیـه شایـستەی پـەروەردگاری جیهانیانە بە میهرەبـان و بە سۆزوو بەزەییە، پاشاو کاربەدەسـتی رۆژی دواییـه )هـیچ پەرستراوێك بە حەق نیە جگە لە الله و هەرچی بیـەوێت دەیکـات، خودایـه تـۆ الله ی هـیچ پەرسـتراوێك بـه حـەق نیـه لـه تـۆ بێنیـازو دەوڵەمەنـدی و ئێمـەش هـەژاروو گەدا، بارانی فریاد رەسمـان بـۆ ببارێنـه و ئـەوەش بۆمـان دەبـارێنی بیکـەرە هێـزوو گەیشتنمان بە قۆناغێکی تری ژیا نمان.**

١٥٩٢- كان إذا استسقى قال اللهم اسق عبادك وبهائمك وانشر رحمتك وأحيي بلدك الميت.

(صحيح) (د) عن ابن عمرو. (المشكاة ١٥٠٦)

**١٥٩٢- پێغەمبـەری خـوا ( ﷺ ) کاتێـك نوێـژە بـارانی دەکـرد دەیفـەرموو خوایـه بـاران ببارێنە بۆ بەنـدەکانت و ئاژەڵـەکانت بـەزەیی و میهرەبـانی خـۆت پـەخش بکـەو وڵاتـی مردووی خۆت زیندوو بکەرەوە.** [1]

[1] ( مەبەست ئەوەیە لە تینوێتیدا مردووە )

## بابەتی نوێژی ئیستیخارە ( ڕوو لە خێرکردن )

١٥٩٣- إذا هم أحدكم بالأمر فليركع ركعتين من غير الفريضة ثم ليقل اللهم إني أستخيرك بعلمك وأستقدرك بقدرتك وأسألك من فضلك العظيم فإنك تقدر ولا أقدر وتعلم ولا أعلم وأنت علام الغيوب اللهم فإن كنت تعلم هذا الأمر وتسميه باسمه خيرا لي في ديني ومعاشي وعاقبة أمري فاقدره لي ويسره لي ثم بارك لي فيه اللهم وإن كنت تعلمه شرا لي في ديني ومعاشي وعاقبة أمري فاصرفني عنه واصرفه عني واقدر لي الخير حيث كان ثم رضني به .

(صحيح) (حم خ ٤ ) عن جابر. (صحيح أبي داود ١٣٧٦)

**١٥٩٣- ئەگەر یەکێکتان بە خەیاڵیدا هات کارێك ئەنجام بدات با دوو رکات نوێژ بکات جگە لە فەرزەکان ئینجا بڵێت ( خوایە بەراستی من داوای خێرت لێ دەکەم کە بە زانستی خۆت ئەم کارەم بۆ یەکلا بکەیتەوە وە داوات لێ دەکەم بە توانای خۆت ئەم کارەم بۆ یەکلا بکەرەوە داوات لێ دەکەم بە بەخشندەی خۆت و گەورەیی خۆت بێگومان تۆ دەتوانی و من ناتوانم و تۆ دەزانی و من نازانم و تۆ زانای پەنهان و نادیارەکانی، جا خوایە ئەگەر دەزانی ئەم کارە( ناوی کارەکە دەبەی )خێری تێدایە بۆ دین و ژین وسەر ئەنجامی فەرمانم بۆم بریار بدەو بۆشم ئاسان بکەو ئینجا فەروو پیرۆزیشم بۆ تێخە،وە خودایە ئەگەر دەزانی بۆ دین و ژین و سەرئەنجام و ئیش و کارم نادرووستی پێوەیە منی لێ لادەو ئەویش لە من لادە و خێر لە کوێیە ئەوەم بۆ بریار بدە و رازیم بکە پێی.**

## بابەتی نوێژی تەسبیح

١٥٩٤- يا عباس يا عماه ألا أعطيك ألا أمنحك ألا أحبوك ألا أفعل بك عشر خصال إذا أنت فعلت ذلك غفر الله ذنبك أوله وآخره قديمه وحديثه خطأه وعمده صغيره وكبيره سره وعلانيته عشر خصال أن تصلي أربع ركعات تقرأ في كل ركعة فاتحة الكتاب وسورة فإذا فرغت من القراءة في أول ركعة وأنت قائم قلت سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر خمس عشرة مرة ثم تركع فتقولها وأنت راكع عشرا ثم ترفع رأسك من الركوع فتقولها عشرا ثم تهوي ساجدا فتقولها وأنت ساجد عشرا ثم ترفع رأسك من السجود فتقولها عشرا ثم تسجد فتقولها عشرا ثم ترفع

رأسك فتقولها عشرا فذلك خمس وسبعون في كل ركعة تفعل ذلك في أربع ركعات فلو كانت ذنوبك مثل زبد البحر أو رمل عالج غفرها الله لك إن استطعت أن تصليها في كل يوم مرة فافعل فإن لم تفعل ففي كل جمعة مرة فإن لم تفعل ففي كل شهر مرة فإن لم تفعل ففي كل سنة مرة فإن لم تفعل ففي عمرك مرة .

(صحيح) (د ن هـ ابن خزيمة ك) عن ابن عباس. (المشكاة ١٣٢٨)

**١٥٩٤- ئەی عەباس ! ئەی مامی خۆم ئایا شتێکت بدەمێ ؟ ئایا شتێکت پێ ببەخشم؟ ئایا ئێستا ( دە ) کارت پێ جێ بەجێ بکەم ، ئەگەر هەستایت پێیان ئەوە خوای گەورە لە گوناهی سەرەتا و کۆتایت دەبورێ، گوناهی کۆن و تازەت، ئەوانەی بە ئەنقەست یان بە هەڵە کردوتن، گوناهی گەورە و بچوك نهێنی و ئاشکرا ؟ دە ئیش و کارە : چوار ڕکات نوێژ بکە لە هەموو ڕکاتێکدا سورەتی ( فاتحە ) و سورەتێکی تر بخوێنە، ئەوجا کە لە خوێندنەوەی قورئان بوویتەوە تۆ هەر بە پێوە ڕاوەستاویت و لە ڕکاتی یەکەمدایت پانزە بڵێ ( سبحان الله و الحمد لله و لااله الاالله و الله اكبر ) پاشان بڕۆ بۆ ( ڕکوع ) بردن و هەمان یادی خوا لە کاتی ( ڕکوع ) کرنوشدا دە جار بڵێ ، پاشان کە سەرت بەرز کردەوە لە ( ركوع )کرنوش ( ١٠ ) جاری تر ئەو یادانە بڵێ ، پاشان بڕۆ بۆ سوژدە بردن و لە کاتی سوژدە بردن دا ( ١٠ ) جاری تر بیلێرەوە ، پاشان کە سەرت بەرز کردەوە لە سوژدە ( ١٠ ) جاری تر بیلێرەوە پاشان کە سەرت بردەوە بۆ سوژدە ( ١٠ ) جاری تر بیلێرەوە ، پاشان کە سەرت بەرزکردەوە جارێکی تر لە سوژدە ( ١٠ ) جاری تر بیلێرەوە، بەمەش دەبێتە ( ٧٥ ) جار لە یەك ڕکاتدا و بەم شێوەیە لەهەر چوار ڕکاتەکەدا ئەنجامیان دەدەیت، جا ئەگەر گوناهەکانت وەك کەفی سەر دەریا بن یا وەك ڕملی کۆکراوە و زۆر بن خوای گەورە لێت خۆش دەبێت ، جا ئەگەر ئەتوانی لە هەموو ڕۆژێکدا یەك جار ئەم نوێژە بکەیت ئەوە بیکە ، ئەگەر بۆت نەکرا لە هەموو هەینییەکدا جارێك ، ئەگەر بۆت نەکرا لە هەموو مانگێك یەك جار گەر بۆت نەکرا ئەوا لە هەموو تەمەنتدا یەك جار ئەنجامی بدە.**

١٥٩٥- يا عم ألا أصلك ألا أحبوك ألا أنفعك تصلي يا عم أربع ركعات تقرأ في كل ركعة بفاتحة الكتاب وسورة فإذا انقضت القراءة فقل الله أكبر والحمد لله وسبحان الله ولا إله إلا الله خمس عشرة مرة قبل أن تركع ثم اركع فقلها عشرا قبل أن ترفع رأسك ثم ارفع رأسك فقلها عشرا قبل أن تسجد ثم اسجد فقلها عشرا قبل أن ترفع رأسك ثم ارفع رأسك فقلها عشرا ثم اسجد فقلها عشرا ثم ارفع

تقلها عشرا قبل أن تقوم فتلك خمس وسبعون في كل ركعة وهي ثلاث مائة في أربع ركعات فلو كانت ذنوبك مثل زبد البحر أو رمل عالج غفرها الله لك إن لم تستطع أن تصليها في كل يوم فصلها في كل جمعة فإن لم تستطع فصلها في كل شهر فإن لم تستطع فصلها في كل سنة .

(صحيح) (ت هـ) عن أبي رافع . (المشكاة ١٣٢٨)

**١٥٩٥- ئەی مامە! ئایا پەیوەندی خزمایەتی خۆشەویستی و سود پێ گەیاندن شتێکت بۆ دەربڕم وەك؟ ئایا خۆشەویستی و ئەویندارى خۆمت بۆ دەربڕم و شتێکت بۆ بکەم ؟ ئایا شتێکی بەسوودت پێ بڵێم ؟ چوار ڕکات نوێژ لەهەر ڕکاتێکیاندا سوڕەتی فاتحە و سوڕەتێکی تر بخوێنە جا کە لێبویتەوە لە خوێندنی قورئان پانزەجار بڵێ:**

**( الله اکبر الحمد لله سبحان الله و لااله الاالله ) پانزە جار پێش ئەوەی ( ڕکوع )کرنوش ببەیت ، پاشان ( ڕکوع )کرنوش ببە و ( ١٠ ) جار ئەو پیاوانە بڵێرەوە پێش ئەوەی سەر بەرز بکەیتەوە ، پاشان سەر بەرز بکەرەوە و ( ١٠ ) جار بیلێرەوە پێش ئەوەی بچیتە سوژدە ، پاشان بەرەو سوژدە برۆ و ( ١٠ ) جار بیلێرەوە پێش ئەوەی سەرت لە سوژدە بەرز بکەیتەوە ، پاشان سەر بەرز بکەرەوە و ( ١٠ ) جار بیلێرەوە پێش ئەوەی هەستیتەوە بۆ ڕکاتی دووەم ، بەم شێوەیە دەکاتە ( ٧٥ ) جار لە یەك ڕکاتدا ، وە لە چوار ڕکاتدا دەگاتە ( ٣٠٠ ) جار کە ئەو چوار سادە دەڵێیتەوە ، جا ئەگەر گوناهەکانت بە وێنەی کەفی سەر دەریا بن یا بە ئەندازەی تە پۆڵکەیەك لم بن ئەوە خوای گەورە لێت دەبورێت، جا ئەگەر هەموو ڕۆژێ ئەم نوێژەت بۆ نەکرا .هەفتەی جارێك بیکە ئەگەر هەر نەتوانی مانگی جارێك ئەگەر هەر نەتوانی ساڵی جارێ.**



# پەراوى تەرمەكان

## بابەتى ئەوەى پێويستە لەسەر نەخۆش

١٥٩٦- اثنتان يكرههما ابن آدم يكره الموت والموت خير له من الفتنة ويكره قلة المال وقلة المال أقل للحساب .

(صحيح) (ص حم) عن محمود بن لبيد. (الصحيحة ٨١٣)

**١٥٩٦- دوو شت هەيە ئادەميزاد حەزى لىٚ ناكات : حەز لەمردن ناكات و مردنيش چاكترە بۆى لە ئاژاوە، حەزيش لە دەست كورتى ناكات و كەم دەرامەتيش حسابى كەمترە.**

١٥٩٧- لا يموتن أحد منكم إلا وهو يحسن الظن بالله تعالى.

(صحيح) (حم م د هـ) عن جابر. (المشكاة ١٦٠٥)

**١٥٩٧- با كەسێك لە ئێوە نەمرێت تا گومانى باش بە خواى خۆى نەبات .**

١٥٩٨- لقنوا موتاكم لا إله إلا الله.

(صحيح) (حم م ٤ ) عن أبي سعيد (م هـ) عن أبي هريرة (ن) عن عائشة. (الإرواء ٦٧٨)

**١٥٩٨- ئەوانەتان لەسەرە مەرگدان فێريان بكەن بڵێن ( لا إله الا الله ).**

١٥٩٩- لقنوا موتاكم لا إله إلا الله فإن نفس المؤمن تخرج رشحا ونفس الكافر تخرج من شدقه كما تخرج نفس الحمار.

(حسن) (طب) عن ابن مسعود. (الصحيحة ٢١٥١)

**١٥٩٩- ئەوانەتان لەسەرە مەرگدان با لە دوا ئێومووە تەلقينيان بكەن بڵێن ( لا إله الا الله ) چونكە گيانى ئيماندار وەكو ئارەق كردن دەردەچێت گيانى بىٚ باوەڕيش لە دەمييەوە دەردەچێت وەكو چۆن گيانى گوێدرێژ دەردەچێت.**

١٦٠٠- موت الفجأة أخذة أسف.

(صحيح) (حم د) عن عبيدالله بن خالد. (المشكاة ١٦١١)

**١٦٠٠- مردنی کتوپڕ بردنەوەیە بە خەم و پەژارە.**

١٦٠١- لقنوا موتاكم لا إله إلا الله فإنه من كان آخر كلامه لا إله إلا الله عند الموت دخل الجنة يوما من الدهر وإن أصابه قبل ذلك ما أصابه.

(صحيح) (حب) عن أبي هريرة. (الإرواء ٦٧٩)

**١٦٠١- ئەوانەتان لەسەرە مەرگدان بڵێن (لا إله الا الله) چونکە هەرکەسێك لە کاتی مردنیدا ئەوە دوا وشەی بێت دەچێتە بەهەشتەوە با هەرچیشی تووش بوو بێت پێش ئەوە.**

١٦٠٢- لا إله إلا الله إن للموت سكرات.

(صحيح) ( حم خ ) عن عائشة. (المشكاة ٥٩٥٩)

**١٦٠٢- (لا إله إلا الله) بەڕاستی مردن ژان و سۆی هەیە.**

## بابەتی نیشانەکانی ئاخر خێری

١٦٠٣- إن الملائكة لا تحضر جنازة الكافر بخير ولا المضمخ بالزعفران ولا الجنب.

(حسن) (حم د) عن عمار بن ياسر. (الترغيب ٢٣٧٤)

**١٦٠٣- فریشتەکان ئامادەی تەرمی بێ باوەڕ نابن بەچاکە یان کەسێك سەرتاپا نرا بێتە زاعفەران، یان کەسێکی لەش گران.**

١٦٠٤- خصال ست ما من مسلم يموت في واحدة منهن إلا كان ضامنا على الله أن يدخله الجنة: رجل خرج مجاهدا فإن مات في وجهه كان ضامنا على الله و رجل تبع جنازة فإن مات في وجهه كان ضامنا على الله و رجل توضأ فأحسن الوضوء ثم خرج إلى المسجد لصلاة فإن مات في وجهه كان ضامنا على الله و رجل في بيته لا يغتاب المسلمين و لا يجر إليه سخطا و لا تبعة فإن مات في وجهه كان ضامنا على الله.

(صحيح) ( طس ) عن عائشة. (الترغيب ٢٧٣٩)

**١٦٠٤- شەش خەسڵەت هەیە ،هیچ موسڵمانێك نییە لەیەکێکیاندا بمرێت و خوا بەهەشتی بۆ مسۆگەر نەکات: پیاوێك بۆ جیهاد دەرچوویێت ئەگەر لەو ڕێگایە تیا چوو**

**خوای گەورە دەسەتەبەری ئەوە پیاویکیش شوێن تەرمێك کەوتبێت ئەگەر لەو ڕێگایە مرد خوای گەورە دەستەبەری ئەوە، پیاویکیش سەردانی نەخۆشێك بکات ئەگەر لەو ڕێگایەدا مرد خوای گەورە دەستبەری ئەوە پیاویکیش دەست نوێژ بەباشی بگرێت بچێت بۆ مزگەوت بۆ نوێژ، ئەگەر لەو ڕێگایەدا مرد خوای گەورە دەستەبەری ئەوە پیاویکیش چووە بۆ لای پێشەواوەیەك نەچووە بۆ لای بۆ ڕێز گرتن و مەزن ڕاگرتنی نەبێت ئەگەر لەو ڕێگایەدا بمرێت خوای گەورە دەستەبەری ئەوە ، پیاویکیش لەماڵی خۆیدا غەیبەتی موسلمانان ناکات ، قین و لێپرسراوێتی بۆ خۆی ڕانەکێشێت ، ئەگەر لەو ڕێگایەدا بمرێت خوای گەورە دەستەبەری ئەوە.**

١٦٠٥- إذا أراد الله بعبد خيرا استعمله قيل ما يستعمله قال يفتح لـه عمـلا صـالحا بـين يـدي موته حتى يرضي عليه من حوله.

(صحيح) (حم ك) عن عمرو بن الحمق. (الصحيحة ١١١٤)

**١٦٠٥- ئەگەر خوای گەورە چاکەی بوێت بۆ بەندەیەکی بەکاری دەهێنێت ، وترا: واتای چییە بە کاری دەهێنێت؟ فەرمووی: چاکی بۆ دەرەخسێنێت پێش مردنی تاکو خەڵکی دەورویەری لێی ڕازی بێت.**

١٦٠٦-إذا أراد الله بعبد خيرا استعمله قيل كيف يستعمله قال يوفقه لعمل صالح قبل الموت ثـم يقبضه عليه.

(صحيح) (حم ت حب ك) عن أنس. (المشكاة ٥٢٨٨)

**١٦٠٦- ئەگەر خوای گەورە چاکەی بوێت بۆ بەندەیەکی بەکاری دەهێنێ ، وترا: واتای چییە بەکاری دەهێنێت؟ فەرمووی: ڕێگای کردەوەیەکی چاکەی بۆ هەموار دەکات پێش مردنی ئەمجار دەییاتەوە لای خۆی.**

١٦٠٧- إذا أراد الله بعبد خيرا طهره قبل موته قالوا وما طهور العبد قـال عمـل صـالح يلهمـه إياه حتى يقبضه عليه.

(صحيح) (طب) عن أبي أمامة. (الصحيحة ١٣٣٤)

**١٦٠٧- ئەگەر خوای گەورە چاکەی بۆ بەندەیەکی بوێت بیەوێت پاکی دەکاتەوە پێش مردنی ، وتیان: چۆنە پاککردنەوەی بەندە؟ فەرمووی: کردەوەیەکی چاك دەخاتە دڵیەوە هەتا گیانی دەکێشێ.**

١٦٠٨- إذا أراد الله بعبد خيرا عسله قيل وما عسله قال يفتح له عملا صالحا قبل موته ثم يقبضه عليه.

(صحيح) (حم طب) عن أبي عنبة. (الصحيحة ١١١٤)

**١٦٠٨- ئەگەر خوای گەورە چاکەی بوێت بۆ بیەوێت بەندەیەکی شیرین و هەنگویناوی دەکات. ووتیان: چۆن هەنگویناوی دەکات؟ فەرمووی: کارێکی چاکەی بۆ دەکاتەوە پێش مردنی دوایی گیانی دەکێشێت.**

١٦٠٩- أيما مسلم شهد له أربعة بخير أدخله الله الجنة أو ثلاثة أو اثنان.

(صحيح) (حم خ ن) عن عمر. (الجنائز ص٤٥)

**١٦٠٩- هەر موسوڵمانێك چوار کەس شایەتی چاکەی بۆ بدەن خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە یان سێ کەس یان دوو کەس .**

١٦١٠- خير الناس من طال عمره وحسن عمله وشر الناس من طال عمره وساء عمله.

(صحيح) (حم ت ك) عن أبي بكرة. (المشكاة ٥٢٨٥)

**١٦١٠- چاکترین کەس ئەو کەسەیە تەمەنی درێژ بێت و کردەوەی باش بێت ، خراپترین کەسیش ئەو کەسەیە تەمەنی درێژ بێت و کردەوەی خراپ بێت .**

١٦١١- خير الناس من طال عمره وحسن عمله.

(صحيح) (حم ت) عن عبدالله بن بسر. (الصحيحة ١٨٣٦)

**١٦١١- چاکترین کەس ئەو کەسەیە تەمەنی درێژ بێت و کردەوەی چاك بێت .**

١٦١٢- خياركم أطولكم أعمارا وأحسنكم أعمالا.

(صحيح) (ك) عن جابر. (الصحيحة ١٢٩٨)

**١٦١٢- چاکترینتان تەمەن درێژترینتانە کە کردەوەکانی چاك بێت کە کردەوەیانیش چاکە .**

١٦١٣- طوبى لمن طال عمره وحسن عمله.

(صحيح) (طب حل) عن عبدالله بن بسر. (الصحيحة ١٨٣٦)

**١٦١٣- ( بەهەشت ) خۆشبەختی بۆ کەسێك تەمەنی درێژ بێت و کردەوەشی چاك بێت.**

١٦١٤- إن الرجل إذا مات بغير مولده قيس له من مولده إلى منقطع أثره في الجنة.

(حسن) ( ن هـ ) عن ابن عمرو . (المشكاة ١٥٩٣)

**١٦١٤- ئەو کەسەی لەجێگایەك بمرێت جگە لەو جێگای کە لێی لەدایك بووە لە جێگەی لەدایك بوونیەوە تا ئەو جێگایەی پێی گەیشتووە بۆی دەپێون لە بەهەشتدا.**

١٦١٥- إن المؤمن تخرج نفسه من بين جنبيه و هو يحمد الله تعالى.

(صحيح) ( هب ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٦٣٢)

**١٦١٥- ئیماندار گیانی دەردەچێت لە نێوان هەردوو تەنیشتیدا و سوپاسی خوا دەکات.**

١٦١٦- المؤمن بخير على كل حال تنزع نفسه من بين جنبيه و هو يحمد الله.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عباس. (الصحيحة ١٦٣٢)

**١٦١٦- ئیماندار لەهەموو بارێکدا لە چاکە دایە گیانی دەردەچێت و سوپاسی خوا دەکات.**

١٦١٧- إني لأعلم كلمة لا يقولها عبد عند موته إلا كانت نورا لصحيفته و إن جسده و روحه ليجدان لها روحا عند الموت.

(صحيح) ( ن هـ حب ) عن طلحة . (الجنائز ٣٤)

**١٦١٧- من وشەیەك دەزانم هەر بەندەیەك لەسەرە مەرگیدا بیلێت دەبێتە ڕۆشنایی بۆ لاپەڕەکەی ، لاشە و گیانیشی لەکاتی مردندا هەست بە ئارامی دەکەن.**

## بابەتی ئەو ڕێزەی بڕوادار پیٚ ی شاد دەبێت

١٦١٨- إذا حضر المؤمن أتته ملائكة الرحمة بحريرة بيضاء فيقولون: اخرجي راضية مرضيا عنك إلى روح و ريحان و رب غير غضبان فيخرج كأطيب ريح المسك حتى إنه ليناوله بعضهم بعضا حتى يأتوا به باب السماء فيقولون: ما أطيب هذا الريح التي جاءتكم من الأرض ! فيأتون به أرواح المؤمنين فلهم أشد فرحا به من أحدكم بغائبه يقدم عليه فيسألونه: ماذا فعل فلان ؟ ماذا فعل فلان ؟ فيقولون: دعوه فإنه كان في غم الدنيا فإذا قال: أما أتاكم ؟ قالوا: ذهب به إلى أمه الهاوية و إن الكافر إذا حضر أتته ملائكة العذاب بمسح فيقولون: اخرجي ساخطة مسخوطا عليك إلى عذاب الله فيخرج كأنتن ريح جيفة حتى يأتوا بها باب الأرض فيقولون: ما أنتن هذه الريح ؟ حتى يأتوا بها أرواح الكفار.

(صحيح) ( ن ك ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٣٠٩)

**١٦١٨- کاتێك موسڵمان لە سەرەمەرگ دایە نزیك دەبێتەوە فریشتەکانی میهرەبانی ئاوریشمێکی سپی دەهێنن و دەڵێن :( بەگیانی ئەو موسڵمانە ) دەرچۆ بەڕازێتی و**

**لێرازیبوونـەوە بـەرەو ئاسـسودەیی و ڕێحانـە و بـۆ لای خوایـەك كـەتوڕە نییـە لێـت ئـیتر گیانەكە وەكو خۆشترین بۆنی میسك دەردەچێت تەنانەت لەنێوان خۆیاندا دەستاو دەستی پێدەكەن تاكو دەیگەیەننە دەرگای ئاسمان و دەڵێن: ئەو بۆنە چەند خۆشە لـە زەوییـەوە هات بۆتان! ئینجا دەیهێننە لای گیانی ئیمانـداران ئـەوانیش ئەوەنـدەی دڵیـان پـێ ی خـۆش دەبێت زیاتر لە دڵخۆش بوونی ئێوە بە گەڕانەوەی كەسێكی غـەریبتان و پرسـیاری لێ دەكـەن فڵانە كەس چی كرد؟ فڵانە كەس چی كرد؟ ئینجا دەڵێن: وازی لێبهێنن ئەو لە خەم و پـەژارەی دوونیادایە ، كە دەڵێت ئایا نەهاتە لاتان؟ دەڵـێن: بـردرا بـەرەو دۆزەخ ، كەسـی بێبـاوەڕیش فریشتەكانی ئەشكە نجە دێنە لای و دەڵـێن: دەرچـۆ بـە بێـزاری و قـین بەسـەردا ڕژاوی بـەرەو سزای خوا ئیتر وكو ناخۆشترین بۆنی لاكێك دەردەچێت تاكو دەیگەیەننە دەرگـای زەوی و دەڵـێن چەند بۆ نێكی ناخۆشە؟ تاكو دەیهێننە لای گیانی بێ باوەڕان.**

١٦١٩- إذا خرجت روح العبد المؤمن تلقاها ملكان يصعدان بها - فذكر من ريح طيبها - و يقول أهل السماء: روح طيبة جاءت من قبل الأرض صلى الله عليك و على جسد كنت تعمرينه فينطلق به إلى ربه ثم يقول: انطلقوا به إلى آخر الأجل و إن الكافر إذا خرجت روحه - فذكر من نتنها - و يقول أهل السماء: روح خبيثة جاءت من قبل الأرض فيقال: انطلقوا به إلى آخر الأجل.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة . (المشكاة ١٦٢٨)

**١٦١٩- كە گیانی ئیماندار دەردەچێت دوو فریـشتە پێـشوازی لێ دەكـەن و بـەرزی دەكەنـەوە - ئیتر باسی بۆنە خۆشەكەی كرد- خەڵكی ئاسمان دەڵێت: گیانێكی بۆن خۆش هات لەزەوییـەوە سۆزی خوات لەسەر بێت و لەسەر ئەو جەستەی تۆ ئاوەدانت كردبوویەوە ئینجا دەیبـەن بـۆ لای پەروەردگاری ئینجا دەڵێت: بیبەن بەرەو كۆتایی ئەجەلەكەی كەسی بێ بـاوەڕیش كـە گیـانی دەردەچێت -ئیتر باسـی بۆگـەنی گیانەكـەی كـرد- خـەڵكی ئاسمـان دەڵـێن: گیـانێكی پـیس لەزەوییەوە هات ئینجا دەوترێت: بیبەن بەرەو كۆتایی ئەجەلەكەی.**

١٦٢٠- أرواح المؤمنين في أجواف طير خضر تعلق في أشجار الجنة حتى يردها الله إلى أجسادها يوم القيامة.

(صحيح) ( طب ) عن كعب بن مالك وأم مبشر . (المشكاة ١٦٣١)

**١٦٢٠- گیانی ئیمانداران لەناو پەیكەری مەلی سەوزدان بەسەر دارەكانی بەهەشتەوە تاكو خوای گەورە دەیانگێڕێتەوە بۆ جەستەكان لە ڕۆژی دواییدا.**

١٦٢١- إن أرواح المؤمنين في طير خضر تعلق بشجر الجنة.

(صحيح) ( هـ) عن أم بشر بن البراء بن معرور وكعب بن مالك . (الصحيحة ٩٩٥)

**١٦٢١- گيانى ئيمانداران لەناو پەيكەرى مەلى سەوزدان بەسەر دارەكانى بەهەشتەوە.**

## بابەتى چى دەڵێت ئەو كەسەى ئامادەى مردوێك دەبێت

١٦٢٢- إذا حضرتم الميت فقولوا خيرا فإن الملائكة يؤمنون على ما تقولون .

(صحيح) (حم ٤ حب ك) عن أم سلمة. (الجنائز ١٢)

**١٦٢٢- ئەگەر ئامادەى تەرمێك بوون قسەى باش بكەن چونكە فريشتەكان ( امين ) دەكەن لەسەر وتەكانتان.**

١٦٢٣-إذا حضرتم موتاكم فأغمضوا البصر فإن البصر يتبع الروح وقولوا خيرا فإن الملائكة تؤمن على ما يقول أهل البيت .

(حسن) (حم هـ ك) عن شداد بن أوس. (الصحيحة ١٠٩١)

**١٦٢٣- ئەگەر ئامادەى تەرمى مردووەكانتان بون چاويان بنوقێنن چونكە چاو بەدواى گياندا دەڕوات، ئينجا قسەى باش بكەن، چونكە فريشتەكان** (آمين) **دەكەن لەسەر قسەكانى خەڵكى ئەو ماڵە.**

## بابەتى ئەوەى پێويستە لەسەر نزيكانى مردوو

١٦٢٤- نفس المؤمن معلقة بدينه حتى يقضى عنه.

(صحيح) ( حم ت ه ك ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٩١٥)

**١٦٢٤- گيانى ئيماندار بەستراوەتەوە بە قەرزەكەيەوە تاكو بۆ دەدرێتەوە.**

١٦٢٥- ألم تروا إلى الإنسان إذا مات شخص بصره فذاك حين يتبع بصره نفسه.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة .

**١٦٢٥- ئايا نابينن كە مرۆڤ دەمرێت چاوى ئەبلەق دەبێت ئەوەيە كەچاو بەدواى گيانيدا دەڕوانێت.**

١٦٢٦- إن الروح إذا قبض تبعه البصر.

(صحيح) ( حم م هـ ) عن أم سلمة . (الجنائز ١٢)

**١٦٢٦- كه گيان دەردەچێت لە نێوان هەردوو تەنيشتيدا چاويش بە دوايدا دەڕوات.**

١٦٢٧- قولي: اللهم اغفر لي و له و أعقبني منه عقبى حسنة.

(صحيح) ( م ٤ ) عن أم سلمة. (الترغيب ٣٤٨٩)

**١٦٢٧- بڵێ: خوايە لە من و لە ئەويش خۆشبە بەفەرمووبووبيشم بكەرەوە بەشێوەيەكی باش.**

## بابەتی شيوەن

١٦٢٨- اثنتان في الناس هما بهم كفر الطعن في الأنساب والنياحة على الميت.

(صحيح) (حم م) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٨٩٦)

**١٦٢٨- دوو خەسڵەت هەيە لەناو خەڵكيدا لە كردەوەی بێ باوەڕانە: تانە وتەشەر لە رەچەڵەكی خەڵكی و شيوەن لەسەر مردوو.**

١٦٢٩- تدمع العين ويحزن القلب ولا نقول إلا ما يرضي الرب والله إنا بفراقك يا إبراهيم لمحزونون.

(صحيح) (حم م د) عن أنس. (فقه السيرة ٤٨٤)

**١٦٢٩- چاو فرمێسك دەڕێژرێت و ،دڵيش خەمبار دەبێت بەڵام هيچ ناڵێين پەروەردگارمان لێ ی رازی نەبێت سوێند بەخوا ئەی ئيبراهيم ئێمە بە دابڕانت لێمان خەمبارين.**

١٦٣٠- تدمع العين ويحزن القلب ولا نقول ما يسخط الرب ولولا أنه وعد صادق وموعود جامع وأن الآخر منا يتبع الأول لوجدنا عليك يا إبراهيم وجدا أشد مما وجدنا وإنا بك يا إبراهيم لمحزونون.

(حسن) ( ه ) عن أسماء بنت يزيد . (الصحيحة ١٧٣٢)

**١٦٣٠- چاو فرمێسك دەڕێژرێت و ، دڵيش خەمبار دەبێت بەڵام هيچ شتێك ناڵێين پەروەردگارمان تووڕە بكات ئەگەر بەڵێنێكی ڕاست و كاتێكی كۆكەرەوە نەبوايە و دوا كەسمان شوێنی يەكەم كەس نەكەوتايە خەمێكی زياتر لەم خەمەمان دەخوارد ئەی ئيبراهيم بەڕاستی ئێمە خەمبارين بۆت ئەی ئيبراهيم.**

١٦٣١- أربع بقين في أمتي من أمر الجاهلية ليسوا بتاركيها الفخر بالأحساب والطعن في الأنساب والاستسقاء بالنجوم والنياحة على الميت وإن النائحة إذا لم تتب قبل الموت جاءت يوم القيامة عليها سربال من قطران ودرع من لهب النار .

(صحيح) (حم طب ك) عن أبي مالك الأشعري. (الصحيحة ٧٣٣)

**١٦٣١- چوار شت لەئوممەتمدا ماونەتەوە کردەوەی لە نەفامی و وازیشی لێ نـاهێنن: شـانازی کردن بە وەجاخزادەیی و تانە و تەشەر لە ڕەچەڵەك و داوای بـاران کـردن لـە ئەستێرەکان و شیوەن لەسەر مردو ئەو کەسەش کەشیوەن دەکـات ئەگـەر نەگەڕێتـەوە پـێش مردنـی لـەڕۆژی قیامەتدا دێت و شەرواڵێکی قەتران لە پێدایە و قەڵغانێك لە بلێسەی ئاگر.**

١٦٣٢- نهى عن النوح ( والشعر ) والتصاوير وجلود السباع والتبرج والغناء والذهب والخز والحرير.

(صحيح) (حم) عن معاوية. (الضعيفة ٤٧٢٥)

**١٦٣٢- قەدەغەی کردووە لەشیوەن کردن و ، وێنە کێشان و پێستی دڕندە و خۆڕازاندنەوە گۆرانی و ئاڵتون و جلی تايبەت ئاوريشم.**

١٦٣٣- نهى رسول الله صلى الله عليه وسلم أن تتبع جنازة معها رانة.

(حسن) (هـ) عن ابن عمر. (الجنائز ٧٠)

**١٦٣٣- پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە کەسێك شوێن تەرمێك بکـەوێت دەنگـی شـیوەنی لەگەڵ بێت.**

١٦٣٤- إنما أنا بشر تدمع العين ويخشع القلب ولا نقول ما يسخط الرب والله يا إبراهيم إنا بك لمحزونون.

(صحيح) (ابن سعد) عن محمود بن لبيد. (الصحيحة ١٧٣٢)

**١٦٣٤- بەڕاستی من ئادەمیزادێکم ، چاو فرمێـسك دەڕێـژێت و دڵ خـەمبار دەبێـت بـەڵام هـیچ نـاڵێین پـەروەردگارمان تـوڕە بکـات، سـوێند بـەخوا ئـەی ئیـبراهیم ئێمـە بـۆ تـۆ خەمبارین.**

١٦٣٥- النائحة إذا لم تتب قبل موتها تقام يوم القيامة و عليها سربال من قطران و درع من جرب.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي مالك الأشعري. (الصحيحة ١٩٥٢)

**١٦٣٥- لاوێنەر ئەگەر تەوبە نەکات پێش مردنی لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەکرێتـەوە و شەرواڵێکی قەترانی لە پێدایە و کراسێکی گەڕۆڵی.**

١٦٣٦- لعن الله الخامشة وجهها و الشاقة جيبها و الداعية بالويل و الثبور.

(حسن) ( ه حب ) عن أبي أمامة. (الصحيحة ٢١٤٧)

**١٦٣٦- لەعنەت لەوەی بە نینۆك ڕوومەتی خۆی دەڕنێت و یەخە دادەڕێت و ، هاوار و شین و ڕۆڕۆی نا بەجێ دەکات.**

١٦٣٧- النياحة على الميت من أمر الجاهلية و إن النائحة إذا لم تتب قبل أن تموت فإنها تبعث يوم القيامة عليها سرابيل من قطران ثم يغلى عليها بدروع من لهب النار.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عباس. (صحيح ابن ماجه ١٥٨٢)

**١٦٣٧- لاواندن و شيوەن كردن لەسەر مردوو لە كردەوەی نەفامییە، لاوێنەر ( شین گێڕە ) ئەگەر تەوبە نەكات پێش مردنی ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەكرێتەوە و بەشەرواڵی قەترانەوە و قەڵغانی ئاگرین لە بڵێسە و كڵپە.**

١٦٣٨- من نيح عليه يعذب بما نيح عليه.

(صحيح) ( حم ق ت ) عن المغيرة. (الجنائز ٢٩)

**١٦٣٨- هەركەسێك شیوەنی لەسەر بكرێت لەسەر ئەو شیوەنە سزا دەدرێت.**

١٦٣٩- أنا بريء ممن حلق و سلق و خرق.

(صحيح) ( م ن هـ ) عن أبي موسى . (الإرواء ٧٦٣)

**١٦٣٩- من بێ بەریم لەو كەسەی قژی دەتاشێت و شیوەن دەكات و جل و بەرگی دادەڕێت.**

١٦٤٠- ليس منا من سلق و من حلق و من خرق.

(صحيح) ( د ن ) عن أبي موسى. (الإرواء ٧٦٣)

**١٦٤٠- لە ئێمە نییە ئەو كەسەی شیوەن بكات و سەری بتاشێت ( قژی بڕنێتەوە ) و جل و بەرگی دادرێت.**

١٦٤١- ليس منا من لطم الخدود و شق الجيوب و دعا بدعوى الجاهلية.

(صحيح) ( حم ق ت ن هـ ) عن ابن مسعود. (الإرواء ٧٦٢)

**١٦٤١- لە ئێمە نییە ئەو كەسەی لە ڕوومەت بدات و یەخە دادڕێت و بانگ بەبانگەوازی نەفامی بكات.**

١٦٤٢- ما من ميت يموت فيقوم باكيهم فيقول: وا جبلاه ! وا سنداه ! أو نحو ذلك إلا وكل به ملكان يلهزانه: هكذا كنت ؟ !.

(حسن) ( ت ) عن أبي موسى. (الترغيب ٣٥٢٢)

**١٦٤٢- هەر مردوویەك بمرێت و كەسێك بەگریانەوە بڵێت: هۆ ئەشكەوتەكەم هۆ پشت و پەناكەم یان قسەیەكی لەو جۆرە خوای گەورە دوو فریشتەی بۆ تەرخان دەكات و لێی دەدەن و دەڵێن: ئایا تۆ وابوویت؟.**

## بـابەتی شۆردنی مردوو

١٦٤٣- من غسله الغسل ومن حمله الوضوء - يعني الميت- .

(صحيح) (ت) عن أبي هريرة. (الجنائز ص٥٣)

**١٦٤٣- ئەوەی شۆردی خۆی بشۆرێت ئەوەی هەڵیگرت دەست نوێژ بگرێـت - واتە مردو -.**

١٦٤٤-من غسل الميت فليغتسل ومن حمله فليتوضأ

(صحيح) (د هـ حب) عن أبي هريرة. (المشكاة ٥٤١)

**١٦٤٤- هەرکەسێك مردوویەکی شۆرد با خۆی بشوات ، هەرکەسێکیش مردوویەکی هەڵگرت با دەست نوێژ بگرێت.**

١٦٤٥-من غسل ميتا فستره ستره الله من الذنوب ومن كفنه كساه الله من السندس .

(حسن) (طب) عن أبي أمامة. (الصحيحة ٢٣٥٣)

**١٦٤٥- هەرکەسێك مردوویەك بشوات و بیپۆشێت و، خوادای گەورە گوناهەکانی دادەپۆشێت هەرکەسێکیش کفنی بکات خوای گەورە ئاوریشمی لەبەر دەکات.**

١٦٤٦- من غسل ميتا فليغتسل.

(صحيح) (د هـ حب) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٤٥)

**١٦٤٦- هەرکەسێك مردوویەکی شۆرد با خۆی بشۆرێت.**

١٦٤٧- اغسلوه بماء و سدر و كفنوه في ثوبين و لا تمسوه طيبا و لا تخمروا رأسه و لا تحنطوه فإن الله يبعثه يوم القيامة ملبيا.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن ابن عباس . (الإرواء ١٢٣٤)

**١٦٤٧- بەئاو و کونار بیشۆرن و لە دوو پۆشاکدا کفنی بکەن و بۆنخۆشی مەکەن سەری دامەپۆشن و مۆمیاشی مەکەن چونکە خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا لە حاڵێکدا زیندووی دەکاتەوە کە دەڵێت:** (( لبيك اللهم لبيك )).

## بابەتی کفن کردنی مردوو

١٦٤٨- إذا أجمرتم الميت فأجمروه ثلاثا .

(صحيح) (حم هق الضياء) عن جابر. (الجنائز ٦٤)

**١٦٤٨- ئەگەر مردوتان بۆنخۆش کرد سێ جار بۆنخۆشی بکەن .**

١٦٤٩-إذا جمرتم الميت فأوتروا .

(صحيح) (حب ك) عن جابر. (الجنائز ٦٤)

**١٦٤٩- ئەگەر مردوتان بۆن خۆش کرد با بەتاك بێت.**

١٦٥٠- إذا توفي أحدكم فوجد شيئا فليكفن في ثوب حبرة.

(صحيح) (د الضياء) عن جابر. (الجنائز ٦٣)

**١٦٥٠- ئەگەر یەکێك لە ئێوە وەفات بکات و شتێك بدۆزێتەوە با لە پۆشاکێکی ((خەبیرەدا)) ڕەنگاوو ڕەنگ یان هێڵ کێشراو[1] کفن بکرێت.**

١٦٥١- من وجد سعة فليكفن في ثوب حبرة.

(صحيح) ( حم ) عن جابر. (الجنائز ٦٣)

**١٦٥١- ئەگەر کەسێك تواناى هەبوو با لە پۆشاکی حەبیرەدا کفن بکرێت.**

١٦٥٢- إذا ولي أحدكم أخاه فليحسن كفنه.

(صحيح) ( حم م د ن ) عن جابر ( ت هـ ) عن أبي قتادة . (الجنائز ٥٨)

**١٦٥٢- ئەگەر یەکێك سەرپەرشتیاری کەسێك بوو با کفنەکەی چاك بکات.**

١٦٥٣- إذا ولي أحدكم أخاه فليحسن كفنه فإنهم يبعثون في أكفانهم و يتزاورون في أكفانهم.

(صحيح) ( سمويه عق خط ) عن أنس . (الصحيحة ١٤٢٥)

**١٦٥٣- ئەگەر کەسێکتان سەرپەشتیاری براکەی بوو با کفنەکەی چاك بکات چونکە بێگومان ئەوان لەکفنەکانیاندا زیندوودەکرێنەوە سەردانی یەکتر دەکەن بە کفنەکانیانەوە.**

---

[1] **صحيح فقه السنه بەرگی یەك لاپەڕە ٦٣١.**

## بابەتی پەلەکردن لە بەرێ کردنی تەرمدا

١٦٥٤-أسرعوا بالجنازة فإن تك صالحة فخير تقدمونها إليه وإن تك سوى ذلك فشر تضعونه عن رقابكم.

(صحيح) (حم ق ٤ ) عن أبي هريرة. (الجنائز ٧١)

**١٦٥٤- پەلە بکەن لەناشتنی تەرمدا ئەگەر چاکەکار بێت چاکترە پێشی بخەن ، ئەگەریش وانەبێت خرا پەیەکە و لە گەردەن خۆتانی دەکەنەوە.**

١٦٥٥- إذا وضعت الجنازة واحتملها الرجال على أعناقهم فإن كانت صالحة قالت قدموني وإن كانت غير صالحة قالت لأهلها يا ويلها أين تذهبون بها يسمع صوتها كل شيء إلا الإنسان ولو سمعها الإنسان لصعق.

(صحيح) (حم خ ن) عن أبي سعيد. (الجنائز ٧٢)

**١٦٥٥- کاتێك تەرم دادەنرێت و پیاوان هەڵیدەگرن ئەگەر چاکەکار بێت دەڵێت: پێشم خەن، ئەگەریش وانەبێت بەکەس و کارەکەی دەڵێت: وای بۆ من بۆ کوێم دەبەن؟ هەموو شتێك گوێی لەدەنگی دەبێت مرۆڤ نەبێت ئەگەر گوێشی لێبوایە دەبورایەوە.**

## بابەتی هەستان لەبەر تەرمی مردوو

١٦٥٦- إذا رأيتم الجنازة فقوموا فمن تبعها فلا يقعد حتى توضع .

(صحيح) (حم ق ٣ ) عن أبي سعيد (خ) عن جابر (الصحيحة ٣٩٦٧)

**١٦٥٦- ئەگەر تەرمێکتان بینی هەڵسنە سەر پێ، هەرکەسێکیش شوێنی کەوت با دانەنیشێ تاکو دادەنرێت.**

١٦٥٧- إذا رأيتم الجنازة فقوموا لها حتى تخلفكم أو توضع .

(صحيح) (حم ق ٤ ) عن عامر بن ربيعة (صحيح الترمذي ١٠٤٢)

**١٦٥٧- ئەگەر تەرمێکتان بینی هەڵسن تاکو تێپەڕدەبێت یان دادەنرێت.**

١٦٥٨- إذا تبعتم الجنازة فلا تجلسوا حتى توضع.

(صحيح) (م) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٣٩٦٧)

**١٦٥٨- ئەگەر شوێن تەرمێك كەوتن دامەنیشن تاكو دادەنرێت.**

١٦٥٩- إذا رأى أحدكم جنازة فإن لم يكن ماشيا معها فليقم حتى يخلفها أو تخلفه أو توضع من قبل أن تخلفه.

(صحيح) (ق ن) عن عامر بن ربيعة. (صحيح النسائي ١٩١٥)

**١٦٥٩- ئەگەر یەكێكتان تەرمێكی بینی ئەگەر بە پێ لەگەڵیدا نەئەڕۆیشت با هەستێت هەتا تێدەپەڕێت یان ئەم بەجێ ی دێڵێت یان پێش ئەوەی بەجێ بهێڵێت دانرا.**

١٦٦٠- إن الموت فزع فإذا رأيتم الجنازة فقوموا.

(صحيح) (حم م د) عن جابر. (المشكاة ١٦٤٩)

**١٦٦٠- بێگومان مردن ترسناكە ئەگەر تەرمێكتان بینی هەستن.**

١٦٦١- إن للموت فزعا فإذا رأيتم جنازة فقوموا.

(صحيح) (ن حب) عن جابر. (الجنائز ٢٥٠)

**١٦٦١- مردن ترسناكە ئەگەر تەرمێكتان بینی هەستن.**

١٦٦٢- قوموا فإن للموت فزعا.

(صحيح) ( حم هـ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٠١٧)

**١٧٦٢- هەڵسن چونكە مردن ترس و بیمێكی هەیە.**

## بابەتی نوێژكردن لەسەر تەرم

١٦٦٣- إذا صليتم على الميت فاخلصوا له الدعاء

(حسن) (د هـ حب) عن أبي هريرة. (الإرواء ٧٣١)

**١٦٦٣- ئەگەر نوێژتان كرد لەسەر مردوو بەدڵسۆزی دوعای بۆ بكەن.**

١٦٦٤- اصنعوا لآل جعفر طعاما فإنه قد أتاهم ما يشغلهم .

(حسن) (حم د ت هـ ك) عن عبدالله بن جعفر. (الجنائز ١٦٦)

**١٦٦٤- خواردن بۆ خاو و خێزانی جەعفەر دروستكەن چونكە ئەوەی تووشیان بووە سەرقاڵی كردوون.**

١٦٦٥- ما من رجل يصلي عليه مائة إلا غفر له .

(صحيح) (طب حل) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٣٦٣)

**١٦٦٥- هیچ كەسێك نیە سەد كەس نوێژی لەسەر بكەن و خوای گەورە لێ ی خۆش نەبێت.**

١٦٦٦- إذا صلوا على جنازة فأثنوا خيرا يقول الرب أجزت شهادتهم فيما يعلمون وأغفر له ما لا يعلمون.

(صحيح) (تخ) عن الربيع بنت معوذ. (الصحيحة ١٣٦٤)

**١٦٦٦- ئەگەر نوێژتان كردە لەسەر تەرمێك و ستایشی چاكەیان كرد پەروەرگار دەڵێت: شایەتیەكەیانم وەرگرت لەوەی كە دەیزانن و لەمردووەكەش خۆش بووم لەوەی ئەوان نایزانن.**

١٦٦٧- نهى أن يصلي على الجنائز بين القبور.

(صحيح) (طس) عن أنس. (الجنائز ١٠٨)

**١٦٦٧- قەدەغەی كردووە نوێژ لەسەر تەرمەكان بكرێت لەناو گۆڕستاندا .**

١٦٦٨- إذا استهل الصبي صلي عليه و ورث.

(حسن) ( ت ن هـ حب ك هق ) عن جابر . (الصحيحة ١٥٣)

**١٦٦٨- ئەگەر منداڵ گریا لەكاتی لەدایك بووندا ئەوا نوێژی لەسەر دەكرێت و میراتی دەگرێت.**

١٦٦٩- من شهد الجنازة حتى يُصلي عليها فله قيراط ومن شهدها حتى تدفن كان لـه قيراطـان مثل الجبلين العظيمين.

(صحيح) (ق ن) عن أبي هريرة. (الترغيب ٣٤٩٨)

**١٦٦٩- هەر كەسێك ئامادەی تەرمێك ببێت تاكو نوێژی لەسەر دەكرێت ئەوە قیراتێك پاداشتی هەیە هەر كەسێكیش ئامادەی تەرمێك بێت تاكو دەنێژرێت دوو قیرات پاداشتی هەیە وەكو دوو كێوی گەورە.**

١٦٧٠- من صلى على جنازة فله قيراط فإن شهد دفنها فله قيراطان القيراط مثل أحد.

(صحيح) (م هـ) عن ثوبان. (الجنائز ٦٨)

**١٦٧٠- هەركەسێك لەسەر تەرمێك نوێژ بكات قیراتێك پاداشتی هەیە ئەگەر ئامادەی ناشتنەكەشی بێت دوو قیراتی هەیە قیراتێكیش وەكو ئوحود.**

١٦٧١- من صلى على جنازة فله قيراط ومن انتظرها حتى توضع في اللحد فله قيراطان والقيراطان مثل الجبلين العظيمين.

(صحيح) (حم ن هـ) عن أبي هريرة. (الجنائز ١٦٨)

**١٦٧١- هەر كەسێك نوێژ بكات لەسەر تەرمێك قیراتێك پاداشتی هەیە هەركەسێكیش چاوەڕوانی بكات تاكو دەخرێتە گۆڕیچەكەوە دوو قیراتی هەیە دوو قیراتەكەش وەكو دوو كێوی زەبەلاحە.**

١٦٧٢- من صلى على جنازة في المسجد فليس له شيء.

(صحيح) (حم هـ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٣٥١)

**١٦٧٢- هەر كەسێك لە مزگەوتێكدا نوێژ لەسەر تەرمێك بكات هیچی بۆ نییە.**

١٦٧٣- من صلى على جنازة ولم يتبعها فله قيراط فإن تبعها فله قيراطان.

(صحيح) (م ت) عن أبي هريرة. (الجنائز ١٦٨)

**١٦٧٣- هەر كەسێك نوێژ لەسەر تەرمێك بكات و شوێنی نەكەوێت یەك قیرات پاداشتی هەیە ئەگەر شوێنیشی بكەوێت دوو قیرات پاداشتی هەیە.**

١٦٧٤- من صلى عليه مائة من المسلمين غفر له.

(صحيح) (هـ) عن أبي هريرة. (الجنائز ٩٩)

**١٦٧٤- هەر كەسێك سەد كەس لە موسڵمانان نوێژی لەسەر بكەن خوای گەورە لێی خۆش دەبێت.**

١٦٧٥- ما من رجل مسلم يموت فيقوم على جنازته أربعون رجلا لا يشركون بالله شيئا إلا شفعهم الله فيه.

(صحيح) ( حم م د ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢٢٦٧)

**١٦٧٥- هیچ كەسێكی موسوڵمان نیە كە بمرێت و چل كەس لەسەر تەرمەكەی نوێژ بكەن كە هاوبەشیان بۆ خوا بڕیار نەدابێت خوا تكایان بۆی گیرا نەكات.**

١٦٧٦- ما من مسلم يصلي عليه أمة إلا شفعوا فيه .

(حسن) (حم طب) عن ميمونة . (الجنائز ص٩٩)

**١٦٧٦- هەر موسڵمانێك خەڵكانێك نوێژی لەسەر بكەن خوای گەورە شەفاعەتیان وەردەگرێت لە ئەو كەسەدا.**

١٦٧٧- ما من مسلم يموت فيقوم على جنازته أربعون رجلا لا يشركون بالله شيئا إلا شفعوا فيه.

(صحيح) (حم د) عن ابن عباس. (الجنائز ص٩٩)

**١٦٧٧- هیچ موسڵمانێك نامرێت و چل پیاو لەسەر تەرمەكەی نوێژ بكەن كە هاوبەش بۆ خوا پەیدا نەكەن تاكو خوای گەورە تكای ئەوان گیرا نەكات بۆ ئەو كەسە.**

١٦٧٨- بعثت إلى أهل البقيع لأصلي عليهم.

(صحيح) ( حم ) عن عائشة . (الصحيحة ١٧٧٤)

**١٦٧٨- رەوانەكرام بۆ لای خەڵكی بەقیع بۆ ئەوەی نوێژیان لەسەر بكەم.**

١٦٧٩- ما من أربعين من مؤمن يستغفرون لمؤمن إلا شفعهم الله فيه.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢٢٦٧)

**١٦٧٩- چل كەسی ئیماندار داوای لێخۆشبوون بكەن بۆ ئیمانداریك خوای گەورە تكایان لەو كەسەدا هەر وەردەگرێت.**

١٦٨٠- لا يموت أحد من المسلمين فيصلي عليه أمة من المسلمين يبلغوا أن يكونوا مائة فما فوقها فيشفعوا له إلا شفعوا فيه.

(صحيح) ( حم ت ن ) عن عائشة. (الجنائز ٩٨)

**١٦٨٠- هەر كەسێك لەموسڵمانان بمرێت و كۆمەڵێك لە موسڵمانان ژمارەیان بگاتە سەدكەس زیاتر نوێژی لەسەر بكەن خوای گەورە شەفاعەتی ئەوان وەردەگرێت لەو كەسەدا.**

١٦٨١- ما من ميت يصلي عليه أمة من المسلمين يبلغون أن يكونوا مائة فيشفعون له إلا شفعوا فيه.

(صحيح) ( حم م ن ) عن أنس وعائشة. (الجنائز ٩٨)

**١٦٨١- هەر مردوویەك كۆمەڵێك لە موسڵمانان نوێژی لەسەر بكەن كە بگەنە سەد كەس خوای گەورە شەفاعەتیان وەردەگرێت.**

١٦٨٢- ما من ميت يصلي عليه أمة من الناس إلا شفعوا فيه.

(حسن) ( ن ) عن ميمونة. (الصحيحة ١٢٦٣)

**١٦٨٢- هیچ مردوویەك نیە ئومەتێك نوێژی لەسەر بكەن حەتمەن خوا تكایان بۆی گیرا دەكات.**

١٦٨٣- لا أعرفن ما مات منكم ميت ما كنت بين أظهركم إلا آذنتموني به فإن صلاتي عليه له رحمة.

(صحيح) ( هـ) عن زيد بن ثابت. (الإرواء ٨٢٧)

**١٦٨٣- نامەوێت مردوویەكتان بمرێت و من لە ناوتاندابم و ئاگادارم نەكەنەوە چونكە بە ڕاستی نوێژی من لەسەری ڕەحمەتە بۆی.**

١٦٨٤- لا يموت فيكم ميت ما دمت بين أظهركم إلا آذنتموني به فإن صلاتي له رحمة.

(صحيح) ( ن ) عن يزيد بن ثابت. (الجنائز ٨٩)

**١٦٨٤- نابێت مردوویەکتان بمرێت و من لە ناوتاندابم و ئاگادارم نەکەنەوە چونکە بەڕاستی نوێژی من لەسەری ڕەحمەتە بۆی.**

## بابەتی بەڕێ کردنی تەرم

١٦٨٥- خمس تجب للمسلم على أخيه: رد السلام و تشميت العاطس و إجابة الدعوة و عيادة المريض و اتباع الجنازة.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة . (الضعيفة ٥٦٦٥)

**١٦٨٥- پێنج شت پێویستە لەسەر موسلمان بۆ براکەی: وەڵامدانەوەی سەلام، ئەوکەسەی کەدەپژمێت پێی بڵێیت (يرحمك الله)، ڕۆشتن بۆ دەعوەتی موسلمان و سەردانی نەخۆش و شوێن کەوتنی تەرم.**

١٦٨٦- الراكب خلف الجنازة و الماشي حيث شاء منها و الطفل يُصلى عليه.

(صحيح) ( حم ن ه ) عن المغيرة بن شعبة. (الجنائز ٧٣)

**١٦٨٦- سوار لەدوای تەرمەوە ڕێ دەکات پیادەیش لەکوێ بیەوێت مناڵیش نوێژی لەسەر دەکرێت.**

١٦٨٧- الراكب يسير خلف الجنازة و الماشي يمشي خلفها و أمامها و عن يمينها و عن يسارها قريبا منها و السقط يُصلى عليه و يُدعى لوالديه بالمغفرة و الرحمة.

(صحيح) ( حم د ت ك ) عن المغيرة. (الإرواء ٧٠٧)

**١٦٨٧- سوار لەدوای تەرمەوە ڕێ دەکات پیادەیش لە دواوەی و لە پێشیەوە و لای ڕاست و لای چەپ لەنزیکەوە ، لەبار چووش نوێژی لەسەر دەکرێت دووعاش بۆ باوك ودایکی دەکرێت بەلێخۆشبوون و بەزەیی.**

١٦٨٨- عودوا المريض و اتبعوا الجنازة تذكركم الآخرة .

(صحيح) ( حم حب هق ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ١٩٨١)

**١٦٨٨- سەردانی نەخۆش بکەن تەرمیش بەڕێ بکەن، با دوا ڕۆژتان بەبیر بخاتەوە.**

١٦٨٩- من تبع جنازة حتى يصلي عليها كان له من الأجر قيراط و من مشى مع الجنازة حتى تدفن كان له من الأجر قيراطان و القيراط مثل أحد.

(صحيح) ( حم ن ) عن البراء ( حم م ه ) عن ثوبان. (الجنائز ٦٨)

**١٦٨٩- هەر کەسێك شوێنی تەرمێك بکەوێت تاکو نوێژی لەسەر دەکرێت بەشی لە پاداشت قیراتێکە دەبێت هەر کەسێکیش ڕێ بکات لەگەڵی تاکو دەنێژرێت بەشی لە پاداشت دوو قیراتە هەموو قیراتێکیش وەکو کێوی ئوحودە.**

١٦٩٠- من تبع جنازة حتى يُصلي عليها و يفرغ منها فله قيراطان و من تبعها حتى يُصلي عليها فله قيراط و الذي نفس محمد بيده لهو أثقل في ميزانه من أحد.

(صحيح) ( حم ه ) عن أبي. (الجنائز ٦٨)

**١٦٩٠- هەرکەسێك دوای تەرمێك بکەوێت تاکو نوێژی لەسەر دەکرێت لە ناشتنی دەبنەوە دوو قیرات پاداشتی هەیە هەرکەسێك دوای تەرمێك بکەوێت تاکو نوێژی لەسەر دەکرێت قیراتێکی هەیە لە پاداشت سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەو قیراتە لەتەرازوودا لە ئوحود قورسترە.**

١٦٩٠- من تبع جنازة حتى يفرغ منها فله قيراطان فإن رجع قبل أن يفرغ منها فله قيراط.

(صحيح) (ن) عن عبدالله بن مغفل. (الجنائز ٦٨)

**١٦٩١- هەرکەسێك دوای تەرمێك بکەوێت تا لە ناشتنی دەبنەوە دوو قیرات پاداشتی هەیە ئەگەر بگەڕێتەوە پێش تەواوبوونی یەك قیراتی هەیە.**

١٦٩٢- من تبع جنازة فصلى عليها ثم انصرف فله قيراط من الأجر ومن تبعها فصلى عليها ثم قعد حتى فرغ منها ومن دفنها فله قيراطان من الأجر كل واحد منهما أعظم من أحد.

(حسن) (ن) عن أبي هريرة. (الجنائز ٦٨)

**١٦٩٢- کەسێك شوێنی تەرمێك بکەوێ و نوێژی لەسەر بکات و دوایی بگەڕێتەوە یەك قیرات پاداشتی دەست دەکەوێت هەر کەسێکیش شوێنی بکەوێت نوێژی لەسەر بکات ئینجا دانیشێت و هەتا لە ناشتنی دەبنەوە دوو قیرات پاداشتی دەکەوێت هەریەکەیان وەکو کێوی ئوحودە.**

١٦٩٣- من تبع جنازة مسلم أيمانا واحتسابا وكان معها حتى يُصلي عليها ويفرغ من دفنها فإنه يرجع من الأجر بقيراطين كل قيراط مثل أحد ومن صلى عليها ثم رجع قبل أن تدفن فإنه يرجع بقيراط من الأجر.

(صحيح) (خ ن) عن أبي هريرة. (الجنائز ٦٨)

**١٦٩٣- هەركەسێك دوای تەرمی موسوڵمانێك بكەوێت بەئیمان و چاوەڕوانكردنی پاداشتەوە و، لەگەڵی بێت تاكو نوێژی لەسەر دەكرێت و تەواو دەبن لە ناشتنی ئەو كەسە بەدوو قیرات پاداشتەوە دەگەڕێتەوە هەموو قیراتێك وەكو ئوحودە هەركەسێكیش نوێژی لەسەر بكات و بگەڕێتەوە پێش ناشتنی ئەو كەسە بەیەك قیرات پاداشت دەگەڕێتەوە.**

١٦٩٤- من خرج مع جنازة من بيتها وصلى عليها ثم تبعها حتى تُدفن كان له قيراطان من أجر كل قيراط مثل أحد ومن صلى عليها ثم رجع كان له من الأجر مثل أحد.

(صحيح) (حم م د) عن أبي هريرة وعائشة. (الترغيب ٣٤٩٨)

**١٦٩٤- هەركەسێك لەگەڵ تەرمێكدا لەماڵی خۆی دەربچێت و نوێژی لەسەر بكات و شوێنی بكەوێت تادەنێژرێت دوو قیرات پاداشتی هەیە هەموو قیراتێك وەكو ئوحودە هەركەسێكیش نوێژی لەسەر بكات و بگەڕێتەوە ئەوەندەی ئوحود پاداشتی هەیە.**

## بابەتی ڕێزی مردوو

١٦٩٥- كسر عظم الميت ككسره حيا.

(صحيح) (حم د هـ) عن عائشة. (الجنائز ٢٣٣)

**١٦٩٥- شكاندنی ئێسكی مردوویەك وەكو شكاندنیەتی بەزیندوویی.**

١٦٩٦- نهى أن يقعد على القبر، وأن يجصص، ويبنى عليه.

(صحيح) (حم م د ن) عن جابر. (الجنائز ٢٠٤)

**١٦٩٦- قەدەغەی كردووە كەس لەسەر گۆڕ دابنیشێت یان گەچ كاری بكرێت یان خانوی لەسەر بكرێت.**

١٦٩٧- لا تجلسوا على القبور ولا تصلوا إليها.

(صحيح) (حم م ٣ ) عن أبي مرثد. (الجنائز ٢٠٩)

**١٦٩٧- دامەنیشن لەسەر گۆڕەكان و بەرەو ڕوویان نوێژ مەكەن.**

١٦٩٨- لأن أطأ على جمرة أحب إلي من أن أطأ على قبر.

(صحيح) (خط) عن أبي هريرة. (الضعيفة ٩٧٠)

**١٦٩٨- گەر پێ بخەمە سەر پشکۆیەك پێم خۆشترە پێ بخەمە سەر گۆڕێك.**

١٦٩٩- لأن أمشي على جمرة أو سيف أو أخصف نعلي برجلي أحب إلي من أن أمشي على قبر مسلم وما أبالي أوسط القبر قضيت حاجتي أو وسط السوق.

(صحيح) (هـ) عن عقبة بن عامر. (الإرواء ٦٢)

**١٦٩٩- ئەگەر بەسەر ژیلەمۆیەك ( پشکۆیەکدا ) یا شمشێرێکدا بڕۆم یان نەعلەکەم بە قاچمەوە هەڵدورم پێم خۆشترە لەوەی بەسەر گۆڕی موسوڵمانێکدا بڕۆم باکیشم نییە پێویستی خۆم لەناوەڕاستی گۆڕێکدا جێ بهێنم یاخود لەنێو بازاڕدا .**

١٧٠٠- لأن يجلس أحدكم على جمرة فتحرق ثيابه فتخلص إلى جلده خير له من أن يجلس على قبر.

(صحيح) (حم م د ن) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٠٩)

**١٧٠٠- باشترە کەسێك لە ئێوە لەسەر ژیلەمۆیەك ( پشکۆیەك ) دابنیشێت و جلەکانی بسوتێنێ و تا دەگاتە پێستەکەشی لەوەی لەسەر گۆڕێك دابنیشێت.**

١٧٠١- لأن يطأ الرجل على جمرة خير له من أن يطأ على قبر.

(صحيح) (حل) عن أبي هريرة. (الضعيفة ٩٧٠)

**١٧٠١- ئەگەر پیاوێك پێ بخاتە سەر ژیلەمۆیەك ( پشکۆیەك ) چاکترە لەوەی پێ بخاتە سەر گۆڕێك.**

١٧٠٢- إن كسر عظم المسلم ميتا ككسره حيا.

(صحيح) ( عب ص د هـ ) عن عائشة . (المشكاة ١٧١٤)

**١٧٠٢- شکاندنی ئێسکی موسڵمانێك بە مردوویی وەکو شکاندنێتی بە زیندوویی.**

١٧٠٣- لعن الله المختفي و المختفية.

(صحيح) ( هق ) عن عائشة. (الصحيحة ٢١٤٨)

**١٧٠٣- نەفرینی خوا لەسەر ئەو کەسە بێت کە گۆڕ هەڵدەدرێت پیاو بێت یان ژن.**

١٧٠٤- لا تقعدوا على القبور.

(صحيح) ( حم ن ) عن عمرو بن حزم. (الجنائز ٢٠٩)

**١٧٠٤- لەسەر گۆڕەکان دامەنیشن.**

## بابەتی ئەسپەردەکردن

١٧٠٥- اللحد لنا والشق لغيرنا .

(صحيح) ( ٤ ) عن ابن عباس. (الجنائز ١٤٤)

**١٧٠٥- گۆڕیچە بۆ خۆمانەو، ناودڕ بۆ کەسانی ترە.**

١٧٠٦- اللحد لنا والشق لغيرنا من أهل الكتاب .

(صحيح) (حم) عن جرير. (الجنائز ١٤٤)

**١٧٠٦- گۆڕیچە بۆ خۆمانەو، ناودڕ بۆ کەسانی ترە لەئەهلی کیتاب.**

١٧٠٧- لا تدفنوا موتاكم بالليل إلا أن تضطروا.

(صحيح) (هـ) عن جابر. (الجنائز ٥٨)

**١٧٠٧- مردووەکانتان بەشەو مەنێژن مەگەر ناچار بن.**

١٧٠٨- يتبع الميت ثلاثة أهله وعمله وماله فيرجع اثنان ويبقى واحد يرجع أهله وماله ويبقى عمله.

(صحيح) (حم ق ت ن) عن أنس. (الصحيحة ٣٢٩٩)

**١٧٠٨- سێ شت دوای مردوو دەکەوێت :کەس و کاری، کردەوەکەی، ماڵەکەی، دوانیان دەگەڕێتەوە و یەکێکی لای دەمێنێتەوە کەس و کار و ماڵەکەی دەگەڕێنەوەو کردەوەکەی لەلای دەمێنێتەوە.**

١٧٠٩- كان إذا فرغ من دفن الميت وقف عليه فقال: استغفروا الله لأخيكم و سلوا له التثبيت فإنه الآن يسأل.

(صحيح) ( د ) عن عثمان. (الجنائز ١٥٦)

**١٧٠٩- ئەگەر تەواو دەبو لەناشتنی مردوویەك لەسەری ڕادەوەستاو دەیفەرموو: داوای لێ خۆش بوون بکەن بۆ براکەتان هەروەها داوای جێگیر بوونی بۆ بکەن بێگومان ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت.**

١٧١٠- كان إذا وضع الميت في لحده قال: بسم الله و بالله و في سبيل الله و على ملة رسول الله.

(صحيح) ( د ت ه هق ) عن ابن عمر. (الإرواء ٧٣٩)

**١٧١٠- كە مردووەكەى دەخستە گۆڕەكەى دەيفەرموو:** ((بسم الله وفي سبيل الله و على ملة رسول الله)) **واتە: بەناوى خوا و لە پێناوى خوا و لەسەر دينى پێغەمبەرى خوا.**

١٧١١- احفروا و أعمقوا و أوسعوا و ادفنوا الاثنين و الثلاثة في قبر واحد و قدموا أكثرهم قرآنا.

(صحيح) ( حم ٤ هق ) عن هشام بن عامر . (الجنائز ١٤١)

**١٧١١- چاڵ هەڵكەنن و قووڵى بكەن وفراوانى بكەن و دوو كەس و سێ كەس لەيەك گۆڕدا بنێژن كاميان زۆرتر قورئانى لەبەرە لە پێشەوە بينێژن.**

١٧١٢- إذا وضعتم موتاكم في قبورهم فقولوا: بسم الله و على سنة رسول الله.

(صحيح) ( حم حب طب ك هق ) عن ابن عمر . (الإرواء ٧٣٩)

**١٧١٢- ئەگەر مردووەكانتان خستە گۆڕەكانيانەوە بڵێن: بەناوى خوا و لەسەر سوننەتى پێغەمبەرى خوا.**

١٧١٣- استغفروا لأخيكم و سلوا له التثبيت فإنه الآن يسأل.

(صحيح) ( ك ) عن عثمان . (الجنائز ١٥٥)

**١٧١٣- داواى لێخۆشبوون و جێگير بوون بكەن بۆ براكەتان چونكە ئێستا پرسيارى لێ دەكرێت.**

١٧١٤- دفن بالطينة التي خلق منها.

(حسن) ( طب ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١٨٥٨)

**١٧١٤- لەو گڵە نێژرا كەلێى دروستكرا.**

١٧١٥- سووا القبور على وجه الأرض إذا دفنتم الموتى.

(حسن) ( طب ) فضالة بن عبيد . (الجنائز ص٢٠٨)

**١٧١٥- گۆڕەكان تەختكەن بەسەر ڕووى زەويدا ئەگەر مردوتان ناشت .**

## بابەتى نوسين لەسەر گۆڕ

١٧١٦- نهى أن يكتب على القبر شيء.

(صحيح) (هـ ك) عن جابر. (الجنائز ٢٠٤)

**١٧١٦- قەدەغەى كردووە كە هيچ شتێك لەسەر گۆڕ بنوسرێت.**

## بابەتی پرسە

١٧١٧- إن لله تعالى ما أخذ وله ما أعطى وكل شيء عنده بأجل مسمى.

(صحيح) (حم ق د ن هـ) عن أسامة بن زيد (الجنائز ١٦٣)

**١٧١٧- ئەوەی كە بردییەوە هی خۆی بوو ئەوەشی بەخشی هەر هی خۆی بوو هەموو شتێكیش لای خوا كاتێكی دیاریكراوی هەیە.**

١٧١٨- ما من مؤمن يعزي أخاه بمصيبة إلا كساه الله من حلل الكرامة يوم القيامة .

(حسن) ( هـ ) عن عمرو بن حزم. (الصحيحة ١٩٥)

**١٧١٨- هیچ بڕوادارێك نیە پرسە و سەرەخۆشی لە گرفتاریەكی براكەی بكات حەتمەن خوا پۆشاكی و خشڵی شەرەفمەندی لەبەردەكات لە ڕۆژی دوایدا.**

## بابەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی پیشاندانی كردەوەی زیندوەكان بە مردوەكان

١٧١٩- إن أعمالكم تعرض على أقاربكم و عشائركم من الأموات فإن كان خيرا استبشروا و إن كان غير ذلك قالوا: اللهم لا تمتهم حتى تهديهم كما هديتنا.

(حسن) ( حم ) عن أنس . (الصحيحة ٢٧٥٨)

**١٧١٩- كردەوەكانتان دەخرێنە پێش چاوی خزم و خێڵە مردووەكانتان جا ئەگەر چاكە بێت مژدە دەدەنە یەكتر ئەگەر واش نەبێت دەڵێن: خوایە نەیانمرێنێت تا ڕێنموونیان دەكەیت وەكو ڕێنمونی ئێمەت كرد.**

## بابەتی قەدەغەكردنی جنێودان بە مردوەكان

١٧٢٠- لا تسبوا الأموات فإنهم قد أفضوا إلى ما قدموا.

(صحيح) (حم خ ن) عن عائشة. (الصحيحة ٢٣٩٧)

**١٧٢٠- قسەی ناشرین بە مردووەكان مەڵێن چونكە ئەوان گەیشتنە ئاكامی كردەوەكانی خۆیان.**

١٧٢١- لا تسبوا الأموات فتؤذوا الأحياء.

(صحيح) (حم ت) عن المغيرة. (الصحيحة ٢٣٩٧)

**١٧٢١- جنێو بە مردووەكان مەدەن ، چونكە زیندووەكانی پێ ئازار دەدەن .**

١٧٢٢- إذا مات صاحبكم فدعوه لا تقعوا فيه.

(صحيح) ( د ) عن عائشة . (الصحيحة ٢٨٥)

**١٧٢٢- ئەگەر كەسێكتان مرد وازی لێبهێنن و قسەی پێ مەڵێن.**

## بابەتی سەردانی گۆڕستان

١٧٢٣-كنت نهيتكم عن زيارة القبور ألا فزوروها فإنها ترق القلب وتدمع العين وتذكر الآخرة ولا تقولوا هجرا.

(صحيح) (ك) عن أنس. (الجنائز ١٧٩)

**١٧٢٣- من سەردانی گۆڕستانم لێ قەدەغە كردبوون ، بەڵام سەردانی بكەن چونكە دڵەكانتان ناسك دەكاتەوە و فرمێسكی چاو دەهێنێتە خوارەوە، دواڕۆژ وەبیر دەهێنێتەوە، قسەی خراپ مەكەن.**

١٧٢٤- حيثما مررت بقبر كافر فبشره بالنار.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عمر ( طب ) عن سعد . (الصحيحة ١٨)

**١٧٢٤- لەهەرلایەك بەلای گۆڕی بێباوەڕێكدا تێپەربوویت مژدەی دۆزەخی بدەرێ.**

١٧٢٥- زوروا القبور فإنها تذكركم الآخرة.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة. (الجنائز ١٧٨)

**١٧٢٥- سەردانی گۆڕستان بكەن چونكە ڕۆژی دواییتان وەبیر دەخاتەوە.**

١٧٢٦- زوروا القبور و لا تقولوا هجرا.

(صحيح) ( هـ ) عن زيد بن ثابت. (الجنائز ١٧٨)

**١٧٢٦- سەردانی گۆڕستان بكەن و قسەی بەتاڵ و نابەجێ مەكەن.**

١٧٢٧- قد كنت نهيتكم عن زيارة القبور فقد أذن لمحمد في زيارة قبر أمه فزوروها فإنها تذكركم الآخرة.

(صحيح) ( ت ) عن بريدة. (الجنائز ١٧٨)

**١٧٢٧- من لێم قەدەغە كردبوون سەردانی گۆڕەكان بكەن بەڵام مۆڵەت درا بـە موحەممـەد سەردانی گۆڕی دایكی بكات بۆیە سەردانی بكەن چونكە دواڕۆژتـان بیر دەخاتەوە.**

١٧٢٨- قولي: السلام على أهل الديار من المؤمنين و المسلمين و يرحم الله المستقدمين منا و المستأخرين و إنا إن شاء الله بكم لاحقون.

(صحيح) (م ن) عن عائشة. (الجنائز ١٨١)

**١٧٢٨- بلێ: سڵاو لە نیشتەجێ بوانی ئەم ماڵانە لە ئیمانداران و موسڵمانان ڕەحمـەتی خوایش لەسەر ئەوانەمان پێشمان كەوتن بـەرەو ئێـرە و ئەوانـەشمان هێشتا نـەهاتوون ئێمەش بە ویستی خوای گەورە پێتان دەگەین.**

١٧٢٩- لعن الله زوارات القبور.

(صحيح) ( حم هـ ك ) عن حسان بن ثابت ( حم ت ه ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٧٦٦)

**١٧٢٩- نەفرینی خوا لەسەر ئەو ئافرەتانەی بەزۆری دەچنە سەر قەبران.**

١٧٣٠- ما أنتم بأسمع لما أقول منهم غير أنهم لا يستطيعون أن يردوا علي شيئا.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن أنس. (فقه السيرة ٢٥٠)

**١٧٣٠- ئێوە لە ئەوان باشتر نابیستن ئەوەی من دەیڵێم ، بەڵام ئەوان ناتوانن وەڵامم بدەنەوە.**

١٧٣١- نهيتكم عن زيارة القبور فزوروها فإن لكم فيها عبرة.

(صحيح) ( طب ) عن أم سلمة. (الجنائز ١٧٩)

**١٧٣١- سـەردانی گۆڕسـتانم لێ قەدەغـەكردن، ئـیتر سـەردانی بكـەن، بێگومـان پەنـد و ئامۆژگاری تیایە بۆ ئێوە.**

١٧٣٢- نهيتكم عن زيارة القبور فزوروها فإنها تذكركم الموت.

(صحيح) ( ك ) عن أنس. (الجنائز ١٨٠)

**١٧٣٢- سەردانی گۆڕستانم لێ قەدەغـەكردن، ئـیتر سـەردانی بكـەن، بەڕاسـتی مردنتـان یاددەخاتەوە**

## بابەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی لەدەست دانی منداڵ

١٧٣٣- ما من رجل مسلم يموت له ثلاثة من ولده لم يبلغوا الحنث إلا أدخله الله الجنة بفضل رحمته إياهم.

(صحيح) ( حم خ ن ) عن أنس. (الصحيحة ٥٦٧)

**١٧٣٣- هيچ كەسێكی موسڵمان نيە سێ منداڵی (نە باڵغی) پێنەگەیشتوی بمرن خوای گەورە ئەیخاتە بەهەشتەوە بەهۆی بەزەیی ئەو كەسە بۆ منداڵە بۆ منداڵەكانی.**

١٧٣٤- ما من مسلم يموت له ثلاثة من الولد ما لم يبلغوا الحنث إلا تلقوه من أبواب الجنة الثمانية من أيها شاء دخل.

(حسن) ( حم هـ) عن عتبة بن عبد. (الترغيب ١٩٩٣)

**١٧٣٤- هەر موسڵمانێك سێ منداڵی بمرێت كە نەگەیشتبێتنە تەمەنی گوناهكردن ، لە هەشت لە دەرگاكانی بەهەشت پێ ی دەگەن لە كاميان بيەوێت دەچێتە ژوورێ.**

## بابەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی دروست كردنی خواردن بۆ كەس و كاری مردوو

١٧٣٥- إن آل جعفر قد شغلوا بشأن ميتهم فاصنعوا لهم طعاما.

(حسن) ( هـ ) عن أسماء بنت عميس . (الجنائز ١٦٧)

**١٧٣٥- خاو خێزانی جەعفەر سەرقاڵی مردووەكەيانن بۆيە خواردنيان بۆ دروست بكەن.**



## بابەتی واجب بوونی زەكات و گوناهی ئەو كەسەی دەرناكات

١٧٣٦- آكل الربا وموكله وكاتبه وشاهداه إذا علموا ذلك والواشمة والموشومة للحسن ولاوي الصدقة والمرتد أعرابيا بعد الهجرة ملعونون على لسان محمد يوم القيامة.

(صحيح) ( ن ) عن ابن مسعود. (الإرواء ١٣٣٥)

**١٧٣٦- سوو خۆر و بەدەری و نوسەرەكەی و هەردوو شايەتەكەی ئەگەر ئاگادار بن هەروەها خاڵ كوت خاڵ بۆ كوترا و بۆ جوانی و تەڵەكەباز لەدەركردنی زەكات و ئەو كەسەی لە پاش كۆچكردن پاشگەز دەبێتەوە وەكو عەرەبێكی بيابان نشينی نەفرينيان لێكراوە لەسەر زمانی موحەممەد( ﷺ ) لەڕۆژی قيامەتدا.**

١٧٣٧- إن الذي لا يؤدي زكاة ماله يمثل إليه ماله يوم القيامة شجاعا أقرع له زبيبتان فيلزمه أو يطوقه يقول أنا كنزك أنا كنزك .

(صحيح) (حم ن) عن ابن عمر. (الترغيب ٧٥٩)

**١٧٣٧- ئەو كەسەی زەكاتی ماڵەكەی دەرنەكات ماڵەكەی لە ڕۆژی قيامەتدا بۆی دەبێتە مارێكی كەچەڵ دوو خاڵی ڕەشی هەيە لەسەر چاوانی تەوقی دەكات يان دەوری دەدات و دەڵێت: من گەنجينەكەی خۆتم من گەنجينكەی خۆتم.**

١٧٣٨- تأتي الإبل على ربها على خير ما كانت إذا هي لم يعط فيها حقها تطؤه بأخفافها وتأتي الغنم على ربها على خير ما كانت إذا لم يعط فيها حقها تطؤه بأظلافها وتنطحه بقرونها ومن حقها أن تحلب على الماء ألا لا يأتين أحدكم يوم القيامة ببعير يحمله على رقبته له رغاء فيقول يا محمد فأقول لا أملك لك شيئا قد بلغت ألا لا يأتين أحدكم يوم القيامة بشاة يحملها

على رقبته لها يعار فيقول يا محمد فأقول لا أملك لك شيئا قد بلغت ويكون كنز أحدكم يوم القيامة شجاعا أقرع يفر منه صاحبه ويطلبه أنا كنزك فلا يزال حتى يلقمه إصبعه.

(صحيح) (ن هـ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٥٥٨)

**١٧٣٨- وشتر دێتە لای خاوەنەكەی لە باشترین شێوەیدا ئەگەر مافەكەی تیا دەرنەكرابێت و ئەو خاوەنەی بە پێی دەشێلێت ، مەڕومالاّت لای خاوەنەكەی لە باشترین شێوە ئەگەر مافەكەی تیا دەرنەكرابێت بە سمەكانی دەچێتە سەر خاوەنەكەی و قۆچی لێدەدەن بە شاخەكانیان مافی خۆیشێتی لەسەر ئاو بدۆشرێت جا كەسێك لە ئێوە با لە ڕۆژی قیامەتدا نەیەت و وشترێكی لەسەر گەردنی هەڵگرتبێت بۆڕەی بێت و بڵێت: ئەی موحەممەد! منیش بڵێم: هیچم لەدەست نایەت بۆت، باكەسێكیش لەئێوە نەیەت و لە ڕۆژی قیامەتدا و مەڕێكی لەسەر گەردنی هەڵگرتبێت ببارێنێت، پێم بڵێت: ئەی موحەممەد! منیش بڵێم: هیچم لەدەست نایەت بۆت، پێم ڕاگەیاندی ئینجا گە نجینەی كەسێك لەئێوە ببێتە مارێكی كەچەڵ خاوەنەكەی لێی هەڵبێت و ئەو بەدوایدا بێت و بڵێت: من گە نجینەكەتم، هەروا بێت تاكو پە نجەی دەخاتە دەمی.**

١٧٣٩- لم يمنع قوم زكاة أموالهم إلا منعوا القطر من السماء ولولا البهائم لم يمطرو .

(صحيح) (طب) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٠٦)

**١٧٣٩- خەڵكانێك زەكاتیان قەدەغە نەكردووە تاكو بارانیان لێ قەدەغە نەكرابێت ئەگەر لەبەر ئاژەڵەكانیان نەبوایە بارانیان بۆ نەدەباری.**

١٧٤٠- ما بلغ أن تؤدي زكاته فزكي فليس بكنز .

(حسن) (د) عن أم سلمة. (الصحيحة ٥٥٩)

**١٧٤٠- هەرچی گەیشتە ئەوەی زەكاتی لێ بدرێت و زەكاتی لێدرا ئەوە گە نجینە نییە.**

١٧٤١- ما من أحد لا يؤدي زكاة ماله إلا مثل له يوم القيامة شجاعا أقرع حتى يطوق عنقه.

(صحيح) (هـ) عن ابن مسعود. (الترغيب ٧٥٦)

**١٧٤١- هیچ كەسێك نییە زەكاتی ماڵەكەی دەرنەكات تاكو ماڵەكەی لە ڕۆژی قیامەتدا نەبێت بە مارێكی كەچەڵ و دەوری گەردنی نەدەدات .**

١٧٤٢- ما من رجل له مال لا يؤدي حق ماله إلا جعل له طوقا في عنقه وهو شجاع أقرع وهو يفر منه وهو يتبعه.

(صحيح) (حم ن) عن ابن مسعود. (الترغيب ٧٥٦)

**١٧٤٢- هەر پیاوێك ماڵێكی هەبێت و مافەكەی دەرنەكات خوای گەورە تەوقێك دەكاتە گەردنی كەمارێكی كەچەڵە خۆی لێ ی هەڵدێت و مارەكەش بەدوایدا.**

١٧٤٣- ما من رجل لا يؤدي زكاة ماله إلا جعل الله يوم القيامة في عنقه شجاعا أقرع ومن اقتطع مال أخيه المسلم بيمين لقي الله وهو عليه غضبان.

(صحيح) (ت) عن ابن مسعود. (الترغيب ١٨٢٧)

**١٧٤٣- هیچ پیاوێك نییە زەكاتی ماڵەكەی دەرنەكات تاكو خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا مارێكی كەچەڵ نەخاتە گەردنی هەر كەسێكیش ماڵی براكەی بە سوێندی درۆ بۆ خۆی دابڕێت دەچێتە لای خوا كە ئەو لێ ی تووڕەیە.**

١٧٤٤- ما من صاحب إبل ولا بقر ولا غنم لا يؤدي زكاتها إلا جاءت يوم القيامة أعظم ما كانت وأسمنه تنطحه بقرونها وتطؤه بأخفافها كلما نفذت أخراها عادت عليه أولاها حتى يقضى بين الناس .

(صحيح) (ن هـ حب) عن أبي ذر. (الترغيب ٧٥٥)

**١٧٤٤- هەر كەسێك خاوەن ووشتر یان خاوەن ڕەشەووڵاخ یان خاوەن مەڕوبزن بێت و زەكاتەكەی دەرنەكات لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو ئاژەڵانە لە جاران گەورەتر و قەڵەو تر دێن و بەشاخەكان قۆچی لێ نەدەن و بە سمەكانیان ئەو كەسە دەشێلن لەگەڵ تەواوبوونی دوا دانەیان یەكەمیان دەگەڕێتەوە سەری تا ئەو كاتەی خوای گەورە دادوەری دەكات لە نێوان خەڵكیدا.**

١٧٤٥- ما من صاحب إبل لا يفعل فيها حقها إلا جاءت يوم القيامة أكثر ما كانت قط وأقعد لها بقاع قرقر تستن عليه بقوائمها وأخفافها " وما من صاحب بقر لا يفعل فيها حقها إلا جاءت يوم القيامة أكثر ما كانت وأقعد لها بقاع قرقر تنطحه بقرونها وتطؤه بقوائمها " ولا صاحب غنم لا يفعل فيها حقها إلا جاءت يوم القيامة أكثر ما كانت وأقعد لها بقاع قرقر تنطحه بقرونها وتطؤه بأظلافها ليس فيها جماء ولا منكسر قرنها " ولا صاحب كنز لا يفعل فيه حقه إلا جاء كنزه يوم القيامة شجاعا أقرع يتبعه فاغرا فاه فإذا أتاه فر منه فيناديه ربه عز وجل خذ كنزك الذي خبأته فأنا أغنى منك فإذا رأى أنه لا بد له منه سلك يده في فيه فيقضمها قضم الفحل.

(صحيح) (حم م ن) عن جابر. (الإرواء ١٥٠٩)

**١٧٤٥- هەر خاوەن ووشترێك مافی خوا لە ووشـترەكانيدا دەرنـەكات، لـە ڕۆژی قيامەتـدا لە جاران زۆرتـر دەبن و لەسەر زەوييەكی تەختاييدا بۆيان دادەنيشێنن و بە پێـو سميـان دەچنە سەری ، هەر خاوەن مانگايەكيش مافی خوا لە مانگاكانيـدا دەرنـەكات ، لـە ڕۆژی قيامەت دا لە جاران زياتر زۆرتر دەبن و ، لە زەوييەكی تەختـدا بۆيـان دادەنيـشێنن و ، بە قاچيان دەيشێلن و ، هەر خاوەن مەڕ و مالاتێك مافی خوا لـە مـەڕو بزنـەكانی نـەدات لە ڕۆژی قيامەتدا دا لە جاران زۆرتر دەبن و بۆيان دادەنيشێنن لە زەوييـەكی ڕاستاييدا بـە سمـەكانيان دەيـشێلن ، نـە كـوڵ و نـە شـاخ شـكاويان تيـا نييـە ، هـەر خـاوەن گە نجينەيـەكيش مـافی خـوا نـەدات لـە گە نجينەكەيـدا لـە ڕۆژی قيامەتـدا دەبێتـە ئەژديهايەكی كەچەڵ دوای دەكەوێت و دەمی كردووەتەوە ، جـا كـە دەيبينـێ هەڵـدێت و ، پەروەردگاری بانگی دەكات : گە نجينەكەت ببە كە شاردبووتەوە ، من لە تۆ بێ نيـازترم لێی ، جا كاتێك دەيبينێ چارەيەكی نييە جگە لەوەی دەستی بخاتـە دەمـی ، وەكـو كـەڵ قەپ بە دەستی خۆی دەكات.**

١٧٤٦- ما من صاحب ذهب ولا فضة لا يؤدي منها حقها إلا إذا كان يوم القيامة صفحت لـه صفائح من نار فأحمي عليها في نار جهنم فيكوى بها جنبه وجبينه وظهره كلما بردت أعيدت له في يوم كان مقداره خمسين ألف سنة حتى يقضى بين العباد فيرى سبيله إمـا إلى الجنـة وإمـا إلى النار " ولا صاحب إبل لا يؤدي منهـا حقهـا ومـن حقهـا حلبهـا يـوم ورودهـا إلا إذا كـان يـوم القيامة بطح لها بقاع قرقر أوفر ما كانت لا يفقـد منهـا فـصيلا واحـدا تطـؤه بأخفافهـا وتعـضه بأفواهها كلما مر عليه أولاها رد عليه أخراها في يوم كان مقداره خمسين ألف سنة حتـى يقـضى بين العباد فيرى سبيله إما إلى الجنة وإما إلى النار " ولا صـاحب بقـر ولا غـنـم لا يـؤدي منهـا حقها إلا إذا كان يوم القيامة بطح لها بقاع قرقـر لا يفقـد منهـا شيئا لـيس فيهـا عقـصاء ولا جلحاء ولا عضباء تنطحه بقرونها وتطؤه بأظلافها كلما مر عليه أولاها رد عليه أخراها في يوم كان مقداره خمسين ألف سنة حتى يقضى بين العباد فيرى سبيله إما إلى الجنة وإما إلى النار .

(صحيح) (حم م د ن) عن أبي هريرة. (المشكاة ١٧٧٣)

**١٧٤٦- هەر خاوەن ئـاڵتون و زيوێك مافی خوايـان تيـا دەرنـەكات ، لـە ڕۆژی قيامـەت دا دەكرێتە لەوحی ئاگرين بۆی و لە دۆزەخدا گەرم دەكرێت و نێـو چـەوان و پـشتی پـێ داخ دەكرێت ، هەر كاتێك سارد بێتەوە بۆی داخ دەكرێتەوە لە ڕۆژێكدا درێـژی پـە نجا هـەزار**

ساڵە ، تاکو دادوەری دەکرێت لە نێو بەندەکانی خوای گەورە و ئیتر ڕێگای خۆی دەبینێ ئایا بەرەو بەهەشت یا بەرەو دۆزەخ ، هەر خاوەن ووشترێکیش مافی خوای لێ نەدات ، لە مافدانیشی ئەوەیە بدۆشرێت لە ڕۆژی هاتنەوەیدا حەتمەن لە ڕۆژی قیامەتدا لە ڕاستە و زەویەکدا خاوەنەکەیان دادەنیشێنن بۆیان لە جاران زۆرتر و یەك بێچوویان وون نابێت بە سمەکانیان دەیشێلن و قەپی پیا دەکەن ، یەك بە دوای یەك ، لە ڕۆژێکدا درێژی پەنجا هەزار ساڵە تاکو داوەری دەکرێت لە نێو بەندەکاندا ، ئیتر ڕێگای خۆی دەبینێ ئایا بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ، هەر خاوەن ڕەشە وڵاخ و مەڕ و ماڵاتێکیش مافی خوایان تیا دەرنەهێنێت ، لە ڕۆژی قیامەتدا دای دەنیشێنن بۆیان لە زەوییەکی تەختایدا بێ ئەوەی یەکێکیان نوقسان بێت نە شاخ لار و نە بێ شاخ و، نە شاخ شکاویان تیا نییە ، بە شاخەکانیان قۆچی لێ دەدەن و بە سمەکانیان دەیشێلن ، کە یەکەمیان بەسەریدا ڕۆیشت ، کۆتا دانەیان دێتەوە ، لە ڕۆژێکدا درێژی پەنجا هەزار ساڵە تاکو دادوەری دەکرێت لە نێوان بەندەکاندا و ، ئینجا ڕێگای خۆی دەبینێ یان بۆ بەهەشت و یان بۆ دۆزەخ.

١٧٤٧- مانع الزكاة يوم القيامة في النار.

(حسن) (طص) عن أنس. (الترغيب ٧٦٢)

**١٧٤٧- ئەو کەسەی زەکات نادات لەڕۆژی قیامەتدا لە ئاگردایە.**

١٧٤٨- هم الأخسرون ورب الكعبة هم الأخسرون ورب الكعبة يوم القيامة الأكثرون إلا من قال في عباد الله هكذا وهكذا وقليل ما هم والذي نفسي بيده ما من رجل يموت يترك غنما أو إبلا أو بقرا لم يؤد زكاتها إلا جاءته يوم القيامة أعظم ما يكون وأسمنه حتى تطأه بأظلافها وتنطحه بقرونها حتى يقضي بين الناس كلما تقدمت أخراها عادت أولاها .

(صحيح) (حم ق ت ن هـ) عن أبي ذر. (الترغيب ٣٢٦٠)

**١٧٤٨- ئەوانەن خەسارۆمەند سوێند بە پەروەردگاری کەعبە ئەوانەن خەسارۆمەند سوێند بە پەروەردگاری کەعبە لەڕۆژی قیامەتدا : فرە ماڵەکان مەگەر کەسێك ئاوها و ئاوها لێی ببەخشێت ، ئەوانەیش کەمن ، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، هەر کەسێك بمرێت مەڕوماڵات یان وشتر یان ڕەشە وڵاخی لە دوای خۆی بەجێهێشتبێت و زەکاتی نەدابێت لەڕۆژی قیامەتدا لە جاری جاران قەڵەوتر دەبێت و تاکو بە**

**سمەكانیان دێنە سەر خاوەنەكەیاندا و بە شاخەكانیان قۆچی لێدەدەن تاكو خوای گەورە دادوەری دەكات لەنێوان خەڵكیدا لەگەڵ هاتنی دوادانەیاندا یەكەمیان دەگەڕێتەوە بەسەریدا.**

١٧٤٩- يا معشر المهاجرين خصال خمس إذا ابتليتم بهن وأعوذ بالله أن تدركوهن لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها إلا فشا فيهم الطاعون والأوجاع التي لم تكن مضت في أسلافهم الذين مضوا ولم ينقصوا المكيال والميزان إلا أخذوا بالسنين وشدة المؤنة وجور السلطان عليهم ولم يمنعوا زكاة أموالهم إلا منعوا القطر من السماء ولولا البهائم لم يمطروا ولم ينقضوا عهد الله وعهد رسوله إلا سلط الله عليهم عدوهم من غيرهم فأخذوا بعض ما كان في أيديهم وما لم تحكم أئمتهم بكتاب الله عز وجل ويتحروا فيما أنزل الله إلا جعل الله بأسهم بينهم.

(صحيح) (هـ ك) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٠٦)

**١٧٤٩- ئەی كۆمەڵانی كۆچكەران! پێنج خەسڵەت هەیە ئەگەر پێیان تاقی كرانەوە پەنایش دەگرم بە خوا پێیان بگەن: هەرگیز بێ ئابڕوویی لە هیچ گەلێكدا بڵاونابێتەوە و هەتا بە ئاشكرا بیكەن تاكو خوای گەورە تاعون و ئێش و ئازارێكیان تیا بڵاوبكاتەوە كە لە پێشینەكانیاندا نەبووە هیچ كاتێكیش لە كێشانە و پێوانە كەم ناكەنەوە تاكو گرانی و نەبوونی و ستەمی فەرمانڕەوا ڕوویان تێ نەكات زەكاتی ماڵەكانیشیان قەدەغە ناكەن تاكو بارانیان لێ نەشاردرێتەوە ئەگەر لەبەر ئاژەڵیش نەبوایە باران نەدەباری هیچ كاتێكیش پەیمانی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) ناشكێنن تاكو خوای گەورە دوژمنێكی دەرەكییان! بەسەردا زاڵ نەكات و، هەندێ لەوەی كە بەدەستیانەوەیە لێیان وەردەگرن، ئەگەر پێشەواكانیشیان بە قورئان حوكم نەكەن و چاكە و بەختەوەری خۆیانی تیا نەبینن خوای گەورە ئاژاوە و پشێوی دەخاتە نێوانیان.**

١٧٥٠- الدينار كنز والدرهم كنز والقيراط كنز.

(صحيح) (ابن مردويه) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٧٢٠)

**١٧٥٠- دینار گە نجینەیە زیو گە نجینەیە سەرمایەی زۆر گە نجینەیە.**

١٧٥١- إذا أديت زكاة مالك فقد أذهبت عنك شره .

(حسن) (ابن خزيمة ك) عن جابر. (الترغيب ٧٤٣)

**١٧٥١- ئەگەر زەكاتی ماڵەكەت دەركرد خراپەكەیت لەخۆت دوور خستۆتەوە.**

١٧٥٢- إذا أديت زكاة مالك فقد قضيت ما عليك .

(حسن) (ت هـ ك) عن أبي هريرة. (الترغيب ٧٥٢)

**١٧٥٢- ئەگەر زەكاتی ماڵەكەت دەربكەیت ئەوەی لەسەرتە كردوتە.**

## بابەتی ئەو شتانەی زەكاتیان واجبە و بڕەكەی

١٧٥٣- تؤخذ صدقات المسلمين على مياههم .

(صحيح) (حم هـ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ١٧٧٩)

**١٧٥٣- زەكاتی موسڵمانان لەسەر ئاوەكانیان وەردەگیرێت.**

١٧٥٤- السائمة جبار والجب جبار والمعدن جبار وفي الركاز الخمس.

(حسن) (حم) عن جابر. (المشكاة ١٧٩٨)

**١٧٥٤- ئاژەڵێك بە دەمی خۆی بلەوەڕێت كە زەرەری خست هەدەرە نابژێردرێت ، كەسێكیش[1] لە بیر هەڵكەندندا تیا بچێت ، كەسێكیش كانی پێ هەڵكەندرێت كە تیاچوو خوێنبای دەدرێت ، گە نجینەش پێنج یەك زەكاتی تیایە.**

١٧٥٥- قد عفوت عن الخيل والرقيق فهاتوا صدقة الرقة من كل أربعين درهما درهم وليس في تسعين ومائة شيء فإذا بلغت مائتين ففيها خمسة دراهم فما زاد فعلى حساب ذلك وفي الغنم في كل أربعين شاة شاة فإن لم يكن إلا تسع وثلاثون فليس عليك فيها شيء " وفي البقر في كل ثلاثين تبيع وفي الأربعين مسنة وليس في العوامل شيء " وفي خمس وعشرين من الإبل خمسة من الغنم فإذا زادت واحدة ففيها ابنة مخاض فإن لم تكن ابنة مخاض فابن لبون ذكر إلى خمس وثلاثين فإذا زادت واحدة ففيها بنت لبون إلى خمس وأربعين فإذا زادت واحدة ففيها حقة طروقة الجمل إلى ستين فإذا كانت واحدة وتسعين ففيها حقتان طروقتا الجمل إلى عشرين ومائة فإن كانت الإبل أكثر من ذلك ففي كل خمسين حقة " ولا يفرق بين مجتمع ولا يجمع بين متفرق خشية الصدقة " ولا يؤخذ في الصدقة هرمة ولا ذات عوار ولا تيس إلا أن يشاء المصدق " وفي النبات ما سقته الأنهار أو سقت السماء العشر وما سقي بالغرب ففيه نصف العشر.

(صحيح) (حم د) عن علي. (صحيح أبي داود ١٣٩٩)

---

[1] صحيح فقه السنه ج٢ ص ٦٢

**١٧٥٥- لە ئەسپ و کۆیلە خۆش بووم ، بەڵام زەکـاتی زیـو بهێـنن لـە هـەر چـل درهـەمێك درهەمێك دەربکەن لـە سـەد و نەوەتـدا هـیچ نییـە کـە گەیـشتە دوو سـەد پێـنج درهـەم، دەکەوێت هەر چییەکیش زیادی کرد هەر لەسەر ئەو حسابەیە لە مەڕیشدا لەهـەموو چـل سەر مـەڕدا مـەڕێکی دەکـەوێت ئەگـەر تـەنها سـی و نـۆ بـوو هیـچت لەسـەر نییـە لـە سـی مانگاشدا گوێرەکەیەك دوو سـاڵە زەکـاتی تیایـە ، لـە چـل مانگاشـدا نـوێنگێنیکی سـێ ساڵەی دەکەوێت لەوانەیش کاردەکەن هیچی تیا نییە ، لە بیست و پێـنج وشـتریش پێـنج مەڕ زەکاتی تیایە ، ئەگەر یەکێك زیادی کرد بەچکە وشترێکی یەك ساڵەی مێینـە پـێ ی نابێتە دووهەم ساڵ زەکاتی دەکەوێت ، ئەگەر ئەوەش نەبوو باوشترێك بێت پێـی نـابێتـە ساڵی سێیەم ، تـا سی و پێنجی باس کرد ئەگەر لەوە یەکێ زیـادی کـرد وشـترێك مێینـەی تیایە پێی نـابێتە ساڵی سێیەم ، تـاکو دەگاتە چل و پێنج ، ئەگـەر لـەوە یـەکێك زیـادی کرد ئەوە وشترێکی تیایە پێی نـابێتە ساڵی چوارەم و کـاتی ئـەوەی هاتبێـت کـەڵ بگرێـت تـا دەگـاتە شەست کە گەیشتە نەوەد و یەك دوو وشتری تیایە سێ ساڵیان تەواو کردبێت و پێیان نابێتە ساڵی چوارەم تـا دەگـاتە سەد و بیست ئەگەر وشترەکان لـەو ژمارانـە زۆرتـر بێت لەهەموو پە نجا سەر وشـترێك دەکـەوێت پێیـان نابێتـە سـاڵی چـوارەم قەدەغەیـشە کۆمەڵ جیا بکرێتەوە یـان جیاوازەکـان کۆبکرێنـەوە لـە تـرسـی زەکاتـدا لـە زەکاتیـشدا ئاژەڵی پیر و کوێر و سابرێن ومرناگیرێت مەگەر ئەو کەسە خۆی حەز بکات لە ڕووەکیـشدا ئەوەی بەڕوبار ئاو دەدرێت یان بەباران دەیەکی تیایـە ئەوەشـی بـە دۆلکـە ئـاو دەدرێـت نیوە دەیەکی تیایە.**

١٧٥٦- في الركاز الخمس.

(صحيح) (هـ) عن ابن عباس (طب) عن أبي ثعلبة (طس) عن جابر وابن مسعود. (الإرواء ٨٠٤)

**١٧٥٦- لە گە نجینەدا پێنج یەك هەیە.**

١٧٥٧- في العسل في كل عشرة أزق زق.

(صحيح) (ت هـ) عن ابن عمر. (الإرواء ٨٠٢)

**١٧٥٧- لە هەنگویندا لەهەموو دە کوننەدا یەك کوننە زەکاتی دەکەوێت.**

١٧٥٨- في ثلاثين من البقر تبيع أو تبيعة وفي أربعين من البقر مسنة.

(حسن) (ت هـ) عن ابن مسعود. (الإرواء ٧٩٤)

**١٧٥٨- لە سی ڕەشە ووڵاخ دا یەك گوێرەكەی یەك ساڵە هەیە كە پێ ی نابێتە ساڵی دووهەم و لە چل مانگادا یەك گوێرەكەی مێینە هەیە كە دوو ساڵی تەواو كردبێت.**

١٧٥٩- في خمس من الإبل شاة وفي عشر شاتان وفي خمس عشرة ثلاث شياه وفي عشرين أربع شياه وفي خمس وعشرين ابنة مخاض إلى خمس وثلاثين فإن زادت واحدة ففيها ابنة لبون إلى خمس وأربعين فإذا زادت واحدة ففيها حقة إلى ستين فإذا زادت واحدة ففيها جذعة إلى خمس وسبعين فإذا زادت واحدة ففيها ابنتا لبون إلى تسعين فإذا زادت واحدة ففيها حقتان إلى عشرين ومائة فإذا كانت الإبل أكثر من ذلك ففي كل خمسين حقة وفي كل أربعين بنت لبون فإذا كانت إحدى وعشرين ومائة ففيها ثلاث بنات لبون حتى تبلغ تسعا وعشرين ومائة فإذا كانت ثلاثين ومائة ففيها بنتا لبون وحقة حتى تبلغ تسعا وثلاثين ومائة فإذا كانت أربعين ومائة ففيها حقتان وبنت لبون حتى تبلغ تسعا وأربعين ومائة فإذا كانت خمسين ومائة ففيها ثلاث حقاق حتى تبلغ تسعا وخمسين ومائة فإذا كانت ستين ومائة ففيها أربع بنات لبون حتى تبلغ تسعا وستين ومائة فإذا كانت سبعين ومائة ففيها ثلاث بنات لبون وحقة حتى تبلغ تسعا وسبعين ومائة فإذا كانت ثمانين ومائة ففيها حقتان وابنتا لبون حتى تبلغ تسعا وثمانين ومائة فإذا كانت تسعين ومائة ففيها ثلاث حقاق وبنت لبون حتى تبلغ تسعا وتسعين ومائة فإذا كانت مائتين ففيها أربع حقاق أو خمس بنات لبون أي السنين وجدت أخذت " وفي سائمة الغنم في كل أربعين شاة شاة إلى عشرين ومائة فإذا زادت واحدة فشاتان إلى المائتين فإذا زادت على المائتين ففيها ثلاث إلى ثلاثمائة فإن كانت الغنم أكثر من ذلك ففي كل مائة شاة شاة ليس فيها شيء حتى تبلغ المائة " ولا يفرق بين مجتمع ولا يجمع بين متفرق مخافة الصدقة وما كان من خليطين فإنهما يتراجعان بالسوية ولا يؤخذ في الصدقة هرمة ولا ذات عوار من الغنم ولا تيس الغنم إلا أن يشاء المصدق .

(صحيح) (حم ٤ ك) عن ابن عمر. (الإرواء ٧٩٢)

**١٧٥٩- لە پێنج وشتردا یەك مەڕی یەك ساڵە یان بزنی دوو ساڵە لە دە وشتردا دوو مەڕی یەك ساڵە یان دوو بزنی دوو ساڵە و لە پانزە وشتردا سێ مەڕ یان بزن و لە بیست وشتردا چوار مەڕ یان بزن لە بیست و پێنج وشتردا** (ابن مخاض)[٢] **یێکی تیایە تاکو سی و پێنج**

[٢] (ابن مخاض) واتە: بێچوە ووشترێکی نێرینە کە دایکی بە ژانەوەیە بە بێچوێکی ترەوە، یان بێچوە ووشترێکی نێرینە کە ساڵی یەکەمی تەمەنی تەواو کربێت و پێ ی نابێتە ساڵی دووهەم.

ئەگەر لەوە یەکێ زیادی کرد ( ابنة لبـون )[٢] یەکی تیایە تاکو دەگاتـە چل و پێنج ئەگـەر یەکێ زیادی کرد ( حقة )سێ ساڵی تەواو کردبێت و شایستەی بارهەڵگرتنـە یـەکی تیایـە تاکو دەگاتە شەست ئەگەر یەکێ زیـادی کـرد ( جذعـة )چـوار سـاڵی تـەواو کردبێت یـەکی تیایە تـاکو دەگاتە حەفتا و پێنج ئەگـەر یـەکێ زیـادی کـرد دوو ( ابنـة لبـون )بێـچوێکی مێینەی دوو ساڵە کە دایکی شیردەرەی تیایە تـاکو دەگاتە نەوەد ئەگەر یـەکێ زیـادی کـرد دوو ( حقة )ی تیایە تـاکو دەگاتـە سـەد و بیـست ئەگـەر وشـترەکان لـەوە زیـاتر بـوون لـە هەموو پە نجا وشتر ( حقة ) یەکی تیایە لە هەموو چل وشـتریش ( ابنـە لبـون )یکـی تیایـە ئەگەر سەد و بیست و یەك بوو سێ ( ابنة لبون )ی تیایـە تـاکو دەگاتـە سـەد و بیست ونـۆ کەگەیشتە سەد و سی و دوو ( ابنة لبون ) و ( حقة ) یەکی تیایە تـاکو دەگاتـە سـەدو سـی و نۆ کەگەیشتە سەد و چل دوو ( حقة ) و یەك ( ابنة لبون ) ی تیایە تاکو دەگاتـە سـەدو چـل ونۆ کەگەیـشتە سـەد و پـە نجا سـێ ( حقـة ) ی تیایـە تـاکو دەگاتـە سـەد و پـە نجا و نـۆ کەگەیـشت سـەد وشەسـت چـوار ( ابنـة لبـون )ی تیایـە تـاکو دەگاتـە سـەد و شەسـت ونـۆ کەگەیشتە سەد و حەفتا سـێ ( ابنـة لبـون ) و یـەك ( حقـة )ی تیایـە تـاکو دەگاتـە سـەد و حەفتا ونۆ کەگەیشتە سەد و هەشتا دوو( حقـة ) و دوو( ابنـة لبـون )ی تیایـە تـاکو دەگاتـە سەد و هەشتا ونۆ کەگەیشتە سەد و نەوەد و سێ ( حقة ) و یەك ( ابنة لبـون )ی تیایـە تـاکو دەگاتە سەدو نەوەد و نۆ کەگەیشتە دوو سەد، چوار ( حقة ) یان پێنج ( ابنة لبون )ی تیایـە لەمەڕ و بزنی خۆ لەوەڕدا لە هەموو چل سەر مـەڕ یـان بـزن یـەك مەڕی یـەك سـاڵە یـان بزنێکی دوو ساڵە تاکو دەگاتە سەد و بیست یـەکێك لـەوە زیـادی کـرد دەبێتـە دوو مـەڕی یەك ساڵە یان دوو بزنی دوو ساڵە تاکو دەگاتە دوو سـەد کەلـەدوو سـەد زیـادی کـرد سـێ کاوڕی تیایە تـا دەگاتە سێ سەد ئەگەر مەڕ یان بزنەکان لـەوە زیـاتر بـن لەهـەموو سەد مەڕ یا سەر بزن کاوڕێك زەکاتی تیایە ئیتر هیچیان تیا نییـە تـا ئەگاتـە سـەد سـەر، کۆمـەڵێك مـەڕ بـۆ نمونـە دوو شـەریك چـل مـەڕیان هـەبێت یـەك مـەڕ زەکاتەکەیەتی ئەگەر جیای بکەنەوە یـەکی بیـست مـەڕیان بەردەکـەوێت ئـەو کاتـە زەکاتی ناکەوێت ، یان یەکی چل مەڕیان هەیە دەبێ یەکی مـەڕێك بـدەن بـە زەکـات

---

[٢] (ابنه لبون) بیچووێکی مێینە کە دوو ساڵی تەواو کردبێت و دایکی شیر بدات بە بێچوێکی تر.

**ئەوان تێكەڵی بكەن و لە هەشتا مەڕەكە یەك مەڕ بدەن ، نابێت جیا بكرێنەوە مەڕی جیا جیایش نابێت كۆبكرێتەوە لەترسی زەكاتدا دوو هاوبەش تێكەڵـەیان كردبێـت بە یەكسانی حساب دەكرێت لەزەكاتیشدا نە ئاژەڵی پیر و نە كـوێر و بـەران و نێـری وەرناگیرێت مەگەر زەكاتدەرەكە خۆی حەز بكات.**

١٧٦٠- في كل سائمة إبل في أربعين بنت لبون لا يفرق إبل عن حسابها من أعطاها مـؤتجرا بهـا فله أجرها ومن منعها فإنا آخذوها وشطر ماله عزمة من عزمات ربنا عز وجل لـيس لمحمـد ولا لآل محمد منها شيء.

(حسن) (حم د ن ك) عن معاوية بن قرة. (الإرواء ٧٨٣)

**١٧٦٠- لەهەموو چل وشتری خۆ لەوەڕی ( بنت لبون )یكی تیایە بێچوێكی مێینەی دووسـاڵە كە دایكی شیردەرە بە بێچوێكی تر خاوەن وشتریش نابێـت وشـترەكانی جیـا بكاتـەوە كـە تێكەڵ بێت لەگـەڵ وشـتری تـر هـەر كەسـێكیش زەكـات بـدات بـەهیوای پاداشـتەكەیەوە دەستی دەكەوێت هەر كەسێكیش نەیدات ئێمـە لێـی دەسـتێنین وەنیـوەی ماڵەكەشـی وەكـو مافێكی خوایە و هیچی بۆ موحەممەد و خاو و خێزانی موحەممەد نییە.**

١٧٦١- في كل سائمة من الغنم فرع تغذوه ماشيتك حتى إذا استحمل للحجيج ذبحتـه فتـصدقت بلحمه على ابن السبيل فإن ذلك هو خير .

(صحيح) (حم د ن هـ) عن بيشة. (الإرواء ١١٨١)

**١٧٦١- لە هـەموو ڕانـە مـەڕێكی بـە خـۆوە ژیـودا فـەرەعێكی[٤] تیایـە ، تـاكو وای لێـدێت بتوانێت بـار هەڵگرێت بۆ حاجیـان ، سەری دەبڕیت و گۆشتەكەی دەكەیتە خێر بۆ ڕێبواران و هەژار ، چونكە ئەوە چاكترە.**

١٧٦٢- فيما دون خمس وعشرين من الإبل في كل خمس ذود شاة فإذا بلغت خمسا وعشرين ففيها ابنة مخاض إلى خمس وثلاثين وإن لم تكن ابنة مخاض فابن لبون ذكر فإن بلغت ستا وثلاثـين ففيهـا ابنة لبون إلى خمس وأربعين فإذا بلغت ستة وأربعين ففيها حقة طروقة الفحل إلى ستين فإذا بلغت واحدا وستين ففيها جذعة إلى خمسة وسبعين فإذا بلغت ستة وسبعين ففيها بنتا لبون إلى تـسعين فإذا بلغت واحدا وتسعين ففيها حقتان طروقتا الفحل إلى عشرين ومائة فإذا زادت على عشرين ومائة ففي كل أربعـين ابنـة لبـون وفي كـل خمـسين حقـة " فـإذا تبـاين أسـنان الإبـل في فـرائض

---

[٤] فەرەع نۆبەرەی وشترە ، لە جاهیلیەتدا ، سەریان دەبڕی بۆ بتەكانیان ، جا ئیسلام كە هات نەهی كرد لەو كارە.

الصدقات فمن بلغت عنده صدقة الجذعة وليست عنده جذعة وعنده حقة فإنها تقبل منه ويجعل معها شاتين إن استيسرتا له أو عشرين درهما ومن بلغت عنده صدقة الحقة وليست عنده إلا جذعة فإنها تقبل منه ويعطيه المصدق عشرين درهما أو شاتين ومن بلغت عنده صدقة الحقة وليست عنده صدقة ابنة لبون وليست عنده إلا حقة فإنه تقبل منه ويعطيه المصدق عشرين درهما أو شاتين ومن بلغت عنده صدقة بنت لبون وليست عنده ابنة لبون وعنده ابنة مخاض فإنها تقبل منه ويجعل معها شاتين إن استيسرتا له أو عشرين درهما ومن بلغت صدقته بنت مخاض وليس عنده إلا ابن لبون ذكر فإنه يقبل منه وليس معه شيء ومن لم يكن عنده إلا أربع من الإبل فليس فيها شيء إلا أن يشاء ربها " وفي صدقة الغنم في سائمتها إذا كانت أربعين ففيها شاة إلى عشرين ومائة فإذا زادت ففيها شاتان إلى مائتين فإذا زادت واحدة ففيها ثلاث شياه إلى ثلاثمائة فإذا زادت ففي كل مائة شاة " ولا يؤخذ في الصدقة هرمة ولا ذات عوار ولا تيس إلا أن يشاء المصدق ولا يجمع بين متفرق ولا يفرق بين مجتمع خشية الصدقة وما كان من خليطين فإنهما يتراجعان بينهما بالسوية " وإذا كانت سائمة الرجل ناقصة من أربعين شاة شاة واحدة فليس فيها شيء إلا أن يشاء ربها " وفي الرقة ربع العشر فإذا لم يكن المال إلا تسعين ومائة درهم فليس فيها شيء إلا أن يشاء ربها.

(صحيح) (حم خ) عن أبي بكر. (الإرواء ٧٨٣)

**١٧٦٢- لە کەمتر لە بیست و پێنج ووشتر لـە هـەر پێنج ووشـترێك، مـەڕێکی مـەڕێکی لـە دەدرێتە زەکات ئەگەر گەیشتنە بیست و پێنج ووشترێکی** (ابنة مخاض)[٥] **ی تیادایە ، تاکو دەگاتە سی و پێنج ئەگەر** (ابنة مخاض)**یش نەبوو با ( ابن لبون )**[٦] **بێت ، کە گەیشتە سی ووشەش** (ابنة لبون) **یکی تیایە تا دەگاتە چل و پێنج ، کە گەیشتە چل و شەش** ( حقة )[٧] **یەکی دەکەوێت کەڵ بگرێت تاکو دەگاتە شەست ،** ( جذعة ) **یەکی دەکەوێت تاکو دەگاتە حەفتا و پێنج، کاتێك گەیشتە حەفتا و شەش دوو** ( بنت لبون ) **ی تیایە ، تاکو دەگاتە نەوەد ، کە گەیشتە نەوەد و یەك ، دوو** ( حقة ) **ی کەڵ گرتوویان دەکەوێت تاکو دەگاتە سەد و بیست ، کە ژمارەکە سەرکەوت لە سەد و بیست ، لـە هـەموو چل دانەیەکدا** (ابنة

---

[٥] (ابن مخاض): بێچوە ووشترێکی نێرینە کە دایکی بە ژانەوە بێت بە بێچوێکی ترەوە ، (مخاض) واتە: ژان ، یان ساڵێکی تەواو کردبێت.

[٦] (ابنە لبون) بێچوێکی نێرینە کە دایکی شیر ئەدات بە بێچوێکی تر ، یان دوو ساڵی تەواو کردبێت.

[٧] (حقە) ووشترێکی مێینە کە سێ ساڵی تەواو کردبێت یان شایستەی بار هەڵگرتن بێت.

لبون )ێکی تیایە ، لە هەموو پەنجا دانەیەکیشدا (حقة )یەکی دەکەوێت ، ئەگەر تەمەنی ووشترەکان جیاواز بوون لە زەکاتەکەدا ، هەرکەسێ (جذعة)یەك زەکاتی دەکەوت و (جذعة) [8] ی نەبوو ، (حقة) هەبوو لێی وەردەگیرێت ، بەڵام دوو مەڕی لەگەڵدا بدات یان بیست درهەم ، هەرکێیش ( حقە )یەك زەکاتی دەکەوت و ، (حقة) ی نەبوو ، بەلام (جذعة) هەبوو ، لێی وەردەگیرێت و ، زەکات وەرگر بیست درهەمی دەداتێ یان دوو مەڕ ، هەرکێیش زەکاتی گەیشتە (ابنة لبون )ێك و ، (ابنة لبون ) ی نەبوو ، بەلام (ابن مخاض ) ی هەبوو ، لێی وەردەگیرێت و ، دوو مەڕیش لەگەڵیدا ئەگەر توانرا یان بیست درهەم ، هەرکێیش زەکاتی گەیشتە (بنت مخاض ) و تەنها (ابن لبون ) ی هەبوو ، لێی وەردەگیرێت و هیچی ناخرێتە پاڵ ، هەرکێیش هیچی نەبوو جگە لە چوار وشتر هیچی ناکەوێت مەگەر خاوەنەکەی خۆی حەز بکات ، زەکاتی مەڕی بە خۆوە ژیو ئەگەر بگاتە چل سەر یەك مەڕی دەکەوێت تاکو دەگاتە سەد و بیست ، ئەگەر لەوە زیاتر بێت دوو مەڕی دەکەوێت تاکو دەگاتە دوو سەد ، ئەگەر یەکێك زیادی کرد سێ مەڕی دەکەوێت ، تاکو دەگاتە سێ سەد ، ئەگەر لەوە زیاتر بوو لە هەموو سەد مەڕ مەڕێکی دەکەوێت ، لە زەکاتیشدا بە پیر و نە کوێر و نە نێری وەرناگیرێت مەگەر خاوەنەکەی خۆی حەز بکات ، ئەوەی جیایە نابێت کۆبکرێتەوە [9] ، ئەوەی کۆیە نابێ جیا بکرێتەوە لەبەر مەترسی زەکات ، هەرچیش تێکەڵ کراوە پێویستە بە یەکسانی بە ئەندازەی بەشی خۆیان زەکاتیان لێ بدرێت ، ئەگەر مەڕی خۆ لەوەڕیش کەمتر بوو لە چل مەڕ هیچی ناکەوێت ، مەگەر خاوەنەکەی خۆی حەز بکات زیوویش چواریەکی دەیەکی تیایە ئەگەریش هەموو ماڵەکە سەد و نەوەد بوو ، زەکاتی ناکەوێت مەگەر خاوەنەکەی خۆی حەز بکات.

١٧٦٣- فيما سقت السماء والأنهار والعيون أو كان عثريا العشر وفيما سقي بالسواني أو النضح نصف العشر .

(صحيح) (حم خ ٤ ) عن ابن عمر. (الإرواء ٧٩١)

---

[8] (جذعة) ووشترێکە چوار ساڵی تەواو کردبێت.

[9] واتە: ئەگەر یەکی ٤٠ مەڕ یان بزنیان هەبوو دەبێ یەکی مەڕێك یان بزنێك بدەن بە زەکات ، بەڵام ئەگەر کۆیان بکەنەوە و تێکەڵیان بکەن لە ترسی زەکات لە هەشتا سەرەکە یەك مەڕ یان یەك بزن ئەدەن بۆیە دروست نیە لە ترسی زەکات تێکەڵی بکەن و یەك سەر بدە بەڵکو دەبێ لە هەر چل سەر سەرێك بدەنن نەك جیای بکەنەوە یەکی ٣٥ یان بەر بکەوێت و زەکاتی لێ نەدەن . وەرگێڕ

**١٧٦٣- ئەوەی ئاسمان و ڕووبارو كانیەكان و جۆگەلە ئاوی دەدات، دەیەكی تیایە، ئەوەشی بە وشتر كاری ئاو بدرێت، یان ئاوی بۆ بگوێزرێتەوە نیوە دەیەكی تیایە.**

١٧٦٤- فيما سقت السماء والأنهار والعيون العشر وفيما سقت السانية نصف العشر .

(صحيح) (حم م د ن هق) عن جابر. (الإرواء ٧٩٦)

**١٧٦٤- ئەوەی ئاسمان و ڕووبارو كانی ئاوەی دەدات دەیەكی تیایە، ئەوەشی بەوشتر ئاو بدرێت نیوە دەیەكی تیایە.**

١٧٦٥- فيما سقت السماء والعيون العشر وفيما سقي بالنضح نصف العشر.

(صحيح) (ت هـ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٧٩٦)

**١٧٦٥- ئەوەی بەئاسمان و كانیەكان ئاو بدرێت دەیەكی تیایە، ئەوەشی بە ئامێر ئاو بدرێت نیوە دەیەكی تیاییە.**

١٧٦٦- ليس على المسلم في عبده ولا في فرسه صدقة .

(صحيح) (حم ق ٤ ) عن أبي هريرة. (الضعيفة ٤٠١٤)

**١٧٦٦- لە ئەسپ و كۆیلەی موسوڵمانانـدا زەكات نییە.**

١٧٦٧- ليس في الأوقاص شيء .

(صحيح) (طب) عن معاذ. (الإرواء ٧٨٧)

**١٧٦٧- لە ( اوقاص )دا زەكات نییە لە زیادەی نێوان ژمارەكان دا زەكات نیە[١٠].**

١٧٦٨- ليس في الخضروات زكاة.

(صحيح) (قط) عن أنس وطلحة (ت هـ) عن معاذ. (الإرواء ٧٩٣)

**١٧٦٨- لەسەوزەدا زەكات نییە.**

١٧٦٩- ليس في الخيل والرقيق زكاة إلا زكاة الفطر في الرقيق .

(صحيح) (د) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢١٨٩)

**١٧٦٩- لەئەسپ و كۆیلەدا زەكات نییە تەنها زەكاتی سەر فیترە نەبێت لە كۆیلەدا.**

١٧٧٠- ليس فيما دون خمسة أوسق من التمر صدقة وليس فيما دون خمس ذود من الإبل صدقة وليس فيما دون خمس أواق من الورق صدقة.

(صحيح) (حم ق ٤ ) عن أبي سعيد. (الإرواء ٨٠٠)

---

[١٠] لە ٤٠ سەر یەك سەر مەڕ یان بزنی هەیە ، بەڵام لە زیادەی ٤٠ هەر ١٢٠ زەكات تا دەبێتە ١٢١ زەكاتی تری تیا نیە. وەرگێڕ

**١٧٧٠- لەکەمتر لە پێنج باری خورما زەکات نیە، لەکەمتر لە پێنج وشتریشدا زەکات نییە، لەکەمتر لە پێنج (ئوقییە) زیویش زەکات نییە.**

١٧٧١- ليس فيما دون خمسة أوسق من التمر ولا حب صدقة.

(صحيح) (حم ق ٤ ) عن أبي سعيد. (الإرواء ٨٠١)

**١٧٧١- لە پێنج بار کەمتر خورما و دانەوێڵە زەکات نییە.**

١٧٧٢- ليس فيما دون خمس من الإبل صدقة وليس في الأربع شيء فإذا بلغت خمسا ففيها شاة إلى أن تبلغ تسعا فإذا بلغت عشرا ففيها شاتان إلى أن تبلغ أربع عشرة فإذا بلغت خمس عشرة ففيها ثلاث شياه إلى أن تبلغ تسع عشرة فإذا بلغت عشرين ففيها أربع شياه إلى أن تبلغ أربعا وعشرين فإذا بلغت خمسا وعشرين ففيها بنت مخاض إلى خمس وثلاثين فإن لم تكن بنت مخاض فابن لبون ذكر فإن زادت بعيرا ففيها بنت لبون إلى أن تبلغ خمسا وأربعين فإن زادت بعيرا ففيها حقة إلى أن تبلغ ستين فإن زادت بعيرا ففيها جذعة إلى أن تبلغ خمسا وسبعين فإن زادت بعيرا ففيها بنتا لبون إلى أن تبلغ تسعين فإن زادت بعيرا ففيها حقتان إلى أن تبلغ عشرين ومائة ثم في كل خمسين حقة وفي كل أربعين بنت لبون .

(صحيح) (هـ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٢١٩٢)

**١٧٧٢- لە خوارەوەی پێنج وشتر کەمتر ، زەکات نییە، لە چوار وشتردازەکات نییە ئەگەر گەیشتە پێنج کاوڕە ڕەمەرێکی تیایە، تا دەگاتە نۆ، کە گەیشتە دە دوو کاوڕە مەڕ زەکاتی دەکەوێ ، تا دەگاتە نۆزدە کە گەیشتە بیست وشتر چوار کاوڕە مەڕی تیایە تا دەگاتە بیست و چوار کە گەیشتە بیست و پێنج وشترێکی (بنت** مخاض **) زەکاتی دەکەوێت، تا دەگاتە سی و پێنج، ئەگەر (بنت** مخاض **) نەبوو با (ابن لبون) بێت، ئەگەر لەوە وشترێك زیادی کرد (** ابنة لبون **)ێکی تیایە تا دەگاتە چل و پێنج، ئەگەر یەك وشتر زیادی کرد (** حقة **)یەکی دەکەوێت تا دەگاتە شەست وشتر، کەلەوە زیادی کرد (** جذعة **)یەکی دەوێت تا دەگاتە حەفتاو پێنج. کەیەك وشتر زیادی کرد دوو (بنت لبون)ی دەکەوێت تا دەگاتە نەوەد وشتر و لەهەموو پەنجا سەر (**حقة**)یەکی دەکەوێت، لەهەموو چل سەریشدا ( بنت لبون)ێکی دەکەوێت.**

١٧٧٣- لا زكاة في مال حتى يحول عليه الحول .

(صحيح) (هـ) عن عائشة. (الإرواء ٧٧٩)

**١٧٧٣- زەکات لەماڵێکدا نییە تاساڵی بەسەردا تێنە پەڕێت.**

١٧٧٤- الزكاة في هذه الأربعة الحنطة والشعير والزبيب والتمر.

(صحيح) (قط) عن عمر. (الصحيحة ٨٧٧)

**١٧٧٤- زەكات لەچوار شتدا هەيە: گەنم، و جۆ، و مێووژ، و خورما.**

## بابەتی كۆكردنەوەی زەكات و دابەشكردنی

١٧٧٥- إذا أتاكم المصدق فلا يصدر عنكم إلا وهو راض.

(صحيح) (حم م ت ن هـ) عن جرير. (المشكاة ١٧٧٦)

**١٧٧٥- ئەگەر كۆكەرەوەی زەكات هاتە لاتان بابەجێتان نەهێڵێ تا لێتان ڕازی نەبێت.**

١٧٧٦- أرضوا مصدقيكم .

(صحيح) (حم م د ن) عن جرير.

**١٧٧٦- كۆكەرەوەی زەكاتەكانتان ڕازی بكەن.**

١٧٧٧- الخازن المسلم الأمين الذي يعطي ما أمر به كاملا موفرا طيبة به نفسه فيدفعه إلى الذي أمر له به أحد المتصدقين.

(صحيح) (حم ق د ن) عن أبي موسى. (المشكاة ١٩٤٩)

**١٧٧٧- گەنجینەوانی دەسپاكی موسوڵمان كەئەوەی فەرمانی پێكراوە بەدڵێكی فراوانەوە دەیدا بەو كەسە، خۆیشی یەكێكە لەخێر خوازەكان.**

١٧٧٨- العامل بالحق على الصدقة كالغازي في سبيل الله عز وجل حتى يرجع إلى بيته .

(صحيح) (حم د ت هـ ك) عن رافع بن خديج. (المشكاة ١٧٨٥)

**١٧٧٨- كۆكەرەوەی زەكات بەڕاستی هەڵسێ بەكارەكەی، وەكو ئەو كەسەیە جیهاد بكات لە پێناو خوادا تا دەگەڕێتەوە نێو ماڵەكەی خوی.**

١٧٧٩- قال رجل لأتصدقن الليلة بصدقة فخرج بصدقته فوضعها في يد سارق فأصبحوا يتحدثون تصدق الليلة على سارق فقال اللهم لك الحمد على سارق لأتصدقن الليلة بصدقة فخرج بصدقته فوضعها في يد زانية فأصبحوا يتحدثون تصدق الليلة على زانية فقال اللهم لك الحمد على زانية لأتصدقن الليلة بصدقة فخرج بصدقته فوضعها في يد غني فأصبحوا يتحدثون تصدق الليلة على غني فقال اللهم لك الحمد على سارق وعلى زانية وعلى غني فأتي فقيل له أما صدقتك

على سارق فلعله أن يستعف عن سرقته وأما الزانية فلعلها أن تستعف عن زناها وأما الغني فلعله أن يعتبر فينفق مما أعطاه الله.

(صحيح) (حم ق هـ) عن أبي هريرة. (مشكلة الفقر ٦)

**١٧٧٩- پیاوێك وتی ئەمشەو ئەبێت خێرێك بكەم، ئیتر چووە دەرەوە، صەدەقەكەی خستە دەستی دزێك، كە ڕۆژ بوویەوە خەڵكی باسی ئەوەیان دەكرد ئەمشەو صەدەقەیەك درا بەدزێك! وتی: خوایە سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەو دزە! ئەمشەویش ئەبێ صەدەقەیەك بكەم ئەمجارە دای بە ئافرەتێكی داوێن پیس! كە ڕۆژ بوویەوە خەڵكی دەیانووت ئەمشەو صەدەقەیەك درا بە ئافرەتێكی داوێن پیس ، ووتی : خوایە سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەم داوێن پیسە! ئەمشەو دەبێت صەدەقەیەك بكەم ، چووە دەرەوە ئەم جارە خستیە دەست پیاوێكی دەوڵەمەند، كە ڕۆژ بوویەوە خەڵكی باسی ئەوەیان دەكرد ئەمشەو صەدەقەیەك درا بە دەوڵەمەندێك! خوایە سوپاس بۆ تۆ، لەسەر دزێك و داوێن پیسێك و دەوڵەمەندێك، كەسێك هاتە لای و پێی وت: صەدەقەكەت بۆ دزەكە بەڵكو ئیتر واز لەدزی بهێنێ، داوێن پیسەكەش بەڵكو دوور بكەوێتەوە لەكاری خراپە، دەوڵەمەندەكەش بەڵكو پەندی لێ وەربگرێت و ماڵ ببەخشێت لەوەی خوا پێی داوە.**

١٧٨٠- لو كان مسلما فأعتقتم عنه أو تصدقتم عنه أو حججتم عنه بلغه ذلك.

(حسن) (د) عن ابن عمرو. (الجنائز ١٧٢)

**١٧٨٠- ئەگەر موسوڵمان بوایە لەجیاتی كۆیلەیەكتان ئازاد بكردایە. یان خێرێكتان لەجێگای بكردایە، یان حەجتان بۆی بكردایە و پێی دەگەیشت.**

١٧٨١- ليس المسكين الذي ترده الأكلة والأكلتان ولكن المسكين الذي ليس له غنى ويستحي ولا يسأل الناس إلحافا .

(صحيح) (خ ن) عن أبي هريرة. (مشكلة الفقر ٧٧)

**١٧٨١- هەژار ئەو كەسە نییە بە پاروویەك و دوو پاروو دەگەڕێتەوە، بەڵكو هەژار ئەو كەسەیە دەوڵەمەندیش نیە و داوای هیچ ناكات و شەرم دەكات، مكوڕیش نییە لەداواكردندا.**

١٧٨٢- ليس المسكين الذي يطوف على الناس فترده اللقمة و اللقمتان و التمرة و التمرتان و لكن المسكين الذي لا يجد غنى يغنيه و لا يفطن له فيتصدق عليه و لا يقوم فيسأل الناس.

(صحيح) ( مالك حم ق د ن ) عن أبي هريرة. (مشكلة الفقر ٧٧)

**١٧٨٢- هەژار ئەو كەسە نییە بەسەر خەڵكیدا دەگـەڕێ و ڕازی دەبێـت بە پارووێـەك و دوو پاروو، یان خورما یەك و دوو خورما، بەڵكو هەژار ئەو كەسەیە كەدەستی كورتەو، كـەس پێی نازانێت خێری پێ بكات و خۆیشی داوا لەخەڵكی ناكات.**

١٧٨٣- ما أعطيكم ولا أمنعكم أنا قاسم أضع حيث أمرت.

(صحيح) (خ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٢٢١)

**١٧٨٣- نە پێتان دەدەم و نەلێتان دەگرمەوە، بەڵكو من دابەشكارم و لەو شوێنە دایـدەنێم كەفەرمانم پێدەكرێت.**

١٧٨٤- ما أوتيكم من شيء ولا أمنعكموه إن أنا إلا خازن أضع حيث أمرت.

(صحيح) (حم د) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٢٢١)

**١٧٨٤- نەهیچتان پێ دەدەم و نەهیچتان لێ دەگرمـەوە، من تـەنها خەزێنـەوات نـیم لـەو شوێنەشدا دایدەنێم كەفەرمانم پێدەكرێت.**

١٧٨٥- المعتدي في الصدقة كمانعها.

(صحيح) (حم د ت هـ) عن أنس. (المشكاة ١٨٠١)

**١٧٨٥- دەست درێژكەر لەخێردا، وەكو ئەو كەسە یە هەر خێرەكەی نەكردوە.**

١٧٨٦- لا تحل الصدقة لغني إلا لخمسة لغاز في سبيل الله أو لعامـل عليهـا أو لغـارم أو لرجـل اشتراها بماله أو لرجل كان له جار مسكين فتصدق على المسكين فأهداها المسكين للغني .

(صحيح) (حم د هـ ك) عن أبي سعيد. (الإرواء ٨٧٠)

**١٧٨٦- زەكات ناشێت بۆ دەوڵەمەند لە پێنج حاڵەتـدا نـەبێت: بـۆ كەسـێك غـەزا بكـات لە پێناوی خوادا، یان بۆ كەسێك كار بكات لەسەر كۆكردنەوەی، یـان بـۆ قـەرزار، یـا لـە دەوڵەمەندێك بە پارەی خۆی لەهەژارەكەی كڕیبێ، یـان پیـاوێـك دراوسـێ یـەكی هـەژاری هەبێت و زەكاتـەكەی پێبدات، ئەویش بیدات بەدەوڵەمەندەكە.**

١٧٨٧- لا تحل الصدقة لغني ولا لذي مرة سوي .

(صحيح) (حم د ت ك) عن ابن عمر (حم ن هـ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٨٧٧)

**١٧٨٧- زەكات ناشێ بۆ دەوڵەمەند، یان بۆ كەسێكی لەش ساغی بەهێز.**

١٧٨٨- لا تشتره ولا تعد في صدقتك وإن أعطاكه بدرهم فإن العائد في صدقته كالعائد في قيئه .

(صحيح) (حم ق د ن) عن عمر. (صحيح أبي داود ١٤١٩)

**١٧٨٨- نەبیکڕەو نە لەخێرەکەت پاشگەز ببەوە، با بە درهەمێکیش بتداتێ، چونکە ئەو کەسەی لەصەدەقەکەی پاشگەز دەبێتەوە وەکو کەسێکە ڕشانەوەی خۆی بخواتەوە.**

١٧٨٩- لا تطعموا المساكين مما لا تأكلون.

(حسن) (حم) عن عائشة. (الصحيحة ٢٤٢٦)

**١٧٨٩- شتێك دەرخواردی هەژاران مەدەن كە خۆتان نایخۆن.**

١٧٩٠- لا جلب ولا جنب ولا تؤخذ صدقاتهم إلا في دورهم.

(صحيح) (د) عن ابن عمرو. (المشكاة ١٧٨٦)

**١٧٩٠- نەهێنان و، نەدوورکەوتنەوە، زەکاتە کانیشیان وەرناگیرێت لەماڵەکانیان نەبێت.**

١٧٩١- يا سعد إني لأعطي الرجل وغيره أحب إلى منه خشية أن يكبه الله في النار على وجهه

(صحيح) (ق د) عن سعد. (الصحيحة ٣٤٩٤)

**١٧٩١- ئەی سەعد! جاری وا هەیە ماڵ دەدەمە کەسێك و کەسێکی ترم بەلاوە خۆشەویستترە لەو کەسە، لەمەترسی ئەوەی خوا نەیخاتە دۆزەخەوە لەسەر ڕوو.**

١٧٩٢- إنك تقدم على قوم أهل كتاب فليكن أول ما تدعوهم إليه عبادة الله فإذا عرفوا الله فأخبرهم أن الله قد فرض عليهم خمس صلوات في يومهم وليلتهم فإذا فعلوا فأخبرهم أن الله قد فرض عليهم زكاة تؤخذ من أموالهم فترد على فقرائهم فإذا أطاعوا بها فخذ منهم وتوق كرائم أموال الناس.

(صحيح) (ق) عن ابن عباس. (الإرواء ٧٧٤)

**١٧٩٢- تۆ دەچیتە لای کەسانێك ئەهلی کیتابن، جا یەکەمین شت کە بانگیان دەکەیت بۆی با پەرستنی خوای گەورە بێت، ئەگەر ئەوەیان جێ بەجێ کرد ئاگاداریان بکە کە خوای گەورە لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون، ئەگەر ئەوەیان زانی ئاگاداریان بکە خوای گەورە زەکاتی لەسەر فەرز کردون لەماڵەکانیان وەرگیردرێت و دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان. ئەگەر گوێڕایەڵ بوون لێیان وەربگرەو خۆت بپارێزە لەوەرگرتنی ماڵە گرانبەهاکانی خەڵك.**

## بابەتی زەكاتی سەرفیترە

١٧٩٣- أدوا صاعا من بر أو قمح بين اثنين أو صاعا من تمر أو صاعا من شعير على كل حر وعبد صغير وكبير

(صحيح) (حم قط الضياء) عن عبدالله بن ثعلبة. (الصحيحة ١١٧٧)

**١٧٩٣- (صاعێك) چوار مست لەدانەوێڵە یا لە گەنم بدەن لەنێوان دوو كەسدا، یان چوار مست لە خورما یان جۆ لەسەر هەموو ئازادو كۆیلە و مناڵ و گەورەیەك.**

١٧٩٤- أدوا صاعا من طعام في الفطر.

(صحيح) (حل هق) عن ابن عباس. (الصحيحة ١١٧٩)

**١٧٩٤- صاعێك لەخۆراك بدەن لەبری سەرفیترە.**

١٧٩٥- زكاة الفطر طهرة للصائم من اللغو والرفث وطعمة للمساكين من أداها قبل الصلاة فهي زكاة مقبولة ومن أداها بعد الصلاة فهي صدقة من الصدقات.

(صحيح) (قط هق) عن ابن عباس. (الإرواء ٨٤٣)

**١٧٩٥- زەكاتی سەرفیترە پاككردنەوەیە بۆ رۆژوان لەخراپە و قسەی بەتاڵ و پوچ، خوراكیشە بۆ هەژاران، هەر كێ پێش نوێژ دەری بكات زەكاتێكی وەرگیراوە، هەر كێ یش لەدوای نوێژ دەرییكات خێرێكە و كردوویەتی.**

١٧٩٦- زكاة الفطر على كل حر وعبد ذكر وأنثى صغير وكبير فقير وغني صاع من تمر أو نصف صاع من قمح .

(صحيح) (هق) عن أبي هريرة. (صحيح سنن أبي داود ١٦١١)

**١٧٩٦- زەكاتی سەرفیترە فەرزە لەسەر هەموو موسوڵمانێك ئازادو كویلە و نێرینە و مێینە، گەورە و بچوك و هەژار و دەوڵەمەند یەك (ساع) چوار مشت لە خورما و (یەك ساع) چوار مشت لە جۆ.**

١٧٩٧- صدقة الفطر صاع من تمر أو صاع من شعير أو مدان من حنطة عن كل صغير وكبير وحر وعبد.

(صحيح) (قط) عن ابن عمر. (الصحيحة ١١٧٧)

**١٧٩٧- زەکاتی سەرفیترە (صاعێك) چوار مشت لە خورما، یان لە جۆ، یان دوو مشت لە گەنم لەجیاتی هەموو منداڵ و گەورە و ئازاد و کۆیلەیەك.**

١٧٩٨- ليس في العبد صدقة إلا صدقة الفطر.

(صحيح) (م) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢١٨٩)

**١٧٩٨- لەسەر کۆیلە زەکات نییە سەرفیترە نەبێت.**

١٧٩٩- الوزن وزن أهل مكة والمكيال مكيال أهل المدينة

(صحيح) (د ن) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٦٥)

**١٧٩٩- کێشانە کێشانەی خەڵکی مەککەیە و ، پێوانە پێوانەی خەڵکی مەدینەیە.**

١٨٠٠- كان يأمر بإخراج الزكاة قبل الغدو للصلاة يوم الفطر.

(صحيح) (ت) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ١٤٢٨)

**١٨٠٠- فەرمانی دەکرد بەدەرکردنی زەکات پێش دەرچوون بۆ نوێژی جەژن. لە جەژنی ڕەمەزاندا.**

## بابەتی ئەوانەی زەکاتیان لەسەر حەرامە

١٨٠١- إن الصدقة لا تحل لنا وإن مولى القوم منهم .

(صحيح) (ت ن ك) عن أبي رافع. (الصحيحة ١٦١٢)

**١٨٠١- زەکات بە ئێمە ناشێت، ئازادکراوی کەسانێکیش لەخۆیانە.**

١٨٠٢- إن الصدقة لا تنبغي لآل محمد وإنما هي أوساخ الناس.

(صحيح) (حم م) عن عبدالمطلب بن ربيعة. (الإرواء ٨٧١)

**١٨٠٢- صەدەقە ناشێت بۆ خاوو خێزانی موحەممەد، چونکە ئەوە چڵکی خەڵکییە.**

١٨٠٣- إن الله أبى ذلك لكم ورسوله أن يجعل لكم أوساخ أيدي الناس.

(صحيح) (طب) عن عبدالمطلب بن ربيعة. (المشكاة ١٨٢٣)

**١٨٠٣- خوای گەورە ئەوەی بۆ ئێوە ڕێگە نەداوە، هەروەها پێغەمبەرەکەشی، کە پیسی دەستی خەڵکی بۆ ئێوە دابنێت.**

١٨٠٤- إن الله حرم علي الصدقة وعلى أهل بيتي.

(صحيح) (ابن سعد) عن الحسن بن علي.

**١٨٠٤- خواى گەورە صەدەقەى لەسەر من قەدەغە كردووە، هەروەها لەسەر خاوو خێزانەكەيشم.**

١٨٠٥- إن هذه الصدقات إنما هي أوساخ الناس وإنها لا تحل لمحمد ولا لآل محمد.

(صحيح) (م د ن) عن المطلب بن ربعية. (المشكاة ١٨٢٣)

**١٨٠٥- ئەم خێر و زەكاتـانە پيسى خەڵكين، ڕەواش نييە نە بۆ مەحەمەد و، نـە بـۆ خـاوو خێزانەكەى.**

١٨٠٦- إنا آل محمد لا تحل لنا الصدقة.

(صحيح) (حم حب) عن الحسن بن على. (الإرواء ٨٦٢)

**١٨٠٦- ئێمە خاوو خێزانى موحەممەدين صەدەقە ڕەوا نييە بۆ ئێمە.**

١٨٠٧- إنا آل محمد لا تحل لنا الصدقة وإن مولى القوم من أنفسهم.

(صحيح) (حم د ن حب ك) عن أبي رافع. (الإرواء ٨٦٢)

**١٨٠٧- ئێمـە خـاوو خێزانـى موحەممـەدين صـەدەقە ڕەوا نييـە بۆمـان، ئـازاد كـراوى كەسانێكيش لەخۆيانە.**

١٨٠٨- إني لأنقلب إلى أهلي فأجد التمرة ساقطة على فراشي فأرفعها لآكلها ثم أخشى أن تكون صدقة فألقيها.

(صحيح) (حم ق) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٤٥٧)

**١٨٠٨- جارى وا هەيە دەگەڕێمـەوە مـاڵى خۆمـان و خورمايـەك دەبينـم لەسـەر جێگاكـەم كەوتووە، بەرزى دەكەمەوە بيخۆم، دوايى دەترسم صەدەقە بێت و فڕێى دەدەم.**

١٨٠٩- كخ كخ ارم بها أما شعرت أنا لا نأكل الصدقة.

(صحيح) (ق) عن أبي هريرة. (المشكاة ١٨٢٢)

**١٨٠٩- كخ كخ فڕێ ى بدە، ئايا هەستت نەكردووە ئێمە صەدەقە ناخۆين؟**

١٨١٠- لولا أخشى أنها من الصدقة لأكلتها.

(صحيح) (حم ق د ن) عن أنس. (صحيح أبي داود ١٤٥٧)

**١٨١٠- گەر نەترسابـام صەدەقە بێت دەمخوارد.**

١٨١١- هو عليها صدقة وهو منها لنا هدية.

(صحيح) (حم ق د ن) عن أنس (ق) عن عائشة. (الصحيحة ٢٥٤٦)

**١٨١١- بۆ خۆی صەدەقەیە و، بۆ ئێمە دیاری یە.**

١٨١٢- إن شئتما أعطيتكما ولا حظ فيها لغني ولا لقوي مكتسب.

(صحيح) (حم د ن) عن رجلين. (الإرواء ٨٦٨)

**١٨١٢- ئەگەر حەز بکەن بەشتان دەدەم، بەشی دەوڵەمەند و کەسی بەتوانایشی تیا نییە.**

١٨١٣- كان إذا أتي بطعام سأل عنه أهدية أم صدقة فإن قيل صدقة قال لأصحابه كلوا ولم يأكل وإن قيل هدية ضرب بيده فأكل معهم.

(صحيح) (ق ن) عن أبي هريرة. (المشكاة ١٨٢٤)

**١٨١٣- ئەگەر خواردنێك بهێنرایە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، پرسیاری دەکرد ئایا دیاری یە یان صەدەقەیە؟ ئەگەر بوترایە صەدەقە بە هاوەڵانی دەوت: بخۆن و خۆی نەیدەخوارد، ئەگەریش بوترایە: دیاری یە لەگەڵیان دەیخوارد.**

١٨١٤- إنما أرى بني هاشم وبني المطلب شيئا واحدا إنهم لم يفارقونا في جاهلية ولا إسلام.

(صحيح) (حم خ د ن هـ) عن جبير بن مطعم. (الإرواء ١٢٢٩)

**١٨١٤- من نەوەی هاشم و نەوەی عەبدولموتتەلیب وەك یەك دادەنێم، ئەوانە لە ئێمە جیانەبوونەتەوە نە لە نەفامیەت و نە لە ئیسلامدا.**

١٨١٥- بنو هاشم وبنو المطلب شيء واحد.

(صحيح) (طب) عن جبير بن مطعم. (الإرواء ١٢٢٩)

**١٨١٥- نەوەی هاشیم و نەوەی موتتەلیب یەکن.**

١٨١٦- قربيه فقد بلغت محلها.

(صحيح) (م) عن جويرية.

**١٨١٦- نزیکی بکەرەوە چونکە گەیشتە جێگای خۆی.**

## بابەتی هاندانی صەدەقە و خەرجکردن بۆ خزم و کەس و کار

**١٨١٧**- ابدأ بمن تعول.

(صحيح) ( طب ) عن حكيم بن حزام. (الصحيحة ٢٢٤٣)

**١٨١٧- بەوانە دەست پێ بکە بەخێویان دەکەیت.**

١٨١٨- ابدأ بنفسك فتصدق عليها فإن فضل شيء فلأهلك فإن فضل شيء عن أهلك فلذي قرابتك فإن فضل عن ذي قرابتك شيء فهكذا و هكذا.

(صحيح) ( ن ) عن جابر . (الإرواء ٤٥٩)

**١٨١٨- بەخۆت دەست پێ بکەو صەدەقەی بۆ بکە، ئەگەر زیاد بوو بۆ خێزانەکەت، ئەگەر لێی مایەوە بۆ خزمانت، ئەگەریش لەئەوان مایەوە ئیتر ئاوها و ئاوهایە.**

١٨١٩- اتقوا النار و لو بشق تمرة.

(صحيح) ( ق ن ) عن عدي بن حاتم ( حم ) عن عائشة ( طس الضياء ) عن أنس ( البزار ) عن النعمان بن بشير وعن أبي هريرة (طب ) عن ابن عباس وعن أبي أمامة . (الصحيحة ٣٤٩٥)

**١٨١٩- خۆتان بپارێزن لە ئاگر ئەگەر بەلەتە خورمایەکیش بێت.**

**١٨٢٠**- اجعلوا بينكم وبين النار حجابا ولو بشق تمرة .

(صحيح) (طب) عن فضالة بن عبيد. (الصحيحة ٣٤٩٥)

**١٨٢٠- لە نێوان خۆتان و ئاگردا بەربەستێك دانێن ، ئەگەر بە لەتی دەنکە خورمایەکیش بێت.**

١٨٢١- اجعلوا بينكم و بين النار حجابا و لو بشق تمرة.

(حسن) ( طب ) عن فضالة بن عبيد . (الصحيحة ٨٩٣)

**١٨٢١- لەنێوان خۆتان و ئاگردا پەرژینێك دروست بکەن ئەگەر لەتە خورمایەکیش بێت.**

١٨٢٢- أحب العباد إلى الله تعالى أنفعهم لعياله.

(صحيح) ( عبدالله في زوائد الزهد ) عن الحسن مرسلا . (الروض ٤٨١)

**١٨٢٢- خۆشەویستترین بەندەکان لەلای خوا، بە کەڵك ترینیانە بۆ منداڵەکانی خۆی.**

١٨٢٣- اخرجي فجذي نخلك لعلك أن تصدقي منه أو تفعلي خيرا.

(صحيح) ( د ن ه ك ) عن جابر . (الصحيحة ٧٢٢)

**١٨٢٣- برۆ خورماكەى بچنە بەڵكو چاكەى لێ بكەيت، يان كارێكى چاكە بكەيت.**

١٨٢٤- إذا أتاكم السائل فضعوا في يده و لو ظلفا محرقا.

(صحيح) ( عد ) عن جابر . (المشكاة ١٨٧٩)

**١٨٢٤- ئەگەر سواڵكەر هاتە دەرگاكەتان، شتێك بخەنە دەستى ئەگەر سمێكى سوتاويش بێت.**

١٨٢٥- إذا أعطى الله أحدكم خيرا فليبدأ بنفسه و أهل بيته.

(صحيح) ( حم م ) عن جابر بن سمرة . (الصحيحة ٢٥٦٨)

**١٨٢٥- ئەگەر خواى گەورە خەيرێكى بەيەكێكتاندا با لە خۆى و خێزانەكەيەوە دەست پێ بكات.**

١٨٢٦- إذا أنفق الرجل على أهله نفقة و هو يحتسبها كانت له صدقة.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن أبي مسعود . (الصحيحة ٧٢٨)

**١٨٢٦- ئەگەر پياوێك خەرجييەكى كرد بۆ خانەوادەكەى و چاوەڕوانى پاداشتى لە خوا لێكرد، بە خێر دەژمێردرێت بۆى.**

١٨٢٧- إذا أنفقت المرأة من بيت زوجها عن غير أمره فلها نصف أجره.

(صحيح) ( ق د ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٧٣٠)

**١٨٢٧- ئەگەر ئافرەتێك شتێك ببەخشێت لەماڵى پياوەكەى بەبێ فەرمانى ئەو نيوەى پاداشتەكەى دەست دەكەوێت.**

١٨٢٨- إذا أنفقت المرأة من بيت زوجها غير مفسدة كان لها أجرها بما أنفقت و لزوجها أجره بما كسب و للخازن مثل ذلك لا ينقص بعضهم من أجر بعض شيئا.

(صحيح) ( ق ٤ ) عن عائشة . (الصحيحة ٧٢٩)

**١٨٢٨- ئەگەر ئافرەتێك لەماڵى مێردەكەى شتێك ببەخشێت بۆ كارێك خراپ نەبێت، پاداشتى ئەو بەخشينەى دەست دەكەوێت، پياوەكەشى بەهەمان شێوە بۆ پەيدا كردن، بۆ خەزێنەدارەكەش وێنەى ئەوە، كەسيان لە پاداشتى ئەو يتريان كەم ناكاتەوە.**

١٨٢٩- إذا كان أحدكم فقيرا فليبدأ بنفسه فإن كان فضل فعلى عياله فإن كان فضل فعلى ذي قرابته فإن كان فضل فهاهنا و هاهنا.

(صحيح) ( حم م ن د ) عن جابر . (الإرواء ٨٣٣)

**١٨٢٩- ئەگەر کەسێك لەئێوە هەژار بوو، با لە خۆیەوە دەست پێ بکات گەر زیادەیەکی هەبوو بۆ خێزانەکەی، ئەگەر زیادەیەکی هەبوو بۆ خزمانی، ئەگەر زیادەیەکی هەبوو بۆ ئەملاو ئەولا.**

١٨٣٠- أربعة دنانير: دينار أعطيته مسكينا و دينار أعطيته في رقبة و دينار أنفقته في سبيل الله و دينار أنفقته على أهلك أفضلها الذي أنفقته على أهلك.

(صحيح) ( خد ) عن أبي هريرة . (الترغيب ١٩٥١)

**١٨٣٠- چوار دینار: دیناریکت بەخشی بەهەژارێ، بەدیناریکیش گەردنێکت ئازاد کرد، دیناریکیشت لە پێناو خوادا خەرج کرد، دیناریکیشت خەرج کرد بۆ کەس و کارت، چاکترینیان ئەوەیە بۆ کەس و کارت خەرج کردوە.**

١٨٣١- ارضخي ما استطعت و لا توعي فيوعي الله عليك.

(صحيح) ( م ن ) عن أسماء بنت أبي بكر . (الصحيحة ٣٦١٧)

**١٨٣١- ببەخشە تاکو دەتوانی، ماڵیش مەگرەوە لە هەژاران، با خوای گەورە لێت نەگرێتەوە.**

١٨٣٢- أعطي و لا توكي فيوكي عليك.

(صحيح) ( د ) عن أسماء بنت أبي بكر . (الصحيحة ٣٦١٧)

**١٨٣٢- ببەخشە و دەمەکەی دامەخە، با خوای گەورە چاکەت لێ نەگرێتەوە.**

١٨٣٣- أفضل الدنانير: دينار ينفقه الرجل على عياله و دينار ينفقه الرجل على دابته في سبيل الله و دينار ينفقه الرجل على أصحابه في سبيل الله عز و جل.

(صحيح) ( حم م ت ن هـ ) عن ثوبان . (الترغيب ١٩٥١)

**١٨٣٣- چاکترین دینارەکان: دینارێك پیاو خەرجی بکاتە سەر منداڵەکانی خۆی، دیناریکیش خەرجی بکاتە سەر وڵاخەکەی لە پێناو خوادا، دیناریکیش خەرجی بکاتە سەر هاورێکانی لە پێناو خوادا.**

١٨٣٤- أفضل الصدقات ظل فسطاط في سبيل الله عز و جل أو منحة خادم في سبيل الله أو طروقة فحل في سبيل الله.

(حسن) ( حم ت ) عن أبي أمامة ( ت ) عن عدي بن حاتم . (الترغيب ١٢٤٠)

**١٨٣٤- چاكترين صەدەقە سێبەرى خێوەتێكە لە پێنـاو خوادا، يـان ديـارى خزمەتكارێكـە بۆ موجاهيدێك لە پێنـاوى خوادا، يان وڵاغێكى پێگەيشتوو لە پێنـاو خوادا.**

١٨٣٥- أفضل الصدقة الصدقة على ذي الرحم الكاشح.

(صحيح) ( حم طب ) عن أبي أيوب وحكيم بن حزام ( خد د ت ) عن أبي سعيد ( طب ك ) عن أم كلثوم بنت عقبة . (الإرواء ٨٩٢)

**١٨٣٥- چاكترين صەدەقە ئەوەيە بكرێت لەسەر خزمێكى كينە لەدڵ.**

١٨٣٦- أفضل الصدقة أن تصدق و أنت صحيح شحيح تأمل الغنى و تخشى الفقر و لا تمهل حتى إذا بلغت الحلقوم قلت: لفلان كذا و لفلان كذا ألا و قد كان لفلان كذا.

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٦٠١)

**١٨٣٦- چاكترين صەدەقە ئەوەيە لەكاتێكدا بيكەيت لەش ساغ بيت، پەرۆش بيت بـۆ ماڵەكـەت، چاوەڕوانى دەوڵەمەندى بيت و لەهەژارى بترسى، چاوەڕوانيش مەكە تـا گيانـت دەگاتـە گـەروت و بڵێيت: فلانە كەس ئەوەى هەيە و فلانە كەس ئەوەى هەيە، بەڵێ فلانە كەس ئەوەى بوو.**

١٨٣٧- أفضل الصدقة جهد المقل و ابدأ بمن تعول.

(صحيح) ( د ك ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٥٦٦)

**١٨٣٧- چاكترين صەدەقە ئەوەيە بەگوێرەى توانا بێت، لەو كەسەشـەوە دەست پـێ بكـە كە بەخێويان دەكەيت.**

١٨٣٨- أفضل الصدقة سقي الماء.

(حسن) ( حم د ن ه حب ك ) عن سعد بن عبادة ( ع ) عن ابن عباس . (الترغيب ٩٦٢)

**١٨٣٨- چاكترين صەدەقە ئاودانە.**

١٨٣٩- أفضل الصدقة ما ترك غنى و اليد العليا خير من اليد السفلى و ابدأ بمن تعول.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٨٢٠)

**١٨٣٩- چاكترين صەدەقە ئەوەيە خاوەنەكەى بەهەژارى نەهێڵێتەوە دەستى بەخـشەريش لەدەستى داواكەر چاكترە، لەوەشەوە دەست پێ بكە كە بەخێويان دەكەين.**

١٨٤٠- أفضل الصدقة ما كان عن ظهر غنى و اليد العليا خير من اليد السفلى و ابدأ بمن تعول.

(صحيح) ( حم م ن ) عن حكيم بن حزام. (الإرواء ٨٢٠)

**١٨٤٠- چاکترین صەدەقە ئەوەیە لە توانـاوە بکرێت، دەستی بەخشەریش لەدەستی داواکەر باشترە، لەوەشەوە دەست پێ بکە کە بەخێوی دەکەی.**

١٨٤١- أما قطع السبيل فإنه لا يأتي عليك إلا قليل حتى يخرج العير إلى مكة بغير خفير " و أما العيلة فإن الساعة لا تقوم حتى يطوف أحدكم بصدقته و لا يجد من يقبلها منه " ثم ليقفن أحدكم بين يدي الله ليس بينه و بينه حجاب و لا ترجمان يترجم له ثم ليقولن له: ألم أوتك مالا ؟ فليقولن: بلى ثم ليقولن: ألم أرسل إليك رسولا ؟ فليقولن: بلى فينظر عن يمينه فلا يرى إلا النار ثم ينظر عن شماله فلا يرى إلا النار فليتقين أحدكم النار و لو بشق تمرة فإن لم يجد فبكلمة طيبة.

(صحيح) ( خ ) عن عدي بن حاتم . (الصحيحة ٢٤٩٥)

**١٨٤١- ڕێگرتنت نایەتە سەر کەم نەبێت، تاکو کاروان دەرچێت بۆ مەککە بەبێ پاسەوانی، مەسەلەی هەژاریش قیامەت هەڵناسێت تاکو کەسێك لەئێوە بەصەدەقەکەی نەگەڕێت و کەسی دەست نەکەوێت بیداتێ، دوای ئەوەش کەسێك لەئێوە لەبەر دەستی خوا دەوەستێت بێ ئەوەی پەرژینیکیان لەنێواندا بێت، یان وەرگێرێك قسەکان وەرگێڕێت، ئەو کاتە خوای گەورەیش پێی دەفەرموێت: ئایا ماڵم پێ نەدای؟ ئەویش ئەڵێ: بەڵێ خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئایا پێغەمبەرێکم بۆ ناردی؟ ئەویش ئەڵێ: بەڵێ، جا ئەو کات تەماشای لای ڕاستی دەکات ئاگر نەبێت هیچ نابینێت تەماشای لای چەپی دەکات ئاگر نەبێت هیچ نابینێت، جا با کەسێك لەئێوە خۆی لەئاگر بپارێزێ ئەگەر بە لەتە خورمایەکیش بێت، ئەگەر ئەوەشی دەست نەکەوت بەوشەیەکی خۆش.**

١٨٤٢- إني ذكرت و أنا في العصر شيئا من تبر كان عندنا فكرهت أن يبيت فأمرت بقسمه.

(صحيح) ( ن ) عن عقبة بن الحارث . (الصحيحة ٣٤٩٥)

**١٨٤٢- من لە کاتێکدا لەنوێژی عەصردا بووم بیرم کەوتەوە کەهەندێ ئاڵتوونمان هەبوو، ئیتر پێم ناخۆش بوو لەماڵ بمێنێتەوە و، فەرمانم کرد بەدابەش کردنی.**

١٨٤٣- املك يدك.

(صحيح) ( تخ ) عن أسود بن أصرم. (الصحيحة ١٥٦٠)

**١٨٤٣- خاوەنی دەستی خۆت بە.**

١٨٤٤- أمك ثم أمك ثم أمك ثم أباك ثم الأقرب فالأقرب.

(حسن) ( حم د ت ك ) عن معاوية بن حيدة ( هـ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٢٣٢)

**١٨٤٤- دایكت، ئینجا دایكت، ئینجا دایكت، دوای ئەوە باوكت، پاشان نزیكتر و نزیكتر.**

١٨٤٤- أمك و أباك و أختك و أخاك و أدناك أدناك.

(حسن) ( ع طب ك ) عن صعصعة المجاشعي ( ك ) عن أبي رمثة ( طب ) عن أسامة بن شريك . (الإرواء ٨٢٦)

**١٨٤٥- دایكت و باوكت و ، خوشكت و ، براكەت و ، نزیك بە نزیك.**

١٨٤٦- إن كان خرج يسعى على ولده صغارا فهو في سبيل الله و إن كان خرج يسعى على أبوين شيخين كبيرين فهو في سبيل الله و إن كان خرج يسعى على نفسه يعفها فهو في سبيل الله و إن كان خرج يسعى رياء و مفاخرة فهو في سبيل الشيطان.

(صحيح) ( طب ) كعب بن عجرة . (الترغيب ١٦٩٢)

**١٨٤٦- ئەگەر بۆ هەڵپە كردن دەرچووە لە پێناو منداڵەكانی ئەوە لە پێناو خوادایە، ئەگەریش دەرچووە هەڵپە دەكات بۆ باوك و دایكێكی بە ساڵاچوو، ئەمە لە پێناو خوادایە، ئەگەریش دەرچووە هەڵپە بكات بۆ خۆی بۆ ئەوەی نیازی بەكەس نەبێت، ئەوە لە پێناو خوادایە، ئەگەریش دەرچووە بۆ ڕیایی و شانازیكردن ئەوە لەڕێگای شەیتاندایە.**

١٨٤٧- إن لم تجدي له شيئا تعطينه إياه إلا ظلفا محرقا فادفعيه إليه في يده.

(صحيح) ( د ت ن حب ك ) عن أم بجيد . (الترغيب ٨٨٤)

**١٨٤٧- ئەگەر هیچت دەست نەكەوت بیدەیتێ پاچەی ئاژەڵێك نەبێت، بیدەرێ.**

١٨٤٨- أنفق يا بلال ! و لا تخش من ذي العرش إقلالا.

(صحيح) ( البزار ) عن بلال وعن أبي هريرة ( طب ) عن ابن مسعود. (المشكاة ١٨٨٥)

**١٨٤٨- ببەخشە ئەی بیلال! لەخوای عەرش مەترسە هەژارت بكات.**

١٨٤٩- أنفقي و لا تحصي فيحصي الله عليك و لا توعي فيوعي الله عليك.

(صحيح) ( حم ق ) عن أسماء بنت أبي بكر . (الصحيحة ٣٦١٧)

**١٨٤٩- ببەخشەو مەژمێرە، باخوا لەسەرت نەژمێرێ، هەر كۆی مەكەرەوە، باخوای گەورە لێت نەسێنێتەوە.**

١٨٥٠- إن الله ليربي لأحدكم التمرة و اللقمة كما يربي لأحدكم فلوه أو فصيله حتى تكون مثل أحد.

(صحيح) ( حم حب ) عن عائشة . (الترغيب ٨٥٧)

**١٨٥٠- خوای گەورە دەنکە خورمایەك و پارو یەکتان بۆ گەورە دەکات وەکو چۆن کەسێك لەئێوە بێچوە ئەسپێك و بێچوە وشترێك گەورە دەکەن، تاکو دەبێتە ئەوەندەی کێوی ئوحود.**

١٨٥١- إن الله تعالى ليرضى عن العبد أن يأكل الأكلة أو يشرب الشربة فيحمد الله عليها.

(صحيح) ( حم م ت ن ) عن أنس . (الصحيحة ١٦٥١)

**١٨٥١- خوای گەورە لەبەندەکەی ڕازی دەبێت، بەوەی کەخواردنێك بخوات یا خواردنەوەیەك بخواتەوە و سوپاسی خوای لەسەر بکات.**

١٨٥٢- إن الله تعالى يقبل الصدقة و يأخذها بيمينه فيربيها لأحدكم كما يربي أحدكم مهره حتى أن اللقمة لتصير مثل أحد.

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة . (الترغيب ٨٥٧)

**١٨٥٢- خوای گەورە صەدەقە وەردەگرێت بەدەستی ڕاستی وەریدەگرێت و گەورەی دەکات بۆ یەکێك لەئێوە وەکو چۆن یەکێکتان بێچوە ئەسپێکی خۆی گەورە دەکات، تەنانەت پارو یەك ئەوەندەی ئوحود گەورە دەبێتەوە.**

١٨٥٣- الأكثرون هم الأسفلون يوم القيامة إلا من قال بالمال هكذا و هكذا...

(حسن) ( هـ حب ) عن أبي ذر . (الصحيحة ١٧٦٦)

**١٨٥٣- زۆرەکان لەژێرەوەن ڕۆژی قیامەت، مەگەر کەسێك بە پارە ئاوهاو ئاوها بکات....**

١٨٥٤- الأيدي ثلاثة فيد الله العليا و يد المعطي التي تليها و يد السائل السفلى فأعط الفضل و لا تعجز عن نفسك.

(صحيح) ( حم د ك ) عن مالك بن نضلة. (الترغيب ١٤٥٥)

**١٨٥٤- دەستەکان سیانن: دەستی خوا بەرزترین دەستە، دەستی بەخشندە بەدوایدا، چاکە بکە و ئەوەی لەخۆت زیادە بیبەخشە.**

١٨٥٥- تصدقوا فسيأتي عليكم زمان يمشي الرجل بصدقته فيقول الذي يأتيه بها: لو جئت بها بالأمس لقبلتها فأما الآن فلا حاجة لي فيها فلا يجد من يقبلها.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن حارثة بن وهب . (مشكلة الفقر ١٢٨)

**١٨٥٥- صەدەقە بکەن، چونکە سەر دەمانێك دێت کەسێك ڕێ دەکات بەصەدەقەکەی، ئەو کەسەیش وا دەچێتە لای پێی دەڵێ: ئەگەر دوێنێ بهاتبای لێم وەردەگرتی، بەڵام ئێستا هیچ پێویستیەکم پێ نییە، ئیتر کەسی دەست ناکەوێت وەریبگرێت.**

١٨٥٦- تصدقوا و لو بتمرة فإنها تسد من الجائع و تطفئ الخطيئة كما يطفئ الماء النار.

(صحيح) ( ابن المبارك ) عن عكرمة مرسلا . (الترغيب ٩٨٣)

**١٨٥٦- صەدەقە بكەن ئەگەر بەخورمايەكيش بووە، چونكە برسێتی لادەداو، تاوان دەكوژێنێتەوە، وەكو چۆن ئاو ئاگر دەكوژێنێتەوە.**

١٨٥٧- تصدقي و لا توعي فيوعى عليك.

(صحيح) ( خ ) عن أسماء بنت أبي بكر . (الصحيحة ٣٦١٧)

**١٨٥٧- صەدەقە بكەو هەمووی هەر هەڵمەگرە با خوا لێت نەگرێتەوە.**

١٨٥٨- ثلاث أقسم عليهن: ما نقص مال عبد من صدقة و لا ظلم عبد مظلمة صبر عليها إلا زاده الله عز و جل عزا و لا فتح عبد باب مسألة إلا فتح الله عليه باب فقر و أحدثكم حديثا فاحفظوه إنما الدنيا لأربعة نفر: عبد رزقه الله مالا و علما فهو يتقي فيه ربه و يصل فيه رحمه و يعمل لله فيه حقا فهذا بأفضل المنازل و عبد رزقه الله تعالى علما و لم يرزقه مالا فهو صادق النية يقول: لو أن لي مالا لعملت بعمل فلان فهو بنيته فأجرهما سواء و عبد رزقه الله مالا و لم يرزقه علما يخبط في ماله بغير علم لا يتقي فيه ربه و لا يصل فيه رحمه و لا يعمل لله فيه حقا فهذا بأخبث المنازل و عبد لم يرزقه الله مالا و لا علما فهو يقول: لو أن لي مالا لعملت فيه بعمل فلان فهو بنيته فوزرهما سواء.

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي كبشة الأنماري . (المشكاة ٥٢٨٧)

**١٨٥٨- سێ شت هەن سوێندیان لەسەر دەخۆم: ماڵی بەندەیەك بەصەدەقە كەم ناكات، هەر بەندەیەكیش ستەمێكی لێبكرێت و ئارام بگرێت خوای گەورە سەربەرزتری دەكات، هیچ بەندەیە كیش دەرگاری داواكردنێك ناكاتەوە، تا خوای گەورە دەرگایەكی هەژاری لێ نەكاتەوە، قسەیەكتانیش بۆ دەكەم لەبەری بكەن، ئەم دونیا بۆ چوار كەسە: بەندەیەك خوای گەورە ماڵ و زانستی پێداوە، ئەویش تەقوای هەیە و پەیوەندی خزمایەتی پێ بەجێ دەهێنێ ومافی خوای تیا دەزانێ، ئەم كەسە لەچاكترین پلەو پایەدایە، بەندەیەكیش خوای گەورە زانستێكی پێ بەخشیوە، ئەویش نیاز پاكە و دەڵێت: ئەگەر ماڵم بوایە وەكو فلانە كەسم دەكرد، ئەویش لەسەر نیەتی خۆی و، پاداشتی هەر دوو لایان وەكو یەكە، بەندەیەكیش خوای گەورە ماڵی پێ بەخشیوە، بەڵام زانستی پێ نەبەخشیووە، بەبێ هیچ زانستێك و كوێرانە لەو ماڵە خەرج دەكات، ترسی خوایشی نییە تیایداو، پەیوەندی خزمایەتی پێ بەجێ ناهێنێ و، مافی خوایشی تیا**

**دیاری ناکات، ئەم کەسە لە خراپترین پلەو پایەدایە، بەندەیەکیش خوای گەورە نەماڵ و نەزانستی پێ نەبەخشیوە، ئەوە دەڵێت: ئەگەر ماڵم بوایە وەکو فلانە کەسم دەکردو، ئەویش لەسەر نیازی خۆی و لەگوناهەکاندا وەکو یەکن.**

١٨٥٩- ثلاث أقسم عليهن: ما نقص مال قط من صدقة فتصدقوا و لا عفا رجل عن مظلمة ظلمها إلا زاده الله تعالى بها عزا فاعفوا يزدكم الله عزا و لا فتح رجل على نفسه باب مسألة يسأل الناس إلا فتح الله عليه باب فقر.

(صحيح) ( ابن أبي الدنيا في ذم الغضب ) عن عبدالرحمن بن عوف . (الترغيب ٢٤٦٣)

**١٨٥٩- سێ شت هەیە سوێندیان لەسەر دەخۆم: ماڵی بەندەیەك بەصەدەقە کەم ناکات، بۆیە صەدەقە بکەن، هیچ کەسێکیش خۆش نابێت لەستەمێك کەلێی کراوە تاکو خوای گەورە سەر بەرزی نەکات، بۆیە لێخۆشبوونتان هەبێت با خوای گەورە سەربەرزتان بکات، هیچ کەسێکیش دەرگایەکی داواکردن لە خەڵکی لە خۆی ناکاتەوە تا خوای گەورە دەرگایەکی هەژاری لێ نەکاتەوە.**

١٨٦٠- الثلث و الثلث كثير إنك أن تذر ورثتك أغنياء خير من أن تذرهم عالة يتكففون الناس و إنك لن تنفق نفقة تبتغي بها وجه الله إلا أجرت بها حتى ما تجعل في في امرأتك.

(صحيح) ( مالك حم ق ٤ ) عن سعد . (الإرواء ٨٩١)

**١٨٦٠- سێ یەك و سێ یەکیش زۆرە، تۆ ئەگەر میراتگرەکانت پاش خۆت بەدەوڵەمەندی بەجێ بهێڵی لەوە چاکترە بار بن بەسەر خەڵکی ترەوە، دەستیان لێ پان بکەنەوە، تۆیش هیچ ماڵێك خەرج ناکەیت لە پێناوی خوادا تاکو پاداشتی لەسەر وەرنەگرێت، تەنانەت ئەوەیش کە دەیکەیتە دەم خێزانەکەتەوە.**

١٨٦١- إن الصدقة لتطفئ عن أهلها حر القبور و إنما يستظل المؤمن يوم القيامة في ظل صدقته.

(حسن) ( طب ) عن عقبة بن عامر. (الصحيحة ٣٤٨٤)

**١٨٦١- صەدەقە گەرمی گۆڕەکان لەسەر خاوەنەکانیان سارد دەکاتەوە، لەرۆژی قیامەتیشدا ئیماندار لەسایەی صەدەقەکەیدا دەبێت.**

١٨٦٢- خير الصدقة ما أبقت غنى و اليد العليا خير من اليد السفلى و ابدأ بمن تعول.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس . (الإرواء ٨٣٤)

**١٨٦٢- باشترین صەدەقە ئەوەیە بەشی خۆت و خێزانەکەتیش بەجێبهێڵی، کەسی بەخشندەیش لەکەسی داواکار چاکترە، بەوەش دەست پێ بکە کە بەخێوی دەکەیت.**

١٨٦٣- خير الصدقة ما كان عن ظهر غنى و ابدأ بمن تعول.

(صحيح) ( خ د ن ) عن أبي هريرة . (الإرواء ٨٣٤)

**١٨٦٣- چاکترین صەدەقە ئەوەیە لەبوونەوە بکرێت، بەوەش دەست پێ بکە کە بەڕێوەی دەبەیت.**

١٨٦٤- دينار أنفقته في سبيل الله و دينار أنفقته في رقبة و دينار تصدقت به على مسكين و دينار أنفقته على أهلك أعظمها أجرا الذي أنفقته على أهلك.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة . (المشكاة ١٩٣١)

**١٨٦٤- دینارێك بدەیت لە پێناو خوادا ، دینارێکیش گەردنێکی پێ ئازاد بکەیت، دینارێکیش خەرج بکەیتە سەر خاوو خێزانەکەدا، گەورەترین پاداشتیان ئەوەیە کە لەسەر خاوو خێزانەکەت خەرجی دەکەیت.**

١٨٦٥- ذكرت و أنا في الصلاة تبرا عندنا فكرهت أن يبيت عندنا فأمرت بقسمته.

(صحيح) ( حم خ ) عن عقبة بن الحارث. (الصحيحة ٣٥٩٤)

**١٨٦٥- پارچە ئاڵتونێکم بەبیردا هاتەوە لەو کاتەی لەنوێژدا بووم، ئیتر حەزم نەکرد لەلامان بمێنێتەوە و فەرمانم کرد بەدابەشکردنی.**

١٨٦٦- ردوا السائل و لو بظلف محرق.

(صحيح) ( حم تخ ن ) عن حواء بنت السكن. (المشكاة ١٨٧٩)

**١٨٦٦- سواڵکەر بەشتێك بگێڕنەوە با چەندە بێ بایەخیش بێت.**

١٨٦٧- سبق درهم مائة ألف درهم: رجل له درهمان أخذ أحدهما فتصدق به و رجل له مال كثير فأخذ من عرضه مائة ألف فتصدق بها.

(حسن) ( ن ) عن أبي ذر ( ن حب ك ) عن أبي هريرة. (مشكلة الفقر ١١٩)

**١٨٦٧- درهەمێك پێشی سەد هەزار درهەمی دایەوە: پیاوێك دوو درهەمی هەیە، یەکێکیانی هەڵگرت و کردی بەخێر، پیاوێکیش ماڵێکی زۆری هەیە سەد هەزار درهەمی لێهەڵگرت و کردی بەخێر.**

١٨٦٨- صدق ابن مسعود زوجك و ولدك أحق من تصدقت به عليهم.

(صحيح) ( خ ) عن أبي سعيد. (الإرواء ٨٧٠)

**١٨٦٨- ڕاستی کرد ئیبنو مەسعود، خێزان و منداڵەکانت مافدارترین کەسانێکن بەصەدەقەی تۆ.**

١٨٦٩- نفقة الرجل على أهله صدقة.

(صحيح) ( خ ت ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ٩٨١)

**١٨٦٩- خەرج کردنی کەسێك لەسەر خاوو خێزانەکەی صەدەقەیە.**

١٨٧٠- لك ما نويت يا يزيد و لك ما أخذت يا معن.

(صحيح) ( حم خ ) عن معن بن يزيد. (الترغيب ١٩)

**١٨٧٠- تۆ لەسەر نیەتی خۆت ئەی یەزید، ئەوەشی بردت بۆ خۆتە ئەی مەعن.**

١٨٧١- صدقة السر تطفئ غضب الرب.

(صحيح) ( طص ) عن عبدالله بن جعفر ( العسكري في السرائر ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٣٧٥)

**١٨٧١- صەدەقەی پەنهان خەشم و قینی خوا لادەبات.**

١٨٧٢- صدقة السر تطفئ غضب الرب و صلة الرحم تزيد في العمر و فعل المعروف يقي مصارع السوء.

(صحيح) ( هب ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ١٩٠٨)

**١٨٧٢- صەدەقەی پەنهان خەشم و قینی خوا لادەبات، بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتیش تەمەن درێژ دەکات، کردەوەی چاکەیش پارێزگاری دەکات لەتیاچوونی خراپ.**

١٨٧٣- صدقة ذي الرحم على ذي الرحم صدقة و صلة.

(حسن) ( طس ) عن سلمان بن عامر. (الإرواء ٨٧٥)

**١٨٧٣- صەدەقەی خزم بۆ خزم خێرە و خزمایەتیشە.**

١٨٧٤- الصدقة على المسكين صدقة و هي على ذي الرحم اثنتان: صدقة و صلة .

(صحيح) ( حم ت ن هـ ك ) عن سلمان بن عامر. (المشكاة ١٩٣٩)

**١٨٧٤- صەدەقە بۆ هەژار خێرە بەڵام بۆ خزم دوو جار خێرە: صەدەقەیەو بەجێ هێنانی خزمایەتیشە.**

١٨٧٥- ضعي في يد المسكين و لو ظلفا محرقا .

(صحيح) ( حم طب ) عن أم عبيد. (المشكاة ١٨٧٩)

**١٨٧٥- شتێ بخەرە دەستی هەژار با چەندیش بێ بایەخ بێت.**

١٨٧٦- قال الله عز و جل: أنفق أنفق عليك.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٩١٥)

**١٨٧٦- خەرج بكە ، با خەرج بكەم بەسەرتدا .**

١٨٧٧- كل امرء في ظل صدقته حتى يقضى بين الناس.

(صحيح) ( حم ك ) عن عقبة بن عامر. (الصحيحة ٣٤٨٤)

**١٨٧٧- لەڕۆژی قیامەتدا هەموو كەسێك لەسایەی صەدەقەكەیدا دەبێت تاكو دادوەری دەكرێت لەنێوان خەڵكیدا.**

١٨٧٨- لقد سألتني عن عظيم و إنه ليسير على من يسره الله عليه تعبد الله لا تشرك به شيئا و تقيم الصلاة المكتوبة و تؤتي الزكاة المفروضة و تصوم رمضان و تحج البيت " ألا أدلك على أبواب الخير ؟ الصوم جنة و الصدقة تطفئ الخطيئة كما يطفئ الماء النار و صلاة الرجل في جوف الليل " ألا أخبرك برأس الأمر و عموده و ذروة سنامه ؟ رأس الأمر الإسلام من أسلم سلم و عموده الصلاة و ذروة سنامه الجهاد " ألا أخبرك بملاك ذلك كله ؟ كف عليك هذا - و أشار إلى لسانه - قال: يا نبي الله ! و إنا لمؤاخذون بما نتكلم به ؟ قال: ثكلتك أمك يا معاذ ! و هل يكب الناس في النار على وجوههم إلا حصائد ألسنتهم.

(صحيح) ( حم ت ك هـ هب ) عن معاذ زاد ( طب هب ) : إنك لن تزال سالما ما سكت فإذا تكلمت كتب لك أو عليك. (الإرواء ٤١٢)

**١٨٧٨- تۆ پرسیاری شتێكی گەورەت لێ كردم، ئاسانیشە لەسەر كەسێك خوا ئاسانی بكات لەسەری، خوای گەورە بپەرستەو هاوتای بۆ برپار مەدە، نوێژە فەرزەكانیش بكە، زەكاتیش دەربهێنە، ڕۆژووی ڕەمەزانیش بگرەو، حەجی ماڵی خوایش بكە. ئایا دەرگاكانی چاكەت پیشان بدەم؟ ڕۆژوو قەڵغانە، صەدەقەش تاوان دەكوژێنێتەوە وەكو چۆن ئاو ئاگر دەكوژێنێتەوە، هەروەها نوێژیش لەناو جەرگەی شەودا. ئایا ئاگادارت بكەم لەسەرو كۆڵەكەو چڵە پۆپەكە ئیسلام؟ سەری مەسەلەكان ئەوەیە موسوڵمان بە سەلامەت دەبێت، كۆڵەكەیشی نوێژە، چڵە پۆپەیەكەشی جیهادە. ئایا ئاگادارت بكەم لەبەر پرسی ئەوانە هەمووی؟ ئەوەت ڕاگرە -ئاماژەی كرد بۆ زوبانی- وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: ئایا ئێمە لەسەر ئەو قسانەی كەدەیكەین بەرپرس دەبین؟ فەرمووی: لەباری دایكت بچویای ئەی موعاز، ئەی خەڵكی بەبۆنەی زمانیانەوە نەبێت بۆ لەسەر ڕومەتیان دەخرێنە دۆزەخەوە.**

١٨٧٩- لك بها سبعمائة ناقة مخطومة في الجنة.

(صحيح) ( حل ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ٦٣٤)

**١٨٧٩- لەجياتى ئەوە حەوت سەد وشترت پێدەدرێت بەهەوسارەوە.**

١٨٨٠- لك بها يوم القيامة سبعمائة ناقة كلها مخطومة.

(صحيح) ( حم م ن ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ٦٣٤)

**١٨٨٠- لەجياتى ئەوە لەرۆژى قيامەتدا حەوت سەد وشترت پێ دەدرێت هەمووى بەرەشمەوە.**

١٨٨١- لو أعطيتها أخوالك كان أعظم لأجرك.

(صحيح) ( م ) عن ميمونة. (صحيح أبي داود ١٤٨٣)

**١٨٨١- ئەگەر بە خاڵوانت بدايە پاداشتى بۆ تۆ زۆرترەدە بوو.**

١٨٨٢- لو كان لي مثل أحد ذهبا لسرني أن لا يمر على ثلاث و عندي منه شيء إلا شيء أرصده لدين.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١١٣٩)

**١٨٨٢- ئەگەر بەبەرزى ئوحود ئاڵتوونم بوايە، پێم خۆش نەدەبوو سێ رۆژم بەسەرا تێپەر بێت و هيچى لاى مابێتەوە، مەگەر ئەوەندەى كە بۆ قەرزى دابنێم.**

١٨٨٣- ليتصدق الرجل من صاع بره و ليتصدق من صاع تمره.

(صحيح) ( طس ) عن أبي جحيفة. (الترغيب ٦١)

**١٨٨٣- با كەسێك لەئێوە گەنم بكات بەصەدەقە ئەگەر ئەندازەيەكيش بێت، با لە خورماكەشى صەدەقە بكات با بە ئەندازەيەكيش بێت.**

١٨٨٤- ليتق أحدكم وجهه عن النار و لو بشق تمرة.

(صحيح) ( حم ) عن ابن مسعود. (الترغيب ٨٦٤)

**١٨٨٤- با كەسێك لەئێوە روومەتى خۆى لە دۆزەخ بپارێزێت ئەگەر بەلەتە خورمايەكيش بووە.**

١٨٨٥- ما أحب أن أحدا تحول لي ذهبا يمكث عندي منه دينار فوق ثلاث إلا دينار أرصده لدين.

(صحيح) ( خ ) عن أبي ذر. (الصحيحة ١٠٢٨)

**١٨٨٥- پێم خۆش نييە ئەوەندەى ئوحود ئاڵتونم هەبێت و سێ رۆژم بەسەر تێپەرێت و شتێكى لام مابێتەوە مەگەر ئەوەندەى نەبێت دايينێم بۆ قەرز دانەوە.**

١٨٨٦- ما أحب أن أحدا عندي ذهبا فيأتي علي ثلاثة و عندي منه شيء إلا شيء أرصده في قضاء دين.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٠٢٨)

**١٨٨٦- پێم خۆش نییە ئەوەندەی ئوحود ئاڵتونم هەبێت و سێ ڕۆژم بەسەر تێپەڕێت و شتێکی لام مابێتەوە مەگەر ئەوەندەی نەبێت داییبنێم بۆ قەرز دانەوە.**

١٨٨٧- ما أطعمت زوجتك فهو لك صدقة و ما أطعمت ولدك فهو لك صدقة و ما أطعمت خادمك فهو لك صدقة و ما أطعمت نفسك فهو لك صدقة.

(صحيح) ( حم طب ) عن المقدام بن معد يكرب. (الصحيحة ٤٥٢)

**١٨٨٧- ئەوەی دەرخواردی هاوسەرەکەتدا صەدەقەیە بۆت، ئەوەشی بەدەرخواردی منالەکانت دا هەر صەدەقەیە، ئەوەیش خۆت دەیخۆی هەر صەدەقەیە.**

١٨٨٨- ما أعطى الرجل امرأته فهو صدقة.

(صحيح) ( حم ) عن عمرو بن أمية الضمري. (الصحيحة ١٠٢٤)

**١٨٨٨- ئەوەی پیاو دەیدا بە هاوسەرەکەی خۆی صەدەقەیە.**

١٨٨٩- ما تصدق أحد بصدقة من طيب و لا يقبل الله إلا الطيب إلا أخذها الرحمن بيمينه و إن كانت تمرة فتربو في كف الرحمن حتى تكون أعظم من الجبل كما يربي أحدكم فلوه أو فصيله.

(صحيح) ( ت ن هـ ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٨٥٧)

**١٨٨٩- هەر کەسێك خێرێکی پاك بکات، خوای گەورەیش خێری پاك نەبێت وەری ناگرێت، خوای بەبەزەیی بە دەستی ڕاستی وەریدەگریت، ئەگەر خورمایەکیش بێت، ئیتر لەدەستی خوای گەورە دەبێت تاکو لەکێوێك گەورەتر دەبێت، وەکو چۆن کەسێك لەئێوە نۆمایەکی خۆی، یان بەچکە وشترێکی خۆی گەورە دەکات.**

١٨٩٠- ما فتح رجل باب عطية بصدقة أو صلة إلا زاده الله تعالى بها كثرة و ما فتح رجل باب مسألة يريد بها كثرة إلا زاده الله تعالى بها قلة.

(صحيح) ( هب ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٢٣١)

**١٨٩٠- هیچ کەسێك دەرگای بەخشندەییەك ناکاتەوە بەخێرێك یان بەسەردانی تاکو خوای گەورە ئەوەندەی تری بۆ زیاد نەکات، هیچ کەسێکیش دەرگای داوا کردنێك لەخۆی ناکاتەوە تاکو خوای گەورە ئەوەندەی تر کەم دەستی نەکاتەوە.**

١٨٩١- ما من يوم يصبح العباد فيه إلا ملكان ينزلان فيقول أحدهما: اللهم أعط منفقا خلفا و يقول الآخر: اللهم أعط ممسكا تلفا.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٩١٧)

**١٨٩١- هەموو ڕۆژێك بەندەكان ڕۆژیان لێ دەبێتەوە، دوو فریشتە دادەبەزن و یەكێكیان بەویتریان دەڵێ: خوایە ئەو كەسەی ماڵ دەبەخشێ لە پێناوت بۆی قەربوو بكە، خوایە ئەو كەسەی كەدەستی نوقاوە ماڵەكەی بۆ لەناو ببەیت.**

١٨٩٢- أما علمت أن ملكا ينادي في السماء يقول: اللهم اجعل لمال منفق خلفا و اجعل لمال ممسك تلفا؟

(حسن) ( طب ) عن عبدالرحمن بن سبرة . (الصحيحة ٩٢٠)

**١٨٩٢- ئایا نەتزانیوە فریشتەیەك هاوار دەكات لەئاسمان و دەڵێت: خوایە قەرەبووی ماڵی كەسێك بكە كە دەیبەخشێت، ماڵی كەسێكی دەست نوقاویش بفەوتێنی.**

١٨٩٣- ما نقصت صدقة من مال و ما زاد الله عبدا بعفو إلا عزا و ما تواضع أحد لله إلا رفعه الله.

(صحيح) ( حم م ت ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٣٢٨)

**١٨٩٣- هیچ ماڵێك بەصەدەقە لێكردنی كەم ناكات، خوای گەورەیش هەموو بەندەیەك بەلێخۆشبوون سەر بەرزتر دەكات، هەر كەسێكیش خۆی بەكەم بزانێ خوای گەورە بەرزیدەكاتەوە.**

١٨٩٤- ما يخرج رجل شيئا من الصدقة حتى يفك عنها لحيي سبعين شيطانا.

(صحيح) ( حم ك ) عن بريدة. (الصحيحة ١٢٦٨)

**١٨٩٤- هەر كەسێك صەدەقەیەك بكات دەمی حەفتا شەیتانی لێدەكرێتەوە.**

١٨٩٥- ما يسرني أن لي أحدا ذهبا يأتي علي ثالثة و عندي منه دينار إلا دينارا أرصده لدين علي.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٠٢٨)

**١٨٩٥- پێم خۆش نییە هێندەی ئوحود ئاڵتوونم هەبێت و سێ ڕۆژیان بەسەر تێپەڕێت لەلای من، مەگەر دینارێك دابنێم بۆ قەرزێك كە لەسەرم بێت.**

١٨٩٦- مثل البخيل و المتصدق كمثل رجلين عليهما جبتان من حديد من ثديهما إلى تراقيهما فأما المنفق فلا ينفق شيئا إلا سبغت على جلده حتى تخفي بنانه و تعفو أثره و أما البخيل فلا يريد أن ينفق شيئا إلا لزقت كل حلقة مكانها فهو يوسعها فلا تتسع.

(صحيح) ( حم ق ت ) عن أبي هريرة . (الترغيب ٨٧٠)

**١٨٩٦- نموونەی ڕەزیل و بەخشندە وەکو دوو پیاون قەڵغانی ئاسنیان لەبەردا بێت لەسەر سنگیان تاسەر چەناگەیان، بەخشندە کەهەرچی دەبەخشێت درێژ دەبێتەوە سەر پێستیدا تاکو پەنجەکانیشی دەشارێتەوە و شوێنەواری ناهێڵێ ، بەڵام ڕەزیلەکە هەر کەویستی ماڵێک خەرج بکات هەموو ئەڵقەیەك دەنوسێتە جێگای خۆیەوە، هەرچی دەیەوێت گەورەی بکاتەوە گەورە نابێتەوە.**

١٨٩٧- من أنفق نفقة في سبيل الله كتبت له سبعمائة ضعف.

(صحيح) ( حم ت ن ك ) عن خزيم بن فاتك. (المشكاة ٣٨٢٦)

**١٨٩٧- هەر کەسێك ماڵێك خەرج بکات لەڕێگای خوادا، حەوت سەد بەرامبەری بۆ دەنوسرێت.**

١٨٩٨- من تصدق بعدل تمرة من كسب طيب و لا يقبل الله إلا الطيب فإن الله يتقبلها بيمينه ثم يربيها لصاحبها كما يربي أحدكم فلوه حتى تكون مثل الجبل.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة. (المشكاة ١١٦)

**١٨٩٨- کەسێك خێر بکات بایی دەنکە خورمایەك لەدەستکەوتی پاك – خوای گەورەیش دەستکەوتی پاك نەبێت وەری ناگرێت- خوای گەورە ئەو خێرە بەدەستی ڕاستی وەردەگرێت و بۆ خاوەنەکەی گەورەی دەکات وەکو چۆن کەسێکتان نۆمایەکی گەورە بکات تا ئەوەندەی شاخێکی پێ دێت.**

١٨٩٩- من كان معه فضل ظهر فليعد به على من لا ظهر له و من كان له فضل من زاد فليعد به على من لا زاد له

(صحيح) ( حم م د ) عن أبي سعيد. (مشكلة الفقر ١١١)

**١٨٩٩- هەر کەسێك وولاخێکی سواری زیادی هەبێت باتبیداتە کەسێك کە وولاخی سواری نەبێت، هەر کەسێکیش بژێوییەکی زیادی هەبێت، بابیداتە بەکەسێك بژێوی نییە.**

١٩٠٠- وجبت صدقتك و رجعت إليك حديقتك.

(صحيح) ( حم هـ ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٢٤٠٩)

**١٩٠٠- خێرەکەت گەیشت، باخچەکەیش بۆ خۆت گەڕایەوە.**

١٩٠١- ويحك ! إن شأن الهجرة لشديد فهل لك من إبل تؤدي صدقتها ؟ فاعمل من وراء البحار فإن الله لن يترك من عملك شيئا.

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ٢١٣٩)

**١٩٠١- بەڵات لێکەوێت! بابەخی کۆچکردن گەورەیە، ئایا وشترت هەیە زەکاتی بدەیت؟ لە پشت دەریاکانەوە کار بکە، خوای گەورە لەکردەوەکانت کەم ناکاتەوە.**

١٩٠٢- ويل للمكثرين إلا من قال بالمال هكذا و هكذا.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٢٤١٢)

**١٩٠٢- وەی بۆ ماڵ زۆرەکان، کەسێك نەبێت بە پارە ئاوهاو ئاوها بکات.**

١٩٠٣- لا توعي فيوعي الله عليك ارضخي ما استطعت.

(صحيح) ( خ ) عن أسماء بنت أبي بكر. (الصحيحة ٣٦١٧)

**١٩٠٣- هەر خەریکی کۆکردنەوە مەبە، با خوا داینەخات لەسەرت و، نەرم بە تا دەتوانی.**

١٩٠٤- لا توكئ فيوكأ عليك.

(صحيح) ( خ ت ) عن أسماء بنت أبي بكر. (الترغيب ٩٢٣)

**١٩٠٤- دایمەخە با لەسەرت دانەخرێت.**

١٩٠٥- لا يأتي رجل مولاه فيسأله من فضل هو عنده فيمنعه إياه إلا دعي له يوم القيامة شجاع أقرع يتلمظ فضله الذي منع منه.

(حسن) ( ن ) عن معاوية بن حيدة. (الصحيحة ٢٤٣٨)

**١٩٠٥- هەر کەسێك هاریکارەکەی بێتە لای و داوای ماڵێکی لێ بکات کە لەخۆی زیادەو نەیداتێ خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا مارێکی کەچەڵی بۆ بانگ دەکات زمانی سوڕ دەدا بەو ماڵە زیادەی کەقەدەغەی کرد لەئەو.**

١٩٠٦- لا يسأل الرجل مولاه من فضل هو عنده فيمنعه إياه إلا دعي له يوم القيامة فضله الذي منعه شجاعا أقرع.

(حسن) ( د ) عن معاوية بن حيدة. (الترغيب ٨٩٥)

**١٩٠٦- هەر کەسێك هاریکارەکەی بێتە لای و داوای ماڵێکی کرد کەخۆی پێویستی پێی نەبوو، ئەویش پێی نەدا لەڕۆژی قیامەتدا ئەو ماڵە زیادەی لێ دەبێتە مارێکی گەورەی کەچەڵ.**

١٩٠٧- يا أبا ذر ! ما أحب أن لي أحدا ذهبا أمسى ثالثة و عندي منه دينار إلا دينارا أرصده لدين إلا أن أقول به في عباد الله هكذا و هكذا و هكذا يا أبا ذر ! الأكثرون هم الأقلون إلا من قال هكذا و هكذا.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي ذر. (الترغيب ٣٢٦٠)

**١٩٠٧- ئەی ئەبو زەڕ! پێم خۆش نییە ئەوەندەی ئوحود ئاڵتوونم هەبێت سێ ڕۆژیان بەسەردا تێپەڕ بێت لەلام و دیناریکیان مابێت، مەگەر دیناریك بۆ قەرزاری نەبێت، یان بەسەر بەندەكانی خوادا ئاوهاو ئاوهای پێبكەم، ئەی ئەبو زەڕ، زۆرەكان كەمن مەگەر كەسێك نەبێت ئاوهاو ئاوهای لێ بكات.**

١٩٠٨- يا أبا ذر ! ما أحب أن لي مثل أحد ذهبا أنفقه كله إلا ثلاثة دنانير.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي ذر. (الترغيب ٧٦٧)

**١٩٠٨- ئەی ئەبو زەڕ، حەز ئەكەم ئەوەندەی ئوحود ئاڵتوونم هەبێت و هەمووی ببەخشم سێ دیناری نەبێت.**

١٩٠٩- يا ابن آدم ! إنك أن تبذل الفضل خير لك و أن تمسكه شر لك و لا تلام على كفاف و ابدأ بمن تعول و اليد العليا خير من اليد السفلى.

(صحيح) ( حم م ت ) عن أبي أمامة. (الإرواء ٨٢٠)

**١٩٠٩- ئەی ئادەمیزاد! ئەگەر ئەوەی لێت زیادە بیبەخشی بۆ خۆت چاكترە، ئەگەریش ڕایگرێت خراپە بۆت، لۆمەش ناكرێت لەسەر ئەوەندەی كەبەشت دەكات، بەوەش دەست پێ بكە كە بەخێوی دەكەی، دەستی بەخشندەیش لەو دەستە باشترە كە پان دەكرێتەوە.**

١٩١٠- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النساء ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٨﴾ الحشر ( تصدق رجل من ديناره من درهمه من ثوبه من صاع بره من صاع تمره و لو بشق تمرة) .

(صحيح) ( حم م ن هـ) عن جرير. (المشكاة ٢١٠)

١٩١٠- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ النساء ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٌ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٍ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٨﴾﴾ الحشر ( **پیاوێك خێری كرد لەدینارەكەی، لەدرهەمەكە، لە پۆشاكەكەی، پێوانەی گە نمەكە، لە پێوانەی خورماكەی، ئەگەر بەلەتە خورمایەكیش بووە** ).

١٩١١- يا عائشة ! لا تحصي فيحصي الله عليك.

(صحيح) ( حم د ) عن عائشة. (صحيح أبي داود ١٤٩١)

**١٩١١- ئەی عائیشە، مەژمێرە، با پەروەردگارت لەسەرت نەژمێری.**

١٩١٢- يا معشر التجار ! إن الشيطان و الإثم يحضران البيع فشوبوا بيعكم بالصدقة.

(صحيح) ( ت ) عن قيس بن أبي غرزة. (المشكاة ٢٧٩٨)

**١٩١٢- ئەی كۆمەڵانی بازرگان، شەیتان و گوناه ئامادەی فرۆشتن دەبن، جل فرۆشتنەكانتان تێكەڵ بكەن بەخێركردن.**

١٩١٣- يا معشر التجار ! إن هذا البيع يحضره اللغو و الحلف فشوبوه بالصدقة.

(صحيح) ( حم د ن هـ ك ) عن قيس بن أبي غرزة. (المشكاة ٢٧٩٨)

**١٩١٣- ئەی كۆمەڵانی بازرگان، ئەم فرۆشتنە قسەی بەتاڵ و سوێندی تیا ڕوودەدات، بۆیە تێكەڵی بكەن لەگەڵ صەدەقە.**

١٩١٤- يا معشر النساء ! تصدقن و أكثرن الاستغفار فإني رأيتكن أكثر أهل النار إنكن تكثرن اللعن و تكفرن العشير ما رأيت من ناقصات عقل و دين أغلب لذي لب منكن أما نقصان العقل: فشهادة امرأتين تعدل شهادة رجل فهذا نقصان العقل و تمكث الليالي ما تصلي و تفطر في رمضان فهذا نقصان الدين.

(صحيح) ( م هـ ) عن ابن عمر ( حم م ت ) عن أبي هريرة ( حم ق ) عن أبي سعيد. (الإرواء ١٩٠)

**١٩١٤- ئەی كۆمەڵی ئافرەتان، خێر بكەن و زۆر داوای لێخۆشبوون لەخوا بكەن، چونكە من ئێوەم بینی زۆرترین خەڵكی ئاگرن، ئێوە زۆر نەفرین دەكەن و نكوڵی دەكەن**

**لەهاودەمتان من کەسانێکم نەبینیوە هۆش و دین ناتەواو، لەئێوە زاڵتر بەسەر کەسی هۆشمەندا، مەسەلەی ئەقڵ ناتەواوی: شایەتی دوو ئافرەت بەرامبەر شایەتی یەك پیاوە، ئەوە نوقسانی ئەقڵێتی ، شەوانیشی بەسەردا تێپەڕ دەبێت و نوێژ ناکات و ڕۆژوو ناگرێت لەڕەمەزاندا، ئەوەش نوقسانی ئاینێتی.**

١٩١٥- يا معشر النساء ! تصدقن و لو من حليكن فإنكن أكثر أهل جهنم يوم القيامة.

(صحيح) ( حم ت ن حب ك ) عن زينب امرأة ابن مسعود. (الإرواء ١٩٠)

**١٩١٥- ئەی کۆمەڵانی ئافرەتان! صەدەقە بکەن ئەگەر لە خشڵەکانیشتان بووە، چونکە ئێوە زۆربەتان خەڵکی دۆزەخن.**

١٩١٦- يد المعطي العليا و ابدأ بمن تعول أمك و أباك و أختك و أخاك ثم أدناك أدناك إنها لا تجني نفس على أخرى.

(صحيح) ( ن ) عن ثعلبة بن زهدم ( حم ) عن أبي رمثة ( ن حب ك ) عن طارق المحاربي. (الإرواء ٨٢٦)

**١٩١٦- دەستی بەخشندە بەرزە، بەوەش دەست پێ بکە کەبەرێوەی دەبەی، دایکت و، باوکت و، خوشکت و ، برات و، دواتر نزیکتر و نزیکتر، کەسیش تاوانی کەس هەڵناگرێت.**

١٩١٧- يقول الله تعالى: يا ابن آدم ! أنى تعجزني و قد خلقتك من مثل هذا ؟ حتى إذا سويتك و عدلتك مشيت بين بردين و للأرض منك وئيد فجمعت و منعت حتى إذا بلغت التراقي قلت: أتصدق و أنى أوان الصدقة ؟ !

(صحيح) ( حم هـ ك ) عن بسر بن جحاش. (الصحيحة ١١٤٣)

**١٩١٧- خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد: چۆن لەدەستم دەردەچیت و لەشتێکی وا دروستم کردووی؟ کاتێك دروستم کردی و ڕێکم کردیتەوە لەنێو دوو پۆشاکدا ڕێتدەکرد و دەنگی شوێن پێکانت لەسەر زەویدا دەهات، ئینجا کۆتکردەوەو قەدەغەت کرد، کاتێکیش گیان گەیشتە چەڵەمەت وتت: خێر دەکەم، ئەی ئەوە کەی کاتی خێر کردنە؟!**

١٩١٨- يقي أحدكم وجهه حر جهنم و لو بتمرة و لو بشق تمرة فإن أحدكم لاقي الله و قائل له ما أقول لأحدكم: ألم أجعل لك سمعا و بصرا ؟ فيقول: بلى فيقول: ألم أجعل لك مالا و ولدا ؟ فيقول: بلى فيقول: أين ما قدمت لنفسك ؟ فينظر قدامه و بعده و عن يمينه و عن شماله ثم لا

يجد شيئا يقي به وجهه حر جهنم ليق أحدكم وجهه النار و لو بشق تمرة فإن لم يجد فبكلمة طيبة فإني لا أخاف عليكم الفاقة فإن الله ناصركم و معطيكم حتى تسير الظعينة فيما بين يثرب و الحيرة و أكثر ما يخاف على مطيتها السرق.

(حسن) ( ت ) عن عدي بن حاتم. (صحيح الترمذي ٢٩٥٤)

**١٩١٨- باكەسێك ڕوومەتی خۆی بپارێزێت لە دۆزەخ ئەگەر بەخورمایەك، یان بەتەلە خورمایەکیش بووە، چونکە ئێوە خوای خۆتان دەبینن و پێتانیش دەڵێ وەکو چۆن ئێستا من پێتان دەڵێم: ئایا گوێ و چاوم پێ نەدای؟ دەڵێت: بەڵێ، دەفەرموێت: ئەوا کوا چیت لە پێشی خۆت نارد؟ ئەویش سەیری پێشی خۆی و، لای ڕاست و چەپی خۆی دەکات، شتێك نابینێ ڕووی خۆی پێ بپارێزێت لەئاگری دۆزەخ، جا با کەسێکتان خۆی بپارێزێ لەو دۆزەخە ئەگەر بەلەتە خورمایەکیش بووە، ئەگەر ئەوەشی دەست نەکەوت بەووشەیەکی جوان، چونکە من لەهەژاری و کەم دەستیتان ناترسم، خوای گەورە پشتگیریتان دەکات و پێتان دەبەخشێ تاکو دەگاتە ئەوەی ئافرەتێك گەشت دەکات لەیەسریبەوە بۆ حیرە، زیاتر مەگەر لەوە بترسێت ووڵاخەکەی بدزێت.**

١٩١٩- اليد العليا خير من اليد السفلى و ابدأ بمن تعول.

(صحيح) ( حم طب ) عن ابن عمر. (مشكلة الفقر ٤٤)

**١٩١٩- دەستی بەخشندە لەدەستی داواکەر چاکترە، بەوەش دەست پێ بکە کە بەخێوی دەکەیت.**

١٩٢٠- اليد العليا خير من اليد السفلى و ابدأ بمن تعول و خير الصدقة ما كان عن ظهر غنى و من يستغن يغنه الله و من يستعفف يعفه الله.

( حم خ ) عن حكيم بن حزام. (الإرواء ٨٢٠)

**١٩٢٠- دەستی بەخشندە لەدەستی داواکەر چاکترە، بەوەش دەست پێ بکە کە بەخێوی دەکەی، چاکترین خێرکردنیش ئەوەیە لە دەوڵەمەندییەوە بکرێت، هەر کەسێکیش داوای دەوڵەمەندی بکات خوا دەوڵەمەندی دەکات، هەر کەسێکیش داوای پاکی بکات خوا پاکی دەکاتەوە.**

١٩٢١- اليد العليا خير من اليد السفلى و اليد العليا هي: المنفقة و اليد السفلى هي: السائلة.

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ١٤٥٤)

**١٩٢١- دەستی بەرز چاکترە لەدەستی نزم، دەستی بەرز: بەخشندەیە و، دەستی نزم: داوا دەکات.**

١٩٢٢- كان إذا أتاه قوم بصدقتهم قال: اللهم صل على آل فلان.

(صحيح) ( حم ق د ن ه ) عن ابن أبي أوفى . (الإرواء ٨٤٥)

**١٩٢٢- ئەگەر خەڵكێك زەكاتی ماڵەكانیان بۆ بهێنابا دەیفەرموو: خوایە بەرەكەت بخەیتە ماڵی فلانە كەسەوە.**

١٩٢٣- في الكبد الحارة أجر.

(صحيح) ( هب ) عن سراقة بن مالك. (الصحيحة ٢٩)

**١٩٢٣- ئاو پێدانی هەموو گیانلەبەرێك خێرو پاداشتی تیایە.**

١٩٢٤- في كل ذات كبد حرى أجر.

(صحيح) ( حم ) عن سراقة بن مالك ( حم ) عن ابن عمرو. (الترغيب ٢١٥٢)

**١٩٢٤- لەسەر هەموو خاوەن جگەرێكی گەرم پاداشت وەرگریت.**

١٩٢٥- لك في كل ذات كبد حرى أجر.

(صحيح) ( طب ) عن مخول السلمي. (الصحيحة ٢١٥٢)

**١٩٢٥- پاداشتت هەیە لەئاو پێدانی هەموو خاوەن جگەرێكی گەرم دا.**

١٩٢٦- ما من مسلم يغرس غرسا إلا كان ما أكل منه له صدقة و ما سرق منه صدقة و ما أكل السبع فهو له صدقة و ما أكلت الطيور فهو له صدقة و لا يرزؤه أحد كان له صدقة.

(صحيح) ( م ) عن جابر. (الصحيحة ٨)

**١٩٢٦- هەر موسوڵمانێك ڕووەكێك بچێنێ و دوایی هەرچی لێ بـو خرێت پاداشتی تیایە بۆی، هەر چیشی لێ بدزرێ هەر پاداشتی تیایە بۆی، ئەوەشی ئاژەڵ و دڕندە بیخوات هەر پاداشتە بۆی، ئەوەشی مەلەوەر لێی بخوات هەر پاداشتی تیایە بۆی، هەرچی كەسێكیش لێی ببات خێر دەبێت بۆ خاوەنەكەی.**

١٩٢٧- ما من مسلم ينفق من كل مال له زوجين في سبيل الله إلا استقبلته حجبة الجنة كلهم يدعوه إلى ما عنده.

(صحيح) ( حم ن حب ك ) عن أبي ذر. (المشكاة ١٩٢٤)

**١٩٢٧- هەر موسوڵمانێك لەهوو ماڵێكی دا جوتێك ببەخشێت لە پێناو خوادا پارێزەرانی بەهەشت پێشوازی لێ دەكەن هەر یەكێكیان بانگی دەكەن بۆ ئەوەی كە لە لایانە.**

## بابەتی ترساندن لە سواڵكردن و هاندان بۆ قایلبوون و بێگەردی

١٩٢٨- إذا نظر أحدكم إلى من فضل عليه من المال و الخلق فلينظر إلى من هو أسفل منه.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٥٢٤٢)

**١٩٢٨- ئەگەر كەسێك لە ئێوە سەیری كەسێكی كرد لەخۆی دەوڵەمەندتر، یان جوانتر، با سەیری كەسێك بكات لەخۆی خراپتر.**

١٩٢٩- انظروا إلى من هو أسفل منكم و لا تنظروا إلى من هو فوقكم فهو أجدر أن لا تزدروا نعمة الله عليكم.

(صحيح) ( حم م ت هـ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٥٢٤٢)

**١٩٢٩- سەیری كەسێك بكەن لەخوارەوەی خۆتان بێ، سەیری كەسێك مەكەن لەسەری خۆتانەوە، چونكە ئەوەشایستەترە بەوەی نیعمەتی خواتان لەبەر چاو نەكەوێت .**

١٩٣٠- إن الدنيا حلوة خضرة فمن أصاب منها شيئا من حله فذاك الذي يبارك له فيه و كم من متخوض في مال الله و مال رسوله له النار يوم القيامة.

(صحيح) ( طب ) عن عمرة بنت الحارث بن أبي ضرار . (الصحيحة ١٥٩٢)

**١٩٣٠- دونیا شیرین و سەوزە، ئەگەر كەسێك لەشتە ڕەواكانی دەست كەوت ئەوەیە كە خوای گەورە بەرەكەتی تێ دەخات، چەندین كەسیش ڕۆدەچن لەماڵی خواو لەماڵی پێغەمبەرەكەی لەڕۆژی قیامەتیش ئاگر بۆ ئەوانە.**

١٩٣١- إن الله تعالى إذا أنعم على عبد نعمة يحب أن يرى أثر النعمة عليه و يكره البؤس و التباؤس و يبغض السائل الملحف و يحب الحيي العفيف المتعفف.

(صحيح) ( هب ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٣٢٠)

**١٩٣١- خوای گەورە كەنیعمەتێك دەدا بەسەر بەندەیەكدا پێی خۆشە شوێنەواری ئەو نیعمەتەی پێوە دیار بێت، ڕقیشی دەبێتەوە لەكلۆڵی و خۆ بەداماو پیشان دان ومكوڕی لەداواكردندا، كەسی بەشەرم و پاك و بێگەردی خۆش دەوێ.**

١٩٣٢- إن الله إذا أنعم على عبد نعمة يحب أن يرى أثر نعمته على عبده.

(صحيح) ( طب هق ) عن عمران بن حصين . (الصحيحة ١٢٩٠)

**١٩٣٢- خوای گەورە ئەگەر نیعمەتێك بدات بەسەر بەندەیەكدا، پێی خۆشە شوێنەواری ئەو نیعمەتە لەسەر بەندەكەی ببینێ.**

١٩٣٣- إن الله تعالى يبغض السائل الملحف.

(صحيح) ( حل ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٣٢٠)

**١٩٣٣- خوای گەورە ڕقی لەداواكاری ڕووداره.**

١٩٣٤- إن المسألة كد يكد بها الرجل وجهه إلا أن يسأل الرجل سلطانا أو في أمر لا بد منه.

(صحيح) ( ت ن ) عن سمرة . (الترغيب ٧٩٢)

**١٩٣٤- داواكردن ماندوو بوونێكە پیاو تووشی خۆی دەكات، مەگەر كەسێك داوای دەسەڵاتێك بكات، یا خود لەشتێكدا كەچاوی نەبێت.**

١٩٣٥- إن المكثرين هم المقلون يوم القيامة إلا من أعطاه الله تعالى خيرا فنفح فيه بيمينه و شماله و بين يديه و ورائه و عمل فيه خيرا.

(صحيح) ( ق ) عن أبي ذر . (الصحيحة ٨٢٦)

**١٩٣٥- خاوەن ماڵ زۆرەكان ئەوانەن كە لەڕۆژی قیامەتدا بەشیان كەمە، مەگەر كەسێك خوا خێرێكی پێ دابێت و ئەویش دەست بكات بەبەخشین بەڕاست و بەچەپ و لەنێو هەردوو دەستی یەوە و لە پشتیەوە و چاكەی لێ بكات.**

١٩٣٦- إن رجالا يتخوضون في مال الله بغير حق فلهم النار يوم القيامة.

(صحيح) ( خ ) عن خولة . (الصحيحة ١٥٩٢)

**١٩٣٦- پیاوانێك دەستكاری ماڵی خوا دەكەن بەناهەق، دۆزەخ بۆ ئەوانە لەڕۆژی دواییدا.**

١٩٣٧- إن هذا المال خضرة حلوة فمن أصابه بحقه بورك فيه و رب متخوض فيما شاءت نفسه من مال الله و رسوله ليس له يوم القيمة إلا النار.

(صحيح) ( حم ت ) عن خولة بنت قيس . (الصحيحة ١٥٩٢)

**١٩٣٧- ئەم ماڵ و سامانە سەوزو شیرینە، هەر كەسێك مافی خۆی پێبدات خوا بەرەكەتی تێدەخات بۆی، لەوانەیە كەسێكیش بەئارەزووی خۆی دەستكاری ماڵی خواو پێغەمبەرەكەی بكات لەڕۆژی قیامەتدا لەئاگر زیاتر هیچی تر چاوەڕوانی نەكات.**

١٩٣٨- إن هذا المال خضر حلو فمن أخذه بحقه بورك له فيه و من أخذه بإشراف نفس لم يبارك له فيه و كان كالذي يأكل و لا يشبع و اليد العليا خير من اليد السفلى.

(صحيح) ( حم ق ت ن ) عن حكيم بن حزام . (الترغيب ٨١٢)

**١٩٣٨- ئەم ماڵ و سامانە سەوز و خۆشە، هەر كەسێك مافى خۆى پێبدات خواى گەورە بەرەكەتى تێدەخات بۆى، هەر كەسێكیش بەتەماعكارى بەدەستى بهێنێ خواى گەورە بەبەرەكەتى ناكات، وەكو كەسێكیش دەبێت هەر بخوات و تێر نەبێت، دەستى بەخشندەیش باشترە لەدەستى داواكار.**

١٩٣٩- إنما أخاف عليكم من بعدي ما يفتح عليكم من زهرة الدنيا و زينتها إنه لا يأتي الخير بالشر أن مما ينبت الربيع يقتل حبطا أو يلم إلا آكلة الخضر فإنها أكلت حتى إذا امتلأت خاصرتاها استقبلت الشمس فثلطت و بالت ثم رتعت و إن هذا المال خضرة حلوة و نعم صاحب المسلم هو لمن أعطاه المسكين و اليتيم و ابن السبيل فمن أخذه بحقه و وضعه في حقه فنعم المعونة هو و من أخذه بغير حقه كان كالذي يأكل و لا يشبع و يكون عليه شهيدا يوم القيامة.

(صحيح) ( حم ق ن هـ ) عن أبي سعيد . (المشكاة ٥١٦٢)

**١٩٣٩- ئەوەى ترسم هەیە لێى دواى خۆم لەسەرتان ڕازاوەیى و خۆشییەكانى دونیایە، چاكە هەرگیز خراپە ناهێنێ.**

١٩٤٠- إنما أنا خازن و إنما يعطي الله فمن أعطيته عطاء عن طيب نفس مني فيبارك له فيه و من أعطيته عطاء عن شره نفس و شدة مسألة فهو كالآكل يأكل و لا يشبع.

(صحيح) ( حم م ) عن معاوية . (الصحيحة ٩٧١)

**١٩٤٠- من تەنها گە نجینەوانم، بەخشندەیش خواى گەورەیە، جا هەر كەسێك بەخشینێكم پێدا بەڕوخۆشى خواى گەورە پیرۆزى دەكات لێى، هەر كەسیش بەخشینم پێدا لەبەر چلێسى و زۆر داواكردنى ئەوە وەكو كەسێك وایە هەر بخوات و تێر نەبێت.**

١٩٤١- إنه ليغضب علي أن لا أجد ما أعطيه من سأل منكم و له أوقية أو عدلها فقد سأل إلحافا.

(صحيح) ( ن ) عن رجل من بني أسد. (الصحيحة ١٧١٩)

**١٩٤١- لێم توڕە دەبێت كەشتێكم لەبەر دەستدا نیە پێى بدەم، هەر كەسێك لەئێوە داوابكات و خۆى ئەندازەى ( أوقیە ) یەكى هەبێت ئەوە پێداگرتنە.**

١٩٤٢- ألا أخبركم بخير الناس منزلة ؟ رجل ممسك بعنان فرسه في سبيل الله حتى يموت أو يقتل " ألا أخبركم بالذي يتلوه ؟ رجل معتزل في شعب يقيم الصلاة و يؤتي الزكاة و يعتزل شرور الناس " ألا أخبركم بشر الناس ؟ رجل يسأل بالله و لا يعطي.

(صحيح) ( حم ت ن حب ) عن ابن عباس . (الصحيحة ٢٥٥)

**١٩٤٢- ئـايا ئـاگادارتـان بكەم كێ چاكترين پلەو پـايـەی هەيـە، پياوێـك دەسـتی گرتـووە بەجڵەوی ئەسپەكەی لەڕێگای خوادا تـاكو دەمرێ يان دەكوژرێ، ئـايا ئـاگادارتـان بكەم كـێ بەدوای ئەودا دێت؟ پياوێكی كەنارگير لە ڕچە ڕێی شاخێكدا نوێژ دەكـات و زەكـات دەدات و خۆی وە دوور دەگرێـت لەخرا پيـەكانی خـەڵكی، ئـايـا ئـاگادارتـان بكـەم لـەخرا پترينی خەڵكی، پياوێك داوا دەكات بەنـاوی خواو، خۆيشی هيچ نـابەخشێت.**

١٩٤٣- ثلاثة لا ينظر الله إليهم يوم القيامة: العاق لوالديه و المرأة المترجلة المتشبهة بالرجـال و الديوث و ثلاثة لا يدخلون الجنة: العاق لوالديه و المدمن الخمر و المنان بما أعطى.

(صحيح) ( حم ن ك ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ٦٧٣)

**١٩٤٣- سێ كەس هەن خوای گەورە سەيريان نـاكات لەڕۆژی قيامەتدا: ئـازاردەری بـاوك و دايـك و، ئافرەتی خۆی وەكو پياوان لێ بكات، هەروەها گەواد، سێ كەسيش ناچنە بەهەشـتەوە: ئـازاردەری دايك و بـاوك، هەميشە مەيخۆر، ئەو كەسەش كە دەبەخشێ و منەت دەكات.**

١٩٤٤- الدنيا حلوة خضرة فمن أخذها بحقه بورك له فيها و رب متخـوض فيمـا اشـتهت نفـسه ليس له يوم القيامة إلا النار.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ١٥٩٢)

**١٩٤٤- دونيـا شـيرين و سـەوزە، هـەر كـێ دەسـتی كـەوێت بـەمافی خـۆی، خـوای گـەورە بەرەكەتی تيا دەخات بۆی، كەسی واش هەيە ڕۆ دەچێت لەئـارەزووەكانی خۆيدا، لـەڕۆژی دوايشدا تەنها دۆزەخی بۆ هەيە.**

١٩٤٥- الدنيا خضرة حلوة.

(صحيح) ( طب ) عن ميمونة. (الصحيحة ٤٨٦)

**١٩٤٥- دونيا سەوزەو شيرينە.**

١٩٤٦- شر الناس الذي يسأل بالله ثم لا يعطي.

(صحيح) ( تخ ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢٥٥)

**١٩٤٦- خراپترين خەڵكی ئەو كەسەيە كە بەخوا تكای لێ دەكرێ و دوای ئەوەش هەر نابەخشێت.**

١٩٤٧- لأن يأخذ أحدكم حبله ثم يغدو إلى الجبل فيحتطب فيبيع فيأكل و يتصدق خير لـه مـن أن يسأل الناس.

(صحيح) ( ق ن ) عن أبي هريرة. (غاية المرام ١٥٥)

**١٩٤٧- ئەگەر كەسێك لەئێوە گوريسێك هەڵگرێت بچێتە شاخەكان و دار بێنێتەوە و بيفرۆشێت و لێی بخوات و خێری لیٚ بكات چاكترە لەوەی داوا لەخەڵكی بكات.**

١٩٤٨- لأن يأخذ أحدكم حبله فيأتي الجبل فيجيء بحزمة الحطب على ظهره فيبيعها فيكف الله بها وجهه خير له من أن يسأل الناس أعطوه أو منعوه.

(صحيح) ( حم خ هـ ) عن الزبير بن العوام. (مشكلة الفقر ٣١)

**١٩٤٨- ئەگەر يەكێك؛ لەئێوە گوريسەكەی ببات و بچێتە شاخ و بارەدارێك بەكۆڵی بهێنیٚ و بيفرۆشیٚ و خوای گەورەيش ڕووی پیٚ بپارێزێت، باشترە بۆی لەوەی داوا لەخەڵكی بكات ئايا پێی بدەن يان پێی نەدەن.**

١٩٤٩- و الذي نفسي بيده لأن يأخذ أحدكم حبله فيحتطب على ظهره خير له من أن يأتي رجلا فيسأله أعطاه أو منعه.

(صحيح) ( مالك خ ن ) عن أبي هريرة. (مشكلة الفقر ٣١)

**١٩٤٩- سوێند بەو كەسەی گيانی منی بەدەستە، ئەگەر كەسێك لەئێوە گوريسەكەی ببات و دار هەڵگرێت بەكۆڵی، چاكترە بۆی لەوەی داوا لەكابرايەك بكات ئەويش يان دەيداتیٚ يان لێی دەگرێتەوە.**

١٩٥٠- لأن يغدو أحدكم فيحتطب على ظهره فيتصدق منه و يستغني به عن الناس خير له من أن يسأل رجلا أعطاه أو منعه ذلك بأن اليد العليا أفضل من اليد السفلى و ابدأ بمن تعول.

(صحيح) ( م ت ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٨٢٦)

**١٩٥٠- ئەگەر كەسێك لەئێوە بەيانی دەرچێت و دار بەكوڵ بهێنیٚ و خێری لیٚ بكات و بیٚ نيازی بكات لەخەڵكی، چاكترە لەوەی داوا لە پياوێك بكات، ئەويش ئايا بيداتیٚ يان لێی بگرێتەوە، چونكە دەستی بەخشندە لەدەستی داواكەر چاكترە، لەو كەسەوە دەست پیٚ بكە كە بەخێوی دەكەی.**

١٩٥١- لو يعلم صاحب المسألة ما له فيها لم يسأل.

(صحيح) ( طب الضياء ) عن ابن عباس. (الترغيب ٧٩٧)

**١٩٥١- ئەو كەسەی دەست لەخەڵكی پان دەكاتەوە، ئەگەر بيزانيبا چی تيايە هەرگيز داوای هيچی نەدەكرد.**

١٩٥٢- ليس الغنى عن كثرة العرض و لكن الغنى غنى النفس.

(صحيح) ( حم ق ت ه ) عن أبي هريرة. (مشكلة الفقر ١٦)

**١٩٥٢- دەوڵەمەندی بەکەلو پەل زۆری نییە، بەڵام دەوڵەمەندی، دەوڵەمەندی دڵ و دەروونە.**

١٩٥٣- الذي يسأل من غير حاجة كمثل الذي يلتقط الجمر.

(صحيح) ( هب ) عن حبشي بن جنادة. (الترغيب ٨٠٢)

**١٩٥٣- ئەو کەسەی داوا لەخەڵکی دەکات بێ ئەوەی پێویستی هەبێت وەکو کەسێکە ژیلەمۆ هەڵگرێتەوە.**

١٩٥٤- ما يزال الرجل يسأل الناس حتى يأتي يوم القيامة و ليس في وجهه مزعة لحم.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة. (المشكاة ١٨٣٩)

**١٩٥٤- هەندێ کەس هەن هەر داوا لەخەڵکی دەکەن، تاکو لەڕۆژی قیامەتدا دێن و پارچەیەك گۆشت بەڕوویانەوە نەماوە.**

١٩٥٥- مسألة الغني شين في وجهه يوم القيامة.

(صحيح) ( حم ) عن عمران. (الترغيب ٧٩٨)

**١٩٥٥- داواکردنی دەوڵەمەند نەنگی یە لەڕۆژی قیامەتدا.**

١٩٥٦- من استعف أعفه الله و من استغنى أغناه الله و من سأل الناس و له عدل خمس أواق فقد سأل إلحافا.

(صحيح) ( حم ) عن رجل من مزينة. (الصحيحة ٢٣١٤)

**١٩٥٦- کەسێك داوای داوێن پاکی بکات خوا داوێن پاکی دەکات، کەسێکیش داوای دەوڵەمەندی بکات خوا دەوڵەمەندی دەکات، هەرکەسێکیش داوا لەخەڵکی بکات و پێنج قاپۆلکەی هەبێت هەتەرییە.**

١٩٥٧- من استغنى أغناه الله و من استعف أعفه الله و من استكفى كفاه الله و من سأل و له قيمة أوقية فقد ألحف.

(صحيح) ( حم ن الضياء ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٢٣١٤)

**١٩٥٧- کەسێك داوای دەوڵەمەندی بکات خوا دەوڵەمەندی دەکات، کەسێکیش داوای داوێن پاکی بکات خوا داوێن پاکی دەکات، کەسێکیش داوا بکات پێویستی بەکەس نەبێت خوا ناهێڵێ پێویستی بەکەس بێت. هەر کەسێکیش سواڵ بکات و بایی جامۆڵکەیەك شتی هەبێت ئەوە پێ داگرتنە.**

١٩٥٨- من أصابته فاقة فأنزلها بالناس لم تسد فاقته و من أنزلها بالله أوشك الله له بالغنى إما بموت آجل أو غنى عاجل.

(حسن) ( حم د ك ) عن ابن مسعود. (المشكاة ١٨٥٢)

**١٩٥٨- هەر كەسێك هەژارییەتی تووش بێت وداوا لەخەڵكی بكات لەسەری لاییەن لەسەری لا ناچێت، كەسێكیش داوای لابردنی لەخوا بكات، نزیكە خوای گەورە دەوڵەمەندی بكات یان بەمردنێكی دواخراو، یان بەدەوڵەمەندییەكی پەلە.**

١٩٥٩- من سأل الناس أموالهم تكثرا فإنما يسأل جمر جهنم فليستقل منه أو ليستكثر.

(صحيح) ( حم م د ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٨٠٣)

**١٩٥٩- كەسێك داوای ماڵی خەڵكی بكات بۆ ئەوەی ماڵی زۆر ببێت، وەكو ئەوەیە داوای ژیلەمۆی دۆزەخ بكات ئیتر ئارەزووی خۆیەتی داوای كەم دەكات یان زۆر.**

١٩٦٠- من سأل الناس و له ما يغنيه جاء يوم القيامة و مسألته في وجهه خموش أو خدوش أو كدوح قيل: و ما الغنى ؟ قال: خمسون درهما أو قيمتها من الذهب.

(صحيح) ( حم ٤ ك ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ٤٩٩)

**١٩٦٠- كەسێك داوای ماڵی خەڵكی بكات و خۆشی ئەوەندەی هەبێت پێویستی پێیان نەبێت، لەرۆژی قیامەتدا دێت و سواڵكردنەكەشی لەڕومەتیدا وەكو برین دیارە، وتیان: ئەی دەوڵەمەندی چی یە؟ فەرمووی: پەنجا درهەم یان بەرامبەرەكەی ئاڵتوون.**

١٩٦١- من سأل شيئا و عنده ما يغنيه فإنما يستكثر من جمر جهنم قالوا: و ما يغنيه ؟ قال: قدر ما يغديه و يعشيه.

(صحيح) ( حم د حب ك ) عن سهل بن الحنظلية. (الترغيب ٨٠٥)

**١٩٦١- كەسێك داوای شتێك بكات و خۆی ئەوەندەی هەبێت كە پێویستی بەخەڵكی نەبێت وەكو ئەوەیە داوای ژیلەمۆیەكی زۆر بكات لەدۆزەخ، وتیان: چی دەوڵەمەندی دەكات؟ فەرمووی: ئەوەندەی نیوەڕۆژەو شێوی بۆ دابین بكات.**

١٩٦٢- من سأل من غير فقر فكأنما يأكل الجمر.

(صحيح) ( حم ابن خزيمة الضياء ) عن حبشي بن جنادة. (غاية المرام ٥٣)

**١٩٦٢- كەسێك سواڵ بكات بەبێ هەژاری وەكو ئەوەیە ژیلەمۆ بخوات.**

١٩٦٣- من سأل و له أربعون درهما فهو الملحف.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ١٧١٩)

**١٩٦٣- کەسێك سواڵ بکات و خۆی چل درهەمی هەبێت ئەو کەسە هەتەرە.**

١٩٦٤- من سأل و له قيمة أوقية فقد ألحف.

(صحيح) ( د حب ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ١٧١٩)

**١٩٦٤- کەسێك جامۆلکەیەکی هەبێت و سواڵ بکات ئەوە پێ داگرتنە.**

١٩٦٥- من نزلت به فاقة فأنزلها بالناس لم تسد فاقته و من نزلت به فاقة فأنزلها بالله فيوشك الله له برزق عاجل أو آجل.

(صحيح) ( ت ) عن ابن مسعود. (الترغيب ٨٣٨)

**١٩٦٥- کەسێك هەژاری بەسەردا بێت و داوا لەخەڵکی بکات لایدەن لەسەری هەژارییەکەی هەر دەمێنێ، هەر کەسێکیش هەژار ببێت و داوا لەخوا بکات لەسەری لایدات نزیکە خوای گەورە ڕۆزییەکی پەلە یان دواخراوی بۆ بنێرێ.**

١٩٦٦- من يتقبل لي بواحدة أتقبل له بالجنة لا يسأل الناس شيئا.

(صحيح) ( حم ن هـ ) عن ثوبان. (المشكاة ١٨٥٧)

**١٩٦٦- کێ قایل دەبێت کارێك نەکات و بەهەشتی بۆ دەستەبەر دەکەم، بەهیچ شێوەیەك داوای ماڵی خەڵکی نەکات.**

١٩٦٧- من يتكفل لي أن لا يسأل الناس شيئا أتكفل له بالجنة.

(صحيح) ( د ك ) عن ثوبان. (المشكاة ١٨٥٧)

**١٩٦٧- کێ ئەوەم بۆ دەستەبەر دەکات داوای ماڵی خەڵکی نەکات و من بەهەشتی بۆ دەستەبەر بکەم.**

١٩٦٨- المسائل كدوح يكدح بها الرجل وجهه فمن شاء أبقى على وجهه و من شاء ترك إلا أن يسأل الرجل ذا سلطان أو في أمر لا يجد منه بدا.

(صحيح) ( حم د حب ) عن سمرة. (الترغيب ٧٩٢)

**١٩٦٨- سواڵکردن برینەو لەڕوومەتی پیاودایە، جا ئەگەر کەسێك پێی خۆشە باڕوومەتی خۆی بهێڵێتەوە ، یان وازبهێنێت، مەگەر کەسێك داوا لەخاوەن دەسەڵاتێك بکات، یان لەمەسەلەیکدا کەناچارە.**

١٩٦٩- استغنوا عن الناس و لو بشوص السواك.

(صحيح) ( البزار طب هب ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٤٥٠)

**١٩٦٩- خۆتـان وە دووربگرن لەداواكردنی ماڵی خەڵكی، ئەگەر بۆ سیواكێكیش بووە.**

١٩٧٠- لا تسأل الناس شيئا و لا سوطك و إن سقط منك حتى تنزل إليه فتأخذه.

(صحيح) ( حم ) عن أبي ذر. (المشكاة ١٨٥٨)

**١٩٧٠- داوای هیچ مەكە لەخەڵكی تەنانەت قامچیكەی دەستت كە دەكەوێتە خـوارەوە، خۆت دابەزەو هەڵیگرە.**

١٩٧١- لا تلحفوا في المسألة فوالله لا يسألني أحد منكم شيئا فتخرج له مسألته مني شيئا و أنا له كاره فيبارك له فيما أعطيته.

(صحيح) ( حم م ن ) عن معاوية. (المشكاة ١٨٤٠)

**١٩٧١- پێ داگر مەبن لەداواكردندا، سوێند بەخوا هەر كەسێكتان داوای شتێكم لێ بكەن و من پێی بدەم و حەزی پێنەكەم، ئەو ماڵەی لێ پیرۆز نابێت.**

١٩٧٢- يا أبا ذر ! أترى أن كثرة المال هو الغنى ؟ إنما الغنى غنى القلب و الفقر فقر القلب من كان الغنى في قلبه فلا يضره ما لقي من الدنيا و من كان الفقر في قلبه فلا يغنيه ما أكثر له في الدنيا و إنما يضر نفسه شحها.

(صحيح) ( ن حب ) عن أبي ذر. (الترغيب ٨٧٢)

**١٩٧٢- ئەی ئەبو زەر! ئایا وادەزانی ماڵ و سامان زۆری دەوڵەمەندییە؟ دەوڵەمەنـدی لەدڵدایە، هەژاریش لەدڵدایە، هەر كەسێك دڵـی دەوڵەمەنـد بێـت ناخۆشـییەكانی دونیا كاریگەری نابێت هەموو ماڵی دونیا دەوڵەمەنـدی ناكـات، بـەڵام ڕەزیلـی زیـان بەدەروونی دەگەیەنێت.**

١٩٧٣- يا قبيصة ! إن المسألة لا تحل إلا لأحد ثلاثة: رجل تحمل حمالة فتحل لـه المسألة حتى يصيبها ثم يمسك و رجل أصابته جائحة اجتاحت ماله فحلت له المسألة حتى يصيب قواما من عيش و رجل أصابته فاقة حتى يقول ثلاثة من ذوي الحجا من قومه: لقد أصاب فلانا فاقة فحلت له المسألة حتى يصيب قواما من عيش ثم يمسك فما سواهن من المسألة فسحت يأكلها صاحبها سحتا.

(صحيح) ( حم م د ن ) عن قبيصة بن المخارق. (الإرواء ٨٦٠)

**١٩٧٣- ئـەی قوبەیـصە! داواكـردن ڕەوا نییـە بـۆ سـێ كـەس نـەبێت: پیاوێـك بـارێكی لەئەستۆی خۆی گرتبێت، ناڕەوا بۆی داوا بكـات تـا ئـەو كـارە ئـە نجام دەدات و ئـیتر واز**

بهێنێ، کەسێکیش تووشی کارەساتێك بوو بێت کە ماڵەکەی لەناو بردبێت، داواکردن بۆ ئەویش ڕەوایە تا بژێوی خۆی دابین دەکات، کەسێکیش تووشی هەژاری بووە، تاکو سێ کەس لەخاوەن بیرو هۆشەکانی کەس و کاری بڵێن: فڵانە کەس تووشی هەژاری بووە، ئەوەیش ڕەوایە داوا بکات تا بژێوی دابین دەبێت ئیتر تەواو ، جگە لەمانەش هەرکەسێك داوای ماڵی خەڵکی بکات ناڕەوایە و خاوەنەکەشی بە ناڕەوایی دەیخوات.

١٩٧٤- يغضب علي أن لا أجد ما أعطيه ! من سأل منكم و له أوقية أو عدلها فقد سأل إلحافا.

(صحيح) ( د ) عن رجل. (الصحيحة ١٧١٩)

**١٩٧٤- لێم عاجز دەبێت کە هیچم لا نییە پێی بدەم! هەر کەسێك لەئێوە داوا بکات و قاپۆلکەیەکی هەبێت یان بەرامبەر ئەوەی هەبێت ئەوە هەتەریە.**

١٩٧٥- ليستغن أحدكم عن الناس بقضيب سواك.

(صحيح) ( هب ) عن ميمون بن أبي شيب مرسلا. (الصحيحة ٢١٩٨)

**١٩٧٥- با کەسێ: لەئێو داوای هیچ لەخەڵکی نەکات ئەگەر دارە سیواکێکیش بووە.**

## بابەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی خاوەن باجەکان

١٩٧٦- إن صاحب المكس في النار.

(صحيح) ( حم طب ) عن رويفع بن ثابت . (الصحيحة ٣٤٠٥)

**١٩٧٦- خاوەنی باج لەئاگردایە.**




## بابەتی حوکمەکانی ڕۆژوو و، ڕێ و شوێنەکانی

١٩٧٧- إذا أذن ابن أم مكتوم فكلوا و اشربوا و إذا أذن بلال فلا تأكلوا و لا تشربوا.

(صحيح) ( حم ن ابن خزيمة حب ) عن أنيسة بن خبيب . (الإرواء ٢١٩)

**١٩٧٧- ئەگەر (ابن ام كلثوم) بانگی دا بخۆن و بخۆنەوە، ئەگەر بیلال بانگی دا ئیتر مەخۆن و مەخۆنەوە.**

١٩٧٨- إذا أقبل الليل من هاهنا و أدبر النهار من هاهنا و غربت الشمس فقد أفطر الصائم.

(صحيح) ( ق د ت ) عن عمر . (الإرواء ٩١٦)

**١٩٧٨- کەشەو هات، لەولاوە، ڕۆژیش پشتی هەڵکرد لەلاوە، خۆریش ئاوا بوو، ئیتر ڕۆژووان ڕۆژوو بشکێنێ.**

١٩٧٩- إذا رأيتم الليل قد أقبل من هاهنا فقد أفطر الصائم.

(صحيح) ( ق د ) عن عبدالله بن أبي أوفى . (الإرواء ٨٩٨)

**١٩٧٩- ئەگەر شەوتان بینی لەئەم لاوە هات ئیتر ڕۆژووان ڕۆژوو بشکێنێ.**

١٩٨٠- إذا سمع أحدكم النداء و الإناء على يده فلا يضعه حتى يقضي حاجته منه.

(صحيح) ( حم ك د ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٣٩٤)

**١٩٨٠- ئەگەر یەکێك لەئێوە گوێی لەبانگ بوو، قاپەکەیش بەدەستیەوە بوو بادایەنەنێت تاکو پێویستی خۆی تەواو دەکات.**

١٩٨١- إذا كان يوم صوم أحدكم فلا يرفث و لا يجهل فإن امرء شاتمه أو قاتله فليقل: إني صائم إني صائم

(صحيح) ( مالك ق د هـ ) عن أبي هريرة . (الإرواء ٩١٨)

**١٩٨١- ئەو ڕۆژەی کەیەکێکتان بەڕۆژوو دەبن با قسەی ناشیرین نەکات و، نەفامی نەکات، ئەگەر کەسێکیش جنێوی پێداو شەڕی لەگەڵ کرد با بڵێت: من بەڕۆژووم ، من بەڕۆژووم.**

١٩٨٢- أذن في الناس أن من كان أكل فليصم بقية يومه و من لم يكن أكل فليصم فإن اليوم يوم عاشوراء

(صحيح) ( حم ق ن ) عن سلمة بن الأكوع ( م ) عن الربيع بنت معوذ . (الصحيحة ٢٦٢٤)

**١٩٨٢- جاڕ بدە بەنێو خەڵكدا هەر كەسێك شتێكی خواردووە با ئەو دوای ڕۆژەكە بەڕۆژووو بێت، ئەگەریش كەسێك هیچی نەخواردووە با بەڕۆژوو بێت چونكە ئەمڕۆ عاشورایە.**

١٩٨٣- أفطر الحاجم و المحجوم.

(صحيح) ( حم د ن هـ حب ك ) عن ثوبان وهو متواتر. (الإرواء ٩١٣)

**١٩٨٣- كەڵە شاخكەر و كەڵەشاخ بۆ كراو، ڕۆژوویان شكا.**

١٩٨٤- أفطر عندكم الصائمون و أكل طعامكم الأبرار و صلت عليكم الملائكة.

(صحيح) ( هـ حب ) عن ابن الزبير . (الكلم ١٩٢)

**١٩٨٤- ڕۆژووان لەلاتان بەربانگ بكەنەوە، خواردنتانیش پیاو چاكان بیخۆن، فریشتەكانیش داوای لێخۆشبوونتان بۆ بكەن.**

١٩٨٥- إن السحور بركة أعطاكموها الله فلا تدعوها.

(صحيح) ( حم ن ) عن رجل . (الترغيب ١٠٦٩)

**١٩٨٥- پارشێو بەرەكەتێكە خوای گەورە پێی بەخشیون، بۆیە وازی لێ مەهێنن.**

١٩٨٦- إن الشيخ يملك نفسه.

(حسن) ( حم طب ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ١٦٠٦)

**١٩٨٦- پیرە پیاو خۆی ڕادەگرێت.**

١٩٨٧- إن الله تعالى جعل البركة في السحور و الكيل.

(حسم) ( الشيرازي في الألقاب ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٢٩١)

**١٩٨٧- خوای گەورە بەرەكەتی خستووەتە پارشێوو پێوانەوە.**

١٩٨٨- إن الله تعالى و ملائكته يصلون على المتسحرين.

(حسن) ( حب طس حل ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١٦٥٤)

**١٩٨٨- خوای گەورە فریشتەكان داوای لێخۆشبوون دەكەن بۆ پارشێوكاران.**

١٩٨٩- إن بلالا يؤذن بليل فكلوا و اشربوا حتى يؤذن ابن أم مكتوم.

(صحيح) ( مالك حم ق ت ن ) عن ابن عمر ( خ ن ) عن عائشة . (الإرواء ٢١٩)

**١٩٨٩- بيلال بەشەو بانگ دەدا، بۆیە بخۆن و بخۆنەوە تا ئەو کاتەی (ابن ام کلثوم) بانگ دەدا.**

١٩٩٠- إن بلالا يؤذن بليل ليوقظ نائمكم و ليرجع قائمكم.

(صحيح) ( ن ) عن ابن مسعود . (الإرواء ٨٩٨)

**١٩٩٠- بیلال بەشەو بانگ دەدا، بۆ ئەوەی خەوتووتان ئاگا بکاتەوە، بەئاگا بووتانیش بگێڕێتەوە.**

١٩٩١- إن وسادك إذن لعريض طويل إنما هو: سواد الليل و بياض النهار.

(صحيح) ( حم د ) عن عدي بن حاتم . (صحيح أبي داود ٢٠٣٤)

**١٩٩١- کەواتە سەرینەکەت پان و درێژە، بەڵکو ئەوە ڕەشی شەو و سپێتی ڕۆژە.**

١٩٩٢- إنا معشر الأنبياء أمرنا أن نعجل إفطارنا و نؤخر سحورنا و نضع أيماننا على شمائلنا في الصلاة.

(صحيح) ( الطيالسي طب ) عن ابن عباس. (الصحيحة ١٧٧٣)

**١٩٩٢- ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران فەرمانمان پێکراوە پەلە بکەین لە ڕۆژوو شکاندندا و پارشێو دوا بخەین، دەستی ڕاستیشمان لەسەر دەستی چەپمان دابنەین لەنوێژدا.**

١٩٩٣- بكروا بالإفطار و أخروا السحور.

(صحيح) ( عد ) عن أنس . (الصحيحة ١٧٧٣)

**١٩٩٣- زوو بەربانگ بکەن و، پارشێو دوا بخەن.**

١٩٩٤- البركة في ثلاثة: في الجماعة و الثريد و السحور.

(صحيح) ( طب هب ) عن سلمان . (الصحيحة ١٠٤٥)

**١٩٩٤- پیرۆزی لەسێ شتدایە: لەکۆمەڵ و، تریت و، پارشێو دایە.**

١٩٩٥- تسحروا فإن في السحور بركة.

(صحيح) ( حم ق ت ن هـ ) عن أنس ( ن ) عن أبي هريرة وابن مسعود ( حم ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٢٩٣٨)

**١٩٩٥- پارشێو بکەن چونکە بەرەکەت لە پارشێودایە.**

١٩٩٦- تسحروا و لو بالماء.

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن عبدالله بن سراقة . (الضعيفة ١٤٠٥)

**١٩٩٦- پارشێو بکەن ئەگەر بەئاویش بووە.**

١٩٩٧- تسحروا و لو بجرعة من ماء.

(صحيح) ( ع ) عن أنس . (الضعيفة ١٤٠٥)

**١٩٩٧- پارشێو بکەن ئەگەر بەقومە ئاوێکیش بووە.**

١٩٩٨- ذهب المفطرون اليوم بالأجر.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن أنس. (صحيح أبي داود ٢٠٨٠)

**١٩٩٨- ئەوانەی ڕۆژوویان شکاند ئەمڕۆ بە پاداشتی زۆر گەڕانەوە.**

١٩٩٩- رب صائم ليس له من صيامه إلا الجوع و رب قائم ليس له من قيامه إلا السهر.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٠١٤)

**١٩٩٩- ڕۆژووانی وا هەیە لەڕۆژووەکەی هیچی دەست ناکەوێت لە برسێتی زیاتر، شەو نوێژکاری وایش هەیە. لەشەو نوێژەکەی تەنها شەو نخونی دەست دەکەوێت.**

٢٠٠٠- رب قائم حظه من قيامه السهر و رب صائم حظه من صيامه الجوع و العطش.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمر ( حم ك هق ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٠٨٣)

**٢٠٠٠- شەو نوێژکاری وا هەیە شەو نخونی بەر دەکەوێت لەشەو نوێژەکەی، ڕۆژووانی وایش هەیە تەنها برسێتی و تینوێتی دەست دەکەوێت لە ڕۆژووەکەی.**

٢٠٠١- السحور أكله بركة فلا تدعوه و لو أن يجرع أحدكم جرعة من ماء فإن الله و ملائكته يصلون على المتسحرين.

(حسن) ( حم ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ١٦٥٤)

**٢٠٠١- پارشێو کردن بەرەکەتە، وازی لێ مەهێنن، ئەگەر قومێك ئاوتان خواردووە، چونکە خوای گەورە و فریشتەکان ڕەحمەت دەنێرن بۆ پارشێوکاران.**

٢٠٠٢- صوموا من وضح إلى وضح .

(حسن) ( طب ) عن والد أبي المليح. (الصحيحة ١٩١٨)

**٢٠٠٢- ڕۆژوو بگرن لەمانگی نوێ بۆ مانگی نوێ.**

٢٠٠٣- صومي عن أختك .

(صحيح) ( الطيالسي ) عن ابن عباس. (الصحيحة ١٩٤٦)

**٢٠٠٣- لەجیاتی خوشکەکەت ڕۆژوو بگرە.**

٢٠٠٤- الصائم المتطوع أمير نفسه إن شاء صام و إن شاء أفطر .

(صحيح) ( حم ت ك ) عن أم هانئ. (المشكاة ٢٠٧٩)

**٢٠٠٤- ئەو كەسەی ڕۆژووی (تطوع) دەگرێت فەرماندەی خۆیەتی، بیەوێت بیشكێنێ یان بیەوێت بیگرێت.**

٢٠٠٥- الصيام جنة.

(صحيح) ( حم ن ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٢٠٤٦)

**٢٠٠٥- ڕۆژوو پەناگەیە.**

٢٠٠٦- الصيام جنة و إذا كان أحدكم صائما فلا يرفث و لا يجهل و إن امرؤ قاتله أو شاتمه فليقل: إني صائم مرتين و الذي نفسي بيده لخلوف فم الصائم أطيب عند الله من ريح المسك يترك طعامه و شرابه و شهوته من أجلي الصيام لي و أنا أجزي به و الحسنة بعشر أمثالها .

(صحيح) ( حم خ ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٢٠٤٦)

**٢٠٠٦- ڕۆژوو پەناگەیە، ئەگەریش كەسێكتان بەڕۆژوو بوو با قسەی ناشرین نەكات و نەفامی نەكات، ئەگەر كەسێكیش شەڕی لەگەڵ كرد یان جنێوی پێدا بلێت: من بەڕۆژووم دووجار، سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە، بۆنی دەمی ڕۆژووان خۆشترە لەلای خوا لە بۆنی میسك، خواردنی و خواردنەوەی و حەزی واز لێدەهێنێ لەبەر من، ڕۆژوو بۆ منە و خۆم پاداشتی دەدەمەوە، چاكەیش بە دە بەرامبەرە.**

٢٠٠٧- الصيام جنة من النار فمن أصبح صائما فلا يجهل يومئذ و إن امرؤ جهل عليه فلا يشتمه و لا يسبه و ليقل إني صائم و الذي نفس محمد بيده لخلوف فم الصائم أطيب عند الله من ريح المسك .

(صحيح) ( ن ) عن عائشة. (الصحيحة ٣٥١٦)

**٢٠٠٧- ڕۆژوو قەڵغانە لەئاگر، بۆیە هەر كەسێك بەڕۆژوو بوو، بانەفامی نەكات لەو ڕۆژەدا، ئەگەر كەسێكیش لەدژی نەفامی كرد باقسەی ناشرین یان جنێوی پێنەداو بلێت: من بەڕۆژووم، سوێند بەو كەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، بۆنی دەمی من ڕۆژووان خۆشترە لەلای خوا لەبۆنی میسك.**

٢٠٠٨- الصيام جنة من النار كجنة أحدكم من القتال .

(صحيح) ( حم ن هـ ) عن عثمان بن أبي العاص. (الترغيب ٩٨٢)

**٢٠٠٨- ڕۆژوو قەڵغانە لەئاگر، وەكو قەڵغانی هەر كەسێكتان لە گاتی جەنگدا.**

٢٠٠٩- الصيام جنة و حصن حصين من النار .

(حسن) ( حم هب ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٩٨٠)

**٢٠٠٩- ڕۆژوو قەڵغانە و قەڵایەكی قایمە بەرامبەر ئاگر.**

٢٠١٠- الصيام جنة و هو حصن من حصون المؤمن و كل عمل لصاحبه إلا الصيام يقول الله: الصيام لي و أنا أجزي به .

(حسن) ( طب ) عن أبي أمامة.

**٢٠١٠- ڕۆژوو قەڵغانە، قەڵای قایمی ئیمانداریشە، هەموو كردەوەیەكیشی بۆ خاوەنەكەیەتی تەنها ڕۆژوو نەبێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ڕۆژوو بۆ منە و خۆم پاداشتی دەدەمەوە.**

٢٠١١- عجلوا الإفطار و أخروا السحور .

(صحيح) ( طب ) عن أم حكيم. (الصحيحة ١١١٣)

**٢٠١١- پەلە بكەن لەبەر بانگ و پارشێو دوا بخەن.**

٢٠١٢- عليكم بهذا السحور فإنه هو الغداء المبارك .

(صحيح) ( حم ن ) عن المقدام. (الصحيحة ٢٤٠٨)

**٢٠١٢- فەرمانتان پێ دەكەم پارشێو بكەن چونكە ئەوە خۆراكێكی پیرۆزە.**

٢٠١٣- فصل ما بين صيامنا و صيام أهل الكتاب أكلة السحر.

(صحيح) ( حم م ٤ ) عن عمرو بن العاص. (صحيح أبي داود ٢٠٢٩)

**٢٠١٣- جیاوازی ڕۆژووی ئێوەو ڕۆژووی ئەهلی كیتاب خواردنی پارشێوە.**

٢٠١٤- الفجر فجران: فأما الفجر الذي يكون كذنب السرحان فلا يحل الصلاة و لا يحرم الطعام و أما الفجر الذي يذهب مستطيلا في الأفق فإنه يحل الصلاة و يحرم الطعام.

(صحيح) ( ك هق ) عن جابر. (الصحيحة ٢٠٠٢)

**٢٠١٤- شەبەق دوو شەبەقە: شەبەقێك وەكو كلكی گورگ وایە، نوێژی تیا دروست نییە، خواردنیشی تیا قەدەغە نییە، بەڵام ئەو شەبەقەی كەدرێژ دەبێتەوە بەئاسماندا، ئەوە نوێژكردن ڕەوا دەكا و خواردن قەدەغە دەكات.**

٢٠١٥- الفجر فجران: فجر يحرم فيه الطعام و تحل فيه الصلاة و فجر تحرم فيه الصلاة و يحل فيه الطعام.

(صحيح) ( ك هق ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٦٩٣)

**٢٠١٥- شەبەق دوو شەبەقە: شەبەقێك خواردنی تیا قەدەغە دەبێت و نوێژکردنی تیا دروستە، شەبەقێکیش نوێژی تیا قەدەغە دەبێت و خواردنی تیا دروستە.**

٢٠١٦- كلوا و اشربوا و لا يهيدنكم الساطع المصعد فكلوا و اشربوا حتى يعترض لكم الأحمر.

(حسن) ( د ت ) عن طلق. (الصحيحة ٢٠٣١)

**٢٠١٦- بخۆن و بخۆنەوە، جارِس مەبن بەبریقەداری سەرکەوتوو، بخۆن و بخۆنەوە تاکو سوورەکە دەبینن.**

٢٠١٧- ليس الصيام من الأكل و الشرب إنما الصيام من اللغو و الرفث فإن سابك أحد أو جهل عليك فقل إني صائم إني صائم.

(صحيح) ( ك هق ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٠٨٢)

**٢٠١٧- ڕۆژوو گرتن تەنها لەخواردن و خواردنەوە نییە، بەڵكو لەقسەی بەتاڵ و ناشرین، ئەگەر كەسێك جنێوی پێتدا یان نەفامی لەدژت كرد، بڵێ: من بەڕۆژووم، من بەڕۆژووم.**

٢٠١٨- ليس الفجر بالأبيض المستطيل في الأفق و لكنه الأحمر المعترض.

(صحيح) ( حم ) عن طلق بن علي. (الصحيحة ٢٠٠٢)

**٢٠١٨- شەبەق ئەو سپی درێژ بووە نییە لەئاسودا، بەڵكو ئەو سوورە ڕێگرەیە.**

٢٠١٩- من أراد أن يصوم فليتسحر بشيء.

(صحيح) ( حم الضياء ) عن جابر. (الصحيحة ٢٣٠٩)

**٢٠١٩- هەر كەسێك ویستی ڕۆژوو بگرێت با بەشتێ پارشێو بكات.**

٢٠٢٠- من أفطر في رمضان ناسيا فلا قضاء عليه و لا كفارة.

(حسن) ( ك هق ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٩٢٠)

**٢٠٢٠- هەر كەسێك لەڕەمەزان شتێكی خواردو لەبیری چوو بەڕۆژووە نەقەزاو نەكەفارەتی لەسەر نییە.**

٢٠٢١- من أكل أو شرب ناسيا فلا يفطر فإنما هو رزق رزقه الله.

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٩٤٠)

**٢٠٢١- هەر كەسێك لەبیری چوو خواردنێك یان خواردنەوەیەكی خوارد، ڕۆژووەكەی نەشكێنێ چونكە ئەوە ڕۆزییەكە خوای گەورە پێی بەخشیوە.**

٢٠٢٢- من دعي إلى طعام و هو صائم فليجب فإن شاء طعم و إن شاء ترك.

(صحيح) ( هـ ) عن جابر. (الصحيحة ٣٤٧)

**٢٠٢٢- هەر كەسێك بانگ كرا بۆ خواردنێك و بەڕۆژوو بوو، با بچێت ئەگەر ویستی بخوات و ئەگەر ویستی واز بهێنێ.**

٢٠٢٣- من ذرعه القيء و هو صائم فليس عليه قضاء و من استقاء فليقض.

(صحيح) ( ٤ ك ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٩١٥)

**٢٠٢٣- كێ ڕشانەوە زۆری بۆ هێنا و ڕشایەوە، بەڕۆژوویش بوو، قەزای لەسەر نییە، هەر كەسێكیش خۆی بەزۆر بڕشێنێتەوە با ڕۆژووەكەی بگرێتەوە.**

٢٠٢٤- من فطر صائما أو جهز غازيا فله مثل أجره.

(صحيح) ( هق ) عن زيد بن خالد. (المشكاة ١٩٩٢)

**٢٠٢٤- كێ خواردنی ڕۆژووانێكی دا. یان موجاهیدێكی ئامادە كرد وەكو ئەو پاداشتی دەبێت.**

٢٠٢٥- من فطر صائما كان له مثل أجره غير أنه لا ينقص من أجر الصائم شيئا.

(صحيح) ( حم ت هـ حب ) عن زيد بن خالد. (الترغيب ١٠٧٨)

**٢٠٢٥- هەر كەسێك نانی ڕۆژووانێك؛ بدات وەكو ئەو پاداشتی دەبێت و، لە پاداشتی ڕۆژووانەكەیش هیچ كەم ناكاتەوە.**

٢٠٢٦- من لم يبيت الصيام قبل طلوع الفجر فلا صيام له.

(صحيح) ( قط هق ) عن عائشة. (الإرواء ٨٩٦)

**٢٠٢٦- هەر كەسێك پێش بەرەبەیان نیەتی ڕۆژووی نەبوو، ڕۆژووی بۆ ناژمێرێت.**

٢٠٢٧- من لم يبيت الصيام من الليل فلا صيام له.

(صحيح) ( ن ) عن حفصة. (الإرواء ٨٩٦)

**٢٠٢٧- هەر كەسێك لەشەوەوە نیەتی ڕۆژووی نەبێت، ڕۆژووی بۆ ناژمێردرێت.**

٢٠٢٨- من لم يجمع الصيام قبل الفجر فلا صيام له.

(صحيح) ( حم ٣ ) عن حفصة. (الإرواء ٨٩٦)

**٢٠٢٨- هەر كێ نیازی تەواوی ڕۆژوو گرتنی نەبێت پێش شەبەق ڕۆژووی بۆ نییە.**

٢٠٢٩- من لم يدع قول الزور و العمل به فليس لله حاجة في أن يدع طعامه و شرابه.

(صحيح) ( حم خ د ت ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٢٠٤٥)

**٢٠٢٩- هەر كێ واز لەدرۆ و كار بەدرۆ كردن نەهێنێ، خوای گەورە پێویستی بەوە نیـە واز لەخواردن و خواردنەوەی بهێنێ.**

٢٠٣٠- من مات و عليه صيام صام عنه وليه.

(صحيح) ( حم ق د ) عن عائشة. (الصحيحة ١٩٤٦)

**٢٠٣٠- كەسێك لەشەوەوە نییەتی ڕۆژووی نەبێت، ڕۆژووی بۆ ناژمێردرێت.**

٢٠٣١- من نسي و هو صائم فأكل أو شرب فليتم صومه فإنما أطعمه الله و سقاه.

(صحيح) ( حم ق هـ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٩٢٠)

**٢٠٣١- كەسێك لەبیری بچێت بەڕۆژووە بخوات و بخواتەوە، با ڕۆژووەكەی تـەواو بكـات، چونكە ئەوە خوای گەورە خواردن و خواردنەوەی پێداوە.**

٢٠٣٢- نعم السحور التمر.

(صحيح) ( حل ) عن جابر. (الصحيحة ٥٦٢)

**٢٠٣٢- چاكترین پارشێو خورمایە.**

٢٠٣٣- هلم إلى الغداء المبارك - يعني السحور -.

(صحيح) ( حم د ن حب ) عن العرباض. (المشكاة ١٩٩٧)

**٢٠٣٣- وەرە بۆ خۆراكی پیرۆز – واتە : پارشێو-.**

٢٠٣٤- لا تزال أمتي بخير ما عجلوا الإفطار ( و أخروا السحور ) .

(صحيح) ( حم ) عن أبي ذر . (الإرواء ٨٩٩)

**٢٠٣٤- ئوممەتی من لە چاكەدان تاكو بە پەلە بەربانگ بكەن.**

٢٠٣٥- لا صيام لمن لم يفرضه من الليل.

(صحيح) ( هـ ) عن حفصة. (الإرواء ٨٩٦)

**٢٠٣٥- ڕۆژوو دروست نییە ئەگەر نیەت لەشەوەوە نەهێنرێت.**

٢٠٣٦- لا يزال الدين ظاهرا ما عجل الناس الفطر لأن اليهود و النصارى يؤخرون.

(حسن) ( د ك ) عن أبي هريرة. (المشكاة ١٩٩٥)

**٢٠٣٦- ئـایین هـەر بەئاشكرایی دەمێنێتـەوە تـاكو خـەڵكی بە پەلـە ڕۆژوو بـشكێنرێت، چونكە جولەكەو گاورەكان دوای دەخەن.**

٢٠٣٧- لا يزال الناس بخير ما عجلوا الفطر.

(صحيح) ( حم ق ت ) عن سهل بن سعد. (الإرواء ٨٩٩)

**٢٠٣٧- خەڵكی لەچاكەدان تاكو پەلە بكەن لەڕۆژوو شكاندندا.**

٢٠٣٨- لا يزال الناس بخير ما عجلوا الفطر فإن اليهود يؤخرون.

(حسن) ( هـ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ١٩٩٥)

**٢٠٣٨- خەڵكی لەباشيدان تا ئەو كاتەی ڕۆژوو بە پەلە بشكێنن، چونكە جوولەكەكان دوای دەخەن.**

٢٠٣٩- لا يغرنكم في سحوركم أذان بلال و لا بياض الأفق المستطيل حتى يستطير.

(صحيح) ( حم م ٣ ) عن سمرة. (الصحيحة ٢٠٣١)

**٢٠٣٩- مەخەڵەتێن لە پارشێو كردنتاندا بەبانگی بيلالْ يان بەسپێتی ئاسۆ كەبەرز دەبێتەوە تاكو لانەچێت.**

٢٠٤٠- لا يفطر من قاء و لا من احتلم و لا من احتجم.

(حسن) ( د ) عن رجل. (المشكاة ٢٠١٥)

**٢٠٤٠- ڕۆژووی ناشكێت كەسێك بڕشێتەوە، يان لەشی گران بێت، يان كەڵەشاخ بكات.**

٢٠٤١- لا يمنعن أحدكم أذان بلال من سحوره فإنه يؤذن بليل ليرجع قائمكم و لينبه نائمكم و ليس الفجر أن يقول هكذا حتى يقول هكذا: يعترض في أفق السماء.

(صحيح) ( حم ق د هـ ) عن ابن مسعود. (الإرواء ٨٩٨)

**٢٠٤١- بانگی بيلال ڕێگەتان لێ ناگرێت پارشێو بكەن، چونكە ئەو بەشەو بانگ دەدا، بۆ ئەوەی بەئاگا بووتان بگێڕێتەوە و، خەوتووتان ئاگا بكاتەوە، شەبەقيش ئەوە نييە وا بكات و وا بكات: لەئاسماندا دەركەوێت.**

٢٠٤٢- أفطر عندكم الصائمون و أكل طعامكم الأبرار و صلت عليكم الملائكة.

(صحيح) ( هـ حب ) عن ابن الزبير . (آداب الزفاف ص٨٥)

**٢٠٤٢- كە ڕۆژووی بشكاندبا لەلای كەسێك دەيفەرموو: ڕۆژووان لەلاتان ڕۆژوو بشكێنن، پياو چاكانيش خواردنتان بخۆن و، فريشتەكانيش بەسەرتاندا دابەزن.**

٢٠٤٣- كان إذا أفطر قال: ذهب الظمأ و ابتلت العروق و ثبت الأجر إن شاء الله.

(حسن) ( د ك ) عن ابن عمر. (الإرواء ٩٠٢)

**٢٠٤٣- كـه ڕۆژووی دەشـكاند، دەیفـەرموو: تینـوێتی نـەما و ڕەگـەكان تـەڕ بـوون و، پاداشتیش جێگە بووە بە پشتیوانی خوا.**

٢٠٤٤- كان إذا أفطر عند قوم قال: أفطر عندكم الصائمون و صلت عليكم الملائكة.

(صحيح) ( طب ) عن ابن الزبير. (آداب الزفاف ص٨٥)

**٢٠٤٤- كە لای خەڵكانێك ڕۆژووی دەشكاند، دەیفەرموو: ڕۆژووان لەلاتان بەربانگ بكەن و فریشتەكانیش داوای لێخۆشبوونتان بۆ بكەن.**

٢٠٤٥- كان إذا دخل قال: هل عندكم طعام ؟ فإذا قيل لا قال: إني صائم.

(صحيح) ( د ) عن عائشة. (صحيح أبي داود ٢١١٩)

**٢٠٤٥- كە نەچووبایەتە ژوورەوە دەیفەرموو: ئایا خواردنتان هەیە؟ ئەگەر بوترابا: نەخێر، دەیفەرموو: من بەڕۆژووم.**

٢٠٤٦- كان إذا كان صائما أمر رجلا فأوفى على شيء فإذا قال غابت الشمس أفطر.

(صحيح) ( ك ) عن سهل بن سعد ( طب ) عن أبي الدرداء. (الصحيحة ٢٠٨١)

**٢٠٤٦- كەبەڕۆژوو دەبوو فەرمانی دەكرد بـە پیاوێك بـچێتە سـەر بەرزاییـەك كـەبیوتبا خۆرئاوا بوو، ڕۆژووی دەشكاند.**

٢٠٤٧- كان إذا كان الرطب لم يفطر إلا على الرطب و إذ لم يكن الرطب لم يفطر إلا على التمر.

(صحيح) ( عبد بن حميد ) عن جابر. (المشكاة ١٩٩١)

**٢٠٤٧- ئەگەر خورمای پێگەیشتوو بووایە تەنها بەوە ڕۆژووی دەشكاند، ئەگـەر نەبوایـە بە هەر خورمایەك بێت ڕۆژووی دەشكاند.**

٢٠٤٨- كان يبدأ إذا أفطر بالتمر.

(صحيح) ( ن ) عن أنس. (الصحيحة ٢١١٧)

**٢٠٤٨- لە بەربانگ كردنەوەدا بە خورمای قەسپ دەستی پێ دەكرد[1].**

٢٠٤٩- كان يدركه الفجر و هو جنب من أهله ثم يغتسل و يصوم.

(صحيح) ( مالك ق ٤ ) عن عائشة وأم سلمة. (صحيح الترمذي ٧٧٩)

**٢٠٤٩- عادەتی وا بوو[2] دەگەیشتە بەرەبەیان و سپێدە هەڵهاتن و لەشی گران بوو لەناو خێزانیدا ئینجا خۆی دەشۆرد بەڕۆژوو دەبوو.**

---

[1] واتە ئەگەر فەریكە خورمای تازە پێگەیشتوی شیرین و تەڕ و ناسكی دەست نەكەوتایە.

[2] واتە پێغەمبەری خوا عادەتی وابوو سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت.

٢٠٥٠- كان يفطر على رطبات قبل أن يصلي فإن لم تكن رطبات فتمرات فإن لم تكن تمرات حسا حسوات من ماء.

(حسن) ( حم د ت ) عن أنس. (الإرواء ٩٠٤)

**٢٠٥٠- عادەتی وا بوو بە چەند دەنكە خورمایەكی فەریكەی شیرین و تازە پێگەیشتوو بەربانگی دەكردەوە پێش ئەوەی نوێژ بكات ، جا ئەگەر فەریكەی دەست نەكەوتایە بە خورمای قەسب بەربانگی دەكردەوە.**

٢٠٥١- كان يقبل و هو صائم

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن عائشة. (الصحيحة ٢١٩)

**٢٠٥١- جاری وا دەبوو ماچیشی دەكرد و بەڕۆژووش دەبوو.**

٢٠٥٢- لا بر أن يصام في السفر.

(حسن) ( طب ) عن ابن عمرو. (الترغيب ١٠٥٦)

**٢٠٥٢- خێر نییە لەسەفەردا ڕۆژوو بگیردرێت.**

## بابەتی بینینی مانگ

٢٠٥٣- أحصوا هلال شعبان لرمضان.

(حسن)(ت ك) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٥٦٥)

**٢٠٥٣- مانگی شەعبان بژمێرن بۆ ڕەمەزان.**

٢٠٥٤- أحصوا هلال شعبان لرمضان و لا تخلطوا برمضان إلا أن يوافق ذلك صياما كان يصومه أحدكم و صوموا لرؤيته و أفطروا لرؤيته فإن غم عليكم فأكملوا العدة ثلاثين يوما فإنها ليست تغمى عليكم العدة.

(حسن) (قط هق) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٥٦٥)

**٢٠٥٤- مانگی شەعبان بژمێرن بۆ ڕەمەزان، ڕۆژوویش تێكەڵ مەكەن لەگەڵ ڕەمەزاندا مەگەر لەگەڵ ڕۆژووی كەسێكتاندا ڕێككەوێت، ڕۆژوو بگرن بەبینینی و، بیشكێنن بە بینینی ئەگەر هەور بوو، مانگی شەعبان بكەن بەسی، چونكە ژمارەكەتان لێ تێكناچێت.**

٢٠٥٥- إذا جاء رمضان فصم ثلاثين إلا أن ترى الهلال قبل ذلك.

(صحيح) ( طب ) عن عدي بن حاتم . (الصحيحة ١٥٠٨)

**٢٠٥٥- ئەگەر ڕەمەزان هات سی ڕۆژ بەڕۆژوو بن، مەگەر پێش ئەوە مانگ ببینن.**

٢٠٥٦- إذا رأيتم الهلال فصوموا و إذا رأيتموه فأفطروا فإن غم عليكم فاقدروا له.

(صحيح) ( ق ن هـ حب ) عن ابن عمر . (الإرواء ٨٩٥)

**٢٠٥٦- ئەگەر مانگتان بینی بەڕۆژوو بن، ئەگەر دیسان بینیتانەوە ڕۆژوو بشکێنن، ئەگەر هەور بوو بیکەن بەژمارە.**

٢٠٥٧- إذا رأيتم الهلال فصوموا و إذا رأيتموه فأفطروا فإن أغمي عليكم فعدوا ثلاثين يوما.

(صحيح) ( حم ق ) عن جابر ( حم م ن هـ ) عن أبي هريرة ( ن ) عن ابن عباس ( د ) عن حذيفة ( حم) عن طلق بن علي . (الإرواء ٨٩٤)

**٢٠٥٧- ئەگەر مانگتان بینی بەڕۆژوو بن، ئەگەر بینیتانەوە بیشکێنن، ئەگەریش هەور بوو سی ڕۆژ بژمێرن.**

٢٠٥٨- إن الله جعل هذه الأهلة مواقيت فإذا رأيتموه فصوموا و إذا رأيتموه فأفطروا فإن غم عليكم فعدوا ثلاثين.

(صحيح) (طب) عن طلق بن علي . (الإرواء ٤\٩)

**٢٠٥٨- خوای گەورە ئەم مانگانەی کردووە بەکاتی دانراو، جا ئەگەر بینیتان ڕۆژوو بگرن و، ئەگەر بینیتانەوە ڕۆژوو بشکێنن، بەڵام ئەگەر هەور بوو سی بژمێرن.**

٢٠٥٩- إنا أمة أمية لا نكتب و لا نحسب.

(صحيح) ( ق د ن ) عن ابن عمر . (صحيح أبي داود ٢٠٠٨)

**٢٠٥٩- ئێمە نەتەوەیەکی نەخوێندەوارین، ناخوێنین و ناژمێرین.**

٢٠٦٠- إن الشهر يكون تسعة و عشرين يوما.

(صحيح) ( خ ت ) عن أنس ( ق ) عن أم سلمة ( م ) عن جابر وعائشة.

**٢٠٦٠- مانگ بیست و نۆ ڕۆژە.**

٢٠٦١- إن الله قد أمده لرؤيته فإن أغمي عليكم فأكملوا العدة.

(صحيح) ( حم م ) عن ابن عباس . (الإرواء ٨٩٤)

**٢٠٦١-خوای گەورە درێژی کردووەتەوە بۆ ئەوەی ببینرێت بۆیە ئەگەر هەور بوو سی تەواو بکەن.**

٢٠٦٢- جعل الله الأهلة مواقيت للناس فصوموا لرؤيته و أفطروا لرؤيته فإن غم عليكم فعدوا ثلاثين يوما.

(صحيح) ( ك ) عن ابن عمر . (الإرواء ٩٠٢)

**٢٠٦٢- خواى گەورە مانگەكانى كردووە بەكاتى دانراو بۆ خەلكى، بۆيە رۆژوو بگرن بەبينينى و، رۆژوو بشكێنن بەبينينى، ئەگەر هەور بوو ژماردنەكە تەواو بكەن.**

٢٠٦٣- الشهر يكون تسعة و عشرين و يكون ثلاثين فإذا رأيتموه فصوموا و إذا رأيتموه فأفطروا فإن غم عليكم فأكملوا العدة.

(صحيح) ( ن ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٩٠٣)

**٢٠٦٣- مانگ بيست ونۆ رۆژەو، سى رۆژە، جا ئەگەر بينيتان رۆژوو بگرن و، كە بينيتانەوە رۆژوو بشكێنن، ئەگەر هەرو بوو ژماردنەكە تەواو بكەن.**

٢٠٦٤- الشهر تسع و عشرون فلا تصوموا حتى تروه و لا تفطروا حتى تروه فإن غم عليكم فأكملوا العدة ثلاثين.

(صحيح) ( حم ق د ) عن ابن عمر. (الإرواء ٩٠٣)

**٢٠٦٤- مانگ بيست و نۆيە، بۆيە رۆژوو مەگرن تاكو دەيبينن، ررۆژوويش مەشكێنن تا دەبينن، ئەگەريش هەور بوو سى رۆژ تەواو بكەن.**

٢٠٦٥- لا تصوموا حتى تروا الهلال و لا تفطروا حتى تروه فإن غم عليكم فاقدروا له.

(صحيح) ( ق ن ) عن ابن عمر. (الإرواء ٨٩٥)

**٢٠٦٥- رۆژوو مەگرن تاكو مانگ دەبينن، رۆژوويش مەشكێنن تاكو دەيبينن، ئەگەر هەور بوو بيژمێرن.**

٢٠٦٦- لا تصوموا قبل رمضان و صوموا لرؤيته و أفطروا لرؤيته فإن حالت دونه غيامة فأكملوا ثلاثين يوما.

(صحيح) ( ت ن حب ) عن ابن عباس. (الإرواء ٨٩٥)

**٢٠٦٦- پێش رەمەزان رۆژوو مەگرن و، رۆژوو بگرن بەبينينى و، بيشكێنن بە بينينى، ئەگەر هەورێك شارديەوە سى رۆژەكە تەواو بكەن.**

٢٠٦٧- صوموا لرؤيته و أفطروا لرؤيته فإن حال بينكم و بينه سحاب فأكملوا عدة شعبان و لا تستقبلوا الشهر استقبالا و لا تصلوا رمضان بيوم من شعبان .

(صحيح) ( حم ن هق ) عن ابن عباس. (الصحيحة ١٩١٧)

**٢٠٦٧- رۆژوو بگرن بەبينينى و، بيشكێنن بەبينينى، ئەگەر هەورێك كەوتە نێوان ئێوەو مانگ، شەعبان بكەن بە سى رۆژ.**

٢٠٦٨- صوموا لرؤيته و أفطروا لرؤيته فإن غم عليكم فأكملوا شعبان ثلاثين .

(صحيح) ( ق ن ) عن أبي هريرة ( ن ) عن ابن عباس ( طب ) عن البراء. (الصحيحة ١٩١٧)

**٢٠٦٨- ڕۆژوو بگرن بەبینینی و، بیشکێنن بەبینینی، ئەگەر هەور بوو شەعبان بکەن بە سی ڕۆژی تەواو.**

٢٠٦٩- صوموا لرؤيته و أفطروا لرؤيته و انسكوا لها فإن غم عليكم فأتموا ثلاثين فإن شهد شاهدان مسلمان فصوموا و أفطروا .

(صحيح) ( حم ن ) عن رجال من الصحابة . (الإرواء ٩٠١)

**٢٠٦٩- ڕۆژوو بگرن بەبینینی و، بیشکێنن بە بینینی، ئەگەر هەوریش بوو سی تەواو بکەن، ئەگەر دوو شایەتی موسوڵمان شایەتیاندا ڕۆژوو بگرن و ڕۆژوو بشکێنن.**

٢٠٧٠- لا تقدموا الشهر بصيام يوم و لا يومين إلا أن يكون شيء يصومه أحدكم لا تصوموا حتى تروه ثم صوموا حتى تروه فإن حال دونه غمام فأتموا العدة ثلاثين ثم أفطروا و الشهر تسع و عشرون.

(صحيح) ( د ) عن ابن عباس. (الإرواء ٩٠٢)

**٢٠٧٠- پێش ڕەمەزان مەکەون بەڕۆژووی ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ، مەگەر کەسێك لەئێوە ڕۆژووی خۆی هەبێت، ڕۆژوویش مەگرن تا دەیبینن، ئینجا ڕۆژوو بگرن تا دەیبیننەوە، ئەگەر هەورێك بینینی قەدەغە کرد سی تەواو بکەن و، ڕۆژوو بشکێنن لەبیست و نۆی مانگ.**

٢٠٧١- لا تقدموا الشهر بيوم و لا يومين إلا أن يوافق ذلك صوما كان يصومه أحدكم صوموا لرؤيته و أفطروا لرؤيته فإن غم عليكم فعدوا ثلاثين ثم أفطروا.

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٩٠٢)

**٢٠٧١- نەکەونە پێش ڕەمەزان بەڕۆژێك و دوو ڕۆژ، مەگەر ئەوە ڕێکەوێت لەگەڵ ڕۆژووی کەسێك لەئێوە، ڕۆژوو بگرن بەبینینی و، بیشکێنن بەبینینی، ئەگەر هەور بوو سی بژمێرن و ڕۆژوو بشکێنن.**

٢٠٧٢- لا تقدموا الشهر حتى تروا الهلال أو تكملوا العدة قبله ثم صوموا حتى تروا الهلال أو تكملوا العدة قبله.

(صحيح) ( د ن حب ) عن حذيفة. (الإرواء ٩٠٢)

**٢٠٧٢- هیچ پێش ڕەمەزان مەخەن تا مانگ دەبینن یان سی تەواو بکەن پێش ڕەمەزان ئینجا، ڕۆژوو بگرن تا مانگ دەبینن یان سی پێش ئەوە تەواو بکەن.**

٢٠٧٣- الصوم يوم تصومون و الفطر يوم تفطرون و الأضحى يوم تضحون .

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٢٤)

**٢٠٧٣- ڕەمەزان ئەو ڕۆژەیە کەڕۆژوو بگرن، جەژنیش ئەو ڕۆژەیە کە ڕۆژوو دەشکێنن، قوربانیش ئەو ڕۆژەیە کە قوربانی دەکەن.**

٢٠٧٤- كان لا يصلي المغرب حتى يفطر و لو على شربة من الماء.

(صحيح) ( ك هب ) عن أنس. (الصحيحة ٢١١٠)

**٢٠٧٤- نوێژی مەغریبی نەدەکرد تاکو ڕۆژووەکەی نەشکێنێ، ئەگەر بەقومێك ئاویش بووە.**

## بابەتی هاندانی ڕۆژووگرتن

٢٠٧٥- أتاني جبريل فقال: يا محمد ! من أدرك أحد والديه فمات فدخل النار فأبعده الله قل: آمين فقلت: آمين قال: يا محمد من أدرك شهر رمضان فمات فلم يغفر له فأدخل النار فأبعده الله قل: آمين فقلت: آمين قال: و من ذكرت عنده فلم يصل عليك فمات فدخل النار فأبعده الله قل: آمين فقلت: آمين.

(صحيح) ( طب ) عن جابر بن سمرة . (الترغيب ٩٩٧)

**٢٠٧٥- جیبریل هاتە لام و وتی: ئەی موحەممەد: کێ فریای دایکی یان باوکی کەوت و مرد و چووە دۆزەخەوە خوا دووری بخاتەوە، بڵێ ئامین، وتم: ئامین، وتی: ئەی موحەممەد! کەسێك فریای مانگی ڕەمەزان کەوت و خوا لێی خۆش نەبوو، چووە دۆزەخەوە، خوا دووری بخاتەوە، بڵێ ئامین، ووتم ئامین، لای هەر کەسێکیش باسکرایت و سەڵەواتی لەسەرت نەدا و مرد چووە دۆزەخەوە، خوا دووری بخاتەوە، بڵێ ئامین.**

٢٠٧٦- إذا جاء رمضان فتحت أبواب الجنة و غلقت أبواب النار و صفدت الشياطين.

(صحيح) ( ن ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٣٠٧)

**٢٠٧٦- بەهاتنی مانگی ڕەمەزان دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو، دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و، شەیتانەکان زنجیر دەکرێن.**

٢٠٧٧- إذا كان أول ليلة من شهر رمضان صفدت الشياطين و مردة الجن و غلقت أبواب النار فلم يفتح منها باب و فتحت أبواب الجنة فلم يغلق منها باب و ينادي مناد كل ليلة: يا باغي الخير أقبل و يا باغي الشر أقصر و لله عتقاء من النار و ذلك كل ليلة.

(حسن) ( ت هـ حب ك هق ) عن أبي هريرة . (المشكاة ١٩٦٠)

**٢٠٧٧- لە یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزاندا شەیتان و جنۆکە سەرکەشەکان کۆت دەکرێن، دەرگاکانی دۆزەخیش دادەخرێن و هیچ دەرگایەکیان ناکرێتەوە. دەرگاکانی بەهەشتیش دەکرێنەوەو هیچ دەرگایەکیان داناخرێن، بانگکەرێکیش هەموو شەوێك بانگ دەکات: ئەی چاکەخواز وەرە، ئەی خراپەکار بەسە، خوای گەورەیش ئازادکراوی هەیە لەئاگر، ئەویش لەهەموو شەوێکدا.**

٢٠٧٨- إن الله تعالى يقول: إن الصوم لي و أنا أجزي به إن للصائم فرحتين: إذا أفطر فرح و إذا لقي الله تعالى فجزاه فرح و الذي نفس محمد بيده لخلوف فم الصائم أطيب عند الله من ريح المسك.

(صحيح) ( حم م ن ) عن أبي هريرة وأبي سعيد معا. (الترغيب ٩٧٨)

**٢٠٧٨- خوای گەورە دەفەرموێت: ڕۆژوو بۆ منە و من پاداشتی دەدەمەوە، ڕۆژووان دوو خۆشی هەیە: کەڕۆژوو دەگرێت دڵی خۆش دەبێت، ئەگەر خوایش ببینێ و پاداشتی بداتەوە دڵی خۆش دەبێت، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، بۆنی دەمی ڕۆژووان خۆشترە لەلای خوا لەبۆنی میسك.**

٢٠٧٩- إن لله تعالى عند كل فطر عتقاء من النار و ذلك في كل ليلة.

(حسن) ( هـ ) عن جابر ( حم طب هب ) عن أبي أمامة . (الترغيب ١٠٠١)

**٢٠٧٩- خوای گەورە لەگەڵ هەموو بەربانگکردنێکدا ئازاد کراوی هەیە لەئاگر، لەهەموو شەوێکدا.**

٢٠٨٠- خصاء أمتي الصيام ( و القيام ) .

(صحيح) ( حم طب ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ١٨٣٠)

**٢٠٨٠- خەساندنی ئوممەتی من ڕۆژوو گرتنە.**

٢٠٨١- رغم أنف رجل ذكرت عنده فلم يصل علي و رغم أنف رجل دخل عليه رمضان ثم انسلخ قبل أن يغفر له و رغم أنف رجل أدرك عنده أبواه الكبر فلم يدخلاه الجنة.

(صحيح) ( ت ك ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٩٢٧)

**٢٠٨١- لوتی بەخۆڵەوە بێت ئەو کەسەی ناو دەبرێم لای و سەڵاواتم بەسەردا نادات، هەروەها کەسێك ڕەمەزان بێت و بڕوات پێش ئەوەی خوا لێی خۆش بێت، هەروەها کەسێك باوك و دایکی پیر بن لەلای و خۆی پێیان نەکاتە بەهەشتەوە.**

٢٠٨٢- رمضان شهر مبارك تفتح فيه أبواب الجنة و تغلق فيه أبواب السعير و تصفد فيه الشياطين و ينادي مناد كل ليلة: يا باغي الخير هلم و يا باغي الشر أقصر.

(صحيح) ( حم هب ) عن رجل. (الصحيحة ١٨٦٨)

**٢٠٨٢- ڕەمەزان مانگێکی پیرۆزە و دەرگاکانی بەهەشتی تیا دەکرێتەوەو، دەرگاکانی دۆزەخی تیا دادەخرێن و، شەیتانەکانیشی تیا کۆت دەکرێت، بانگکەرێکیش هەموو شەوێك بانگ دەکات، ئەی چاکەخواز وەرە، ئەی خراپەکار بەسە.**

٢٠٨٣- صيام المرء في سبيل الله يبعده من جهنم مسيرة سبعين عاما .

(صحيح) ( طب ) عن أبي الدرداء. (صحيح النسائي ٢٢٥٢)

**٢٠٨٣- ڕۆژووی کەسێك لەڕێگای خوادا، حەفتا ساڵ لەئاگری دۆزەخ دووری دەخاتەوە.**

٢٠٨٤- الصوم جنة .

(صحيح) ( ن ) عن معاذ. (المشكاة ٢٩)

**٢٠٨٤- ڕۆژوو پەناگەیە.**

٢٠٨٥- الصوم جنة من عذاب الله .

(صحيح) ( هب ) عن عثمان بن أبي العاص. (صحيح النسائي ٢٢٣١)

**٢٠٨٥- ڕۆژوو قەڵغانە لەسزای خوای گەورە.**

٢٠٨٦- الصوم جنة يستجن بها العبد من النار .

(حسن) ( طب ) عن عثمان بن أبي العاص. (صحيح النسائي ٢٢٣١)

**٢٠٨٦- ڕۆژوو بە پاگەیە بەندە پەنای پێ دەبات لە ئاگر.**

٢٠٨٧- عليك بالصوم فإنه لا مثل له .

(صحيح) ( حم ن حب ك ) عن أبي أمامة. (الصحيحة ١٩٣٧)

**٢٠٨٧- لەسەرتە ڕۆژوو بگریت چونکە هاو وێنەی نییە.**

٢٠٨٨- في الجنة ثمانية أبواب فيها باب يسمى الريان لا يدخله إلا الصائمون.

(صحيح) ( خ ) عن سهل بن سعد. (المشكاة ١٩٥٧)

**٢٠٨٨- بەهەشت هەشت دەرگای هەیە ، دەرگایەکی تیایە ناوی ڕەییانە بێجگە ڕۆژووەوان کەسی لێ ناچێتە ژوور.**

٢٠٨٩- قال الله تعالى: الصيام جنة يستجن بها العبد من النار و هو لي و أنا أجزي به.

(حسن) ( حم هب ) عن جابر. (الترغيب ٩٨١)

**٢٠٨٩- خوای گەورە فەرمویەتی: ڕۆژوو قەڵغانە بەندەی موسوڵمان خۆی پێ دەپارێزێ لە ئاگر ئەو ڕۆژووە بۆ منە و هەر منیش پاداشتی لەسەر ئەدەمەوە.**

٢٠٩٠- قال الله تعالى: كل عمل ابن آدم له إلا الصيام فإنه لي و أنا أجزي به و الصيام جنة و إذا كان يوم صوم أحدكم فلا يرفث و لا يصخب و إن سابه أحد أو قاتله فليقل: إني امرؤ صائم و الذي نفس محمد بيده لخلوف فم الصائم عند الله أطيب من ريح المسك و للصائم فرحتان يفرحهما: إذا أفطر فرح بفطره و إذا لقي ربه فرح بصومه.

(صحيح) ( ق ن ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٩٧٨)

**٢٠٩٠- خوای گەورە دەفەرموێت: هەرچی کردەوەی ئادەمیزاد هەیە بۆ خۆیەتی ڕۆژوو نەبێت بۆ منە و خۆم پاداشتی دەدەمەوە، ڕۆژوویش پەناگەیە، جا لەو ڕۆژەی کەسێکتان بەڕۆژوو دەبێت باقسەی ناشرین نەکات و هاوار نەکات و، ئەگەر کەسێکیش جنێوی پێدا یان شەڕی لەگەڵ کرد با بڵێت: من کەسێکی بەڕۆژووم، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، بۆنی دەمی ڕۆژووان لەلای خوا خۆشترە لەبۆنی میسك، ڕۆژووانیش دوو خۆشی هەیە، دڵخۆش دەبێت پێیان: کەڕۆژوو دەشکێنێ دڵخۆش دەبێت، هەروەها کاتێك خوای خۆی دەبینێ دڵخۆش دەبێت بەڕۆژووەکەی.**

٢٠٩١- كل عمل ابن آدم يضاعف الحسنة بعشر أمثالها إلى سبعمائة ضعف إلى ما شاء الله قال الله عز و جل: إلا الصوم فإنه لي و أنا أجزي به يدع شهوته و طعامه من أجلي للصائم فرحتان فرحة عند فطره و فرحة عند لقاء ربه و لخلوف فمه أطيب عند الله من ريح المسك.

(صحيح) ( حم م ن هـ) عن أبي هريرة. (المشكاة ١٩٥٩)

**٢٠٩١- هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد چاکەکەی دە بەرامبەر تا حەوت سەد بەرامبەر خۆی دەبێتەوە، لەوەش زیاتر تا خوای گەورە خۆی دەزانێت، خوای گەورە دەفەرموێت: تەنها ڕۆژوو نەبێت بۆ منە و خۆم پاداشتی دەدەمەوە. حەز و خواردنی خۆی واز لێ دەهێنێ لە پێناو من، ڕۆژووان دوو خۆشی هەیە: خۆشییەك لەکاتی چاوپێکەوتنی خوای خۆی، بۆنی دەمی ڕۆژووانیش لەلای خوا خۆشترە لە بۆنی میسك.**

٢٠٩٢- للصائم فرحتان فرحة حين يفطر و فرحة حين يلقى ربه.

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٩٧٨)

**٢٠٩٢- ڕۆژووان دوو خۆشی هەیە: خۆشییەك لەکاتی بەربانگدا، خۆشییەکیش کاتێك چاوی بەخوای خۆی دەکەوێت.**

٢٠٩٣- للصائمين باب في الجنة يقال له: الريان لا يدخل فيه أحد غيرهم فإذا دخل آخرهم أغلق من دخل فيه شرب و من شرب لم يظمأ أبدا.

(صحيح) ( ن ) عن سهل بن سعد. (الترغيب ٩٧٩)

**٢٠٩٣- ڕۆژووانان دەرگایەکیان هەیە لەبەهەشتدا پێی دەوترێت: (الريان) ئەوان نەبێت کەسی لێوە ناچێتە ژوورەوە، کە دوا کەسیان دەچێتە ژوورەوە دادەخرێت، هەر کەسێك بچێتە ژوورەوە ئاو دەخواتەوە. هەر کەسیش ئاو بخواتەوە لەوێ هەرگیز تینوی نابێت.**

٢٠٩٤- من ختم له بصيام يوم دخل الجنة.

(صحيح) ( البزار ) عن حذيفة. (الصحيحة ١٦٤٥)

**٢٠٩٤- کەسێك کۆتایی بۆ بهێنرێت بەڕۆژوو گرتنی ڕۆژێك دەچێتە بەهەشتەوە.**

٢٠٩٥- من صام رمضان إيمانا و احتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه ( و ما تأخر ).

(صحيح) ( خط ) عن ابن عباس. (الترغيب ٩٩٢)

**٢٠٩٥- هەر کێ ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت بەباوەڕو چاوەڕوانکردنی پاداشتەوە خوای گەورە لەهەرچی گوناهی پێشووتری هەیە خۆش دەبێت.**

٢٠٩٦- من صام رمضان إيمانا و احتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ١٢٤٢)

**٢٠٩٦- هەر کێ ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت بەئیمان و چاوەڕوان کردنی پاداشتەوە خوای گەورە لەگوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت.**

٢٠٩٧- من صام رمضان و صلى الصلوات و حج البيت كان حقا على الله أن يغفر له إن هاجر في سبيل الله أو مكث بأرضه التي ولد فيها.

(حسن) ( ت ) عن معاذ. (الصحيحة ١٩١٣)

**٢٠٩٧- کەسێك ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت و، نوێژەکانی بکات و، حەجی ماڵی خوا بکات خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، ئیتر چی کۆچ بکات لە پێناوی خوادا یان بمێنێتەوە لەو خاکەی کەتیایدا لە دایك بووە.**

٢٠٩٨- من صام يوما في سبيل الله باعد الله بذلك اليوم حر جهنم عن وجهه سبعين خريفا.

(صحيح) ( ن هـ) عن أبي سعيد. (صحيح النسائي ٢٢٥٢)

**٢٠٩٨- هەر کێ ڕۆژێك لە پێناو خوادا ڕۆژوو بگرێت خوای گەورە بلێسەی دۆزەخ لەڕوومەتی دوردەخاتەوە حەفتا پاییز.**

٢٠٩٩- من صام يوما في سبيل الله باعد الله منه جهنم مسيرة مائة عام.

(حسن) ( ن ) عن عقبة بن عامر. (الترغيب ٩٨٨)

**٢٠٩٩- هەر كێ ڕۆژێك لە پێناوی خوادا ڕۆژوو بگرێت خوای گەورە دۆزەخی سەد ساڵ لێدوور دەخاتەوە.**

٢١٠٠- من صام يوما في سبيل الله باعد الله وجهه من جهنم سبعين عاما.

(صحيح) ( ن ) عن أبي سعيد. (صحيح النسائي ٢٢٥٢)

**٢١٠٠- هەر كێ یەك ڕۆژ لە پێناو خوادا ڕۆژوو بگرێت خوای گەورە دەم وچاوی حەفتا ساڵ لەئاگری دۆزەخ دوردەخاتەوە.**

٢١٠١- من صام يوما في سبيل الله بعد الله وجهه عن النار سبعين خريفا.

(صحيح) ( حم ق ت ن ) عن أبي سعيد. (الترغيب ٩٨٩)

**٢١٠١- كەسێك ڕۆژێك لە پێناو خوادا ڕۆژوو بگرێت خوای گەورە دەم و چاوی حەفتا پاییز لەئاگر دوور دەخاتەوە.**

٢١٠٢- من صام يوما في سبيل الله جعل الله بينه و بين النار خندقا كما بين السماء و الأرض.

(صحيح) ( ت ) عن أبي أمامة. (الصحيحة ٥٦٣)

**٢١٠٢- كەسێك ڕۆژێك ڕۆژوو بگرێت لە پێناو خوادا، خوای گەورە لەنێوان ئەو و ئاگردا كەندرێك دروست وەكو ماوەی نێوان ئاسمان و زەوی.**

٢١٠٣- من صام يوما في سبيل الله زحزح الله وجهه عن النار بذلك اليوم سبعين خريفا.

(صحيح) ( حم ت ن هـ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٩٨٩)

**٢١٠٣- كەسێك ڕۆژێك ڕۆژوو بگرێت لە پێناو خوادا خوای گەورە حەفتا ساڵ ڕوومەتی دەخزێنێ دوور لەئاگر بەو تەنها ڕۆژە.**

٢١٠٤- هذا شهر رمضان قد جاءكم تفتح به أبواب الجنة و تغلق فيه أبواب النار و تسلسل فيه الشياطين.

(صحيح) ( حم ن ) عن أنس. (الترغيب ٩٩٨)

**٢١٠٤- ئەوە مانگی ڕەمەزانە هاتە لاتان، دەرگاكانی بەهەشتی تیا دەكرێتەوەو، دەرگاكانی دۆزەخی تیا دادەخرێت و شەیتانەكانی تیا كۆت دەكرێت.**

٢١٠٥- إذا جاء رمضان فتحت أبواب الجنة و غلقت أبواب النار و صفدت الشياطين.

(صحيح) ( ن ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٥٠٧)

**٢١٠٥- کە ڕەمەزان دێت دەرگاکـانی بەهەشـت دەکرێتـەوەو دەرگاکـانی دۆزەخ دادەخـرێن و شەیتانەکان کۆت دەکرێن.**

٢١٠٦- إذا جاء رمضان فتحت أبواب الرحمة و غلقت أبواب جهنم و سلسلت الشياطين.

(صحيح) ( ن ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٥٠٧)

**٢١٠٦- کە ڕەمەزان دێت دەرگاکانی ڕەحمەت دەکرێنـەوە و دەرگاکـانی دۆزەخ دادەخـرێن و شەیتانەکان زنجیر دەکرێن.**

٢١٠٧- إن لله تعالى عتقاء في كل يوم و ليلة لكل عبد منهم دعوة مستجابة.

(صحيح) ( حم ) عن أبي هريرة أو أبي سعيد ( سمويه ) عن جابر . (الترغيب ١٠٠٢)

**٢١٠٧- هەموو ڕۆژو شەوێکی ڕەمەزان خوای گەورە ئازادکراوی هەیە لەدۆزەخ هـەر یـەکێك لەو بەندانە داوایەکی جێبەجێکراوی هەیە.**

٢١٠٨- أليس قد مكث هذا بعده سنة فـأدرك رمـضان فـصامه و صـلى كـذا و كـذا سـجدة في السنة ؟ فلما بينهما أبعد مما بين السماء و الأرض. (الترغيب ٣٧٣)

(صحيح) ( هـ حب هق ) عن طلحة .

**٢١٠٨- ئایا ئەوە دوای ڕەمەزان ساڵێك نەمایەوە و فریای ڕەمـەزان کـەوت و نوێـژی کـردو ئەوەندەو ئەوەندە سوجدەی برد لەساڵەکەدا.**

## بـابەتـی ڕۆژووی ( تطوع ) و ئەو ڕۆژانەی ڕۆژووگرتن تیایاندا قەدەغەیە.

٢١٠٩- أحب الصيام إلى الله صيام داود و كان يصوم يوما و يفطر يومـا و أحـب الـصلاة إلى الله صلاة داود كان ينام نصف الليل و يقوم ثلثه و ينام سدسه. (الإرواء ٤٥٠)

(صحيح) ( حم ق د ن هـ ) عن ابن عمرو .

**٢١٠٩- باشـترین ڕۆژوو لـەلای خـوا ڕۆژووی داودە، ئـەو ڕۆژێـك بـەڕۆژوو دەبـوو، ڕۆژێـك دەیشکاند، باشترین نوێژیش لەلای خوا نوێژی داودە، نیوەی شـەو دەخـەوت و سـێ یـەکی نوێژی دەکردو، شەش یەکی دەخەوت.**

٢١١٠- إذا صمت من الشهر ثلاثا فصم ثلاث عشرة و أربع عشرة و خمس عشرة.

(صحيح) ( حم ت ن حب ) عن أبي ذر . (الترغيب ١٠٣٨)

**٢١١٠- ئەگەر سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بوویت لە مانگەکەدا، سیانزەو چواردەو پانزە بگرە.**

٢١١١- صوموا الشهر و سرره .

(حسن) ( د ) عن معاوية. (صحيح أبي داود ١١٥)

**٢١١١- سەرەتای مانگ و كۆتاییەكەی ڕۆژوو بگرن.**

٢١١٢- إذا كان العام المقبل صمنا يوم التاسع.

(صحيح) ( د ) عن ابن عباس . (المشكاة ٢٠٤١)

**٢١١٢- كە ساڵی داهاتوو هات ڕۆژی نۆیەم بەڕۆژوو دەبین.**

٢١١٣- أفضل الصوم صوم أخي داود كان يصوم يوما و يفطر يوما و لا يفر إذا لاقى.

(صحيح) ( ت ن ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ٣٩٩٠)

**٢١١٣- چاكترین ڕۆژوو ڕۆژووی داودی برامە، ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو ڕۆژێك نەیدەگرت، لەڕوبەرو بوونەوەشدا هەڵنەدەهات.**

٢١١٤- أفضل الصيام بعد رمضان الشهر الذي تدعونه المحرم.

(صحيح) ( ن ) عن جندب . (الإرواء ٤٤٨)

**٢١١٤- چاكترین ڕۆژوو لەدوای ڕەمەزان ئەو مانگەیە كەموحەڕەمی پێ دەڵێن.**

٢١١٥- إن كنت صائما فصم أيام الغر.

(حسن) ( حم ن حب ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٥٦٧)

**٢١١٥- ئەگەر ڕۆژوو دەگریت ڕۆژە سپیەكان بەڕۆژوو بە.**

٢١١٦- إن كنت صائما فعليك بالغر البيض: ثلاث عشرة و أربع عشرة و خمس عشرة.

(حسن) ( ن ) عن أبي ذر . (الصحيحة ١٥٦٧)

**٢١١٦- ئەگەر ڕۆژوو دەگریت ڕۆژە سپیەكان بگرە: سیانزەو چواردەو پانزە.**

٢١١٧- إن اليوم يوم عاشوراء فمن أكل فلا يأكل شيئا بقية يومه و من لم يكن أكل أو شرب فليصم.

(صحيح) ( حب ) عن سلمة بن الأكوع . (الصحيحة ٢٦٢٤)

**٢١١٧- ئەمڕۆ ڕۆژی عاشورایە، هەر كەسێك شتێكی خواردووە، با ئەو دوای ڕۆژەكە هیچ نەخوات، ئەوەشی هیچی نەخواردووە با بە ڕۆژوو بێت.**

٢١١٨- إن عاشوراء يوم من أيام الله فمن شاء صامه و من شاء تركه.

(صحيح) ( حم م ) عن ابن عمر . (الصحيحة ٣٥٣١)

**٢١١٨- عاشورا ڕۆژێكە لەڕۆژەكانی خوا، كەسێك ویستی با بە ڕۆژوو بێت، هەر كێ یش نایەوێت باوازی لێ بهێنێ.**

٢١١٩- إن هذا يوم كان يصومه أهل الجاهلية فمن أحب أن يصومه فليصمه و من أحب أن يتركه فليتركه - يعني يوم عاشوراء -.

(صحيح) ( م ) عن ابن عمر . (الصحيحة ٣٥٤٨)

**٢١١٩- ئەمە ڕۆژێکە خەڵکی لەجاهیلیەتدا بەڕۆژوو دەبوون تیایدا، ئەگەر کەسێك حەز دەکا تێیدا بەڕۆژوو بێت با بەڕۆژوو بێت، هەر کێ یش دەیەویت نەیگرێت باوازی لێ بهێنێ - واتە: ڕۆژی عاشورا-.**

٢١٢٠- ألا أخبركم بما يذهب وحر الصدر ؟ صوم ثلاثة أيام من كل شهر.

(صحيح) ( ن ) عن رجل من الصحابة . (الترغيب ١٠٣٦)

**٢١٢٠- ئاگادارتان بکەم چی کینە و ڕاڕایی دڵ لا دەبات؟ ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێکدا.**

٢١٢١- ثلاث من كل شهر و رمضان إلى رمضان فهذا صيام الدهر كله.

(صحيح) ( م د ن ) عن أبي قتادة . (الإرواء ٩٣٣)

**٢١٢١- سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێکدا، ڕەمەزانیش بۆ ڕەمەزان، وەکو ئەوەیە ساڵەکە هەمووی بەڕۆژوو بوو بێت.**

٢١٢٢- جعل الله الحسنة بعشر أمثالها الشهر بعشرة أشهر و صيام ستة أيام بعد الشهر تمام السنة.

(صحيح) ( أبو الشيخ في الثواب ) عن ثوبان . (الإرواء ٩٣٢)

**٢١٢٢- خوای گەورە چاکەی کردووە بە دە بەرامبەر، مانگیش بە دە مانگ، هەروەها شەش ڕۆژ بە ڕۆژوو بوون پاش ڕەمەزان وەکو بەڕۆژوو بوونە لەهەموو ساڵەکەدا.**

٢١٢٣- خمس من عملهن في يوم كتبه الله من أهل الجنة: من صام يوم الجمعة و راح إلى الجمعة و عاد مريضا و شهد جنازة و أعتق رقبة.

(صحيح) ( ع حب ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ١٠٢٣)

**٢١٢٣- پێنج شت هەن هەرکێ بیکات لەڕۆژێکدا خوای گەورە بەبەهەشتی دەینوسێ: کەسێك ڕۆژی هەینی بەڕۆژوو بێت و، بڕوات بۆ نوێژی جومعە و، سەردانی نەخۆش بکات و، ئامادەی تەرم بێت و، کۆیلە ئازاد بکات.**

٢١٢٤- شهر الصبر و ثلاثة أيام من كل شهر صوم الدهر.

(صحيح) ( ن ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٠٣٢)

**٢١٢٤- مانگی ئارام گرتن و سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێکدا وەکو ڕۆژوو گرتنی هەموو ساڵەکەیە.**

٢١٢٥- صم أفضل الصيام صيام داود صوم يوم و فطر يوم.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمرو. (صحيح النسائي ٢٣٨٩)

**٢١٢٥- باشترين ڕۆژوو بەڕۆژوو بەڕۆژوو داودە، ڕۆژ نەڕۆژێك.**

٢١٢٦- صم شهر الصبر رمضان صم شهر الصبر و ثلاثة أيام من كل شهر ( صم من الحرم و اترك صم من الحرم و اترك صم من الحرم و اترك.

(صحيح) (د هـ) عن الباهلي. (الصحيحة ٢٦٢٣)

**٢١٢٦- مانگى ئارام گرتن ڕەمەزان بەڕۆژوو بە، مانگى ئارامى بەڕۆژوو بە لەگەڵ سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێدا..**

٢١٢٧- صوم ثلاثة أيام من كل شهر و رمضان إلى رمضان صوم الدهر و إفطاره .

(صحيح) ( حم م ) عن أبي قتادة. (الإرواء ٩٤٦)

**٢١٢٧- سێ ڕۆژ ڕۆژوو گرتن لەهەموو مانگێكدا و، ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، وەكو ڕۆژوو گرتن و بەربانگى ساڵێكە.**

٢١٢٨- صوم شهر الصبر و ثلاثة أيام من كل شهر يذهبن وحر الصدر .

(صحيح) ( البزار ) عن علي وابن عباس ( البغوي الباوردي طب ) عن النمر بن تولب. (الإرواء ٩٢٨)

**٢١٢٨- ڕۆژووى مانگى ئارامگرتن و سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێكدا ڕۆژووى هەموو ساڵەكەیە.**

٢١٢٩- صوم شهر الصبر و ثلاثة أيام من كل شهر يذهبن وحر الصدر .

(صحيح) ( البزار ) عن علي وابن عباس ( البغوي الباوردي طب ) عن النمر بن تولب. (الترغيب ١٠٣٢)

**٢١٢٩- ڕۆژووى مانگى ئارام گرتن و سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێكدا، كینەو ڕاڕایى دڵ لا دەبەن.**

٢١٣٠- صوم يوم عرفة كفارة السنة الماضية و السنة المستقبلة .

(صحيح) ( طس ) عن أبي سعيد. (الترغيب ١٠١٠)

**٢١٣٠- ڕۆژووى عەرەفە سڕینەوەى گوناهى ساڵێكى ڕابردوو و، ساڵێكى داهاتووە.**

٢١٣١- صوم يوم عرفة يكفر سنتين ماضية و مستقبلة و صوم عاشوراء يكفر سنة ماضية .

(صحيح) ( حم م ت ) عن أبي قتادة. (الإرواء ٩٣٣)

**٢١٣١- ڕۆژووى عەرەفە گوناهى دوو ساڵ لا دەبات ڕابوردوو و داهاتوو، ڕۆژى عاشوڕایش گوناهى ساڵێكى ڕابردوو لادەبات.**

٢١٣٢- صيام ثلاثة أيام من كل شهر صيام الدهر و إفطاره .

(صحيح) ( حم حب ) عن قرة بن إياس. (الصحيحة ٢٨٠٦)

**٢١٣٢- ڕۆژووی سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێکدا وەکو ڕۆژووی هەموو ساڵەکەیە.**

٢١٣٣- صيام ثلاثة أيام من كل شهر صيام الدهر و هي أيام البيض: صبيحة ثلاث عشرة و أربع عشرة و خمس عشرة .

(حسن) ( ن ع هب ) عن جرير. (الترغيب ١٠٤٠)

**٢١٣٣- ڕۆژووی سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێکدا ، ڕۆژووی ساڵەکەیە و بریتی یە لە ڕۆژە سپیەکان: بەرەبەیانی سیانزەو چواردەو پانزە.**

٢١٣٤- صيام حسن صيام ثلاثة أيام من الشهر .

(صحيح) ( حم ن حب ) عن عثمان بن أبي العاص. (صحيح النسائي ٢٤١١)

**٢١٣٤- ڕۆژوویەکی چاکە سێ ڕۆژ لەمانگێکدا.**

٢١٣٥- صيام شهر رمضان بعشرة أشهر و صيام ستة أيام بعده بشهرين فذلك صيام السنة .

(صحيح) ( حم ن حب ) عن ثوبان. (الترغيب ١٠٠٧)

**٢١٣٥- بەڕۆژوو بوونی مانگی ڕەمەزان بەرامبەر دە مانگە، ڕۆژووی شەش ڕۆژیش دوای ئەوە بەرامبەر دوو مانگە، ئەوە دەکاتە ڕۆژووی هەموو ساڵەکە.**

٢١٣٦- صيام يوم عرفة إني أحتسب على الله أن يكفر السنة التي قبله و السنة التي بعده و صيام يوم عاشوراء إني أحتسب على الله أن يكفر السنة التي قبله .

(صحيح) ( ت حب ) عن أبي قتادة. (الإرواء ٩٣٣)

**٢١٣٦- ڕۆژوو گرتنی عەرەفە ئومێدم هەیە لای خوای گەورە گوناهی ساڵێك ڕابردوو، لەگەڵ ساڵێك داهاتوو بسڕێتەوە، ڕۆژووی عاشورایش داواکارم لەخوای گەورە گوناهی ساڵێکی ڕابردوو بسرێتەوە.**

٢١٣٧- الصوم في الشتاء الغنيمة الباردة .

(حسن) ( حم ع طب هق ) عن عامر بن مسعود ( طس عد هب ) عن أنس ( عد هب ) عن جابر. (الصحيحة ١٩٢٢)

**٢١٣٧- رۆژووگرتن لەزستاندا دەستكەوتێكە لەساردیدا .**

٢١٣٨- الغنيمة الباردة الصوم في الشتاء.

(حسن) ( ت ) عن عامر بن مسعود. (الصحيحة ١٩٢٢)

**٢١٣٨- دەسكەوتی فێنك[٢] (بەر سێبەر) رۆژوو گرتنە لە زستاندا.**

٢١٣٩- عاشوراء يوم العاشر .

(صحيح) ( قط فر ) عن أبي هريرة. (الضعيفة ٢٨٤٩)

**٢١٣٩- عاشورا رۆژی دەیەمە.**

٢١٤٠- كان عاشوراء يوما يصومه أهل الجاهلية فمن أحب منكم أن يصومه فليصمه و من كرهه فليدعه.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٣٥٤٨)

**٢١٤٠- عاشورا رۆژێك بوو خەڵكی لەجاهلیەتدا بەرۆژوو دەبوون تیایدا، هەر كێ بیەوێت ئەو رۆژە بگرێت با بیگرێت، كێ یش پێی خۆش نییە با بەرۆژوو نەبێت.**

٢١٤١- لئن بقيت إلى قابل لأصومن التاسع.

(صحيح) ( م هـ) عن ابن عباس. (صحيح أبي داود ٢١١٣)

**٢١٤١- ئەگەر تا ساڵی داهاتوو بمێنم، رۆژی نۆیەمكیش بەرۆژوو دەبم .**

٢١٤٢- من صام ثلاثة أيام من كل شهر فقد صام الدهر كله.

(صحيح) ( حم ت ن هـ لضياء ) عن أبي ذر. (الإرواء ٩٢٩)

**٢١٤٢- هەر كەس سێ رۆژ لە هەموو مانگێكدا بەرۆژوو بێت، وەكو ئەوەیە هەموو ساڵەكە بەرۆژوو بێت.**

٢١٤٣- من صام رمضان و أتبعه ستا من شوال كان كصوم الدهر.

(صحيح) ( حم م ٤ ) عن أبي أيوب. (الإرواء ٩٣٢)

**٢١٤٣- هەر كێ رەمەزان بەرۆژوو بێت و شەش رۆژ لەشەووال بەدوایدا بگرێت وەكو ئەوەیە هەموو ساڵەكە بەرۆژوو بوو بێت.**

٢١٤٤- من صام ستة أيام بعد الفطر كان تمام السنة ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ﴿١٦٠﴾﴾ (الانعام).

(صحيح) ( هـ ) عن ثوبان. (الترغيب ١٠٠٧)

---

[٢] **واتە دەسكەوتی بێ جەنگ و بێ ئەزیەت.**

**٢١٤٤- هەر كەس شەش رۆژ بەرۆژوو بێت پاش جەژن وەكو ئەوەیە هەموو ساڵەكە رۆژووی گرتبێت: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ﴿١٦٠﴾﴾ (الانعام)**

٢١٤٥- من صام يوم عرفة غفر الله له سنتين: سنة أمامه و سنة خلفه.

(صحيح) ( هـ ) عن قتادة بن النعمان. (الضعيفة ٥\٢٢)

**٢١٤٥- كەسێك رۆژی عەرەفە بەرۆژوو بێت خوای گەورە لەگوناهی دوو ساڵی خۆش دەبێت، ساڵێك لە پێشی و ساڵێك لە پاشی.**

٢١٤٦- نحن أحق و أولى بموسى منكم.

(صحيح) ( حم ق د هـ) عن ابن عباس. (صحيح أبن ماجه ١٧٣٤)

**٢١٤٦- ئێمە مافدارترو لە پێشترین لەئێوە بە موسا.**

٢١٤٧- هذا يوم عاشوراء و لم يكتب الله عليكم صيامه و أنا صائم فمن شاء فليصم و من شاء فليفطر.

(صحيح) ( ق ) عن معاوية.

**٢١٤٧- ئەمە رۆژی عاشورایە، خوای گەورەیش رۆژووی تیایدا فەرز نەكردووە لەسەرتان، خۆیشم بەرۆژووم، كێ پێی خۆشە با بەرۆژوو بێت، هەر كەسیش حەز ناكات با رۆژوو نەگرێت.**

٢١٤٨- لا صوم فوق صوم داود شطر الدهر صم يوما و أفطر يوما.

(صحيح) ( خ ن ) عن ابن عمرو. (الترغيب ١٠٥٠)

**٢١٤٨- رۆژوو نییە لەسەرووی رۆژووی داودەوە نیوەی ساڵ، رۆژێك بەرۆژوو بەو رۆژێك مەیگرە.**

٢١٤٩- يا أبا ذر ! إذا صمت من الشهر ثلاثة أيام فصم ثلاث عشرة و أربع عشرة و خمس عشرة.

(صحيح) ( ت ن ) عن أبي ذر . (الإرواء ٩٢٩)

**٢١٤٩- ئەی ئەبو زەر! ئەگەر سێ رۆژ لەمانگێكدا بەرۆژوو بوویت، سیانزەو چواردەو پانزە بەرۆژوو بە.**

٢١٥٠- إن في الجنة بابا يقال له: الريان يدخل منه الصائمون يوم القيامة لا يدخل منه أحد غيرهم يقال: أين الصائمون ؟ فيقومون فيدخلون منه فإذا دخلوا أغلق فلم يدخل منه أحد.

(صحيح) ( حم ق ) عن سهل بن سعد . (الترغيب ٩٧٩)

**٢١٥٠- دەرگایەك هەیە لەبەهەشتدا رەیانی پێ دەوترێت، رۆژووانان لێوەی دەچنە ژوورەوە لەرۆژی قیامەتدا، كەسی تر جگە لە ئەوان لێی ناچێتە ژوورەوە، دەوترێت: كوا**

**ڕۆژووانـــان؟ ئـــەوانیش هەڵدەســن و لـــەوێوە دەچـــنە ژوری، کەتـــەواو بـــوون دەرگاکـــە دادەخرێت، ئیتر کەس لێیەوە ناچێتە ژورەوە.**

٢١٥١- كان أحب الشهور إليه أن يصومه شعبان ثم يصله برمضان.

(صحيح) ( د ) عن عائشة. (الترغيب ٥٠٨٦)

**٢١٥١- خۆشەویسترین مانگ لەلای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی ڕۆژووی تیـا بگرێت شـەعبان بوو کەبیداتە دەم ڕەمەزانەوە.**

٢١٥٢- كان أكثر ما يصوم الاثنين و الخميس فقيـل لـه ؟ فقـال: الأعمـال تعـرض كـل اثـنين و خميس فيغفر لكل مسلم إلا المتهاجرين فيقول: أخروهما.

(صحيح) ( حم ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٩٣١)

**٢١٥٢- زۆرتر دوو شەممەو پێنج شـەممە بـەڕۆژوو دەبـوو، پێیـان وت؟ فـەرمووی: کردەوەکـان هەموو دوو شەممەو پێنج شەممەیەك دەخرێنە ڕوو، لەو ڕۆژەدا خـوای گـەورە خـۆش دەبێـت لـە هەموو موسوڵمانێك دوو کەس نەبێت کەقسە بەیەکەوەنەکەن، دەوترێت: دوایان بخەن.**

٢١٥٣- كان لا يدع صوم أيام البيض في سفر و لا حضر.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٥٨٠)

**٢١٥٣- پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لەڕۆژووی (الايام البيض) ڕۆژە سپیەکان نەدەهێنا نە لە سەفەر و نە لە ناو شاردا.**

٢١٥٤- كان يتحرى صيام الاثنين و الخميس.

(صحيح) ( ت ن ) عن عائشة. (الإرواء ٩٣١)

**٢١٥٤- پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەڕا بەدوای ڕۆژوو گرتنی دوو شەممەو پێنج شەممە.**

٢١٥٥- كان يصوم الاثنين و الخميس.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٩٣١)

**٢١٥٥- پێغەمبەر ﷺ دوو شەممە و پێنج شەممە بەڕۆژوو دەبوو.**

٢١٥٦- كان يصوم تسع ذي الحجة و يوم عاشوراء و ثلاثة أيـام مـن كـل شـهر: أول اثـنين مـن الشهر و الخميس و الاثنين من الجمعة الأخرى.

(حسن) ( حم د ن ) عن حفصة. (صحيح أبي داود ٢١٠٦)

**٢١٥٦- پێغەمبەر ﷺ نۆی ( ذی الحجة ) بەڕۆژوو دەبوو، هەروەها ڕۆژی عاشوراو، سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێکدا : یەکەم دوو شەممە لە مانگێکدا و، پێنج شەممە و دوو شەممە لە هەفتەی داهاتوو.**

٢١٥٧- كان يصوم من غرة كل شهر ثلاثة أيام و قلما كان يفطر يوم الجمعة.

(حسن) ( ت ) عن ابن مسعود. (المشكاة ٢٠٥٨)

**٢١٥٧- پێغەمبەر ﷺ لەسەرەتای هەموو مانگێك سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو، کەم جاریش جومعان بەڕۆژوو نەدەبوو.**

٢١٥٨- إذا انتصف شعبان فلا تصوموا حتى يكون رمضان.

(صحيح) ( حم ٤ ) عن أبي هريرة . (المشكاة ١٩٧٤)

**٢١٥٨- ئەگەر شعبان نیوە بوو ئیتر تاکو ڕەمەزان ڕۆژوو مەگرن.**

٢١٥٩- إنكم مصبحوا عدوكم و الفطر أقوى لكم فأفطروا.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي سعيد . (صحيح أبي داود ٢٠٨١)

**٢١٥٩- ئێوە سەر لەبەیانی دەچنە سەر دوژمنەکانتان، بەڕۆژوو نەبوونیش بەهێزترتان دەکات بۆیە ڕۆژوو مەگرن.**

٢١٦٠- أنهاكم عن صيام يومين: الفطر و الأضحى.

(صحيح) ( ع ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ٢٣٩٨)

**٢١٦٠- نەهی تان لێ دەکەم لەڕۆژوو گرتنی دوو ڕۆژ: جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان.**

٢١٦١- إياكم و الوصال إنكم لستم في ذلك مثلي إني أبيت يطعمني ربي و يسقيني فاكلفوا من العمل ما تطيقون

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٦٠٤)

**٢١٦١- نەکەن بەدوای یەکدا ڕۆژوو بگرن، ئێوە لەوەدا وەکو من نین، من دەمێنمەوە خوای گەورە خۆی خواردن و خواردنەوەم پێدەدا، بۆیە ئەوەندەی پێتان دەکرێت ئەوە بکەن.**

٢١٦٢- صيام يوم السبت لا لك و لا عليك .

(صحيح) ( حم ) عن امرأة. (الإرواء ٩٤٢)

**٢١٦٢- ڕۆژووی ڕۆژی شەممە نەبۆ تۆیەو نە لە سەرتە.**

٢١٦٣- ليس من البر الصيام في السفر.

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن جابر ( هـ ) عن ابن عمر. (الإرواء ٩٠٧)

**٢١٦٣- چاكە نییە ڕۆژوو گرتن لە سەفەردا.**

٢١٦٤- ليس من البر الصيام في السفر فعليكم برخصة الله التي رخص لكم فاقبلوها.

(صحيح) ( ن حب ) عن جابر. (الترغيب ١١٣٠)

**٢١٦٤- چاكە نییە ڕۆژووگرتن لەسەفەردا، لەسەرتانە ڕوخسەتی خوا وەربگرن كە پێتانی بەخشیوە.**

٢١٦٥- ما بال رجال يواصلون ؟ ! إنكم لستم مثلي أما و الله لو مد لي الشهر لواصلت وصالا يدع المتعمقون تعمقهم.

(صحيح) ( حم م ) عن أنس. (الصحيحة ٣٦٠٤)

**٢١٦٥- ئەوە پیاوانێك بۆچی ڕۆژوو بەسەر یەكەوە دەگرن؟! ئێوە وەكو من نین، سوێند بەخوا ئەگەر مانگەكەم بۆ درێژ بكرایەتەوە ئەبێ بەدەم یەكەوە ڕۆژووم بگرتایە بەشێوەیەك كەقووڵ بووەكان واز لەقوڵبوونەوەی خۆیان بهێنن.**

٢١٦٦- من صام الأبد فلا صام و لا أفطر.

(صحيح) ( حم ن هـ ك ) عن عبدالله بن الشخير. (الترغيب ١٠٥٠)

**٢١٦٦- ئەگەر كەسێك هەمیشە بەڕۆژوو بێت، نەڕۆژوو دەگرێت و نەدەیشكێنێ.**

٢١٦٧- نهى أن يفرد يوم الجمعة بصوم.

(صحيح) ( حم ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٢٠٩١)

**٢١٦٧- پێغەمبەر ﷺ نەهی كردووە لەوەی تەنها جومعە تاك بكرێتەوە بۆ ڕۆژوو گرتن.**

٢١٦٨- نهى عن الوصال.

(صحيح) ( ق ) عن ابن عمر وأبي هريرة وعائشة. (صحيح أبي داود ٢٠٤٣)

**٢١٦٨- پێغەمبەر ﷺ نەهی كردووە لەوەی ڕۆژوو بەبەردەوامی بگردرێت.**

٢١٦٩- لا تصم المرأة و بعلها شاهد إلا بإذنه غير رمضان و لا تأذن في بيته و هو شاهد إلا بإذنه و ما أنفقت من كسبه من غير أمره فإن نصف أجره له.

(صحيح) ( حم ق د ت هـ ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٢١٢١)

**٢١٦٩- ئافرەت ڕۆژوو نەگرێت بە بێ مۆڵەتی مێردەکەی جگە لە ڕۆژووی ڕەمەزان، ڕێگە بەهاتنە ژوورەوەی کەسیش نەدات بەبێ مۆڵەتی پیاوەکەی ئەگەر ئامادە بێت، هەر چییەکیش ببەخشێت لەماڵی مێردەکەی بەبێ فەرمانی ئەو، نیوەی پاداشتەکەی دەست دەکەوێت.**

٢١٧٠- لا تصوموا هذه الأيام أيام التشريق فإنها أيام أكل و شرب.

(صحيح) ( حم ن ) عن حمزة بن عمرو الأسلمي ( حم ك ) عن بديل بن ورقاء. (الصحيحة ١٢٨٢)

**٢١٧٠- ئەو ڕۆژانە بەڕۆژوو مەبن، ڕۆژانی تەشریق، چونکە ڕۆژی خواردن و خواردنەوەیە.**

٢١٧١- لا تصوموا يوم الجمعة إلا و قبله يوم أو بعده يوم.

(صحيح) ( حم ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٩٨١)

**٢١٧١- ڕۆژوو مەگرن لەڕۆژی جومعە، مەگەر ڕۆژێك لە پێشی یان لە پاشی بگرن.**

٢١٧٢- لا يصومن أحدكم يوم الجمعة إلا أن يصوم يوما قبله أو يوما بعده.

(صحيح) ( ق ٤ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٩٨١)

**٢١٧٢- کەسێك لەئێوە با ڕۆژی هەینی بەڕۆژوو نەبێت، مەگەر ڕۆژێك لە پێشی یان لە پاشی لەگەڵیدا بگرێت.**

٢١٧٣- لا تصوموا يوم الجمعة مفردا.

(صحيح) ( حم ن ك ) عن جنادة الأزدي. (الصحيحة ٩٨١)

**٢١٧٣- ڕۆژی جەمعە بەتەنها خۆی بەڕۆژوو مەبن.**

٢١٧٤- لا تصوموا يوم السبت إلا في فريضة و إن لم يجد أحدكم إلا عود كرم أو لحاء شجرة فليفطر عليه.

(صحيح) ( حم د هـ ك ) عن الصماء بنت بسر. (الإرواء ٩٤٢)

**٢١٧٤- ڕۆژی شەممە بەڕۆژوو مەبن ئەگەر ڕەمەزان نەبێت، ئەگەر کەسێکتان هەر هیچی دەست نەکەوت دارە مێوێك یان توێکڵی دارێك نەبێت با بیخوات.**

٢١٧٥- لا صام من صام الأبد.

(صحيح) ( ق ن هـ ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٢٨٥٥)

**٢١٧٥- ڕۆژووی نەگرت ئەو کەسەی هەمیشە بەڕۆژوو بوو.**

٢١٧٦- لا صام من صام الدهر صوم ثلاثة أيام صوم الدهر كله.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٢٨٥٥)

**٢١٧٦- ڕۆژووی نەگرت ئەو کەسەی هەموو ساڵەکەی بەڕۆژوو بوو وەکو ڕۆژوو گرتنی سێ ڕۆژ.**

٢١٧٧- لا وصال في الصوم.

(صحيح) ( الطيالسي ) عن جابر. (الصحيحة ٢٨٩٤)

**٢١٧٧- بەدوای یەکدا بەڕۆژوو بوون قەدەغەیە.**

٢١٧٨- لا يصلح الصيام في يومين: يوم الأضحى و يوم الفطر من رمضان.

(صحيح) ( م ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٢٣٩٨)

**٢١٧٨- ڕۆژوو لەدوو ڕۆژدا ڕەوا نییە: جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزان.**

٢١٧٩- يا عبد الله ! ألم أخبر أنك تصوم النهار و تقوم الليل ؟ فلا تفعل فإنك إذا فعلت ذلك هجمت عينك و نفهت نفسك فصم و أفطر و قم و نم فإن لجسدك عليك حقا و إن لعينيك عليك حقا و إن لزوجك عليك حقا و إن بحسبك أن تصوم من كل شهر ثلاثة أيام فإن لك بكل حسنة عشر أمثالها فإذن ذلك صيام الدهر كله " قال: إني أجد قوة قال: فصم صيام نبي الله داود و لا تزد عليه نصف الدهر.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٧٠٧)

**٢١٧٩- ئەی بەندەی خوا! ئایا تۆ نیت بەڕۆژوو دەبیت و شەو نوێژ دەکەی؟ ئەو کارە مەکە، چونکە ئەگەر وا بکەیت چاوەکانت دەچنە خوارەوەو لاشەت ماندوو دەبێت، بۆیە ڕۆژوو بگرەو مەشیگرە، شەو نوێژ بکە و جار جارەیش مەیکە، چونکە لەشت مافی هەیە بەسەرتەوە، چاوەکانیشت هەر مافیان هەیە بەسەرتەوە. خێزانەکەتیش مافی هەیە بەسەرتەوە. بەسە لەهەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت، چونکە هەموو چاکەیەکت بە دە چاکە بۆ دەنوسرێت، کەواتە ئەوە ڕۆژووی هەموو ساڵەکەیە، وتی: من لەوە بەهێزترم، فەرمووی: کەواتە ڕۆژووی داود بگرە، ئیتر نیوەی تری ساڵەکە مەخەرە سەری.**

٢١٨٠- يا عثمان ! أرغبت عن سنتي ؟ ! فإني أنام و أصلي و أصوم و أفطر و أنكح النساء فاتق الله يا عثمان ! فإن لأهلك عليك حقا و إن لضيفك عليك حقا و إن لنفسك عليك حقا فصم و أفطر و صل و نم.

(صحيح) ( د ) عن عائشة. (الإرواء ٢٠٧٥)

**٢١٨٠- ئەى عوسمان: ئايا لاتداوە لەسوننەتى من؟! چونكە من دەخەوم و نويَژ دەكەم، رۆژوو دەگرم و ناشيگرم و، ئافرەتيش مارە دەكەم، بۆيە لەخوا بترسە ئەى عوسمان! چونكە خاوو خيَزانەكەت مافيان هەيە بەسەرتەوە، ميوانەكەشت مافى هەيە بەسەرتەوە، خۆيشت مافت بەسەر خۆتەوە هەيە، جا رۆژوو بگرەو جار جارەيش مەيگرە، شەو نويَژ بكە و، بشخەوە.**

٢١٨١- لا تقدموا شهر رمضان بصوم قبله بيوم أو يومين إلا أن يكون رجل كان يصوم صوما فليصمه.

(صحيح) ( حم م ٤ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٣٩٨)

**٢١٨١- پيَش رەمەزان بەرۆژيَك و دوو رۆژ رۆژوو مەگرن، مەگەر كەسيَك لەگەلْ رۆژووەكەى خۆى ريَككەويَت.**

٢١٨٢- نهى عن صيام يوم قبل رمضان و الأضحى و الفطر و أيام التشريق.

(صحيح) ( هق ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٣٨٩)

**٢١٨٢- پيَغەمبەر ﷺ نەهى كردووە لە رۆژوو گرتنى رۆژيَك پيَش رەمەزان و جەژنى قوربان و جەژنى رەمەزان و رۆژانى تەشريق.**

## بابەتى ئيعتيكاف و شەو نويَژى رەمەزان

٢١٨٣- أما بعد فإنه لم يخف على شأنكم الليلة و لكني خشيت أن يفرض عليكم صلاة الليل فتعجزوا عنها.

(صحيح) ( م ) عن عائشة . (صلاة التراويح ١١)

**٢١٨٣- لەدواى ئەوەش: من مەسەلەى ئيَوەم لىَ شاراوە نەبوو ئەمشەو، بەلاَم ترسام شەو نويَژتان لەسەر فەرز بكريَت و ئيَوەيش نەتوانن.**

٢١٨٤- رأيت الذي صنعتم فلم يمنعني من الخروج إليكم إلا أني خشيت أن تفرض عليكم.

(صحيح) ( مالك ن ) عن عائشة. (صلاة التراويح ١١)

**٢١٨٤- ئەوەى ئيَوە كردتان بينيم، هيچ ريَگريش نەبوو لەبەردەم دەرچوونم بۆ لاتان ئەوە نەبيَت ترسام فەرز بكريَتە سەرتان.**

٢١٨٥- من صام رمضان إيمانا و احتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٨٩٨)

**٢١٨٥- هەر كێ شەو نوێژی ڕەمەزان بكات، بەئیمان و چاوەڕوانكردنی پاداشتەوە خوای گەورە لە گوناهەكانی پێشووی خۆش دەبێت.**

٢١٨٦- من قام ليلة القدر إيمانا و احتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه.

(صحيح) ( خ ٣ ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٩٩٢)

**٢١٨٦- هەركێ دانیشت بۆ (ليلة القدر) بە ئیمان و چاوەڕوانكردنی پاداشتەوە خوای گەورە لە گوناهەكانی پێشووی خۆش دەبێت.**

٢١٨٧- كان إذا أراد أن يعتكف صلى الفجر ثم دخل معتكفه.

(صحيح) ( د ت ) عن عائشة. (المشكاة ٢١٠٤)

**٢١٨٧- كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بیوستبا ئیعتیكاف بكات نوێژی بەیانی دەكرد و دەرچووە جێگای ئیعتیكافەكەی.**

٢١٨٨- كان إذا دخل العشر شد مئزره و أحيا ليله و أيقظ أهله.

(صحيح) ( ق د ن هـ ) عن عائشة. (المشكاة ٢٠٩٠)

**٢١٨٨- كە دە شەوی كۆتایی ڕەمەزان دەهات، پێغەمبەر ﷺ قولی لێ هەڵدەماڵی و شەوەكانی زیندوو دەكردەوە.**

٢١٨٩- كان إذا كان مقيما اعتكف العشر الأواخر من رمضان و إذا سافر اعتكف من العام المقبل عشرين.

(صحيح) ( حم ) عن أنس . (الصحيحة ١٤١٠)

**٢١٨٩- پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لەمەدینە بوایە، دە شەوی كۆتایی ڕەمەزان ئیعتیكافی دەكرد، ئەگەریش لەسەفەردا بوایە ساڵی دوای ئەوە بیست ڕۆژ ئیعتیكافی دەكرد.**

٢١٩٠- كان يجتهد في العشر الأواخر ما لا يجتهد في غيرها.

(صحيح) ( حم م ت ) عن عائشة. (الصحيحة ١١٢٣)

**٢١٩٠- پێغەمبەر ﷺ لە دە شەوی كۆتاییدا كۆششی دەكرد، زیاتر لەكۆشش كردنی لەهەر جێگەیەكدا.**

٢١٩١- أتاكم شهر رمضان شهر مبارك فرض الله عليكم صيامه تفتح فيه أبواب الجنة و تغلق فيه أبواب الجحيم و تغل فيه مردة الشياطين و فيه ليلة هي خير من ألف شهر من حرم خيرها فقد حرم.

(صحيح) ( حم ن هب ) عن أبي هريرة . (المشكاة ١٩٦٢)

**٢١٩١- وا مـانگی ڕەمـەزان هاتـە لاتـان، مـانگێکی پـیرۆزە، خـوای گـەورە ڕۆژوو گرتنـی تیایدا فـەرز کـردووە لەسـەرتـان، دەرگـاکـانی بەهەشـتی تیـا دەکرێتـەوە و، دەرگـاکـانی دۆزەخی تیا دادەخرێت و، شەیتانە سەر کەشەکان تیایدا کۆت دەکـرێن، شـەوێکی تیایـە چاکترە لەهەزار شەو، هەر کەسێك بێ بەش بێت لەچاکەکەی خۆی بێ بەشە.**

٢١٩٢- أرى رؤياكم قد تواطأت في السبع الأواخر فمن كان متحريها فليتحرها في السبع الأواخر.

(صحيح) ( مالك حم ق ) عن ابن عمر . (المشكاة ٢٠٨٤)

**٢١٩٢- دەبینم خەونەکانتان ڕێککەوتوون لەسەر حەوت شەوی کۆتـایی، جا هـەر کەسـێك بۆی دەگەڕێت، با لەو شەوانەدا بۆی بگەڕێت.**

٢١٩٣- أريت ليلة القدر ثم أنسيتها و أراني صبيحتها أسجد في ماء و طين.

(صحيح) ( م ) عن عبدالله بن أنيس . (الصحيحة ٣٩٨٥)

**٢١٩٣- (ليله القدر)م پێ پیشاندراو لە بیرم چوو، بە بەیانییەکەیدا لەخەونمدا بینـیم لەناو ئاو و قوڕدا سوجدە دەبەم.**

٢١٩٤- أريت ليلة القدر ثم أيقظني بعض أهلي فنسيتها فالتمسوها في العشر الغوابر.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٩٨٥)

**٢١٩٤- (ليلـه القـدر)م پـێ پیـشـاندرا، ئینجـا یـەکێك لەکـەس و کارەکـانم بـەئاگای کردمەوە، بۆیە لە دە شەوی کۆتـاییدا بۆی بگەڕێن.**

٢١٩٥- اطلبوا ليلة القدر في العشر الأواخر فإن غلبتم فلا تغلبوا في السبع البواقي.

(صحيح) ( عم ) عن علي . (الصحيحة ١٤٧١)

**٢١٩٥- بۆ (ليله القدر) بگەڕێن لـە دە شـەوی کۆتـاییـدا، ئەگـەر هـەر تواناتـان نـەبوو، حەوت شەوی کۆتـایی لەدەست خۆتـان دەرمەکەن.**

٢١٩٦- اطلبوا ليلة القدر في العشر الأواخر في تسع يبقين و سبع يبقين و خمس يبقين و ثلاث يبقين.

(صحيح) ( حم ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ١٤٧١)

**٢١٩٦- لە دە شەوی کۆتـاییدا بگەڕێن بۆ (ليله القدر)، نۆ شەوی بمێنـێ و حـەوت شـەوی بمێنێ ون پێنج شەوی بمێنێ و، سێ شەوی بمێنێ.**

٢١٩٧- اطلبوا ليلة القدر في العشر الأواخر من رمضان.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس . (صحيح أبي داود ١٢٥٠)

**٢١٩٧- بۆ (ليله القدر) بگەڕێن لە دە شەوی کۆتـاییدا لەڕەمەزان .**

٢١٩٨- التمسوا ليلة القدر آخر ليلة من رمضان.

(صحيح) ( ابن نصر ) عن معاوية . (الصحيحة ١٤٧١)

**٢١٩٨- بگەڕێن بۆ (ليله القدر) لە شەوى كۆتايى ڕەمەزاندا.**

٢١٩٩- التمسوا ليلة القدر في العشر الأواخر من رمضان في وتر فإني قد رأيتها فنسيتها.

(صحيح) ( حم طب الضياء ) عن جابر بن سمرة . (الصحيحة ١٤٧١)

**٢١٩٩- بگەڕێن بۆ (ليله القدر) لە تاكەكانى دە شەوى كۆتايى ڕەمەزاندا، چونكە پێم پيشاندرا و لەبيرم چووەوە.**

٢٢٠٠- التمسوا ليلة القدر ليلة سبع و عشرين.

(صحيح) ( طب ) عن معاوية . (الصحيحة ١٤٧١)

**٢٢٠٠- چاوەڕوانى (ليله القدر) بن لەشەوى بيست و حەوتدا.**

٢٢٠١- التمسوها في العشر الأواخر فإن ضعف أحدكم أو عجز فلا يغلبن على السبع البواقي.

(صحيح) ( م ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١٤٧١)

**٢٢٠١- چاوەڕوانى (ليله القدر) بكەن لە دە شەوى كۆتاييدا، ئەگەر كەسێكتان لاواز بوو يان تواناى نەما لە حەوت شەوى كۆتايى لە دەست خۆى با دەر نەكات.**

٢٢٠٢- التمسوها في العشر الأواخر: في تسع تبقين أو سبع تبقين أو خمس تبقين أو ثلاث تبقين أو آخر ليلة.

(صحيح) ( حم ت ك هب ) عن أبي بكرة . (المشكاة ٢٠٩٢)

**٢٢٠٢- چاوەڕوانى (ليله القدر) بكەن لە بيست و يەك و بيست و سێ و، بيست و پێنج و بيست و حەوت و شەوى كۆتايى ڕەمەزان.**

٢٢٠٣- التمسوها في العشر الأواخر من رمضان: في تاسعة تبقى و في سابعة تبقى و في خامسة تبقى.

(صحيح) ( حم خ د ) عن ابن عباس . (صحيح أبي داود ١٢٥٠)

**٢٢٠٣- چاوەڕوانى بن لە دە شەوى كۆتايى ڕەمەزاندا: كاتێك نۆ شەوى دەمێنێ و، حەوت شەوى دەمێنێ و پێنج شەوى دەمێنێ.**

٢٢٠٤- التمسوها في العشر الأواخر من رمضان و التمسوها في التاسعة و السابعة و الخامسة.

(صحيح) ( د ) عن أبي سعيد . (صحيح أبي داود ١٢٥٢)

**٢٢٠٤- چاوەڕوانى بن لە دە شەوى كۆتايى ڕەمەزاندا، هەروەها چاوەڕێى بكەن لە نۆو، حەوت و، پێنج دا.**

٢٢٠٥- إن هذا الشهر قد حضركم و فيه ليلة خير من ألف شهر من حرمها فقد حرم الخير كله و لا يحرم خيرها إلا محروم.

(حسن) ( هـ ) عن سعيد . (المشكاة ١٩٦٤)

**٢٢٠٥- ئەم مانگە هاتە لاتان و، شەوێكى تيايە چاكترە لە هەزار شەو، هەر كێ لێى بێ بەش بێت لەهەموو چاكەيەك بێ بەش بووە، هەناسە سارديش نەبێت كەس لێى بێ بەش نابێت.**

٢٢٠٦- إني أريت ليلة القدر ثم أنسيتها فالتمسوها في العشر الأواخر في الوتر و إني رأيت أني أسجد في ماء و طين من صبيحتها.

(صحيح) ( مالك حم ق ن هـ ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ٣٩٨٥)

**٢٢٠٦- من (ليله القدر)م پێ پيشاندرا و دوايى لەيادم ڕۆيشت، بۆيە داواى بكەن لە دە شەوى كۆتاييدا، لە تاكەكان، من لەخەونمدا بينيم لە بەرەبەيانەكەيدا سوجدە دەبەم لەناو ئاو و قوڕدا.**

٢٢٠٧- إني خرجت لأخبركم بليلة القدر و إنه تلاحى فلان و فلان فرفعت و عسى أن يكون خيرا لكم فالتمسوها في السبع و التسع و الخمس.

(صحيح) ( حم خ ) عن عبادة بن الصامت . (الصحيحة ٣٩٥٢)

**٢٢٠٧- من دەرچووم بۆ ئەوەى ئاگادارتان بكەمەوە لەكاتى (ليله القدر) جا فلان و فلان ناكۆكييان كەوتە نێوان و ئيتر هەواڵە كە بەرز كرايەوە بەڵكو ئەوەش باشتر بێت بۆتان، بۆيە چاوەڕوانى بكەن لەحەوت و نۆ و پێنج دا.**

٢٢٠٨- تحروا ليلة القدر فمن كان متحريها فليتحرها في ليلة سبع و عشرين.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عمر . (صحيح أبي داود ١٢٥٣)

**٢٢٠٨- بگەڕێن بۆ (ليله القدر)، هەر كێ بەتەمايە با كۆشش بكات بۆ شەوى بيست و حەوت.**

٢٢٠٩- تحروا ليلة القدر في السبع الأواخر.

(صحيح) ( مالك م د ) عن ابن عمر . (صحيح أبي داود ١٢٥٣)

**٢٢٠٩- بگەڕێن بۆ (ليله القدر) لە حەوت شەوى كۆتايى دا.**

٢٢١٠- تحروا ليلة القدر في الوتر من العشر الأواخر من رمضان

(صحيح) ( حم ق ت ) عن عائشة . (الصحيحة ٣٦١٦)

**٢٢١٠- بگەڕێن بۆ (ليله القدر) لە تاكەكانى دە شەوى كۆتايى ڕەمەزاندا.**

٢٢١١- تحروا ليلة القدر ليلة ثلاث و عشرين.

(صحيح) ( طب ) عن عبدالله بن أنيس . (صحيح أبي داود ١٢٤٩)

**٢٢١١- بگەڕێن بۆ (ليله القدر) لەشەوی بیست و سێ دا.**

٢٢١٢- خرجت و أنا أريد أن أخبركم بليلة القدر فتلاحى رجلان فاختلجت مني فاطلبوها في العشر الأواخر: في سابعة تبقى أو تاسعة تبقى أو خامسة تبقى.

(صحيح) ( الطيالسي ) عن عبادة بن الصامت . (الصحيحة ٣٩٥٢)

**٢٢١٢- دەرچووم و دەمەویست ئاگادارتان بکەمەوە لە کاتی (ليله القدر) ئیتر دوو پیاو شەڕیان کرد و جنێویان بەیەکتردا، ئیتر منیش لەبیرم چوو، بۆیە هەوڵی بۆ بدەن لە دە شەوی کۆتاییدا: کاتێك ڕەمەزان حەوتی دەمێنێ، یان نۆی دەمێنێ، یان پێنجی دەمێنێ.**

٢٢١٣- صبيحة ليلة القدر تطلع الشمس لا شعاع لها كأنها طست حتى ترتفع.

(صحيح) ( حم م ٣ ) عن أبي. (المشكاة ٢٠٨٨)

**٢٢١٣- بەرەبەیانی شەوی قەدر خۆر دەردەچێت و تیشکی نییە دەڵێی تەشتە تاکو بەرز دەبێتەوە.**

٢٢١٤- ليلة القدر في العشر الأواخر في الخامسة أو الثالثة.

(صحيح) ( حم ) عن معاذ. (الصحيحة ١٤٧١)

**٢٢١٤- شەوی قەدر لە دە شەوی کۆتاییدایی لە پێنجەم یان لە سێ یەم.**

٢٢١٥- ليلة القدر ليلة بلجة لا حارة و لا باردة و لا سحاب فيها و لا مطر و لا ريح و لا يرمى فيها بنجم و من علامة يومها تطلع الشمس لا شعاع لها .

(صحيح) ( طب ) عن واثلة. (الضعيفة ٤٤٠٤)

**٢٢١٥- شەوی قەدر شەوێکی پرشنگدارە، نە گەرمە و نەساردە، ئەستێرەشی تیا نا هاوێژرێت، نیشانەی ڕۆژەکەشی ئەوەیە خۆر هەڵدێت و تیشکی نییە.**

٢٢١٦- ليلة القدر ليلة سابعة أو تاسعة و عشرين إن الملائكة تلك الليلة في الأرض أكثر من عدد الحصى.

(حسن) ( حم ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٢٠٥)

**٢٢١٦- شەوی قەدر شەوی بیست و حەوتە یان بیست و نۆیە، فریشتەکان لەو شەوەدا لەسەر زەوی لەژمارەی چەو زۆرترە.**

٢٢١٧- ليلة القدر ليلة سبع و عشرين.

(صحيح) ( د ) عن معاوية. (الصحيحة ١٤٧١)

**٢٢١٧- شەوی قەدر شەوی بیست و حەوتە.**

٢٢١٨- ليلة القدر ليلة سمحة طلقة لا حارة و لا باردة تصبح الشمس صبيحتها ضعيفة حمراء.

(صحيح) ( الطيالسي هب ) عن ابن عباس. (الضعيفة ٤٤٠٤)

**٢٢١٨- شەوی قەدر شەوێكی ئاسانی خۆشە، نە گەرمە و نە ساردە، خۆر سەر لە بەیانییەكەی سور و لاواز دەبێت.**

٢٢١٩- يا أيها الناس إنها كانت أبينت لي ليلة القدر و إني خرجت لأخبركم بها فجاء رجلان يحتقان و معهما الشيطان فنسيتها فالتمسوها في العشر الأواخر من رمضان التمسوها في التاسعة و السابعة و الخامسة.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٢٥٩٢)

**٢٢١٩- خەڵكینە من كاتی شەوی قەدرم پێ ڕاگەیانرا بوو، ئینجا من دەرچووم كە ئاگادارتان بكەمەوە، دوو پیاو هاتن و مشت و مڕیان دەكرد و، شەیتانیان لەگەڵ بوو، منیش لەیادم چوو، بۆیە داوای بكەن لە دە شەوی كۆتایی ڕەمەزان، لەنۆیەم و حەوتەم و پێنجەم.**




## بابەتی فەزڵی حەج و عەمرە

٢٢٢٠- أبشروا هذا ربكم قد فتح بابا من أبواب السماء يباهي بكم الملائكة يقول: انظروا إلى عبادي قد قضوا فريضة و هم ينظرون أخرى.

(صحيح) ( حم هـ ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ٦٦١)

**٢٢٢٠- مژدەتان لێ بێت، خوای ئێوە، دەرگاکانی ئاسمانی کردەوە، شانازیتان پێوە دەکات لای فریشتەکان، دەفەرمووێت: بڕوانن بۆ بەندەکانم، فەرزێکیان بەجێهێنا و چاوەڕوانی یەکێکی ترن.**

٢٢٢١- أديموا الحج و العمرة فإنهما ينفيان الفقر و الذنوب كما ينفي الكير خبث الحديد.

(صحيح) ( الدارقطني في الأفراد طس ) عن جابر . (الصحيحة ١٠٨٥)

**٢٢٢١- حەج و عومرە بەدوای یەکدا بکەن، چونکە هەژاری و گوناه لا دەبەن، وەکو چۆن ئاگر پیسی ئاسن لا دەبات.**

٢٢٢٢- استمتعوا من هذا البيت فإنه قد هدم مرتين و يرفع في الثالثة.

(صحيح) ( طب ك ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١٤٥١)

**٢٢٢٢- ڕابواردن بکەن بەماڵی خواوە، چونکە دوو جار ڕوخێنراوە و، لەسێیەم جار بەرز دەکرێتەوە.**

٢٢٢٣- أفضل الأعمال الإيمان بالله وحده ثم الجهاد ثم حجة برة تفضل سائر الأعمال كما بين مطلع الشمس إلى مغربها.

(صحيح) ( طب ) عن ماعز . (الترغيب ٦٣٦٧)

**٢٢٢٣- چاكترين كردەوە باوەڕ هێنانە بەخوای تاك و تەنيا، ئينجا جيهاد، ئينجا حەجێكی چاك، لەكردەوەكانی تر چاكترە ئەوەندەی ماوەی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا.**

٢٢٢٤- أقيموا الصلاة و آتوا الزكاة و حجوا و اعتمروا و استقيموا يستقم بكم.

(حسن) ( طب ) عن سمرة . (الترغيب ٧٤٦)

**٢٢٢٤- نوێژەكانتان بەجوانی بكەن و، زەكات بدەن و، حەج و عومرە بكەن و، بەردەوام بن، تاكو بەردەواميتان پێ ببەخشرێت.**

٢٢٢٥- أما خروجك من بيتك تؤم البيت الحرام فإن لك بكل وطأة تطؤها راحلتك يكتب الله لك بها حسنة و يمحو عنك بها سيئة" و أما وقوفك بعرفة فإن الله عز و جل ينزل إلى السماء الدنيا فيباهي بهم الملائكة فيقول: هؤلاء عبادي جاءوني شعثا غبرا من كل فج عميق يرجون رحمتي و يخافون عذابي و لم يروني فكيف لو رأوني ؟ فلو كان عليك مثل رمل عالج أو مثل أيام الدنيا أو مثل قطر السماء ذنوبا غسلها الله عنك" و أما رميك الجمار فإنه مدخور لك" و أما حلقك رأسك فإن لك بكل شعرة تسقط حسنة فإذا طفت بالبيت خرجت من ذنوبك كيوم ولدتك أمك.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمر . (الترغيب ١١١٢)

**٢٢٢٥- دەرچوونت لەماڵی خۆت بەرەو ماڵی خواو، بەهەموو هەنگاوێكی وڵاخەكەت چاكەیەكت بۆ دەنوسرێ و خراپەیەكت لەسەر دەسڕێتەوە، وەستا نيشت لەعەرەفە، خوای گەورە دادەبەزێ بۆ ئاسمانی دونيا و شانازی دەكات بەئێوەوە لای فريشتەكان دەفەرموێت: ئەوانە بەندەكانی منن، بەئاڵۆزاوی و خۆڵاوی لەجێگايەكی دوورەوە هاتوون بۆ لام، بەئومێدی بەزەيی و لەترسی سزای من، منيشيان نەبينيوە، ئەی چۆن ئەگەر منيان ببينايە؟ ئەگەر ئەوەندەی خۆڵی عاليج ، يان وەكو ڕۆژەكانی دونيا و دڵۆپەكانی ئاسمان گوناهت هەبێت خوای گەورە لەسەرتی دەسڕێتەوە، بەردە بارانكردنيشت بۆ شەيتان ئەوە كارێكە پاریزراوە بۆت، سەرتاشينەكەتيش، بە كەوتنی هەموو موويەك چاكەیەكت بۆ دەنوسرێت، ئەگەر تەواف يشت كرد بەدەوری كەعبەدا، لەگوناهەكانت دەردەچيت وەكو ئەو ڕۆژەی لەدايك بوويتە.**

٢٢٢٦- إن الحج و العمرة لمن سبيل الله و إن عمرة في رمضان تعدل حجة.

(صحيح) ( ك ) عن أم معقل . (الإرواء ٨٦٩)

**٢٢٢٦- بەڕاستی حەج و عومرە لە ڕای خوادان ، بێگومان عومرە لە ڕەمەزاندا بەرامبەری حەجێكە.**

٢٢٢٧- إن لك من الأجر على قدر نصبك و نفقتك.

(صحيح) ( ك ) عن عائشة . (الترغيب ١١١٦)

**٢٢٢٧- بەگوێرەی ماندوو بون و خەرجیت پاداشتت دەست دەکەوێت.**

٢٢٢٨- ألا أدلك على جهاد لا شوكة فيه ؟ حج البيت

(صحيح) ( طب ) عن الشفاء . (الترغيب ١٠٩٨)

**٢٢٢٨- ئایا جیهادێکی بێ ئازارت پیشان بدەم؟ حەجی ماڵی خوا.**

٢٢٢٩- إذا رميت الجمار كان لك نورا يوم القيامة.

(حسن) ( البزار ) عن ابن عباس . (الصحيحة ٢٥١٥)

**٢٢٢٩- کە بەردەکان فڕێدەدەیت، دەبنە ڕووناکی بۆت لەڕۆژی قیامەتدا.**

٢٢٣٠- تابعوا بين الحج و العمرة فإن متابعة بينهما تنفي الفقر و الذنوب كما ينفي الكير خبث الحديد.

(صحيح) ( هـ ) عن عمر . (الصحيحة ١٢٠٠)

**٢٢٣٠- حەج و عومرە بەدوایی یەکدا بکەن، چونکە ئەو کارە، هەژاری وگوناه لادەبات وەکو چۆن ئاگر پیسی ئاسن لادەبات.**

٢٢٣١- تابعوا بين الحج و العمرة فإنهما ينفيان الذنوب كما ينفي الكير خبث الحديد.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٢٠٠)

**٢٢٣١- بەدوای یەکدا حەج و عومرە ئەنجام بدەن، چونکە ئەو دوو کارە گوناه لا دەبەن وەکو چۆن ئاگر پیسی ئاسن لا دەبات.**

٢٢٣٢- تابعوا بين الحج و عمرة فإنهما ينفيان الفقر و الذنوب كما ينفي الكير خبث الحديد و الذهب و الفضة و ليس للحجة المبرورة ثواب إلا الجنة.

(صحيح) ( حم ت ن ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٢٠٠)

**٢٢٣٢- حەج و عومرە بەدوایی یەکدا بکەن، چونکە ئەو کارە، هەژاری وگوناه لادەبات وەکو چۆن ئاگر پیسی ئاسن و ئاڵتوون و زیو لادەبات، حەجی چاکیش پاداشتی نییە جگە لە بەهەشت.**

٢٢٣٣- جهادكن الحج.

(صحيح) ( خ ) عن عائشة . (الإرواء ٩٦٣)

**٢٢٣٣- جیهادی ئێوە ئەی ئافرەتان حەجە.**

٢٢٣٤- الحاج: الشعث التفل.

(حسن) ( ت ) عن ابن عمر . (المشكاة ٢٥٢٧)

**٢٢٣٤- حاجی کەسێکی ئاڵۆزاوە بۆنی خۆش لەخۆی نادات.**

٢٢٣٥- الحج المبرور ليس له جزاء إلا الجنة.

(حسن) ( طب ) عن ابن عباس ( حم ) عن جابر . (الإرواء ٧٦٩)

**٢٢٣٥- حەجی چاك پاداشتی نییە بەهەشت نەبێت.**

٢٢٣٦- الحج جهاد كل ضعيف.

(حسن) ( هـ ) عن أم سلمة . (الضعيفة ٣٥١٩)

**٢٢٣٦- حەج جیهادی هەموو کەسێکی لاوازە.**

٢٢٣٧- الحجاج و العمار وفد الله دعاهم فأجابوه و سألوه فأعطاهم.

(حسن) ( البزار ) عن جابر . (الصحيحة ١٨٢٠)

**٢٢٣٧- ئەوانەی حەج و عومرە دەکەن نێردەی خوان، بانگی کردوون و ئەوانیش وەڵامیان داوەتەوە، داوایانیش لێی کردووە، پێیانی بەخشیوە.**

٢٢٣٨- عجلوا الخروج إلى مكة فإن أحدكم لا يدري ما يعرض له من مرض أو حاجة.

(حسن) ( حل هق ) عن ابن عباس. (الإرواء ٩٩٠)

**٢٢٣٨- پەلەی ڕۆیشتن بکەن بۆ مەککە، کەسێك لەئێوە نازانێت چی دێتە ڕێگا لە نەخۆشی و پێویستی.**

٢٢٣٩- العمرة إلى العمرة كفارة لما بينهما من الذنوب و الخطايا و الحج المبرور ليس له جزاء إلا الجنة.

(صحيح) (حم) عن عامر بن ربيعة. (الصحيحة ١٢٠٠)

**٢٢٣٩- عومرە بۆ عومرە کەففارەتە بۆ هەموو گوناه و تاوانێك لە نێوانیاندا، حەجی چاکیش پاداشتی نییە لەبەهەشت زیاتر.**

٢٢٤٠- العمرة إلى العمرة كفارة لما بينهما و الحج المبرور ليس له جزاء إلا الجنة.

(صحيح) (مالك حم ق ٤) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٢٠٠)

**٢٢٤٠- عومرە بۆ عومرە سڕینەوەی گوناهی نێوانیانە، حەجی چاکیش پاداشتی نیی لەبەهەشت زیاتر.**

٢٢٤١- الغازي في سبيل الله عز و جل و الحاج و المعتمر وفد الله دعاهم فأجابوه و سألوه فأعطاهم.

(صحيح) ( هـ حب ) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٨٢٠)

**٢٢٤١- ئەوەی غەزا دەکات لە پێناو خوای گەورە و، ئەوانەی حەج و عومرە دەکەن، نێردەی خوای پەروەردگارن، بانگی کردوون و وەڵامیان داوەتەوە، داوایان لێی کردووە پێی بەخشیون.**

٢٢٤٢- لكن أحسن الجهاد و أجمله حج مبرور.

(صحيح) ( خ ن ) عن عائشة. (الإرواء ٩٨١)

**٢٢٤٢- بەلام چاكترين و جوانترين جيهاد حەجێكی وەرگيراوە.**

٢٢٤٣- ما أهل مهل قط و لا كبر مكبر قط إلا بشر بالجنة.

(حسن) ( طس ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٦٢١)

**٢٢٤٣- كەس نەيوتووە ( لبيك اللهم لبيك ) يان ( الله أكبر ) تاكو خوای گەورە مژدەی بەهەشتی پێنەدا بێت.**

٢٢٤٤- ما ترفع إبل الحاج رجلا و لا تضع يدا إلا كتب الله تعالى له بها حسنة أو محا عنه سيئة أو رفعه بها درجة.

(حسن) ( هب ) عن ابن عمر. (الترغيب ١١٠٦)

**٢٢٤٤- وشتری حاجيان پێ بەرز ناكەنەوە، يان دەست داناگرن، تاكو خوای گەورە چاكەيەكيان بۆ نەنووسێت ، يا ن خراپەيەكيان لەسەر لانەدات، يا پلەيەك بەرزيان نەكاتەوە.**

٢٢٤٥- من أتى هذا البيت فلم يرفث و لم يفسق رجع كما ولدته أمه.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الثمر المستطاب ١\٥٤٧)

**٢٢٤٥- كەسێك بێتە لای كەعبە و قسەی ناشرين نەكات و بەد ڕەوشتی نەكات، دەگەڕێتەوە وەكو ئەو ڕۆژەی لەدايك بووە.**

٢٢٤٦- من أراد الحج فليتعجل.

(حسن) ( حم د ك هق ) عن ابن عباس. (الإرواء ٩٩٠)

**٢٢٤٦- كەسێك دەيەوێت حەج بكات با پەلە بكات.**

٢٢٤٧- من أراد الحج فليتعجل فإنه قد يمرض المريض و تضل الضالة و تعرض الحاجة.

(حسن) ( حم هـ ) عن الفضل. (الإرواء ٩٩٠)

**٢٢٤٧- كەسێك دەيەوێت حەج بكات با پەلە بكات، چونكە لەوانەيە نەخۆش بكەوێت، يان شتی لێ ون بێت، يان كارو پێويستی دێتە ڕێ.**

٢٢٤٨- من حج لله فلم يرفث و لم يفسق رجع كيوم ولدته أمه.

(صحيح) ( حم خ ن هـ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٥٠٧)

**٢٢٤٨- هەر كەسێك حەج بۆ خوا بكات، قسەی ناشرين و بەدڕەوشتی نەكات وەكو ئەو ڕۆژە دەگەڕێتەوە كە لە دايك بووە.**

٢٢٤٩- من طاف بهذا البيت أسبوعا فأحصاه كان كعتق رقبة لا يضع قدما و لا يرفع أخرى إلا حط الله عنه بها خطيئة و كتب له بها حسنة.

(صحيح) ( ت ن ك ) عن ابن عمر. (المشكاة ٢٥٨٠)

**٢٢٤٩- كەسێك يەك هەفتە تەواف بكات بەدەوری ماڵی خواو بيژمێرێت، وەكو ئەوەيە كۆيلەيەكی ئازاد كرد بێت، پێيەك بەرز ناكاتەوەو داينانێت تاكو خوای گەورە گوناهێكی لەسەر لانەبات و چاكەيەكی بۆ نەنووسێت.**

٢٢٥٠- نعم الجهاد الحج.

(صحيح) ( خ ) عن عائشة. (الإرواء ٩٨١)

**٢٢٥٠- حەج چاكترين جيهادە.**

٢٢٥١- هلم إلى جهاد لا شوكة فيه: الحج.

(صحيح) ( طب ) عن الحسين. (الإرواء ٩٦٣)

**٢٢٥١- وەرن بۆ جيهادێكی بێ درك: حەجكردن.**

٢٢٥٢- وفد الله ثلاثة: الغازي و الحاج و المعتمر.

(صحيح) ( ن حب ك ) عن أبي هريرة. (المشكاة ١٥٣٧)

**٢٢٥٢- نێردەكانی خوا سێ ن: غەزاكارو، حاجی و، ئەو كەسەی عومرە دەكات.**

٢٢٥٣- إذا كان رمضان فاعتمري فيه فإن عمرة فيه تعدل حجة.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عباس . (الإرواء ٨٦١)

**٢٢٥٣- كە ڕەمەزان هات عومرەی تيادا بكە چونكە عومرەيەك لە ڕەمەزان بەرامبەر حەجێكە.**

٢٢٥٤- عمرة في رمضان تعدل حجة .

(صحيح) ( حم خ هـ ) عن جابر ( حم ق د هـ ) عن ابن عباس ( د ت هـ ) عن أم معقل ( هـ ) عن وهب بن خنبش ( طب ) عن ابن الزبير. (الإرواء ٢٦١)

**٢٢٥٤- عومرەيەك لە ڕەمەزاندا بەرامبەر حەجێكە.**

٢٢٥٥- عمرة في رمضان كحجة معي .

(صحيح) ( سمويه ) عن أنس. (الإرواء ١٥٨٦)

**٢٢٥٥- عومرەيەك لە ڕەمەزاندا، بەرامبەر حەجێكە لەگەڵ من.**

## بابەتی ترساندن لەهاندانی حەجكردن

٢٢٥٦- إن الله تعالى يقول: إن عبدا أصححت له جسمه و وسعت عليه في معيشته تمضي عليه خمسة أعوام لا يفد إلي لمحروم.

(صحيح) ( ع حب ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ١٦٦٢)

**٢٢٥٦- خـوای گـەورە دەفـەرموێت: بەندەيـەك لاشـەم سـاغ كـردووە، بژێويـشم فـراوان كردووە، پێنج ساڵی بەسەردا تێپەڕ دەبێت و نايەتە سەردانی ماڵەكەم.**

٢٢٥٧- تعجلوا إلى الحج فإن أحدكم لا يدري ما يعرض له.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عباس . (الإرواء ٩٧٢)

**٢٢٥٧- پەلە بكەن بۆ حەج، چونكە ئێوە نازانن چيتان دێتە ڕێ.**

## بابەتی قەدەغەكردنی گەشتی ئافرەت بەبێ مەحرەم

٢٢٥٨- لا تسافر المرأة إلا مع ذي محرم و لا يدخل عليها رجل إلا و معها محرم.

( حم ق ) عن ابن عباس. (الإرواء ٩٧٧)

**٢٢٥٨- نابێت ئافرەت سەفەر بكات لەگەڵ مەحرەم دا نەبێت، نـابێتيش پياوێـك بـچێتە لای ئەگەر مەحرەمێكی لەگەڵدا نەبێت.**

٢٢٥٩- لا تسافر المرأة ... إلا و معها محرم يحرم عليها.

(صحيح) ( د ك ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٤٢١)

**٢٢٥٩- ئافرەت نابێت سەفەر بكات، تاكو مەحرەمێكی خۆی لەگەڵ نەبێت.**

٢٢٦٠- لا تسافر المرأة ثلاثة أيام إلا مع ذي محرم.

(صحيح) ( حم ق د ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٣٠٦٥)

**٢٢٦٠- ڕەوا نييە ئافرەت ماوەی سێ ڕۆژ سەفەر بكات لەگەڵ مەحرەمێكدا نەبێت.**

٢٢٦١- لا تسافر المرأة مسيرة يومين إلا و معها زوجها أو ذو محرم منها و لا صوم في يومين: الفطر و الأضحى.

(صحيح) ( خ ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٣٠٦٥)

**٢٢٦١- ڕەوا نییە ئافرەت ماوەی دوو ڕۆژ سەفەر بکات لەگەڵ مێردەکەی یان مەحرەمێکیدا نەبێت، ڕۆژوویش ڕەوا نییە لەدوو ڕۆژدا نەبێت: جەژنی ڕەمەزان و قوربان.**

٢٢٦٢- لا يحل لامرأة أن تسافر إلا و معها ذو محرم منها.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٠٦٥)

**٢٢٦٢- ڕەوا نییە بۆ ئافرەتێك سەفەر بكات تاكو مەحرەمێكی خۆی لەگەڵی نەبێت.**

٢٢٦٣- لا يحل لامرأة تؤمن بالله و اليوم الآخر أن تسافر سفرا يكون ثلاثة أيام فصاعدا إلا و معها أبوها أو ابنها أو زوجها أو أخوها أو ذو محرم منها.

(صحيح) ( حم م د ت هـ ) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ١٥١٨)

**٢٢٦٣- ڕەوا نییە بۆ ئافرەتێك ماوەی باوەڕی هەبێت بەخوا و ڕۆژی دوایی سەفەرێك بكات كە سێ ڕۆژ بێت بەرەو ژوور، تاكو باوكی یان كوڕی یا مێردی یان برای یان هەرمەحرەمێكی تری لەگەڵدا نەبێت.**

٢٢٦٤- لا يحل لامرأة تؤمن بالله و اليوم الآخر أن تسافر مسيرة ثلاث إلا و معها ذو محرم.

(صحيح) ( م ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٤٣٨٩)

**٢٢٦٤- ڕەوا نییە بۆ ئافرەتێك باوەڕی هەبێت بەخوا و ڕۆژی دوایی ماوەی سێ ڕۆژ سەفەر بكات تاكو مەحرەمێكی لەگەڵ نەبێت.**

٢٢٦٥- لا يحل لامرأة تؤمن بالله و اليوم الآخر أن تسافر مسيرة يوم إلا مع ذي محرم.

(صحيح) ( حم م د هـ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٥٦٧)

**٢٢٦٥- ڕەوا نییە بۆ ئافرەتێك باوەڕی هەبێت بەخوا و ڕۆژی دوایی، سەفەرێك بكات بۆ ماوەی یەك ڕۆژ لەگەڵ لەگەڵ مەحرەمێكدا نەبێت.**

٢٢٦٦- لا يحل لامرأة تؤمن بالله و اليوم الآخر أن تسافر مسيرة يوم و ليلة إلا مع ذي محرم.

(صحيح) ( حم ق د ت ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٥٦٧)

**٢٢٦٦- ڕەوا نییە بۆ ئافرەتێك باوەڕی هەبێت بەخوا ڕۆژی دوایی ماوەی ڕۆژ و شەوێك سەفەرێك بكات لەگەڵ مەحرەمێكدا نەبێت.**

## بابەتی كاتە دانراوەكان

٢٢٦٧- مهل أهل المدينة من ذي الحليفة و للطريق الآخر الجحفة و مهل أهل العراق من ذات عرق و مهل أهل نجد من قرن و مهل أهل اليمن من يلملم.

(صحيح) ( م هـ ) عن جابر. (الإرواء ٩٨٠)

**٢٢٦٧- میقاتی خەڵكە مەدینە لە(ذي الحليفة)ەوەیە، لەو ڕێگە كە شەوە لە جوحفەوە، خەڵكی عێراقیش لە (ذات عرق)ەوە، خەڵكی نەجدیش لە قەرنەوە، خەڵكی یەمەنیش لە یەلەملەمەوە.**

٢٢٦٨- يا عبد الرحمن ! اذهب بأختك فأعمرها من التنعيم.

(صحيح) ( ق ) عن عائشة. (الإرواء ١٠٧٥)

**٢٢٦٨- ئەی عەبدوڕەحمان، خوشكەكەت ببە و لە تەنعیمەوە عومرەی پێ بكە.**

٢٢٦٩- يا عبد الرحمن ! أردف أختك عائشة فأعمرها من التنعيم فإذا هبطت بها من الأكمة فمرها فلتحرم فإنها عمرة متقبلة.

(صحيح) ( حم د ك ) عن عبدالرحمن بن أبي بكر. (الإرواء ١٠٧٥)

**٢٢٦٩- ئەی عەبدوڕەحمان! خوشكەكەت لەگەڵ خۆت سوار بكە و لە تەنعیمەوە عومرەی پێ بكە، كاتێك لەتەپكە كە هاتیتە خوارەوە. فەرمانی پێ بكە با ئیحرام بكات، چونكە ئەوە عومرەیەكی وەرگیراوە.**

٢٢٧٠- يهل أهل المدينة من ذي الحليفة و يهل أهل الشام من الجحفة و يهل أهل نجد من قرن و يهل أهل اليمن من يلملم.

(صحيح) ( حم ق ت ن هـ ) عن ابن عمر. (الإرواء ٩٨٠)

**٢٢٧٠- خەڵكی مەدینە لە(ذي الحليفة)وە ئیحرام دەبەستن، خەڵكی شام لە جوحفەوەو، خەڵكی نەجد لە قەرنەوەو، خەڵكی یەمەن لە یەلەملەمەوە.**

## بابەتی شێوازەكانی ئیحرام و چۆنێتی

٢٢٧١- دخلت العمرة في الحج إلى يوم القيامة.

(صحيح) ( م د ) عن جابر ( د ت ) عن ابن عباس مرسلا . (صحيح أبي داود ١٥٧١)

**٢٢٧١- عومرە لەناو حەجدایە تا ڕۆژی قیامەت.**

٢٢٧٢- لو أني استقبلت من أمري ما استدبرت لم أسق الهدي و لجعلتها عمرة فمن كان منكم ليس معه هدي فليحل و ليجعلها عمرة.

(صحيح) ( م د ) عن جابر. (صحيح أبي داود ١٦٦٣)

**٢٢٧٢- ئەگەر ئێستام بووایە قوربانییەکانم لەگەڵ خۆم نە دەهێناو هەر دەمکردە عومرە، جا هەر کەسێك لەئێوە قوربانی نەهێناوە با نیەتی عومرەی لێ بهێنێ.**

٢٢٧٣- لو أني استقبلت من أمري ما استدبرت ما أهديت و لولا أن معي الهدي لأحللت.

(صحيح) ( حم ق ) عن جابر. (صحيح أبي داود ١٦٦٣)

**٢٢٧٣- ئەگەر ئێستام بووایە ( هدی )م لەگەڵ خۆم نەدەهێنا، ئەگەر ئێستاش لەگەڵم نەبوایەن ئیحرامەکەم دەکردەوە.**

٢٢٧٤- من أحرم بالحج و العمرة أجزأه طواف واحد و سعي واحد منهما و لم يحل حتى يقضي حجه و يحل منهما جميعا.

(صحيح) ( ت هـ ) عن ابن عمر. (صحيح الترمذي ٩٤٨)

**٢٢٧٤- هەر کەسێك ئیحرام بکات بەحەج و عومرە، یەك تەواف و یەك سەعی بەسە بۆی، ئیحرامەکەشی ناکاتەوە تاکو حەجەکەی تەواو نەکات و لەهەر دووکیان نەبێتەوە.**

٢٢٧٥- من قرن بين حجه و عمرته أجزأه لهما طواف واحد.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عمر. (صحيح الترمذي ٩٤٨)

**٢٢٧٥- هەر کێ حەج و عومرەی بەست بەیەکەوە یەك تەواف بەسە بۆی.**

٢٢٧٦- هذه عمرة استمتعنا بها فمن لم يكن عنده الهدي فليحل الحل كله فإن العمرة قد دخلت في الحج إلى يوم القيامة

(صحيح) ( حم م ) عن ابن عباس. (الإرواء ٩٦٤)

**٢٢٧٦- ئەمە عومرەیەکە بە( تمتع ) کردمان، ئەگەر کەسێك لەئێوە قوربانی نەهێناوە با یەکجاری ئیحرام بکاتەوە، چونکە عومرەکە چووە ناو حەجەکەوە تا ڕۆژی قیامەت.**

٢٢٧٧- يا آل محمد ! من حج منكم فليهل بعمرة في حجته.

(صحيح) ( حب ) عن أم سلمة. (الصحيحة ٢٤٦٩)

**٢٢٧٧- ئەی خاوو خێزانی موحەممەد! کەسێ لە ئێوە حەجی کرد با سەرەتا بەعومرە دەست پێ بکات.**

٢٢٧٨- قولي: لبيك اللهم لبيك و محلي من الأرض حيث تحبسني فإن لك على ربك ما استثنيت.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عباس ( حم ) عن ضباعة. (الإرواء ١٠١٠)

**٢٢٧٨- بڵێن: (لبيك اللهم لبيك) جێگام لەزەویدا ئەو شوێنەیە کە گیرم دەدەیت تیایدا، چونکە ئەوەی جیای دەکەیتەوە مافی خۆتە لەلای خوای گەورە.**

## بابەتی ئیحرام کردن و هەندێ کردەوەی پەیوەندیدار

٢٢٧٩-أتاني الليلة آت من عند ربي فقال: صل في هذا الوادي المبارك - يعني العقيق - و قل عمرة في حجة.

(صحيح) (حم خ د) عن عمر . (الإرواء ٩٨٨)

**٢٢٧٩- ئەمشەو کەسێك لەلای خوای خۆمەوە هاتە لام و، ووتی: لەو دۆڵە پیرۆزە نوێژ بکە، واتە: عەقیق و، بڵێ: عومرەیەك لەناو حەجێکدا.**

٢٢٨٠- قاطع السدر يصوب الله رأسه في النار.

(صحيح) ( هق ) عن معاوية بن حيدة. (الصحيحة ٦١٦)

**٢٢٨٠- ببڕی درەختی حەرەم خوای گەورە بەسەر سەریدا دەیخاتە دۆزەخەوە.**

٢٢٨١- إن الذين يقطعون السدر يصبون في النار على رءوسهم صبا.

(صحيح) ( هق ) عن عائشة . (الصحيحة ٦١٦)

**٢٢٨١- ئەوانەی کە درەخت دەبڕن، لەسەر سەریان فڕە دەدرێنە نێو دۆزەخەوە.**

٢٢٨٢- خمس قتلهن حلال في الحرم: الحية و العقرب و الحدأة و الفأرة و الكلب العقور.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٠٢٠)

**٢٢٨٢- پێنج شت کوشتنیان ڕەوایە لەحەرەمدا: مارو، دووپشك و، سوورە داڵ و، قەلە ڕەش.**

٢٢٨٣- خمس كلهن فاسقة يقتلهن المحرم و يقتلن في الحرم: الفأرة و العقرب و الحية و الكلب العقور و الغراب.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عباس . (الإرواء ١٠٢٠)

**٢٢٨٣- پێنج شت هەن هەموویان خراپەکارن لەحەرەم دا دەکوژرێن و ئەو کەسە ئیحرامی بۆ شیوە بۆی هەیە بیانکوژێت: مشك و، دووپشك و، مارو، سەگی هار و، قەلە ڕەش.**

٢٢٨٤- خمس من الدواب كلهن فاسق يقتلن في الحرم: الغراب و الحدأة و العقرب و الفأرة و الكلب العقور.

(صحيح) ( ق ت ن ) عن عائشة . (الصحيحة ١٩٣)

**٢٢٨٤- پێنج جانەوەر هەن خرا پەكارن دەكوژرێن لەحەرەمدا : قەلە ڕەش و، سووره دالْ و، دووپشك و، مشك و، سەگی هار.**

٢٢٨٥- خمس من الدواب ليس على المحرم في قتلهن جناح: الغراب و الحدأة و الفأرة و العقرب و الكلب العقور.

(صحيح) ( مالك حم ق د ن هـ ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١٩٣٠)

**٢٢٨٥- پێنج جا نەوەر هەن گوناه نییه ئیحرام پۆش بیانكوژن: قەلە ڕەش و سوره دالْ و، مشك و، دووپشك و، سەگی هار.**

٢٢٨٦- السراويل لمن لا يجد الإزار و الخف لمن لا يجد النعلين.

(صحيح) ( د ) عن ابن عباس. (صحيح أبي داود ١٠٦٥)

**٢٢٨٦- دەرپێ بۆ كەسێك جل و بەرگی نەبێت، پێڵاویش بۆ كەسێك نەعلی دەست نەكەوێت.**

٢٢٨٧- كان إذا أراد أن يحرم تطيب بأطيب ما يجد.

(صحيح) ( م ) عن عائشة.

**٢٢٨٧- پێغەمبەر ﷺ كە بیویستبا ئیحرام بكات بەخۆشترین بۆن خۆی بۆ نخۆش دەكرد.**

٢٢٨٨- من الله تعالى لا من رسوله: لعن الله قاطع السدر.

(صحيح) ( طب هق ) عن معاوية بن حيدة. (الصحيحة ٦١٥)

**٢٢٨٨-لەخوای گەورەوە نەك لە پێغەمبەرەكەی:خوای گەورەلەعنەتی كردووە لەبڕی درەخت.**

٢٢٨٩- من قطع سدرة صوب الله رأسه في النار.

(صحيح) ( د الضياء ) عن عبدالله بن حبشي. (الصحيحة ٦١٦)

**٢٢٨٩- كەسێك درەختێك ببڕێت خوای گەورە لەسەر سەری دەیخاتە ئاگرەوە.**

٢٢٩٠- من لم يجد نعلين فليلبس خفين و ليقطعهما أسفل من الكعبين.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عمر. (الإرواء ٩٩٦)

**٢٢٩٠- كەسێك جووتێ نەعلی نەبێت با دوو پێلاو لە پێ بكات و لەخوار پاژنەوە بیبڕێتەوە.**

٢٢٩١- من لم يجد نعلين فليلبس خفين و من لم يجد إزارا فليلبس سراويل - يعني المحرم -.

(صحيح) ( حم م ) عن جابر ( حم ق ن هـ ) عن ابن عباس. (الإرواء ٩٩٦)

**٢٢٩١- کەسێك جووتێ نەعلی نەبێت با جووتێ پێڵاو لە پێ بکات، کەسێکیش پۆشاکی نەبێت با دەرپێ لە پێ بکات، واتە: ئەو کەسەی لەئیحرام دایە.**

٢٢٩٢- المحرمة لا تنتقب و لا تلبس القفازين.

(صحيح) ( د ) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ١٦٠١)

**٢٢٩٢- ئەو ئافرەتەی لە ئیحرامدایە نابێت ڕووپۆش لەسەر بکات یان دەسکێش لەدەست بکات.**

٢٢٩٣- لا تلبسوا القميص و لا العمائم و لا السراويلات و لا البرانس و لا الخفاف إلا أحد لا يجد النعلين فليلبس الخفين و ليقطعهما أسفل من الكعبين و لا تلبسوا من الثياب شيئا مسه زعفران أو ورس و لا تنتقب المرأة المحرمة و لا تلبس القفازين.

(صحيح) ( خ ت ن ) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ١٦٠١)

**٢٢٩٣- نەکراس لەبەر بکەن و، نەمێزەر و، نە دەرپێ و، نە پۆشاکی کڵاو دار و، نە پێڵاو، مەگەر بۆ کەسێك نەعلی دەست نەکەوێت با پێڵاو لە پێ بکات و لەخوار پاژنەوە بیبڕێتەوە، هیچ جل و بەرگێکیش لەبەر مەکەن زافەرانیش بەکاربهێنن، ئەو ئافرەتەیش لەئیحرامدایە پەچە نەکات و دەست کێش لەدەست نەکات.**

٢٢٩٤- لا يلبس المحرم القميص و لا العمامة و لا السراويل و لا البرنس و لا ثوبا مسه ورس و لا زعفران و لا الخفين إلا أن لا يجد نعلين فليلبس الخفين و ليقطعهما حتى يكونا أسفل من الكعبين.

(صحيح) ( حم ق د ن هـ ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٠١١)

**٢٢٩٤- ئەو کەسەی لەئیحرامدایە قەدەغەیە بۆی لەبەر کردنی کراس و، مێزەرو، دەرپێ و، یان پۆشاکێك زافەرانی پیا کرا بێت و، یان پێڵاو لە پێ بکات، مەگەر کەسێك جووتێ نەعلی دەست نەکەوێت با پێڵاو لە پێ بکات و خوار پاژنەکەی ببڕێتەوە.**

٢٢٩٥- لا ينكح المحرم و لا ينكح و لا يخطب.

(صحيح) ( م د ن هـ ) عن عثمان. (الإرواء ١٠٢١)

**٢٢٩٥- ئەو کەسەی لەئیحرامدایە نەژن بهێنێ و، نەژنی پێبدرێت، نە خوازبێنیش بکات.**

٢٢٩٦- يقتل المحرم ( السبع العادي و الكلب العقور و الفأرة و العقرب و الحدأة و الغراب ) .

(صحيح) ( ت هـ ) عن أبي سعيد. (الإرواء ١٠١٥)

**٢٢٩٦- ئەو کەسەی لەئیحرامدایە، هەڵسێ بە کوشتنی.. سەگی هارو، مشك و، دووپشك و، سوورە داڵ و، قەلە ڕەش.**

٢٢٩٧- احجج عن أبيك و اعتمر.

(صحيح) ( د ) عن أبي رزين . (المشكاة ٢٥٢٨)

**٢٢٩٧- حەج بكە لەجياتى باوكت و عومرەيش بكە.**

٢٢٩٨- اقضوا الله فالله أحق بالوفاء.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عباس . (الإرواء ٧٨٢)

**٢٢٩٨- مافى خوا بگێڕنەوە، خواى گەورە مافدارترە بەگێڕانەوەى مافەكانى.**

٢٢٩٩- حج عن أبيك و اعتمر.

(صحيح) ( ت ن هـ ك ) عن أبي رزين العقيلي . (المشكاة ٢٥٢٨)

**٢٢٩٩- حەج بكە لەجياتى باوكت و عومرەيش.**

٢٣٠٠- حج عن نفسك ! ثم حج عن شبرمة.

(صحيح) ( د ) عن ابن عباس . (الإرواء ٩٧٦)

**٢٣٠٠- بۆ خۆت حەج بكە دوايى لەجياتى شوبرومە حەج بكە.**

٢٣٠١- إذا حج الصبي فهي له حجة حتى يعقل فإذا عقل عليه حجة أخرى و إذا حج الأعرابي فهي له حجة فإذا هاجر فعليه حجة أخرى.

(صحيح) ( ك ) عن ابن عباس . (الإرواء ٩٦٨)

**٢٣٠١- ئەگەر منداڵ حەجى كرد بۆى دەژمێردرێت تاكو دەبێتە خاوەن بيرو هۆش، لەو كاتە حەجێكى ترى لەسەرە، ئەگەر عەرەبى بيابان نشينيش حەجى كرد بەحەج بۆى دەنوسرێت، ئەگە كۆچى كرد حەجێكى تر دەكەوێتە سەرى.**

٢٣٠٢- أيما صبي حج ثم بلغ الحنث فعليه أن يحج حجة أخرى و أيما أعرابي حج ثم هاجر فعليه أن يحج حجة أخرى و أيما عبد حج ثم أعتق فعليه أن يحج حجة أخرى.

(صحيح) ( خط الضياء ) عن ابن عباس . (الإرواء ٩٦٨)

**٢٣٠٢- هەر منداڵێك حەجى كرد و دوايى گەيشتە تەمەنى گەورەيى حەجێكى تر دەكەوێتە سەرى، هەر عەرەبێكى بيابان نشينيش حەجى كرد و دوايى كۆچى كرد حەجێكى تر دەكەوێتە سەرى. هەر كۆيلەيەكيش حەجى كرد و دوايى ئازاد كرا، حەجێكى تر دەكەوێتە سەرى.**

٢٣٠٣- أتاني جبريل فأمرني أن آمر أصحابي و من معي أن يرفعوا أصواتهم بالتلبية.

(صحيح) ( حم ٤ حب ك هق ) عن السائب بن خلاد . (المشكاة ٢٥٤٩)

**٢٣٠٣- جيبريل هاتە لام و، فەرمانی پێکردم فـەرمان بکـەن بکـەم بـەهاوەڵان وئەوانـەی لەگەڵمدان کەدەنگیان بە( لبيك اللهم لبيك ) بەرز بکەنەوە.**

٢٣٠٤- أتاني جبريل فقال لي: إن الله يأمرك أن تـأمر أصـحابك أن يرفعـوا أصـواتهم بالتلبيـة فإنها من شعائر الحج.

(صحيح) ( حم هـ حب ك ) عن زيد بن خالد . (الصحيحة ٨٣٠)

**٢٣٠٤- جبريـل هاتـە لام و پێـی وتم: خـوای گـەورە فـەرمانت پـێ دەكـات فـەرمان بکەيتـە هاوەڵانت دەنگيان بەرز بکەنەوە بە ( لبيك اللهم لبيك ) چونکە ئەوە لەدروشمەکانی حەجە.**

٢٣٠٥- اللهم حجة لا رياء فيها و لا سمعة.

(صحيح) ( هـ ) عن أنس . (الترغيب ١١٢٢)

**٢٣٠٥- خوايە گيان حەجێك بێت بێ ڕيايی و ناو دەرکردن.**

٢٣٠٦- أمرني جبريل برفع الصوت في الإهلال فإنه من شعار الحج.

(صحيح) ( حم هق ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٨٢٨)

**٢٣٠٦- جيبريل فەرمانی پێکردم بەدەنگ بەرزکردنـەوە بـە ( لبيـك اللهم لبيـك ) چـونکە ئەوە لە دروشمەکانی حەجکردنە.**

٢٣٠٧- لبيك إله الحق لبيك.

(صحيح) ( حم ن هـ ك ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢١٤٦)

**٢٣٠٧- پەيڕەويت دەکەم خوای ڕاستەقينە پەيڕەويت دەکەم.**

٢٣٠٨- لبيك اللهم لبيك إنما الخير خير الآخرة.

(صحيح) ( ك هق ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢١٤٦)

**٢٣٠٨- پەيڕەويت دەکەم خوايە پەيڕەويت دەکەم، چاکە هەر چاکەی دواڕۆژە.**

٢٣٠٩- لبيك اللهم لبيك لبيك لا شريك لك لبيك إن الحمد و النعمة لك و الملك لا شريك لك.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن ابن عمر ( حم خ ) عن عائشة ( م د هـ ) عن جابر ( ن ) عـن ابـن مـسعود ( حم ) عن ابن عباس ( ع ) عن أنس ( طب ) عن عمرو بن معدي كرب. (صحيح أبي داود ١٥٩٠)

**٢٣٠٩- پـەيڕەويت دەكـەم خوايـە پـەيڕەويت دەكـەم، پـەيڕەويت دەكـەم هـيچ هاوتـايەکت نييە، سەرم لەڕێتە، سوپـاس و نيعمـەت بـۆ تـۆيـە و هـەموو موڵـك و سامانێکيش، خوايە تۆ هاوتـات نييە.**

٢٣١٠- ما من مسلم يلبي إلا لبى ما عن يمينه و شماله من حجر أو شجر أو مدر حتى تنقطع الأرض من هاهنا و هاهنا

(صحيح) ( ت هـ ك ) عن سهل بن سعد. (المشكاة ٢٥٥٠)

**٢٣١٠- هەر موسوڵمانێك لەببەیك بكات، هەموو شتێكی لەدوورو بەری لەڕاست و چەپ لەبەرد و دار و شار هەمووی لەبیك دەكات، تاكو زەوی دەپچڕێت لێرەو لەوێ.**

٢٣١١- أفضل الحج العج و الثج.

(حسن) ( ت ) عن ابن عمر ( هـ ك هق ) عن أبي بكر ( ع ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٥٠٠)

**٢٣١١- چاكترین حەج دەنگ بەرزكردنەوەیە بە لەببەیك و خوێن ڕشتنی قوربانییە.**

## بابەتی چونیەتی حەجكردن و چوونە ناو مەككەوە

٢٣١٢- يا أيها الناس ! خذوا عني مناسككم فإني لا أدري لعلي لا أحج بعد عامي هذا.

(صحيح) ( ن ) عن جابر. (الإرواء ١٠٥٩)

**٢٣١٢- ئەی خەڵكینە! شێوازەكانی خوا پەرستنم لێوە فێربن، چونكە نازانم لەوانەیە لە پاش ئەمساڵ ئیتر حەج نەكەم.**

٢٣١٣- كان إذا كان قبل التروية بيوم خطب الناس فأخبرهم بمناسكهم.

(صحيح) ( ك هق ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٢٠٨٢)

**٢٣١٣- پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك لە پێش ڕۆژی تەرویە، وتاری دا بۆ خەڵكی و ئاگاداری كردنەوە لەجێگای قوربانی و خوا پەرستنەكانیان.**

٢٣١٤- إذا أقيمت الصلاة فطوفي على بعيرك من وراء الناس.

(صحيح) ( ن ) عن أم سلمة . (الصحيحة ١٢٥٧)

**٢٣١٤- كاتێك نوێژ دادەبەسرێت بەسەر وشترەكەتەوە بسوڕێرەوە لەدوای خەڵكەكەوە.**

٢٣١٥- اسعوا فإن الله قد كتب عليكم السعي.

(صحيح) ( حم ) عن حبيبة بنت أبي تجراة . (الإرواء ١٠٥٧)

**٢٣١٥- سەعی بكەن، چونكە خوای گەورە سەعی لەسەرتان نوسیوە.**

٢٣١٦- إن الله كتب عليكم السعي فاسعوا.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس . (الإرواء ١٠٧٥)

**٢٣١٦- خوای گەروە سەعی لەسەرتان نوسیوە بۆیە سەعی بکەن.**

٢٣١٧- الطواف بالبيت صلاة و لكن الله أحل فيه المنطق فمن نطق فلا ينطق إلا بخير .

(صحيح) ( طب حل ك هق ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٢١)

**٢٣١٧- تەواف بەدەوری کەعبەدا نوێژە، بەلاّم خوای گەورە قسە کردنی تیایدا ڕەوا کردووە، جا ئەگەر کەسێك قسەی کرد با بە چاکە قسە بکات.**

٢٣١٨- الطواف حول البيت مثل الصلاة إلا أنكم تتكلمون فيه فمن تكلم فيه فلا يتكلم إلا بخير .

(صحيح) ( ت ك هق ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٢١)

**٢٣١٨- تەواف بەدەوری کەعبەدا وەکو نوێژە ، بەلاّم دەتوانن قسەی تیادا بکەن، جا ئەگەر قسەی کرد با یە چاکە قسە بکات.**

٢٣١٩- الطواف صلاة فأقلوا فيه الكلام .

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٢١)

**٢٣١٩- تەواف نوێژە بۆیە قسەی کەم تیادا بکەن.**

٢٣٢٠- طوفي من وراء الناس و أنت راكبة .

(صحيح) ( خ د ) عن أم سلمة. (الصحيحة ١٢٥٩)

**٢٣٢٠- تەواف بکە لەدوای خەڵکییەوە بەسواری.**

٢٣٢١- قده بيده.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس.

**٢٣٢١- بەدەستی خۆت بەڕێوەی ببە.**

٢٣٢٢- من حج هذا البيت أو اعتمر فليكن آخر عهده الطواف بالبيت .

(صحيح) ( حم ٣ الضياء ) عن الحارث الثقفي. (الضعيفة ٤٥٨٥)

**٢٣٢٢- هەر کەسێ حەجی ئەم ماڵەی کرد... با کاری کۆتایی تەواف کردن بێت.**

٢٣٢٣- نبدأ بما بدأ الله به.

(صحيح) ( حم ٣ ) عن جابر. (الإرواء ١١٠٥)

**٢٣٢٣- بەوە دەست پێ دەکەین کە خوای گەورە دەستی پێکردووە.**

٢٣٢٤- لا نقطع الأبطح إلا شدا.

(صحيح) ( حم هـ ) عن أم ولد شيبة. (الصحيحة ٢٤٣٧)

**٢٣٢٤- (ئەبتەح) نابڕین بەڕێكردنی توند نەبێت.**

٢٣٢٥- لا نقطع الوادي إلا شدا.

(صحيح) ( ن ) عن امرأة صحابية. (الصحيحة ٢٤٣٧)

**٢٣٢٥- ئەم دۆڵە نابڕین بەڕێكردنی توند نەبێت.**

٢٣٢٦- لا يحج بعد العام مشرك و لا يطوف بالبيت عريان.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٠٨٦)

**٢٣٢٦- قەدەغەیە پاش ئەمساڵ بت پەرستێك حەج بكات، یان كەسێك بەڕووتی تەواف بكات.**

٢٣٢٧- لا يدخل الجنة إلا نفس مسلمة و لا يطوف بالبيت عريان و لا يجتمع المسلمون و المشركون في المسجد الحرام بعد عامهم هذا و من كان بينه و بين النبي عهد فعهده إلى مدته و من لم يكن له عهد فأجله أربعة أشهر.

(صحيح) ( حم ت ك ) عن علي. (الإرواء ١١٠١)

**٢٣٢٧- كەسێك موسوڵمان نەبێت ناچێتە بەهەشتەوە، قەدەغەیشە كەسێكی ڕووت تەواف بكات بەدەوری كەعبەدا، موسوڵمانان و بتپەرستان هەرگیز نابێت لە (المسجد الحرام)دا كۆببنەوە لە پاش ئەمساڵ، هەركەسێكیش پەیمانێكی هەیە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ پەیمانەكەی دەبڕێتە سەر تا كۆتایی، كەسێكیش پەیمانی نییە مۆڵەتی چوار مانگی هەیە.**

٢٣٢٨- لا ينفرن أحد حتى يكون آخر عهده الطواف بالبيت.

(صحيح) ( حم د هـ ) عن ابن عباس ( هـ ) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ١٧٤٧)

**٢٣٢٨- كەس پەلە نەكات لەگەڕانەوە تا كاری كۆتایی تەواف كردن نەبێت بەدەوری ماڵی خوا.**

٢٣٢٩- يا بني عبد مناف ! لا تمنعوا أحدا طاف بهذا البيت و صلى أية ساعة شاء من ليل أو نهار.

(صحيح) ( حم ٤ حب ك ) عن جبير بن مطعم. (الإرواء ٤٧٤)

**٢٣٢٩- ئەی بەنی عەبدو مەناف! كەس قەدەغە مەكەن لەوەی تەوافی ماڵی خوا بكات و نوێژ بكات لەهەر كاتێكی شەوو ڕۆژدا بیەوێت.**

٢٣٣٠- منى مناخ من سبق.

(حسن) ( ت هـ ك ) عن عائشة. (المشكاة ٢٦٢٥)

**٢٣٣٠- مینا جێگای دابەزینی هەر كەسێكە پێشتر بگات.**

٢٣٣١- منزلنا غدا إن شاء الله بخيف بني كنانة حيث تقاسموا على الكفر.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٦٧٥)

**٢٣٣١- جێگامان بەویستی خوا سبەی لە( خەیف )ی بەنی كینانە دەبێت لەو شوێنەی پێكەوە سوێندیان لەسەر بێ باوەڕی خوارد.**

٢٣٣٢- نحن نازلون غدا بخيف بني كنانة حيث قاسمت قريش على الكفر.

(صحيح) ( هـ ) عن أسامة بن زيد. (صحيح أبي داود ١٧٥٤)

**٢٣٣٢- ئێمە سبەی لەخەیفی بەنی كینانە لا دەدەین، لەو شوێنەی قورەیش سوێندیان لەسەر بێ باوەڕی خوارد.**

٢٣٣٣- يمكث المهاجر بمكة بعد قضاء نسكه ثلاثا.

(صحيح) ( حم م ت ن ) عن العلاء بن الحضرمي. (صحيح الترمذي ٩٤٩)

**٢٣٣٣- كۆچكار پاش تەواو كردنی عیبادەتەكانی سێ لەڕۆژ لەمەككە دەمێنێتەوە.**

٢٣٣٤- ليشترك النفر في الهدي.

(صحيح) ( ك ) عن جابر.

**٢٣٣٤- با چەند كەسێك بەشدار بن لەیەك قوربانیدا.**

٢٣٣٥- ارفعوا عن بطن عرنة و ارفعوا عن بطن محسر.

(صحيح) ( ك هق ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٥٣٤)

**٢٣٣٥- بەرز ببنەوە لە** (بطن عرنة) **و هەروەها لە** (بطن محسر).

٢٣٣٦- ارفعوا عن بطن محسر و عليكم بمثل حصا الخذف.

(صحيح) ( حم هق ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٥٣٤)

**٢٣٣٦- بەرزببنەوەلە** (بطن محسر)**، و بەردی بچوكیش هەڵگرن.**

٢٣٣٧- إن الله تطاول عليكم في جمعكم هذا فوهب مسيئكم لمحسنكم و أعطى محسنكم ما سأل ادفعوا بسم الله.

(صحيح) ( هـ ) عن بلال . (الصحيحة ١٦٢٤)

**٢٣٣٧- خوای گەورە چاكەی لەگەڵتان كردووە لەم كۆمەڵەتان، خراپە كارتانی بەخشیوە بەچاكە كارتان، ئەوەشی چاكە كارتان داوای كردووە پێی بەخشیوە، بەڕێكەون بەناوی خوا.**

٢٣٣٨- إن الله يباهي بأهل عرفات أهل السماء فيقول لهم: انظروا إلى عبادي هؤلاء جاءوني شعثا غبرا.

(صحيح) ( حب ك هق ) عن أبي هريرة . (الترغيب ١١٣٢)

**٢٣٣٨- خواى گەورە شانازى دەكات بەخەڵكى عەرەفاتەوە لاى خەڵكى ئاسمان و پێيان دەفەرموێت: تەماشاى ئەو بەندانەم بكەن چۆن هاتوون بۆ لاى من بەئاڵۆزى و خۆڵاوى.**

٢٣٣٩- إن الله تعالى يباهي ملائكته عشية عرفة بأهل عرفة يقول: انظروا إلى عبادي أتوني شعثا غبرا.

(صحيح) ( حم طب ) عن ابن عمرو . (الترغيب ١١٥٢)

**٢٣٣٩- خواى گەورە لەئێوارەى عەرەفەدا لە لاى فريشتەكانى شانازى دەكات بەوانەى لەعەرەفەن و دەفەرموێت: تەماشاى بەندەكانم بكەن چۆن بەئاڵۆزى و تۆزاوى هاتوونە بۆ لام.**

٢٣٤٠- الحج عرفة من جاء قبل طلوع الفجر من ليلة جمع فقد أدرك الحج أيام منى ثلاثة فمن تعجل في يومين فلا إثم عليه و من تأخر فلا إثم عليه.

(صحيح) ( حم ٤ ك هق ) عن عبدالرحمن بن يعمر . (الإرواء ١٠٦٤)

**٢٣٤٠- حەج عەرەفەيە، هەر كەس پێش بەرەبەيانى شەوى موزدەليفە بكات فرياى حەج كەوتووە، ڕۆژانى مينا سێ ڕۆژن هەر كەسێك پەلە بكات لەدووڕۆژدا گوناهبار نابێت، كەسێكيش دواكەوێت هەر گوناهبار نييە.**

٢٣٤١- عرفة كلها موقف .

(صحيح) ( ن ) عن جابر. (صحيح النسائي ٣٠١٥)

**٢٣٤١- عەرەفە هەمووى جێگاى وەستانە.**

٢٣٤٢- عرفة كلها موقف و ارتفعوا عن بطن عرنة و مزدلفة كلها موقف و ارتفعوا عن بطن محسر و منى كلها منحر .

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس. (الصحيحة ١٥٣٤)

**٢٣٤٢- عەرەفە هەمووى جێگاى وەستانە، بەڵام بەرز ببنەوە** (بطن عرنة) **و، موزدەليفە هەمووى جێگاى وەستانە، هەروەها بەرز ببنەوە لە** (بطن محسر) **و، مينا هەمووى جێگايە بۆ قوربانى سەربڕين.**

٢٣٤٣- كل عرفة موقف و كل منى منحر و كل المزدلفة موقف و كل فجاج مكة طريق و منحر.

(صحيح) ( د ك ) عن جابر. (المشكاة ٢٥٩٦)

**٢٣٤٣- هەموو عەرەفە جێگایە بۆ وەستان، هەموو مینا جێگایە بۆ قوربانی سەر بڕین، موزدەلیفەیش هەمووی جێگای وەستانە، هەموو ڕێگەکانی مەککەیش ڕێگایە و جێگایە بۆ قوربانی سەربڕین.**

٢٣٤٤- كل عرفات موقف و ارفعوا عن عرنة و كل مزدلفة موقف و ارفعوا عن بطن محسر و كل فجاج منى منحر و كل أيام التشريق ذبح.

(صحيح) ( حم ) عن جبير بن مطعم. (المشكاة ٢٥٩٦)

**٢٣٤٤- هەموو عەرەفات جێگای ڕاوەستانە، بەڵام بەرز ببنەوە لە ( عرنة ) و هەموو موزدەلیفەیش جێگایە بۆ ڕاوەستان، بەڵام بەرز ببنەوە لە( بطن محسر )، هەموو ڕێگەکانی میناش جێگایە بۆ قوربانی سەر بڕین، هەموو ڕۆژانی تەشریق یش کاتە بۆ سەربڕین.**

٢٣٤٥- كونوا على مشاعركم هذه فإنكم اليوم على إرث من إرث إبراهيم.

(صحيح) ( حم ت ن هـ ك ) عن زياد بن مربع. (المشكاة ٢٥٩٥)

**٢٣٤٥- لەسەر شوێنەکانی خۆتان بن ، ئێوە ئەمڕۆ لەسەر میراتییەکن لەمیراتییەکانی ئیبراهیم.**

٢٣٤٦- ما من يوم أكثر من أن يعتق الله فيه عبدا أو أمة من النار من يوم عرفة و إنه ليدنو ثم يباهي بهم الملائكة فيقول: ماذا أراد هؤلاء ؟.

(صحيح) ( م ن هـ ) عن عائشة. (الترغيب ١١٥٤)

**٢٣٤٦- هیچ ڕۆژێك نییە ئەوەندەی ڕۆژی عەرەفە خوای گەورە بەندەکانی لە پیاو و ژن ئازاد بکات، لەو ڕۆژەدا نزیك دەبێتە و شانازی دەکات لەلای فریشتەکان و دەفەرموێت: ئەوان چییان ویست؟**

٢٣٤٧- من أدرك عرفة قبل طلوع الفجر فقد أدرك الحج.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٠٥١)

**٢٣٤٧- هەر کەسێك فریای عەرەفە بکەوێت پێش دەرکەوتنی بەرەبەیان، فریای حەج کەوتووە.**

٢٣٤٨- من شهد صلاتنا هذه و وقف معنا حتى ندفع و قد وقف بعرفة قبل ذلك ليلا أو نهارا فقد تم حجه و قضى تفثه.

(صحيح) ( ت هـ ) عن عروة بن مضرس. (الإرواء ١٠٥١)

**٢٣٤٨- کەسێك ئامادەی ئەم نوێژەمان بوو، لەو شوێنە شماندا ڕاوەستا تاکو بەڕێدەکەوین، پێش ئەوەش لە عەرەفە ڕاوەستا بوو بەشەو یان بەڕۆژ، ئەوە حەجەکەی تەواو کردووە و کارەکانی ئەنجامداوە.**

٢٣٤٩- من طاف بالبيت سبعا و صلى ركعتين كان كعتق رقبة.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عمر. (الترغيب ١١٤٢)

**٢٣٤٩- كەسێك حەوت جار بەدەوری کەعبەدا تەواف بكات و دوو ڕکات نوێژ بکات وەکو ئەوەیە کۆیلەیەك ئازاد بکات.**

٢٣٥٠- من أدرك معنا هذه الصلاة: صلاة الغداة و قد أتى عرفات قبل ذلك ليلا أو نهارا فقد قضى تفثه و تم حجه.

(صحيح) ( حم د ن ك ) عن عروة بن مضرس. (الإرواء ١٠٥١)

**٢٣٥٠- هەر کەسێك فریای ئەم نوێژە بکەوێت لەگەڵمان: نوێژی بەیانی، پێشتریش چووبێتە عەرەفات بەشەو یان بەڕۆژ ئەوە کارەکانی ئەنجامداوەو حەجەکەی تەواو بووە.**

٢٣٥١- المزدلفة كلها موقف.

(صحيح) ( ن ) عن جابر. (صحيح أبي داود ١٦٦٥)

**٢٣٥١- موزدەلیفە هەمووی جێگایە بۆ ڕاوەستان.**

٢٣٥٢- نحرت هاهنا و منى كلها منحر فانحروا في رحالكم و وقفت هاهنا و عرفة كلها موقف و وقفت هاهنا و جمع كلها موقف.

(صحيح) ( م د ) عن جابر. (صحيح أبي داود ١٦٦٥)

**٢٣٥٢- لێرەدا قوربانیم سەربڕی و مینا هەمووی جێگایە بۆ ئەو کارە، هەر یەکەو لەجێگای خۆی قوربانی سەرببڕێت، لێرەیش ڕاوەستام و عەرەفە هەمووی جێگایە بۆ ڕاوەستان، لێرەیش ڕاوەستان و موزدەلیفەیش هەمووی جێگای ڕاوەستانە.**

٢٣٥٣- هذا الموقف و عرفة كلها موقف.

(صحيح) ( هـ ) عن علي. (حجاب المرأة ٢٧)

**٢٣٥٣- ئەمە جێگای ڕاوەستانە و عەرەفەیش هەمووی جێگای ڕاوەستانە.**

٢٣٥٤- هذا قزح و هو الموقف جمع كلها موقف هذا المنحر و منى كلها منحر.

(صحيح) ( ت ) عن علي. (حجاب المرأة ٢٧)

**٢٣٥٤- ئەمە (قەزەحە) جێگای وەستانە و (جەمع) یش هەمووی جێگایە بۆ ڕاوەستان، ئا لێرەیش دا قوربانیم سەربڕی و مینا هەمووی جێگای بۆ ئەو کارە، بۆیە هەر کەسە و لەشوێنی خۆی قوربانی سەر ببڕێت.**

٢٣٥٥- هذه عرفة و هو الموقف و عرفة كلها موقف.

(صحيح) ( ت ) عن علي. (حجاب المرأة ٢٧)

**٢٣٥٥- ئەوە ( قوزەح )ە جێگای وەستانە، بەڵام ( جەمع ) هەمووی جێگایە بۆ ڕاوەستان، ئەمە جێگای قوربانی سەربڕینە و مینا هەموو جێگایە بۆ ئەو کارە.**

٢٣٥٦- يا أيها الناس ! عليكم بالسكينة فإن البر ليس بإيجاف الخيل و الإبل.

(صحيح) ( حم د ك ) عن ابن عباس. (حجاب المرأة ٢٧)

**٢٣٥٦- ئەمە عەرەفەيە و جێگای ڕاوەستانە، عەرەفە هەمووی جێگای ڕاوەستانە.**

٢٣٥٧- يا أيها الناس ! عليكم بالسكينة فإن البر ليس بإيجاف الخيل و الإبل.

(صحيح) ( حم د ك ) عن ابن عباس. (صحيح أبي داود ١٦٧٦)

**٢٣٥٧- خەڵكینە! لەسەر خۆ ین ، چاكە كردن بەتاودانی ئەسپ و وشتر نییە.**

٢٣٥٨- يا أيها الناس ! عليكم بالسكينة و الوقار فإن البر ليس في إيضاع الإبل.

(صحيح) ( حم ن ) عن أسامة بن زيد. (صحيح النسائي ٣٠١٨)

**٢٣٥٨- خەڵكینە! لەسەرخۆ و شكۆدار بن، چاكە كردن بە غاردانی وشتر نییە.**

٢٣٥٩- أبني ! لا ترموا جمرة العقبة حتى تطلع الشمس.

(صحيح) ( حم ٤ ) عن ابن عباس . (الإرواء ١٠٧٦)

**٢٣٥٩- ئاشكرای بكەرەوە! بەردی جەمرەی عەقەبە فڕێ مەدەن تاكو خۆر هەڵدێ.**

٢٣٦٠- إذا رمى أحدكم جمرة العقبة فقد حل له كل شيء إلا النساء.

(صحيح) ( د ) عن عائشة . (الصحيحة ٢٣٩)

**٢٣٦٠- ئەگەر كەسێك لەئێوە بەردی جەمرەی عەقەبەی فڕێدا هەموو شتێكی بۆ ڕەوا دەبێت تەنها ئافرەت نەبێت.**

٢٣٦١- إذا قضى أحدكم حجه فليعجل الرجوع إلى أهله فإنه أعظم لأجره.

(حسن) ( ك هق ) عن عائشة . (الصحيحة ١٣٧٩)

**٢٣٦١- ئەگەر كەسێك لەئێوە حەجی خۆی تەواو كرد با پەلە بكات لە گەڕانەوەی بۆ لای كەس و كاری، چونكە ئەوە پاداشتی زۆرترە.**

٢٣٦٢- ارموا الجمرة بمثل حصى الخذف.

(صحيح) ( حم ابن خزيمة الضياء ) عن رجل من الصحابة . (الصحيحة ١٤٣٧)

**٢٣٦٢- بەردی جەمرە فڕە بدەن لەوێنەی بەردی بچووك.**

٢٣٦٣- عليكم بحصى الخذف الذي ترمى به الجمرة .

(صحيح) ( حم ن حب ) عن الفضل بن عباس. (الصحيحة ٢١٤٤)

**٢٣٦٣- پێویستە بەبەردی بچووك جەمرە بەرد باران بكەن.**

٢٣٦٤- إن هذا يوم رخص لكم إذا أنتم رميتم الجمرة أن تحلوا من كل ما حرمتم منه إلا النساء فإذا أمسيتم قبل أن تطوفوا بهذا البيت صرتم حرما كهيئتكم قبل أن ترموا الجمرة حتى تطوفوا به.

(حسن) ( حم د ك ) عن أم سلمة . (صحيح أبي داود ١٧٤٥)

**٢٣٦٤- ئەمڕۆ رۆژی ڕوخسەتەبۆ ئێوە، ئەگەر بەردی جەمرەتان فڕێ دا هەموو شتێكتان بۆ ڕەوا دەبێت ئافرەت نەبێت، كە ئێوارەتان بەسەردا هات پێش تەواف كردن بەدەوری كەعبەدا دووبارە دەچنە ئیحرامەوە وەكو پێش بەرد فڕەدانی جەمرە تاكو تەواف بكەن.**

٢٣٦٥- الاستجمار تو و رمي الجمار تو و السعي بين الصفا و المروة تو و الطواف تو و إذا استجمر أحدكم فليستجمر بتو.

(صحيح) ( م ) عن جابر . (المشكاة ٢٦٢٢)

**٢٣٦٥- خۆ پاككردنەوە بەتاك، بەرد فڕەدانیش بەتاك، سەعی نێوان سەفاو مەڕوەیش بەتاك، سوڕانەوە بەدەوری كەعبە بەتاك، ئەگەریش كەسێك لەئێوە خۆی پاك كردەوە بەبەرد با بە تاك ئەنجامی بدات.**

٢٣٦٦- ليس على النساء حلق إنما على النساء التقصير.

(صحيح) ( د ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٦٠٧)

**٢٣٦٦- ژنان سەرتاشینیان لەسەر نییە، ژنان تەنها كورت كردنەوەیان لەسەرە.**

٢٣٦٧- يا أيها الناس ! لا يقتل بعضكم بعضا و لا يصب بعضكم بعضا و إذا رميتم الجمرة فارموا بمثل حصى الخذف.

(حسن) ( حم د هـ ) عن أم جندب. (الصحيحة ٢٤٤٥)

**٢٣٦٧- خەڵكینە! یەكتر مەكوژن و ، لە یەكتریش مەدەن، ئەگەر بەردی جەمرەتانیش فڕێدا بەبەردی بچووك فڕەی بدەن.**

٢٣٦٨- كان إذا رمى الجمار مشى إليه ذاهبا و راجعا.

(صحيح) ( ت ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٢٠٧٢)

**٢٣٦٨- كاتێك بەردی جەمرەی فڕێدەدا بەڕێكردن دەچووە لای و دەگەڕایەوە.**

٢٣٦٩- كان إذا رمى جمرة العقبة مضى و لم يقف.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢٠٧٣)

**٢٣٦٩- پێغەمبەری خوا ﷺ كە بەردی جەمرەی عەقەبەی فڕێدەدا ڕانەدەوەستا.**

٢٣٧٠- كان إذا طاف بالبيت استلم الحجر و الركن في كل طواف.

(صحيح) ( ك ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٢٠٧٨)

**٢٣٧٠- پێغەمبەری خوا ﷺ كەتەوافی دەكرد بەدەوری ماڵی خوا، دەستی دەدایە بەردەكە و گۆشەكە، لەهەموو سوڕانەوەیەكدا.**

٢٣٧١- كان لا يستلم إلا الحجر و الركن اليماني.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمر. (صحيح الترمذي ٨٥٨)

**٢٣٧١- پێغەمبەر ﷺ تەنها دەستی دەدایە بەردەكە و گۆشەی یەمانی.**

٢٣٧٢- إن دماءكم و أموالكم عليكم حرام كحرمة يومكم هذا في شهركم هذا في بلدكم هذا ألا إن كل شيء من أمر الجاهلية تحت قدمي موضوع و دماء الجاهلية موضوعة و أول دم أضعه من دمائنا دم ربيعة بن الحارث بن عبد المطلب و ربا الجاهلية موضوع و أول ربا أضع من ربانا ربا العباس بن عبد المطلب فإنه موضوع كله فاتقوا الله في النساء فإنكم أخذتموهن بأمانة الله و استحللتم فروجهن بكلمة الله و إن لكم عليهن أن لا يوطئن فرشكم أحدا تكرهونه فإن فعلن ذلك فاضربوهن ضربا غير مبرح و لهن عليكم رزقهن و كسوتهن بالمعروف و إني قد تركت فيكم ما لن تضلوا بعده إن اعتصمتم به كتاب الله و أنتم مسؤلون عني فما أنتم قائلون ؟ قالوا: نشهد أنك قد بلغت و أديت و نصحت فقال: اللهم اشهد.

(صحيح) ( م د ن ) عن جابر . (المشكاة ٢٥٥٥)

**٢٣٧٢- خوێن و ماڵتان قەدەغەیە لەنێوان خۆتاندا، وەكو قەدەغە بوونی ئەم ڕۆژەو، ئەم مانگە و، ئەم شوێنە، هەموو شتێك لەڕوداوەكانی نەفامی لەژێر پێمدایە و بەتاڵە، ئەو شتێك لەڕووداوەكانی نەفامی ڕژان بەتاڵن، یەكەمین خوێنانەش لەسەردەمی نەفامیدا ڕژان بەتاڵن، یەكەمین خوێنیش كە بەتاڵی دەكەمەوە خوێنی ڕەبیعەی كوڕی حارسی كوڕی عەبدول موتتەلیبە، سووی سەردەمی نەفامیش هەمووی بەتاڵە، یەكەمین سوویش لەوانە سووی عەبباسی كوڕی عەبدول موتتەلیبە، ئەوانە هەمووی پوچڵ و**

**بەتاڵن، لەخوایش بترسن سەبارەت بەئافرەتەکانتان، چونکە ئێوە ئەوانتان بەڕاسپاردەی خوای گەورە وەرگرتووە، ئەوانتان بە وشەیەك لەلای خواوە بۆ ڕەوا بووە، پێویستە لەسەرتان کەسێك نەهێننە سەر جێگاکانتان ئێوە حەزیان لێ نەکەن، ئەگەریش وایان کرد لێیان بدەن بەبێ توند و تیژی، ئێوەش لەسەرتانە بژێوی و جل و بەرگیان بۆ بکەن بەباشی، ئینجا من دوو شتم بۆ بەجێ هێشتوون ئەگەر دەستیان پێوە بگرن هەرگیز گومڕا نابن، ئێوەیش بەرپرسن بەرامبەرم جا با بزانم چی دەڵێن؟ وتیان: شایەتی دەدەین کە ئاینت ڕاگەیاند و گەیاندت بەشوێنی خۆی و ئامۆژگاریت کرد، فەرمووی: خوایە بەشایەت بە.**

**٢٣٧٣-** لتأخذوا عني مناسككم فإني لا أدري لعلي لا أحج بعد حجتي هذه.

(صحيح) ( م ) عن جابر. (المشكاة ٢٦١١)

**٢٣٧٣- ڕێ و شوێنی عیبادەتەکانتانم لێ وەرگرن، چونکە نازانم لەوانەیە دوای ئەم ساڵە جارێکی تر حەج نەکەم.**

**٢٣٧٤-** لو قلت نعم لوجبت و لو وجبت لم تقوموا بها و لو لم تقوموا بها عذبتم.

(صحيح) ( هـ ) عن أنس. (المشكاة ٢٥٢٠)

**٢٣٧٤- ئەگەر بڵێم بەڵێ واجب دەبێت لەسەرتان، ئەگەریش واجب بێت پێی هەڵناسن، ئەگەریش پێی هەڵنەسن سزا دەدرێن.**

**٢٣٧٥-** هذه ثم ظهور الحصر - قاله صلى الله عليه وسلم لأزواجه في حجة الوداع -.

(صحيح) ( خ د ) عن أبي واقد. (الصحيحة ٢٤٠١)

**٢٣٧٥- ئەمە و، دوای ئەوە پەیوەست بوون بەماڵەوە، بەخێزانەکانی فەرموو لەحەجی ماڵئاوایی دا.**

**٢٣٧٦-** يا أيها الناس ! أي يوم أحرم ؟ أي يوم أحرم ؟ أي يوم أحرم ؟ قالوا: يوم الحج الأكبر قال: فإن دماءكم و أموالكم و أعراضكم عليكم حرام كحرمة يومكم هذا في بلدكم هذا في شهركم هذا ألا لا يجني جان إلا على نفسه ألا و لا يجني والد على ولده و لا ولد على والده " ألا إن الشيطان قد أيس أن يعبد في بلدكم هذا أبدا و لكن ستكون له طاعة في بعض ما تحتقرون من أعمالكم فيرضى بها ألا إن المسلم أخو المسلم فليس يحل لمسلم من أخيه شيء إلا ما أحل من نفسه ألا و إن كل ربا في الجاهلية موضوع لكم رءوس أموالكم لا تظلمون و لا تظلمون غير ربا العباس بن عبد المطلب فإنه موضوع كله و إن كل دم كان في الجاهلية موضوع و أول دم أضع

من دم الجاهلية دم الحارث بن عبد المطلب ألا و استوصوا بالنساء خيرا فإنما هن عوان عندكم ليس تملكون منهن شيئا غير ذلك إلا أن يأتين بفاحشة مبينة فإن فعلن فاهجروهن في المضاجع و اضربوهن ضربا غير مبرح فإن أطعنكم فلا تبغوا عليهن سبيلا ألا و إن لكم على نسائكم حقا و لنسائكم عليكم حقا فأما حقكم على نسائكم فلا يوطئن فرشكم من تكرهون و لا يأذن في بيوتكم لمن تكرهون ألا و إن حقهن عليكم أن تحسنوا إليهن في كسوتهن و طعامهن.

(حسن) ( ت ن هـ ) عن عمرو بن الأحوص. (الإرواء ٢٠٩٠)

**٢٣٧٦- خەڵكینە! كام ڕۆژ قەدەغەترە، كام ڕۆژ قەدەغە ترە، كام ڕۆژ قەدەغەترە، وتیان :ڕۆژی حەجی گەورە. فەرمووی: كەواتە خوێن و ماڵ و ئابڕوتان قەدەغەیە لەسەرتان وەكو قەدەغە بوونی ئەم ڕۆژەتان، لە ئەم شوێنەتان، لە ئەم مانگەتان، هەر كەسێك تاوان بكات بەسەر خۆیدا دەشكێتەوە، هیچ باوكێك تاوان نەكاتە سەر كوڕەكەیداو، هیچ كوڕێكیش تاوان نەكاتە سەر باوكی، شەیتان بێ هیوا بووە لەوەی بپەرسترێت لەم وڵاتەی ئێوە، بەلام گوێڕایەڵی دەكرێت لەهەندێ لەو شتانەی ئێوە بەبێ بایەخی دادەنێن و ئەویش ڕازی دەبێت، موسوڵمانێك هیچی بۆ ڕەوا نییە لە براكەی ئەوەندە نەبێت خۆی گەردنی ئازاد بكات، ئەوەش بزانن كە هەموو سوودەكانی سەردەمی نەفامی پوچەڵ و بەتاڵن، سەرمایەكانتان بۆ خۆتانە نەستەم بكەن و نەستەمتان لێ بكرێت، جگە لە سووی عەبباسی كوڕی عەبدول موتتەلیب هەمووی پوچەڵ و بەتاڵە، هەموو خوێنێكیش ڕێژرا بێت لەسەردەمی نەفامیدا بەتاڵە، یەكەمین خوێنیش كە بەتاڵی دەكەمەوە خوێنی حارسی كوڕی عەبدول موتتەلیبە، ڕاسپاردەی چاكەیش بكەن بەئافرەتانەوە، چونكە ئەوان وەكو دیلن لەلای ئێوە، هیچتان نییە بەسەریانەوەلەوەزیاتره مەگەر خراپە كارییەكی ئاشكرا بكەن، ئەگەریش وایان كرد لێیان جیاببنەوە لەجێگەكانداو، لێیان بدەن بەبێ بۆند و تیژی،ئەگەر گوێڕایەڵتان بوون ئیتر ستەمیان لێ مەكەن و سەغڵەتیان مەكەن، ئێوە مافتان هەیە بەسەر ژنەكانتانەوە، ئەوانیش مافیان هەیە بەسەرتانەوە، مافی ئێوە بەسەر ژنەكانتانەوە ئەوەیە هیچ كەسێك نەهێننە ماڵەكانتان ئێوە حەزیان لێ نەكەن، ڕێگەی هاتنە**

**ژوورەوەیش نەدەنەهیچ کەسێك کەئێوە حەزیان لێ ناکەن، مافی ئەوانیش بەسەر ئێوە وە ئەوەیە چاکەیان لەگەڵ بکەن لە پۆشاك و خۆراکدا.**

٢٣٧٧- انزعوا بني عبد المطلب ! فلولا أن تغلبكم الناس على سقايتكم لنزعت معكم.

(صحيح) ( م د هـ ) عن جابر . (صحيح أبي داود ١٩٠٥)

**٢٣٧٧- ئاو هەڵگۆزن ئەی نەوەی عبدالمطلب ئەگەر لەبەر زاڵ بوونی خەڵکی نەبوایە بەسەرتاندا و دەست گرتنیان بەسەر ئاو هەڵگۆزینتاندا لە ئاوی زمزم لەگەڵ هەڵدەگۆزین.**

٢٣٧٨- السكينة عباد الله السكينة.

(صحيح) ( أبو عوانة ) عن جابر. (صحيح النسائي ٣٠٢٢)

**٢٣٧٨- لەسەر خۆ بن بەندەکانی خوا لەسەر خۆ بن.**

٢٣٧٩- طوافك بالبيت و سعيك بين الصفا و المروة يكفيك لحجك و عمرتك .

(صحيح) ( د ) عن عائشة. (الصحيحة ١٩٨٤)

**٢٣٧٩- سوڕانەوەت بەدەوری کەعبەداو، سەعیەکەت لەسەفاو مەروەدا بەسە بۆ حەج و عومرەکە یشت.**

٢٣٨٠- قفوا على مشاعركم هذه فإنكم على إرث من إرث أبيكم إبراهيم.

(صحيح) ( د الباوردي ) عن ابن مربع الأنصاري. (المشكاة ٢٥٩٥)

**٢٣٨٠- ڕاوەستن لەسەر جێگای عیبادەتەکانتان چونکە ئێوە لەسەر میراتێکن لەمیراتەکانی باوکتان ئیبراهیم.**

٢٣٨١- يا بني عبد المطلب ! سقايتكم و لولا أن يغلبكم عليها الناس لنزعت.

(صحيح) ( حم ت ) عن علي. (صحيح أبي داود ١٦٦٣)

**٢٣٨١- ئەی نەوەی عەبدول موتتەلیب! ئاودانەکەتان.**

## بابەتی فریا نەکەوتن و گیر خواردن

٢٣٨٢- الضبع صيد فكلها و فيها كبش مسن إذا أصابها المحرم .

(صحيح) ( هق ) عن جابر. (الإرواء ١٠٣٤)

**٢٣٨٢- کەمتیار نێچیرە لێی بخۆ، بەرانێکی پیریشی لەسەرە ئەگەر ئەو کەسەی لەئیحرامدایە ڕاوی بکات.**

٢٣٨٣- الضبع صيد و فيه كبش .

(صحيح) ( قط هق ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٠٣٤)

**٢٣٨٣- کەمتیار نیچیرەو، بەرانێکی لەسەرە.**

٢٣٨٤- في الضبع كبش.

(صحيح) ( هـ ) عن جابر. (الإرواء ١٠٥٠)

**٢٣٨٤- کەمتیار بەرانێکی لەسەرە.**

٢٣٨٥- لعلك آذاك هوامك ؟ احلق رأسك و صم ثلاثة أيام و أطعم ستة مساكين أو أنسك شاة.

(صحيح) ( ق د ) عن كعب بن عجرة. (الإرواء ١٠٤٠)

**٢٣٨٥- لەوانەیە جۆرو جانەوەرەکانی سەرت عەزێتیان دابێت، سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە و، نانی شەش هەژار بدە، یان مەڕێك بکە بەقوربانی.**

٢٣٨٦- من كسر أو مرض أو عرج فقد حل و عليه حجة أخرى من قابل.

(صحيح) ( حم ٤ ك ) عن الحجاج بن عمرو بن غزية. (المشكاة ٢٧١٣)

**٢٣٨٦- کەسێك جێگایەکی بشکێت، یان نەخۆش بکەوێت یان شەل بێت ئیتر لەئیحرامەکەی دەبێتەوەو، ساڵی داهاتوو حەجێکی تری دەکەوێتە سەر.**

## بابەتی دروست کردنی کەعبە

٢٣٨٧- صلي في الحجر إن أردت دخول البيت فإنما هو قطعة من البيت و لكن قومك استقصروه حين بنوا الكعبة فأخرجوه من البيت.

(صحيح) ( حم ت ) عن عائشة. (الصحيحة ٤٣)

**٢٣٨٧- نوێژ بکە لەحیجردا ئەگەر حەزت کرد بچیتە ناو کەعبەوە، چونکە حیجر بەشێکە لە کەعبە، بەڵام کەسەکانی تۆ لێیان دابڕی لەکاتی دروست کردنی کەعبەدا و، ئیتر لەبەیت جیایان کردەوە.**

٢٣٨٨- لولا أن الناس حديث عهدهم بكفر و ليس عندي من النفقة ما يقوى على بنيانه لكنت أدخلت فيه من الحجر خمسة أذرع و لجعلت لها بابا يدخل الناس منه و بابا يخرج منه.

(صحيح) ( م ن ) عن عائشة. (الصحيحة ٤٣)

**٢٣٨٨- ئەوە نەبێت خەڵكی تازە لەبێباوەڕی دابڕاون و ئەوەنـدەیش خـەرجیم نییـە کـە بتوانم کەعبە دروست بکەمەوە، پێنج باڵم لەحیجر دەدایە دەم کەعبەوە، دەرگایەکیشم بۆ دەرکرد بۆ هاتنە ژوورەوەی خەڵکی و دەرگایەکیش بۆ دەرچوونیان.**

٢٣٨٩- لولا أن قومك حديث عهد بجاهلية لهدمت الكعبة و لجعلت لها بابين.

(صحيح) ( ت ن ) عن عائشة . (الصحيحة ٤٣)

**٢٣٨٩- ئەگەر کەس و کـارت ماوەیـەکی کـەم نەبوایـە لـە جاهیلیـەت دابـڕاون، کەعبـەم دەڕوخان و دوو دەرگام بۆ دروست دەکرد.**

٢٣٩٠- لولا أن قومك حديثو عهد بجاهلية لأنفقت كنـز الكعبـة في سـبيل الله و لجعلـت بابهـا بالأرض و لأدخلت فيها من الحجر.

(صحيح) ( م ) عن عائشة. (الصحيحة ٤٣)

**٢٣٩٠- لەترسی ئـەوە نـەبێت کـەس و کارەکـەت تـازە لەنـەفامی دەرچـوونە گە نجینـەی کەعبەم خەرج دەکرد لەڕێگای خـوادا و، دەرگاکەشیم لەسـەر زەوی دەکـرد و، حیجریـشم دەخستە پاڵی .**

٢٣٩١- لولا حداثة عهد قومك بالكفر لنقضت البيت فبنيته على أسـاس إبـراهيم و جعلـت لـه خلفا فإن قريشا لما بنت البيت استقصرت.

(صحيح) ( حم ن ) عن عائشة. (الصحيحة ٤٣)

**٢٣٩١- تـازە دابڕانی میللەتەکەت نـەبێت بەبێباوەڕییـەوە، کەعبـەم دەڕوخانـدو لەسـەر بناغەی ئیبراهیم دروستم دەکردەوە، دەرگایەکیشم لە پشتەوە بۆی دروست دەکرد، چـونکە قورەیش کاتێك کەعبەیان دروست کردەوە، کورتیـان کردەوە.**

٢٣٩٢- يا عائشة ! لولا أن قومك حديثو عهد بجاهلية لأمـرت بالبيـت فهـدم فأدخلـت فيـه مـا أخرج منه و ألزقته بالأرض و جعلت له بابين: باب شرقيا و باب غربيا فبلغت به أساس إبراهيم.

(صحيح) ( ق ن ) عن عائشة. (الصحيحة ٤٣)

**٢٣٩٢-ئەی عـائیشە! ئەوە نەبوایە کەلەکەت تـازە لەنـەفامی دابـڕاون فـەرمانم دەکـرد کەعبە بڕوخێنرێت و ئەوەی لێی دەرکراوە دەمگێڕایەوە سەری دەملکاند بەزەوییـەوە و دوو دەرگاشم بـۆ دروسـت دەکـرد، دەرگایـەك لەڕۆژهەڵاتـەوە و، دەرگایـەکیش لـەڕۆژئاواوە و دەمگەیاندە وە سەر بناغەی ئیبراهیم.**

## بابەتى فەزلى ئاوى زەمزەم

**٢٣٩٣**- إن جبريل لما ركض زمزم بعقبه جعلت أم إسماعيل تجمع البطحاء رحم الله هاجر لو تركتها كانت عينا معينا.

(صحيح) ( عم ن الضياء ) عن أبي . (الصحيحة ١٦٦٩)

**٢٣٩٣- كاتێك جيبريل بە پاژنەى لەزمزەمى داو هەڵى قوڵاند، دايكى ئيسماعيل، بەردو كەرسەكى كۆكردەوە رەحمەتى خوا لەهاجەر بێت ئەگەر وازى لێبهێنايە دەبووە كانى يەكى پڕ ئاو ورەوان.**

**٢٣٩٤**- ابن السبيل أول شارب يعني من زمزم .

(صحيح) ( طص ) عن أبى هريرة . (الروض ١٠٣٣)

**٢٣٩٤- رێبوار يەكەمين بخۆرەوەيە - واتە: لەزمزەم-.**

**٢٣٩٥**- إنها مباركة إنها طعام طعم - يعني زمزم -.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي ذر . (الترغيب ١١٦٢)

**٢٣٩٥- ئاوێكى پيرۆزە و، برى خواردن دەكەوێت -واتە: زمزەم-.**

**٢٣٩٦**- خير ماء على وجه الأرض ماء زمزم فيه طعام من الطعم و شفاء من السقم و شر ماء على وجه الأرض ماء بوادي برهوت بقبة حضرموت كرِجْلِ الجَراد من الهوام تصبح تتدفق و تمسي لا بلال بها.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٠٥٦)

**٢٣٩٦- باشترين ئاو لەسەر رووى زەوى ئاوى زەمزەمە، خواردنە بۆ برسێتى، چارەسەريشە بۆ نەخۆشى، خراپترين ئاويش لەسەر رووى زەوى ئاوێكە لە دۆڵى (بەرەهوت) لەقوبەى ((كڵاوەى)) حەزرەمەوت وەكو قاچى كوللە وايە ئەوەندكە و زيندەوەرى لەسەر بەيلنيان هەڵدەقوڵێ و ئيواران تەراپى نامێنێ).**

**٢٣٩٧**- إنها لمباركة هي طعام طعم و شفاء سقم.

(صحيح) ( الطيالسي ) عن أبي ذر . (الترغيب ١١٦٢)

**٢٣٩٧- ئەوە ئاوێکی پیرۆزە، خواردنێکی تێرکەرە و چارەسەری لەنەخۆشیە.**

٢٣٩٨- زمزم طعام طعم و شفاء سقم.

(صحيح) ( ش البزار ) عن أبي ذر. (الترغيب ١١٦٢)

**٢٣٩٨- زەمزەم خواردنێکی تێرکەرو چارەسەرە لەبیماری.**

٢٣٩٩- يرحم الله أم إسماعيل لو تركت زمزم أو قال لو لم تغرف من الماء لكانت عينا معينا.

(صحيح) ( خ ) عن أنس. (الصحيحة ١٦٦٩)

**٢٣٩٩- ڕەحمەتی خوا لەدایکی ئیسماعیل ئەگەر وازی لەزەمزەم بهێنایە – یان فەرمووی: ئەگەر لەو ئاوەی هەڵنە گرتایە، دەبوویە کانیەکی هەڵقوڵاو.**

٢٤٠٠- يرحم الله أم إسماعيل لولا أنها عجلت لكانت زمزم عينا معينا.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عباس. (الصحيحة ١٦٦٩)

**٢٤٠٠- ڕەحمەتی خوا لە دایکی ئیسماعیل لەبەر ئەوە نەبێت پەلەی کرد، زەمزەم دەبوویە کانییەکی هەڵقوڵاو.**

٢٤٠١- ماء زمزم لما شرب له.

(صحيح) ( ش حم هـ هق ) عن جابر ( هب ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٨٨٣)

**٢٤٠١- ئاوی زەمزەم بۆ ئەو مەبەستەیە بۆی دەخورێتەوە.**

٢٤٠٢- كان يحمل ماء زمزم.

(صحيح) ( ت ك ) عن عائشة. (الصحيحة ٨٨٣)

**٢٤٠٢- پێغەمبەر ﷺ ئاوی زەمزەمی هەڵدەگرت.**

## بابەتی فەزیلەتەکانی بەردە ڕەشەکەو گۆشەی یەمانی و مەقام

٢٤٠٣- الركن و المقام ياقوتتان من يواقيت الجنة.

(صحيح) ( ك ) عن أنس. (المشكاة ٢٥٧٩)

**٢٤٠٣- گۆشە و مەقام دوو گەوهەرن لەگەوهەرەکانی بەهەشت.**

٢٤٠٤- إن الركن و المقام ياقوتتان من ياقوت الجنة طمس الله تعالى نورهما و لو لم يطمس نورهما لأضاءتا ما بين المشرق و المغرب.

(صحيح) ( حم ت حب ك ) عن ابن عمرو . (المشكاة ٢٥٧٩)

**٢٤٠٤- گۆشە و مەقام دوو گەوهەرن لەگەوهەرەكانی بەهەشت، خوای گەورە ڕووناكی یانی كوژاندەوە، ئەگەریش ڕووناكییەكانیانی نەكوژاندایەتەوە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایان ڕووناك دەكردەوە.**

٢٤٠٥- إن لهذا الحجر لسانا و شفتين يشهد لمن استلمه يوم القيامة بحق.

(صحيح) ( حب ك ) عن ابن عباس . (الترغيب ١١٤٤)

**٢٤٠٥- ئەم بەردە زمان و لێوی هەیە، شایەتی دەدات بۆ هەر كەسێك دەستی دابێت پێ یەوە بەڕەوایی لەڕۆژی قیامەتدا.**

٢٤٠٦- إن مسح الحجر الأسود و الركن اليماني يحطان الخطايا حطا.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عمر . (المشكاة ٢٥٨٠)

**٢٤٠٦- دەستهێنان بەسەر بەردە ڕەشەكەو گۆشەی یەمانی گوناهەكان دەوەرێنن بەوەرین.**

٢٤٠٧- الحجر الأسود من الجنة.

(صحيح) ( حم ) عن أنس ( ن ) عن ابن عباس . (الضعيفة ٢٦٤٥)

**٢٤٠٧- بەردە ڕەشەكە لەبەهەشتەوەیە.**

٢٤٠٨- الحجر الأسود من الجنة و كان أشد بياضا من الثلج حتى سودته خطايا أهل الشرك.

(حسن) ( حم عد هب ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢٦١٨)

**٢٤٠٨- بەردە ڕەشەكە لەبەهەشتەوەیە، لەبەفریش سپی تر بوو، تاكو تاوانەكانی بت پەرستان ڕەشیان كردەوە.**

٢٤٠٩- الحجر الأسود من حجارة الجنة.

(صحيح) ( سمويه ) عن أنس .

**٢٤٠٩- بەردە ڕەشەكە لە بەردەكانی بەهەشتە.**

٢٤١٠- كان الحجر الأسود أشد بياضا من الثلج حتى سودته خطايا بني آدم.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس. (الضعيفة ٢٦٤٥)

**٢٤١٠- بەردە ڕەشەكە لەبەفر سپی تر بوو تاكو تاوانەكانی ئادەمیزاد ڕەشیان كردەوە.**

٢٤١١- لولا ما مس الحجر من أنجاس الجاهلية ما مسه ذو عاهة إلا شفي و ما على الأرض شيء من الجنة غيره.

(صحيح) ( هق ) عن ابن عمرو. (الترغيب ١١٤٧)

